دکتۆر عزت اللەی عزەتی



# کوردستان



## لە لێکۆڵینەوەیەکی جیۆپۆلەتیکی ئێـران و عێراقدا






وەرگێڕانی لەفارسیەوە:
هاوڕێ یاسین محەمەدئەمین

پیاچونەوەی:
د. جەزا تۆفیق تالیب

دکتۆر عزت اللەی عزەتی

# کوردستان
# لەلێکۆڵینەوەیەکی جیۆپۆلەتیکی ئێران و عێراقدا

وەرگێڕانی لەفارسیەوە/ هاوڕێ یاسین محمدامین
پیاچونەوەی / د. جەزا تۆفیق تالیب

٢٠١٣

پێناسەی کتێب:
ناوی کتێب : **کوردستان لەلێکۆڵینەوەیەکی جیۆپۆلەتیکی ئێران و عێراقدا**
ناوی نوسەر : **دکتۆر عزت اللەی عزەتی**
وەرگێڕی لە فارسیەوە : **هاوڕێ یاسین محمدامین**
نۆبەتی چاپ : چاپی یەکەم – سلێمانی ٢٠١٣
چاپ : چاپخانەی چوارچرا
تیراژ : ١٠٠٠ دانە

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (٢٧٤٧) ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێدراوە.

## فهرست



## بەشی یەکەم

## لێکۆڵینەوە لەپێگەی ئێران و عێراق لەستراتیجی ناوخۆیی و ناوچەییدا



## بەشی دووەم

## شوێنی ئێران لەستراتیجی جیهانیدا

## بەشی سێیەم

## لێکۆڵینەوە لە پێگەی ئێران و عێراق لەستراتیجی ئەمەریکادا



## بەشی چوارەم

## هاوکاریەکانی ئێران و عێراق



## بەشی پێنجەم

## لێکۆڵینەوە لەرەگوڕیشەی دروستبوونی قەیران بەمەبەستی گەیشتن بەمۆدێلێکی ستراتیجی

## پێشەکی وەرگێڕ

هەرچەندە لەم ساڵانەی دواییدا چەندین کتێب و لێکۆڵینەوەی زانستی سەبارەت بەجیۆپۆلەتیك نوسراوە و وەرگێردراوەتە سەر زمانی کوردی، بەڵام لێکۆڵینەوەیەك بەجۆرە و بەم ووردەکارەیە سەبارەت بەوڵاتانی ئێران و عێراق و پەیوەست بەکوردستانەوە زۆر دەگمەنە. ئەمڕۆ جیۆپۆلەتیك لەئاڵۆزترین و جەنجاڵترین بابەتەکانە کەسیاسیەکان و توێژەران و چاودێرانی سیاسی سەرقاڵ کردووە و لەجیهان و ناوچەکەش چەندین سەنتەر و لێکۆڵینەوە سەبارەت بەجوگرافیای سیاسی و جیۆپۆلەتیك دامەزراوە بۆ لێکۆڵینەوە لەسەرجەم بوارەکانی ئەم زانستە بەپێی قۆناغەکان، لەنیوەی یەکەمی سەدەی بیستدا جیۆپۆلەتیك هەلی ئەوەی بۆ ڕەخسا کە چڕۆبکات و پەرەبسێنێت ڕۆڵی شوێن و فاکتەرە جوگرافیەکان لەئاراستەکردن و جڵەوکردنی جەنگەکاندا ببینێت بەتایبەتی لە جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی و جەنگی سارددا، لەپاش ئەمانی جەنگی ساردیش لەنێوان بلۆکی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤێت و پەیمانی وارشۆ گەشەی ئەم زانستە وەك لقێك لەزانستی جوگرافیای سیاسی هەر بەردەوامە.

ئەم کتێبە یەکێکە لەکتێبە گرنگ و بەناوبانگەکانی دکتۆر عزت الله عزتی کەبەدەگمەن توێژینەوەیەکی زانستی و گرنگی وا لەکتێبخانەکاندا بەرچاودەکەوێت کە لەبارەی جیۆپۆلەتیکی دوو وڵات لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کەبریتیە لە ئێران و عێراق کرابێت، گرنگی ئەم کتێبە لەوەدایە کەتوێژەر ئەم لێکۆڵینەوەیەی زۆر بەشێوەی وورد و ئەکادیمی نوسیوە و ئەمکارەی بۆ دەفتەری زانیاری سیاسی و نێودەوڵەتی سەر بەوەزارەتی کاروباری دەرەوە کردووە و لەگەڵ ئەوەی نوسەر خۆی ئێرانیە بەڵام دەتوانین بڵێین زۆر بێلایەنانە و زانستیانە ئەم توێژینەوەیەی ئەنجام داوە و بەووردی ئاماژەی بۆ سەرجەم کێشە و کەلێنە جیۆپۆلەتیکیەکانی ئێران و عێراق کردووە، کەبەدرێژایی مێژوو بووەتە سەرچاوەی ناکۆکی و ململانێ لەنێوان ئەم دووڵاتانەدا و بەشێوەی جۆراوجۆ بەپێی سەردەمە مێژووییەکان.

نوسەر لەنوسینی ئەم کتێبەدا زیاتر لە (٢٦) سەرچاوەی دەگمەنی ئینگلیزی و (٧٦) سەرچاوەی فارسی بەکارهێناوە و لێکۆڵینەوەکەی دابەشکردووە بۆ پێشەکی و پێنج بەش بەم شێوەیەی خوارەوە:

بەشی یەکەم لێکۆلینەوە لەپێگەی ئێران و عێراق لەستراتیجی ناوخۆیی و ناوچەییدا، کەزۆر بەووردی و شارەزایی ئاماژەی بۆ پێگەی ستراتیجی هەردوو وڵات کردووە و خاڵە لاوەزەکانی لەڕووی ستراتیجیەوە خستۆتەڕوو. بەشی دووەمی تەرخانکردووە بۆ شوێنی ئێران لەستراتیجی جیهانیدا بەپێی قۆناغەکانی مێژوو چڕکردنەوەی بابەتەکە بەدرێژایی مێژووی سەدەی بیستەم. لەبەشی سێیەمدا

ناماژەیەکی وورد بۆ لێکۆڵینەوە لەپێگەی ئێران و عێراق لەستراتیجی ئەمەریکادا بەتایبەتی لەماوەی جەنگی سارد و دوای نەمانی جەنگەکەش دەکات. لەبەشی چوارەمدا باس لەوهەنگاوانە دەکات بۆ ئاسایی کردنەوەی گرژیەکانی نێوان هەردوو وڵات و دروستکردنی هاوکاری لەنێوانیاندا تادەگات بەوئاستەی بتوانرێت ئێران و عێراق وەك یەك وڵات لەناوچەکە کاربکەن. بەشی پێنجەم تەرخانکراوە بۆ لێکۆڵینەوە لەرەگوریشەی دروستبوونی قەیرانەکان بەمەبەستی گەیشتن بەمۆدێلێکی ستراتیجی لەنێوان ئەم دوو وڵاتەدا تابتوانرێت هەنگاوەکانی لێکنزیکبوونەوە ئەنجامبدرێت.

نوسەر لەم کتێبەدا هەندێك هەڵەی ئەکادیی و جوگرافی کەمی کردووە، من هەوڵمداوە بەپێی پێویست هەڵەکان لەپەراوێزدا ڕاستبکەمەوە بەبێئەوەی دەستکاری دەقی نوسینەکە بکەم، هەروەها دەشێت لەڕووی زانستیەوە ڕەخنەم لەهەندێك لەبۆچونەکانی نوسەر هەبێت بەڵام ئەو ڕەخنانە هیچ لەبەهای لێکۆڵینەوەکە کەمنکاتەوە چونکە بەدەگمەن کەسێك دەدۆزیتەوە بەم شێوە زانستی و بێلایەنیە لەبارەی جیۆپۆلەتیکی ئێران و عێراقەوە بنوسێت، شتێکیتر کەگرنگە لێرەدا باسی بکەم ئەوەیە ئەم کتێبە کە بەزمانی فارسی نوسراوە لەژێر ناونیشانی (لێکۆڵینەوەیەك لەجیۆپۆلەتیکی ئێران و عێراق)، بەڵام لەبەرئەوەی ئەم لێکۆڵینەوەیە گرنگیەکی زۆری داوە بەکورد و کوردوستان و لەناو کۆدە جیۆپۆلەتیکیەکاندا جەخت لەکوردستان دەکاتەوە و زۆربەی کەلێنە جیۆپۆلەتیکیەکانی بەستۆتەوە بەناوچە کوردستانیەکانی هەردوو وڵاتەوە زۆربەی باسەکەی چ لەڕووی جوگرافی و چ لەڕووی مێژووییەوە تەرخانکردووە بۆ کوردستان و زۆربەی کێشە جیۆپۆلەتیکیەکانی نێوانی هەردوو وڵاتی بەستۆتەوە بەکوردستانەوە، بۆیە من لەدانانی ناونیشانی کتێبەکەدا ووشەی کوردستانم بۆ زیادکردووە بەمجۆرەی خوارەوە (کوردستان لەلێکۆڵینەوەیەکی جیۆپۆلەتیکی ئێران و عێراقدا)، بۆیە لەوبارەیەوە داوای لێبووردن لەنوسەردەکەم.

لەکۆتایدا هیوادارم بەم وەرگێرانە بتوانم بەشێك لەئەرکی سەرشانی خۆم بەرامبەر بەنەتەوەکەم و خوێنەرانی بواری جوگرافیا و جیۆپۆلەتیك و سیاسەت و ڕۆشنبیران جێبەجێکردبێت و بێگومان وەرگێرانیش بێکەموکورتی نییە و هیوادارم جێگای ڕەزامەندی خوێنەرانی ئازیز بێت.

وەرگێر

هێوری یاسین محمدامین

٢٠١٢/٧/١٠

## پێشەکی نوسەر

دوای هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤێت و کۆتایی جەنگی سارد و نەمانی پەیمانی وارشۆ، گۆڕانکاری گەورە لە جوگرافیای سیاسی و شوێنی جیوپۆلەتیکی جیهاندا ڕوویداوە. گۆڕانکاریەکان و پێشهاتەکانی ناوچەکانی دەوروبەر و نزیکی سنوری ئێران بە بەراورد بە زۆربەی ناوچەکانیتری جیهان گەورەتر و ئاڵۆزتر بووە. ئەگەرچی هاوکات لەگەڵ شۆڕشی ئیسلامی ئێران، دوو گۆڕانکاری سەرەکی لە دەوروبەری ئەم وڵاتە واتە ئێران ڕوویدا، هەرچەندە ئەم دوو ڕووداوە دوای کۆتایهاتنی جەنگی ساردیش هەر بەردەوامبوو و بارودۆخەکەش خراپتر بوو. لەوانەش داگیرکردنی وڵاتی ئەفغانستان لەلایەن یەکێتی سۆڤێتەوە لە ساڵی (١٩٨٠)، لە دوای ڕوودانی شۆڕشی ئیسلامی لەئێران، هێرشی سوپای عێراق بۆ سەر ئێران لە (ئەیلولی ١٩٨٠) بەردەوامبوونی شەڕ بۆ ماوەی هەشت ساڵ تا لەساڵی (١٩٨٨) کۆتایی هات و دوابەدوای ئەوە هێرشی عێراق بۆ سەر کوێت لەساڵی (١٩٩٠) دەستی پێکرد. ئەمانە گۆڕانکاری زۆر بەرچاو بوون کە لەوڵاتانی هاوسنوری ئێران ڕوویاندا. هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤێت و سەربەخۆبوونی کۆمارەکانی، وڵاتی ئێرانی بەرەو مەیدانێکی نوێ برد لەبواری جوگرافیای سیاسیدا. ئێران کە جاران لەباکورەوە تەنیا هاوسنور بوو لەگەڵ یەکێتی سۆڤێتدا، بەڵام پاش هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤێت و دروستبوونی چەندین کۆمار و کۆتاییهاتنی جەنگی سارد لە (دیسەمبەری ١٩٩١) لەگەڵ چەندین وڵاتیتر لەئاسیای ناوەڕاست و قەوقاز بووە دراوسێ، کۆماری تازە سەربەخۆی تورکمانستان لەباکوری ڕۆژهەڵاتی ئێران و لەڕۆژهەڵاتی دەریای قەزوین و هەروەها کۆمارەکانی ئازەربایجان و ئەرمینیا و کۆماری خودموختاری نخجوان (لەناو پێکهاتەی کۆماری ئازەربایجان) لەڕۆژئاوای دەریای قەزوین باکوری ڕۆژئاوای ئێران بوونە هاوسنور.

دوای هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤێت و کۆتایهاتنی جەنگی سارد و نەمانی پەیمانی وارشۆ، گۆڕانکاری لەسیاسەتی نێودەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا سەبارەت بە ئێران ڕوویدا، کە دوای پچڕانی پەیوەندی ئێران لەگەڵ ئەو وڵاتە لەئەنجامی ڕوودانی شۆڕشی ئیسلامی لەئێران و هاتنەدەرەوەی ئێران لە (پەیمانی سنتو) لەساڵی (١٩٧٩) و دواتر هەڵوەشانەوەی ئەم پەیماننامەیە (وەك باڵی ڕۆژهەڵاتی پەیمانی ناتۆ). دوای پچڕانی پەیوەندی ئێران لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و داگیرکردنی سەفارەتەکەی لەلایەن خوێندکارانی باڵی ئیمامەوە، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەهەوڵی گۆشەگیرکردنی ئێراندا بوو لەڕێگای پەیڕەویکردنی ستراتیجی جڵەوگیری دوولایەنەوە. جەنگی سەپێنراوی

عێراق بەسەر ئێران و بەردەوامبوونی بۆ ماوەی هەشت ساڵ، یەکێك بوو لەو ڕێگایانەی کە بووەهۆی لاوازکردنی ژێرخانی ئابووری و سەربازی هەردوو وڵات لەناوچەکەدا.

هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤێت و دامەزراندنی کۆمارە سەربەخۆکان، کاریگەری لەسەر نەخشە ستراتیجیەکانی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی (لەوانە تورکیا) هەبوو، ووردەوردە ئارەزووی ئەو کۆمارانەی لەژێر نفوزی مۆسکۆدا بوون بەرەو ڕۆژئاواو دەچوون. دوورایی ئەم کۆمارانە لەمۆسکۆوە بووەهۆی کرانەوەیان بەرەو ڕۆژئاوا، هەروەها یارمەتیدەر بوو بۆ ئەوەی ئەمەریکا و پەیمانی ناتۆ جێپێی خۆیان قایم بکەن، لەڕێگای باشکردنی باری ئابووری و کۆمەڵایەتی ئەم کۆمارانە لەناوچەکە نفوز پەیدابکەن.

ئەگەرچی لەسەرەتای هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤێت کۆمەڵەیەك بە ناوی (کۆمەڵەی وڵاتە سەربەخۆ بەرژەوەند هاوبەشەکان) دامەزرا، کە لەهەموو کۆمارەکانی ناو یەکێتی سۆڤێت (جگە لەکۆمارەکانی بەڵتیك) پێکهاتبوو. بەڵام ڕەوتی بارودۆخەکە لەماوەی ساڵانی دواییدا پیشانیدا کە ئەم کۆمەڵەیە نەیتوانیوە لەڕەوشی چارەسەری ناکۆکیەکان و بەدیهێنانی زەمینەیەکی ئەمنی و ئابووری بۆ ئەندامانی کۆمەڵەکە سەرکەوتن بەدەست بهێنێت. لەبەرئەوە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی لەڕۆژئاوا بەتایبەت ئەندامانی پەیمانی ناتۆ، لەهەوڵدان بۆ زیاد کردن و فراوانکردنی نفوزی خۆیان لەئاسیای ناوەراست و قەفقاز، لەڕێی هاوکاری یەکێك لە هاوپەیمانەکانی خۆیان (تورکیا) کە کەوتۆتە باکوری ڕۆژئاوای ئێران و باشووری قەفقازەوە. نفوزی خۆی لەباکوری ئێران بەتایبەت لەقەفقاز زیاد کردووە دوای تێپەڕینی زیاتر لە (٧) ساڵ، بۆتە هۆی کەمکردنەوەی ئامادەیی و نفوزی ئێران لەهاوکێشە سیاسی ـ ئابووریەکانی ئەم کۆمارانەدا.

پەیمانی ناتۆ بەو بڕیارەی کەدای بۆ فراوانکردنی قەڵەمڕەوی خۆی بەرەو ڕۆژهەڵات بەتایبەت لەقەفقاز، نەك تەنیا مەبەستی جڵەوکردنی ڕوسیا لەسنوری باشوور ڕۆژئاوا بوو، بەڵکو لەهەمانکاتدا مەبەستی جڵەوکردن و گەمارۆدانی ئێرانە لەباکوری ڕۆژئاواوە و ڕێگرتن لەئێران بۆ گەیشتن بە قەوقاز و ڕوسیا. دابەشکردنی دەریای قەزوین بەپێی نەتەوە و وڵاتەکان بووەهۆی ئەوەی کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی ناوی نێوان ئێران و ڕوسیا بپچڕێت و لەچوارچێوەی وڵاتانی کەناری دەریای قەزوین ڕێکبخرێت. لەکاتێکدا ڕوسیا و ئێران پێویستیان بە هاوکاری و پەیوەندی ڕاستەوخۆ هەیە. بەمجۆرە ئێران لەلای باکورەوە گەمارۆدراوە لەلایەن دراوسێکانیەوە کە زیاتر بەرژەوەندیەکانیان نزیك بوو لەگەڵ ڕۆژئاوا بەتایبەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ئەندامانی پەیمانی ناتۆ و بەتایبەتیتر تورکیا وڵاتانیتری ناوچەکە کە دوژمنە لەگەڵ ئێران وەك ئیسرائیل دەبیننەوە.

ئەمڕۆ ئێران بە لەدەستدانی پێگەی شارستانی خۆی لەناوچەکانی قەفقاز و ئاسیای ناوەڕاست. لەگەڵ دوژمنانێکدا ڕووبەڕووە کە بۆتەهۆی لاوازکردنی ئامادەیی ئێران و ڕوسیا و بەهێزکردنی ناتۆ و

ئیسرائیل، کە لەسەر سنوری (٢) هەزارکیلۆمەتری بۆتە هەڕەشە بۆ سەر بەرژەوەندیە نەتەوەییەکانی ئێران، چونکە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و یەکێتی ئەوروپا سیاسەتی دەرەکی و پەیوەندی دەرەوەی ئەم وڵاتانە ڕێکدەخەن نەك سەرکردەکانیان. (ڕەوتی کاروبارەکان لەم سااڵنەی دواییدا سەبارەت بە پەیوەندیە دیپلۆماسیەکان ڕاست و دروستی ئەم بۆچوونە دەسەلمێنێت).

ئێران ئێستا لەهەرسێ ناوچەی قەفقاز (جگە لە ئەرمینیا لەم ساتەدا) و ئاسیای ناوەڕاست (جگە لەتاجیکستان کە هاوسنور نییە) و دەریای قەزوین، کە سێ ناوەندی گرنگی جیوپۆلەتیکی و پەیوەندین، لەکاتێکدا لەدەستدانی نفوزی خۆی لەم ناوچانە، کە جاران ناوچەی نفوزی خۆی بووە لەزۆر ڕووەوە لەدەستی داوە و لەقۆناغی گەڕانەوەیە بۆ ئاستی پەیوەندی ئابووری لەقۆناغی جەنگی ساردا.

لەڕۆژهەڵاتەوە، ئێران هاوسنورە لەگەڵ ئەفغانستان و پاکستان کە هەر دووکیان سەرچاوەی کێشە بوون بۆ ئێران لەڕابردو و ئیستا و داهاتوودا، لەئەفغانستان، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە یارمەتی هاوپەیمانە هەرێمیەکەی (پاکستان)، تاڵبانیان هێنایە سەرحکم و لەیەکەمین قۆناغی سەرکەوتنیان لەساڵی (١٩٩٧) پەیوەندی ڕۆژئاوای ئەفغانستان، واتە ناوچەی هرات کە بەشێکەبووە لەقەڵەمڕەوی شارستانی و فەرهەنگی ئێران لەگەڵ ئێران پچڕاند و لەئەنجامدا پەیوەندی شیعەکان و تاجیکەکانی ئەفغانستان لەگەڵ ئێران پچڕا. لەساڵی (١٩٩٨) و داگیرکردنی مەزاری شەریف سەنتەری خەباتی حکومەتی ئیسلامی ئەفغانستان، دوا سەنگەری بەرگری شیعە و هەوادارانی ئێران لەڕۆژئاوای ئەفغانستان لەلایەن تاڵیبانەوە داگیرکرا، کە ژمارەیەکی زۆر لەشیعەکانی تێدا کوژران و کونسوڵخانەی ئێران لەم شارەدا وێران کرا و هەشت کەسی دیپلۆمات و پەیامنێرێکی ئێران بە دڕندانەترین شێوە کوژران. تووڕەی خەڵکی ئێران و کۆمەڵگای جیهانی، ئێرانی تا ئاستی هێرشی سەربازی دژی ئەفغانستان هاندا و کۆبوونەوەی هێزی سەربازی سەد هەزار کەسی ئێران بە درێژی سنور لەگەڵ ئەفغانستان لەساڵی (١٩٩٨) هەردوو وڵاتی دراوسێی گەیاندە ئاستی مەترسی پێکدادانی سەربازی و هەڵگیرساندنی جەنگ.

سنورەکانی ڕۆژهەڵاتی لەدەیەی ڕابردوودا ناوەندی ڕوبەڕوو بوونەوەی باندی مادەسڕکەرەکان بووە کە ئەفغانەکان بەرهەمیاندەهێنا و لەڕێگای ئێرانەوە بەرەو ئەورووپایان دەبرد. هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤێت و دەرچونی سوپای سوور لەئەفغانستان و ڕوخانی حکومەتی سۆسیالستی دکتۆر نەجیب اللە لەئەفغانستان لەساڵی (١٩٩٢) بووە هۆی سەرهەڵدانی تیرۆر و دڕندایەتی و جەنگی ناوخۆ و بەرهەمهێنانی مادەی سڕکەر لەئەفغانستان کە ئاسایشی ئێران و وڵاتانی ناوچەکەی خستبووە مەترسیەوە.

بەمجۆرە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەباکور و ڕۆژهەڵات کێشەی بۆ جوگرافیای سیاسی ئێران دروست دەکرد، کە دەرچون لێی پێویستی بە وردەکاری و کات و متمانەسازی هەیە.

لەرۆژئاواوە ئێران هاوسنورە لەگەڵ عێراق و تورکیا، خاکی عێراق کە دوای ڕوخانی دەوڵەتی عوسمانی لەدەیەی دووەمی سەدەی بیست، لەژێر ئینتدابی بەریتانیای گەورەدا بوو، تا لەساڵی (١٩٤٥) هاتەدەرەوە، کێشە سنوریەکانی نێوان ئێران و عوسمانی بە میرات بۆ ئەم وڵاتە مایەوە و بووە بەڵگە بۆ بەشەرهاتنی لەگەڵ ئێراندا، لەئەنجامدا عێراق دوای کەمتر لەدوو ساڵ لەسەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی هێرشی کردە سەر ئێران و جەنگی خوێناوی لەنێوان ئەم دوو وڵاتە دراوسێیەدا بەرپابوو، بۆ ماوەی هەشت ساڵ درێژەی کێشا.

سنوری نێوان ئێران و عێراق (١٦٠٩)کم درێژە کە لەڕووی جوگرافیا سیاسیەوە بە یەکێك لەنالەبارترین حاڵەتی هێڵی سنوری دادەنرێت، ناکۆکی نێوان دوو وڵاتی دراوسێ زیاد دەکات، ئەم سنورە تایبەتمەندی زۆری هەیە، کە بۆتەهۆی دروستبوونی گرژی و ئاڵۆزی لەنێوان هەردوو وڵاتی دراوسێدا.

دوای تێکشکانی عێراق لەئەنجامی داگیرکردنی کوێت لەساڵی (١٩٩١) ڕاستەوخۆ لەوکاتەدا کە هاوپەیمانە سەرەکیەکەی (یەکێتی سۆڤێت) لەحاڵەتی هەڵوەشاندنەوەدا بوو، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی لەرۆژئاوا ئەو توانایەیان بەدەستهێنا کە خواستەکانی خۆیان لەچوارچێوەی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتوەکاندا بڕیارنامەیەك پەسەند بکەن بۆ هێرشکردنە سەر عێراق و ئەو وڵاتەش ڕووبەڕوی گەماڕۆی ئابووری و سەربازی بکەنەوە کەتا ئەمڕۆ بەردەوامە (مەبەستی ئەوکاتەی کتێبەکەی تێدانوسراوە واتە ٢٠٠٢ وەرگێڕ). وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا بە جێگیرکردنی دوو هەرێمی دژە فڕین لەباکور و باشووری عێراق، تەنیا سێیەکی ئاسمانی عێراقیان لەدەسەڵاتی حکومەتی ئەو وڵاتەدا هێشتەوە. لەناوچەی دژە فڕین تەنیا فڕۆکەی سەربازی ئەمەریکا و بەریتانیا دەیانتوانی بفڕن. دروستکردنی ناوچەی دژە فڕین، بووە هۆی نەمانی دەسەڵات حکومەتی عێراق لەباکور و باشوری ئەو وڵاتە. لاوازی و نەمانی حکومەتی ناوەندی عێراق لەباکور ئەو هەلەی بۆ کوردەکان ڕەخساند، کە دەسەڵاتی خۆیان لەرێگای یارمەتی ئەمەریکا و تورکیاوە[1] بەردەوامی پێبدەن. لەم ماوەیەدا تورکیا بەدوای تەماعی خۆی بە بیانوی ڕاونانی (پ.ك.ك)ە چەندین جار لەشکرکێشی بۆناو خاکی عێراق (کوردستانی عێراق ــ وەرگێڕ) کردووە، لەگەڵ ئەوەی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی نارازی دەربڕیوە لەمبارەیەوە.

وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ لەناوبردنی حکومەتی سەدام و دانانی حکومەتێك لەعێراق لەژێر نفوزیی خۆیدا، کاری گەمارۆدانی وڵاتی ئێران لەرۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و باکورەوە تەواو دەبێت. لەبەرئەو هۆیانە عێراق سەرێشەی زۆری بۆ ئێران دروستکردووە کە سەد هەزار قوربانی و سێسەدهەزار کەم ئەندامی بۆ ئێران بەجێهێشتووە و زەرەری گەورەی بەژێرخانی ئابووری ئێران گەیاندووە، بەڵام لەڕووی

---

[1] ) کوردەکان دەسەڵاتی خۆیان لەرێگای یارمەتی تورکیاوە بەردەوامی پێنادەن بەپێچەوانەوە دەوڵەت و حکومەتی تورکیا هەمیشە بەئاشکرا و بەنهێنی دژایەتی ئەو دەسەڵاتە کوردیە نیمچە سەربەخۆیە کاردەکات. وەرگێڕ

ئاسایشی نەتەوەییەوە بەرژەوەندی نەتەوەیی ئێران لەم ساتەدا دەتوانێت لاوازی جیوستراتیجی ئێران لەستراتیجی جڵەوکردنی چەند لایەنە تاناستێك وەلانێت و قوڵایی ستراتیجی ئێران تاناستێك فراوان بکات. هەرچەندە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەهەوڵی ڕوخاندنی حکومەتی سەدام حسێندایە بەڵام ئەو تائێستا توانیویەتی کاری خۆی لەناوچەکە ئەنجامدات و لەرێگای ئەو هەوڵانەوە واچاوەڕوان دەکرێت لەناییندەیەکی نزیکدا گۆڕانکاری بەرچاو ڕووبات، چونکە ڕێگای جیاواز بۆ گۆڕینی ڕژێم لەعێراق هەیە و سەرنگونکردنی سەدام حسێن دابەشکردنی دەسەڵات لەعێراقدا بەدوای خۆیدا دێنێت، کە لەو کاتەدا کوردەکان و شیعەکان[1] و عەرەبەکان کە هەریەکەیان بۆخۆیان داوای دەسەڵاتی زیاتر دەکەن. تورکیا، ئێران و سوریا بەهۆی بوونی کورد لەوڵاتەکەیاندا لەکاتی دروستبوونی وڵاتێکی سەربەخۆی زۆرینەی کورد ڕووبەڕووی کێشەی گەورە دەبنەوە. کوردەکانی تورکیا کە دانیشتوانەکەی نزیکە (٢٠) ملیۆن کەس دەبێت و داوای سەربەخۆیی دەکەن خاکی تورکیا دەخەنە بەر هەڕەشە. لەبەر ئەم هۆیە تورکیا داوای مانەوەی خلکی عێراق دەکات بەیەکپارچەیی، لەگەڵ ئەوەی نەیاری حکومەتەکەی سەدامیشە. تورکیا لەکاتی هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی عوسمانی و دروست بوونی دەوڵەتی کۆماری تورکیا لەساڵی (١٩٢٤) نارازی بوو لەپێدانی کەرکوك و موسڵ بە عێراق ( تەنیا کەرکوك و موسڵ نەبوو بەڵکو ولایەتی موسڵ کە دەکاتە هەرێمی کوردستان ـ وەرگێڕ). بۆ ئەم مەبەستە پەرلەمانی تورکیا هەموو ساڵێك لەبووجەی وڵاتەکەیدا بودجەیەکی ڕەمزی بۆ ئەم ویلایەتەی تەرخان دەکات، بۆیە زۆرکەس پێی وایە هێرشەکانی ئەم ساڵانەی دوایی بۆ باکوری عێراق (هەرێمی کوردستان ـ وەرگێڕ) دەیەوێت ئەو ناوچانە بخاتەوە سەر خاکی خۆی. لەم لایەنەوە ئیسرائیل یارمەتی ئاشکرای لەبواری زانیاری و چەك بە تورکیا بەخشیوە و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پاریزگاری لەم رفتارەی تورکیا دەکات.

نەبوونی دەسەڵاتی ناوەند لەناوچە کوردنشینەکانی باکور، بۆتەهۆی بەهێزبوونی ڕەوتی جیابوونەوەی کوردە جوداخوازەکان و ئامادەیی هێزی سەربازی تورکیا لەم ناوچەیە بە بیانوی سەرکوتکردنی پارتی کرێکارانی کوردستان لەباکوری عێراق. هەرلەم بارودۆخەدا پەیمانی هاریکاری سەربازی لەنێوان تورکیا و ئیسرائیل واژۆکرا بە مەبەستی جڵەوکردنی ئێران و لاوازکردنی عێراق.

لەباکوری ڕۆژئاوای ئێران، تورکیا چەندینجار بە بیانووی گەڕان بەدوای بەرهەڵستکارانی ئەنقەرەدا ئاسمانی ئێرانی بەزاندووە و ناوچەی سنوری و قەڵەمڕەوی ئێرانی بۆردومان کردووە و سنورەکانی ئێران لەگەڵ تورکیا و عێراق کەوتۆتە بەر هەڕەشە. سەرەڕای ئەوە ئەگەر زۆرە کە تورکیا لەهەوڵی جێبەجێکردنی

---

[1] ) نوسەر شیعەی وەك نەتەوەیەکی سەربەخۆ ناودەبات لەکاتێکدا شیعە مەزهەبە نەك نەتەوە، ئەوانیش هەر سەر بەنەتەوەی عەرەبی عێراقن کە ئەم بۆچوونەش زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ئایدیۆلۆجی سیاسی حکومەتی ئیسلامی ئێران و ئەو جیاوازیە قوڵەی لەنێوان سونە و شیعەی عیراقدا هەیە کە وەك دوونەتەوەی جیاواز دەڕواننە یەکتر. وەرگێڕ.

نەخشەی فراوانخوازی خۆیدا بێت، بە پشتگیری ئەمەریکا و یارمەتی هونەری سەربازی ئیسرائیل. لەپارێزگاکانی موسڵ و کەرکوك کە کوردەکان لەپاڵ تورکمانەکانی عێراقدا دەژین، بەرواڵەت پشتیوانی لەتورکمانەکان دەکات بەڵام لەناخدا بۆ گەیشتنە بەسەرچاوەکانی نەوت.

بەشێوەی گشتی دەتوانین بڵێین بارودۆخی سنوری ئێران لەرۆژهەڵات، باکور و رۆژئاواوە مەترسیدار و ناثارامە، بۆ چاودێریکردنی ئەم سنورانە پێویستی بە بەرێوەبردنێکی کارامە و سیاسەتێکی ناوخۆ و دەرەکی بەهێز و زانستی هەیە.

لەباشوورەوە، ئێران لەگەڵ وڵاتانی باشووری کەنداوی فارسی هاوسنورە کە دوای شۆرشی ئیسلامی ئێران، ئەنجومەنێکیان بەناوی (ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو) دامەزراند کە شەش وڵاتی کەنداو (کوێت، عەرەبستانی سعودی، بەحرین، قەتەر، ئیمارەتی عەرەبی یەکگرتوو و سەڵتەنەی عومان) تێیدا ئەندامن. ئامانج لەدامەزراندنی ئەم ئەنجومەنە بەربەرەکانی کردنی شۆرشی ئیسلامی ئێران و پارێزگاریکردن لەحکومەتی عێراق بوو لەماوەی جەنگی هەشت ساڵای لەگەڵ ئێراندا. پەیوەندی ئێران لەگەڵ ئەم ئەنجومەنە و هەموو وڵاتانی ئەندامی ئەنجومەن بە درێژایی جەنگی ئێران و عێراق بەتەواوی ئاڵۆز بووە، تاوەکاتەی لەساڵی (١٩٩١) عێراق هێرشی کردە سەر کوێت و لەبەرامبەردا ئێران نارەزایەتی لەسەر ئەم داگیرکاریە پیشاندا و ژمارەیەك لەهاوڵاتیانی ئاوارەی کوێتی لەماوەی ئەو داگیرکاریەدا گرتەخۆی و پاراستنی، هەروەها ئێران بەشداریکرد لەکوژاندنەوەی بیرە نەوتەکانی کوێت کە لەلایەن عێراقەوە ئاگریتێبەردرا، پەیوەندی ئەم ئەنجومەنە لەگەڵ ئێران باشبوو. دەستپێکی سەرۆکایەتی کۆماری محمد خاتەمی قۆناغێکی نوێی لەپەیوەندی ئێران لەگەڵ وڵاتانی ناوچەکە دامەزراند. دوای بەستنی کۆنفرانسی سەرکەوتووی سەرانی رێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی لەتاران لەساڵی (١٩٩٨) پەیوەندی ئێران لەگەڵ وڵاتانی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو باش بوو، بەشداریکردنیان لەسەر ئاستی باڵای سیاسی لەدانیشتنەکەدا نیشاندانی فۆرمێکی رێکوپێکی نوێی سیاسیە لەناوچەکەدا. لەم بوارەدا عەرەبستانی سعودی کاریگەری زۆر باشی هەبوو، دیداری ئاغای خاتەمی سەرۆك کۆمار لەسعودیە و کوێت، لەساڵی (١٩٩٩) ئاسۆیەکی نوێ لەهاوکاری نێوان ئێران و عەرەب سەریهەڵدا.

لەکەنداوی فارسی مەسەلەی دورگەکانی ئێران (تنبی بچوك وگەورە و ئەبوموسا) کە لەلایەن ئیمارەتی عەرەبی داوادەکرێت لەو مەسەلانەیە کە روبەرووی ئێران دەبێتەوە و ئەمەش بەپاڵپشتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ناوبەناو دەخرێتە روو بۆ تێکدانی پەیوەندی نێوان ئێران و عەرەبەکان، بەگشتی لەهەموو دانیشتنەکانی کۆمکاری عەرەبی و ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو خراوەتەروو بۆتە جێگای نیگەرانی عەرەبەکان لەئێران. لەکاتێکدا کە دوای کۆتاییهاتنی جەنگی سارد ئەم دورگانە گرنگی ستراتیجی خۆی لەنێوان ئێران، عەرەب، ئیمارەتی عەرەبی و ئەمەریکا لەدەستداوە. خستنەرووی

مەسەلەی پەیوەست بەو سێ دورگەیە تەنیا هەوڵێکی ئەمەریکیە بۆ دروستکردنی بازاڕی چەکی خۆی لەناو وڵاتە عەرەبییەکاندا کە مەترسی بزوتنەوە ئیسلامیەکان و فراوان بوونی نفوزی ئێرانیان هەیە.

بەسەرنجدان لەگۆڕانکاریەکانی جیهان و بەجیهانیبوونی ئابووری و فراوانبوونی ڕێکخراوی هەرێمایەتی لەسەر بنەمای گونجاوی هاوسێیەتی و ڕێگرتن لەگرژی و دوژمنایەتی لەنێوان دراوسێکاندا، سەقامگیری ئابوری، فەرهەنگی و بازرگانی لەگەڵ عێراقدا دەتوانێت یارمەتیدەربێت بۆ پەرەپێدانی هەردوو وڵات. ئەم توێژینەوەیە لەپێناوی ئەوەدایە کە زانیاری فراوان و هەمەجۆر لەئاستی ناوخۆیی، هەرێمی و جیهانی و کێشەکانی ئێران و عێراق و ستراتیجی هەرێمی و جیهانی لەقۆناغە جیاوازەکانی پێش و دوای جەنگی سارد بخاتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. ئەم توێژینەوەیە ڕێڕەوێکی زانستی گرتۆتەبەر و گرنگترین شت لەم باسەدا تۆمارکردن لایەنی جیوپۆلەتیك و لایەنی سیاسەتی دەرەوەی ئێران لەپەیوەندی لەگەڵ عێراقدا.

## بەشی یەکەم

### لێکۆڵینەوە لە پێگەی ئێران و عێراق لەستراتیجی ناوخۆیی و ناوچەییدا

بە کۆتاییهاتنی جەنگی دووەمی جیهانی، بۆ ماوەی دوو ساڵ ئارامی بەرقەرار بوو، جیهانی دوای جەنگ لەحاڵەتێکی بێ کێشمەکێشم و ئارامیدا بوو وەك قۆناغێکی پێویستی دوای جەنگ. بێشك لەساڵی (١٩٤٥) بە پشت بەستن بە تەواوی عەقل و مەنتق ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەیتوانی بانگەشەی رابەری جیهان بکات. ئەڵمانیا، ئیتالیا و یابان تێکشکابوون و فەرەنسا داگیرکرابوو، یەکێتی سۆڤێت زەرەری زۆری بەرکەوتبوو و بەریتانیا تارادەیەك شکستی خواردبوو، لەبەرامبەردا ئەمەریکا لەماوەی جەنگدا ئابووریەکەی بەتەواوی پەرەیسەندبوو. لەساڵی (١٩٤٥)دا ئەمەریکا لە(٥٠٪) پشکی بەرهەمی جیهانی بەدەستەوەبوو. بەجۆرە باڵادەستی ئەمەریکا کاریگەرتر و بەهێزتر بوو لەو دووهێزەی کە پێشتر هەبوون. دەسەڵاتگەری ئەمەریکا لەبەرامبەر دەسەڵاتێکی بەرهەڵستکاری گەورەی ئایدیۆلۆجی و سەربازی یەکێتی سۆڤێتدا، کە لەکۆتایدا جەنگی ساردی لێ بەرپا بوو. زاراوەی جەنگی سارد لەبەرامبەر جەنگی گەرم کە لەئەڵمانیا روویدا بۆ یەکەمجار لەلایەن (والتر لیپمان Walter Lippman) بەکارهێنرا، جەنگێك کە شەش ساڵ (١٩٣٩ - ١٩٤٥) بەردەوام بوو، زیاتر لە (٥٠) ملیۆن قوربانی لێکەوتەوە، هۆی پەیدابوونی ئەم زاراوەیە بەپلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ هەستیاریەك کە پەیوەستبوو بە ولاتانی سەرکەوتووەوە لەسەروویانەوە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و یەکێتی سۆڤێت، چونکە ئەم دوو زلهێزە کە بۆ یەکەمینجار لەجیهانی دوو جەمسەری دروستبوون و خاوەنی ئامانجی ستراتیجی جیاواز بوون. یەکێتی سۆڤێت دەیویست بە جەنگی ئایدیۆلۆجی باڵی رۆژئاوای خۆی لەئەورووپای رۆژهەڵات کە ماوەی بیست ساڵ بوو ویران بووبوو، وەك ئامانجی ستراتیجی خۆی پارێزگاری لێبکات. لەکاتێکدا ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە ئاشکرا بەدوای بەرژەوەندی بەدەستهێنانی نەوتی خاوی هەرزان و کردنەوەی دەرگای ئابووری جیهان بەرووی کەلوپەلی ئەمەریکیدا بوون، ئەو ناوچانەی کە جێگای ناکۆکی ئەم دووانە بوو، ئەو ولاتان و خەڵکانە دەگرێتەوە کە لە دەرەوەی ئەم دوو ئۆردوگایە بوون، زاراوەیەك بۆ ئەوناوچانە بەکاردەهێنرا کەپێی دەوترێت (جیهانی سێیەم)[١]. هەروەها دەسەڵاتە رۆژئاواییەکان بەهۆی نەبوونی یان کەمی کێشەی

[١] ) بلۆکی رۆژئاوا (ولاتانی سەرمایەداری) خۆیان وەك جیهانی یەکەم دەناساند و بلۆکی رۆژهەڵات (ولاتانی سۆشیالستی) وەك جیهانی دووەم و ئەوانەی لەدەرەوەی ئەم دووبلۆکەبوون بە جیهانی سێیەم دەناسرێت. وەرگێڕ.

جیۆستراتیجی لەبیری داگیرکردنی زەوی و فراوانخوازیدا نەبوون. لەکاتێکدا کە یەکێتی سۆڤێت بەهۆی ئەو شێوە کلاسیکیەی کە لەجوگرافیای ئەو وڵاتەدا هەیە، بەپێچەوانەی بلۆکی ڕۆژئاواوە لەفکری فراوانکردنی زەویەکەیدا بوو. لەبەرئەوە ئەم بۆچونە بووە هۆی ئەوەی هەردوو زلهێز دوچاری پێکدادانی بەرژەوەندی بن. لەئەنجامدا یەکتری بە ئیمپریالیزم و بوونی فکری دەسەڵاتخواز تاوانبار بکەن. لەکاتێکدا هەر لایەکیان خاوانی تایبەتمەندی خۆیانن و کارەکانیان لە دەیەی (٥٠ و ٦٠ هەتا ٧٠) کانیش سەلمێنەری ڕاستی ئەم شێوە بیرکردنەوەیەیە. بەپێی بۆ چونی (فرد هالید) دەتوانین جەنگی سارد بۆ چوار قۆناغ دابەشبکەین :

قۆناغی یەکەم (١٩٤٧ ـ ١٩٥٣) کە هالید ئەمە بە سەرەتای جەنگی سارد ناودەبات، هەموو ڕووبەڕووبوونەوە سەرەکیەکانی زلهێزەکان لە ناوچەی دەورووبەر (ڕیملاند) ڕوویداوە، لەم قۆناغەدا پەیوەندی زلهێزەکان بە قەیرانی یۆنان و تورکیا لەساڵی (١٩٤٧) و بلۆکبەندی و گەمارۆی بەرلین لەلایەن ڕووسیا لەساڵی (١٩٤٨) تا دەگات بە جەنگی گەرم لەنێوان هەردوو کۆریادا.

قۆناغی دووەم (١٩٥٣ ـ ١٩٦٩) کە بە قۆناغی (دوژمنایەتی لە هەڵبەزودابەزدا) ناودەبرێ، پێکهاتوە لەو قەیران و گرژیانە. لەم قۆناغەدا ململانێکانی ڕیملاند ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باشوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا گرتەوە.

قۆناغی سێیەم (١٩٦٩ ـ ١٩٧٩) کاتی توانەوە و نەمانی حکمڕانیکردنە. خاوکردنەوەی گرژی و هەوڵی ئاسینی هاوئاهەنگی بۆ چارەسەری جیاوازیەکان لەڕێگای گفتوگۆوە، بەڵام ململانێ لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەردەوام بوو. جەنگی سارد لەم سەردەمەدا مۆدێلە ماکندەریەکەی خۆی لەدەستدا.

قۆناغی چوارەم لەساڵی (١٩٨٥) توانەوەی بەستەڵەکی ڕوویدا، بەڵام لەو جێگایانەی کە ئاسایشی جیهانی تەنیا بۆ دوو زلهێزەکە (وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و یەکێتی سۆڤێت) هەبوو، سیستەمی جیهانی جیوپۆلەتیکی جەنگی سارد هەربەردەوامی هەبوو.

لەقۆناغی جەنگی سارددا ڕووبەڕووبوونەوە و ڕکەبەرایەتیە سیاسی، ئابووری و ئایدیۆلۆجیەکان گەیشتە چڵەپۆپە و ململانێ سەربازیەکان بەهێزتر بوو. بە هەر ئەندازەیەك دەستیان بە تەکنەلۆجیای سەربازی باڵاتر بگەیشتایە، پێوەری جەنگی سارد بەرزتر دەبووەوە، تا ئەو جێگایەی هەردوو زلهێزەکە لەهەندێك ناوچەدا لەبەردەم جەنگی گەرمدا دەوەستان. نمونەی دیاری ئەمە قەیرانی کوبا، جەنگی ڤێتنام، جەنگی کۆریا و شەڕە خۆجێیەکان لەو جۆرەبوون، بەڵام هیچ کاتێك ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی یەك نەبوونەتەوە. پێش ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ یەکتر ڕووسەکان هەستیان بە مەترسی کردووە و پاشە کشێیان کردوە. ڕەوتی گۆڕانکاریەکانی مێژوو دەیسەلمێنێت کە هەمیشە جەنگی سارد لەناوچەیەك دەستپێدەکات و پەرەدەسێنێت و کاتێك بەخاڵی بنبەست دەگات دەگۆڕێت بۆ جەنگی گەرم. بەڵام دەتوانین بڵێین دیاردەی کۆتایهاتی جەنگی سارد لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەمەوە تا ساڵی (١٩٨٩) تەنیا ڕوداوێکە

لەجیهاندا، کە بەپێی ئەو بەڵگە ستراتیجیانەی ئاماژەی بۆکراوە، بە بێگۆڕان و سەرهەڵدانی جەنگی گەرم کۆتایی پێهاتووە.

* * *

لەسەردەمی جەنگی سارددا، وڵاتی ئێران وەك تەوەردیەکی (محوریکی) ستراتیجی جیهانی بە هەموو چەمکە ستراتیجیەکان، جێگەی تێبینی و سەرنج بووە. لەسەدەی پازدەیەم و شازدەیەم هەمان بارودۆخ لەهەمان کاتدا بوونی هەبووە. چونکە لەم سەردەمەدا بازرگانی دەریایی لەدەستی ئیسپانیا و پرتوگالیەکاندا بووە، کەنداوی فارس وەك تەوەرەی بازرگانی ڕۆژهەڵات وابووە. تەواوی بیرکردنەوەی ئەوانەیش لەهەمان شوێنەوە سەرچاوە دەگرێت. لەم ڕووەوە ئەگەر سەیری پێگەی دەرچەی دورگەی هورمز بکەین تێبینی دەکرێت بەپێچەوانی بۆچونی هەموانەوە کە دەسەڵاتی دەریایی دەبێت بەرگریکردنی خۆی لەدەریا بێت، لێرەدا جێگیرکردنی پێگەی بەرگری بەرەو وشکانی واتە بەرەو ئێران ئەنجامدراوە کە نیشانەی گرنگی شوێنی ئێرانە. ئەگەر توێژینەوە لەشوێنی بەرگری دورگەی هورمز لەدیدی پسپۆرێکی بواری سەربازیەوە بکەین ئاشکرا دەبێت کەبەرەی پاڵنەری قایکاری پرتوگال لەم دورگەیەدا ڕووەو ئێرانە. لەبەرئەوە لەو سەردەمەشدا هێزی دەریایی پرتوگال لەهێزی وشکانی ئێران هەراسان بووە، لەسەدەی پازدە و شازدەهەم بەدواوە تا سەدەی بیستەم ئەم بیرکردنەوەیە بەردەوامی هەبووە، تەنیا جیاوازیەك لەسەدەی بیستەمدا کە سەریهەڵداوە دۆزینەوەی نەوتە و بوون بە بەشێك لەبازاڕی جیهانی و بازرگانی دەریایی نێودەوڵەتیە.

یەکەمجار نەوت لەساڵی (١٩٠٤) لە ئێران دۆزرایەوە و لەساڵی (١٩٠٨) دەرهێنرا. دواتر لەوڵاتانی عەرەبی دەرهێنرا و بەدوایدا کۆمپانیای (بریتش پترۆلیۆم) دامەزرا. ئەو سەردەمە توندترین قۆناغە کە وڵاتی ئێران لەسەنتەری ڕوانینی جیۆستراتیجی جیهاندا لەسەرەتای سەدەی بیستەم جێگیربووە.

ئامانجی بەریتانیا ئەوەبوو کە دەسەڵاتی بەسەر ناوەکانی باشووری ئاسیا لەکەناڵی سوێسەوە تا گەروی مەلکا هەبێت. لەبەرئەوە هەموو گۆڕانکاریە سیاسیەکان، کە لەوڵاتانی کەناری کەنداو لەوانە ئێران ڕوویدا، لەبیرکردنەوەی بەریتانیەوە سەرچاوەی گرتبوو کە دوو ئامانجی سەرەکی لێی هەبوو، یەکەمیان سەرکردایەتی دەریایی بە مەبەستی پارێزگاری لەبازرگانی دەریایی و دووەم سەرکردایەتی سەربازی بە مەبەستی هەبوونی دەسەڵات بەسەر ناوچە قەیراناویەکان کە هەڕەشە بوون بۆ سەر ئامانجە ستراتیجیەکان، لەبەرئەوە تێبینی دەکرێت ئێران بە درێژایی ئەو سەردەمانە، لەناو کرۆکی ئەم بیرکردنەوە و چەمکی ستراتیجیانەدا بوویێت. هەروەك ئەوەی لەجەنگی یەکەمی جیهانیدا دەرکەوت، ئەڵمانیەکان لەبەرامبەر ئەم مەسەلانە وەستابوون، بۆیە هەمیشە ئامانجیان ئەوەبوو کە سەرکردایەتی ئەوروپا بگرنە

دەست، کە ئەم بیرکردنەوەیە ڕیشەی مێژووی هەیە و لەسەردەمی ئیمپراتۆری (نەمسا ـ مەجەر)وە بوونی هەبووە. کاتێك تیۆری سەربازی شلیفون و مولتکە دروستبوو[1]. دەرکەوت کە ئەوانە لەو باوەڕەدا بوون کە ئێران کەوتۆتە تەوەرەی یان بەشی باشووری تەوەرەی ئۆراسیای ئەو سەردەمەوە، بەڵام لەو کاتەدا کەناری باشوری زاگرۆسی مەبەست بوو، بەڵام باکوری زاگرۆسی نەدەگرتەوە. ئەگەر لەکێشەکانی جەنگی دووەمی جیهانی بڕوانین، بەریتانیەکان زانیاریان دەستکەوت بوو کە ژمارەیەك لەهاوڵاتیانی ئەڵمانیا لەسەردەمی ڕەزاشا لەناوچەی دەشت و تەختاییەکان لەباشووری ئێران جێگیر بوون.

کاتێك کە بەریتانیەکان لەباشوری ئێران دابەزین ئەم بابەتەیان وەك بیانوو بۆ جەنگ هێنایەوە و بوونی ئەڵمانیەکان لەئێران بەبەڵگە بۆ داواکردنی یارمەتی بوو لەئەڵمانیا بۆ جەنگ دژی هاوپەیمانان هێنایەوە، هەرچەندە ئەڵمانیەکان لەباشووری ئێران جێگیر کرابوون، بەڵام بوونی ئەمانە بۆ هاوکاری ئابووری بوو، وە چالاکیەکانیان لایەنی سەربازی نەدەگرتەوە. چالاکی ئەمانە بۆ توێژینەوە و دامەزراندنی هێڵی پەیوەندی و ڕێگاکانی گواستنەوە و گەیاندن بوو، بەهیچ جۆرێك چالاکی سەربازی نەبوو، بۆیە ئەڵمانیەکانیش ئارەزوی هاوکاری ئابووری و هونەری یان بۆ ئێران هەبوو. لەبەرئەوە بەریتانیەکان لەڕووی نیەت خراپیەوە دژی بوونی ئەڵمانیەکان بوون لە ئێران، وروژاندنی ئەم بابەتەیان تەنیا بیانوو بوو.

ئەڵمانیەکان هەمیشە بۆچونی سیاسی تایبەتیان بۆ ئێران هەبوو کەتا ئێستاش بەردەوامە. ئەڵمانیەکان هەتا لە ستراتیجی دورمەودای خۆیاندا بۆچونی تایبەتیان بۆ ئێران هەیە و تۆماریانکردووە کەتا (٢٠) ساڵی ئاییندە پەیوەندیان باش دەبێت لەگەڵ ئێران ئەگەر هەر حکومەتێك لەسەرکار بێت.

## عێراق لە قۆناغی جەنگی سارددا

### هەوڵدان بۆ گەیشتن بەدەسەڵاتی باڵاتری ناوچەیی:

پێش قسەکردن و توێژینەوە لەبارودۆخی عێراق لەجەنگی سارددا، پێویستە لەسەرتادا بارودۆخی جوگرافی و ئابووری ئەو وڵاتە بخەینەڕوو. بەبێ ناساندنی باری جوگرافی و ئابووری عێراق ناتوانین هۆکاری ویست و بڕیارەکانی ئەم وڵاتە لەناوچەکە هەست پێبکەین. جیوپۆلەتیکی عێراق بە توندی کەوتۆتە ژێرکاریگەری جوگرافیای ناڵەبارەوە. لەبەر ئەم هۆیە شارەزایی لەجوگرافیا و ئابووری عێراق پێویستە.

### جوگرافیای عێراق :

عێراق یان (کۆماری عێراق) دراوسێی ڕۆژئاوای ئێرانە و ڕووبەرەکەی (٤٣٣٩٧٠ کم٢) کەوتۆتە باشوری ڕۆژئاوا ئاسیاوە و پایتەختەکەی شاری بەغدایە. ژمارەی دانیشتوانی ئەم وڵاتە لەساڵی (١٩٩٥)

---

[1]) شلیفون یەکەمین کەس بوو کە لەئەوروپا تیۆرێکی سەربازی دانا، دوای ئەو مولتکە بوو کە هەردووکیان ئەڵمانی بوون . ئەم دوانە سەنجی تایبەتیان بۆ سیاسەتی دەرکی ئەڵمانیا هەبوو، وە دەیانویست سەرۆکایەتی ئەوروپا بۆ ئەڵمانیا بێت.

نزیکەی (٢٣,١٤٤,٠٠٠) کەس بوو.[1] عێراقی ئەمڕۆ لەسەدەی شازدەهەم بەدواوە لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیدا بووە و یەکێکە لەوڵاتە عەرەبیە تازە دامەزراوەکان، کە دوای کۆتاییهاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی و هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەچوارچێوەی دەوڵەتێکی پاشایەتی کە پێکهاتبوو لەسێ ویلایەتی پێشوی دەوڵەتی عوسمانی بەناوەکانی (بەغدا، بەسرە و موسڵ). لە(١٤) تەموزی ساڵی (١٩٥٨) کۆتایی هات بە دەسەڵاتی پاشایەتی و حکومەتی کۆماری دامەزرا. دانیشتوانی عێراق بۆ ساڵی (٢٠٠٠) گەیشتۆتە (٢٥,٤) ملیۆن کەس. عێراق لە باکورەوە تورکیا و لەرۆژهەڵاتەوە ئێران و لەباشورە و کەنداوی فارسی و کوێت و عەرەبستانی سعودیە و لەرۆژئاواوە ئەردەن و لەباکوری رۆژئاواوە کۆماری سوریا دەورەی داوە. لەرووی جوگرافیەوە عێراق بۆ چوار هەرێمی جوگرافی جیاواز دابەش دەبێت. تایبەتمەندی هەریەکە لەوانە لەخوارەوە باس دەکەین:

١- بیابانی رۆژئاوا و باشوری رۆژئاوا : ئەم ناوچەیە بیابانەکان و ناوچەی رۆژئاوای رووباری فورات دەگرێتەوە کە هاوسنورە لەگەڵ عەرەبستانی سعودی و ئەردەن، زۆرترین رووبەری ئەم ناوچەیە بیابان و لماوییە، لێژی ئەم ناوچەیە لەرۆژئاواوە بەرەو رۆژهەڵاتە. لەشوێنە جیاوازەکانی ئەم ناوچەیە گردۆلکەی لمی بەرچاو دەکەوێت کە لەنێوانیاندا چەندان دۆڵی گرنگی وەك دۆڵی حۆران دروست بووە.

لەباشوری ئەم ناوچەیە شاخی (صنم) هەیە کە لەبەردی لمین و کۆنگلۆمایت پێکهاتووە و کەوتۆتە چل کیلۆمەتری باشوری رۆژئاوای بەسرەوە. لەرۆژئاوای رووباری فورات لەنێوان شاری هیت و نەجەف چاڵایی گەورە هەیە کە لەنزیك رومادیەوە تا نزیکی کەربەلا درێژ دەبێتەوە. ئەم نزماییانە دابەش دەبێت بۆ دوو حەوز لەباکور بەناوی (حەبانیە) و لەباشور بەناوی (ابودبس ــ رەزازە) ناودەبرێت.

٢- جەزیرە: ناوچەی جەزیرە کە لەسوریاوە بۆ ناوەندی عێراق درێژدەبێتەوە. دەشتی بیابانییە (بانێکی وشکە ــ وەرگێر) کە بەرزاییەکەیان (٤٥٠) مەترە لەباکوری رۆژئاوا تا (٧٩) مەتر لەنزیك شاری بەغدا. جەزیرە کەوتۆتە نێوان رووباری دیجلە و فوراتەوە و لەباشورەوە بە کەناڵ و تۆڕی ئاوی ئەو دوو رووبارە دەورەدراوە. تایبەتمەندیەکانی ئەم ناوچەیە بوونی دۆڵ و شیوی وشکە. شاخی (سنجار)، (لوتکەی چل میران) و (شاخی مکحول) هەمووی کەوتۆتە ئەم ناوچەیەوە، گرنگترین دۆڵ لەم ناوچەیە دۆڵی (سەرسارە) کە لەچیای سنجارەوە دەستپێدەکات دەروات بەرەو باشوور تا حەوزی رووباری دیجلە درێژ دەبێتەوە.

٣- دەشتە لیتەییەکانی ناوەڕاست و باشوری رۆژهەڵات : ئەم دەشتانە لەباکوری بەغداوە بە ئاراستەی باشوری رۆژهەڵات درێژدەبێتەوە ، لەنزیکی شاری رومادی لەکەناری فورات و لە باشوری سامەڕا لەکەناری دیجلەوە دەستپێدەکات تا کەنداوی فارس درێژ دەبێتەوە. ئەم دەشتانە لیتەییە کە

---

[1] بەپێی خەمڵاندنی ساڵی (٢٠١٠) ژمارەی دانیشتوانی عێراق نزیکەی (٣٢) ملیۆن کەسە ــ وەرگێر.

لەقۆناغی جیۆلۆجی و دواتر کەڵەکەبووە لەئەنجامی نیشتنی لیتەی چوار ڕووباری (دیجلە، فورات، کەرخە و کارون) دروست بووە بە درێژایی نێوان ڕووباری دیجلە و فورات چەندین ئیمپراتۆریەت لەکۆندا دروست بووە، پاشماوەی وێرانەی شارەکانی ئەم ئیمپراتۆرانە هێشتا ماون.

ڕووباری دیجلە و فورات بەم ناوچەیەدا دەڕوات و دەریاچەی وەرزی[1] کە لە ئاوی لافاوی ئەم ڕووبارانە دروست دەبێت بە تایبەت لەناوچەکانی باشووری عێراق دەبینرێت. ئەم دوو ڕووبارە لەباکوری قورنە یەکدەگرن. ناوچەیەکی فراوان کە قامیش و زەل دای پۆشیوە و ڕووبەرەکەی دەگاتە (١٥٠٠ کم٢) کە تا سنوری ئێران درێژدەبێتەوە بە (هۆری حمار) ناودەبرێت. زۆرترینی ئەم قامیش و زەلانە زەلکاوی هەمیشەیی دروست دەکەن کە هەندێك بەشیان لەسەرەتای وەرزی زستان وشك دەبن. لەهەندێك شوێن تەنیا لەساڵی لافاودا بەشێوەی زۆنگاو دەبینرێن.

٤- ناوچەی شاخاوی باکوری ڕۆژهەڵات[2] : ئەم ناوچە شاخاویانە لە ڕووی ڕووبەرەوە لە (٢٠٪) خاکی عێراق پێکدەهێنێت لە ڕاستیدا درێژکراوەی شاخەکانی تۆرۆس لە تورکیا و زاگرۆس لە ئێرانە، کە بە لێژیەکی مناسب بۆ ناو خاکی عێراق درێژ دەبێتەوە، ئاراستەی زنجیرە شاخەکان لە باکوری ڕۆژئاواوە بەرەو باشوری ڕۆژهەڵاتە دەڕوات، ئەم بەرزاییانە لە ڕووی جۆر و بەرزیەوە لەگەڵ یەکتر جیاوازن بەشی جۆراوجۆر پێکدەهێنن کە بریتیە لە:

(أ) شاخەکانی باکور کە زۆربەیان لەمادەی گرکانی دروست بوون لەگرنگترین شاخەکانی ئەم ناوچەیە ( گارە ٢١٦٠م، شرانش ـ ٢٠٥٢م، ئامێدی ـ ٢٠١٣م، ئاکرێ ـ ١٥٤٨م، برادۆست ـ٢٠٧٦م، حسارۆست ـ ٣٦٠٧م. کە دەتوانین بە شاخەکانی نێوان زێی گەورە و ڕووباری دیجلەی ناوبەرین.

(ب) شاخەکانی ڕۆژهەڵات کە کەوتۆتە نێوان ڕووباری دیجلە و شاخەکانی کوردستانی ئێرانەوە کە هێڵی سنوری نێوان ئێران و عێراق لە سەرەوەی ئەم شاخانە دیاری دەکرێت گرنگترینی ئەو شاخانە قەندیل ـ ٣٤٥٢، بەردەسپی، ٢٤٨٩م، هەورامان ـ ٢٥٤٨م، بەمۆ ـ ١٨٢٨م.

---

[1]) نوسەر مەبەستی لە هۆر و زۆنگاوەکانە، هەرچەندە وەرزینین بەڵام ئاوی لافاوی وەرزانەی دیجلە و فورات هۆکاری پێکهێنانیانە ـ وەرگێڕ

[2]) نووسەر لەم باسەدا هەندێك هەڵەی منهجی کردووە کە پێویستە لێرەدا ڕوونی بکەمەوە : لەسەرەتادا ناونیشانەکە دەبێت بنوسرێت (ناوچەی شاخاوی و نیمچە شاخاوی ) چونکە ئەو لەناو باسەکەیدا باسی هەردوو بەشەکەی دەکات. پاشان دەڵێت ئەم ناوچەیە ڕێژەی (٥٪)ی خاکی عێراق پێکدەهێنێت بەڵام ئەمە تەنیا ناوچەی شاخاویەکانە بۆیە مادەم باسی هەردوو بەشەکە دەکات و ئاماژە بۆ شاخی حەمرین دەکات وەك سنوری جیاکەرەوەی ئەم ناوچەیە لەگەڵ ناوچەی دەشتی لیتەیی کەواتە دەبێت بڵێت ڕووبەری ئەم ناوچەیە دەگاتە ڕێژەی (٢٠٪) خاکی عێراق کە دەکاتە زیاتر لە(٨٠,٠٠٠کم٢) ئەمەش لە (٥٪)ی ناوچەی شاخاویە و (١٥٪)ی ناوچەی نیمچە شاخاویە. سەرەرای ئەوەش کاتێك ئاماژە بۆ شاخەکان دەکات تەنیا باسی ئاکرێ و ئامێدی و هەورامان دەکات بۆیە من بۆ زانیاری زیاتر هەندێك شاخی ترم بۆ زیاد کردووە ـ وەرگێڕ.

بەرزاییەکانی حەمرین کە لە باکوری ڕۆژئاواوە بەرەو باشوری ڕۆژهەلأت درێژ دەبێتەوە لەمەندەلیەوە بەرەو فەتحە لەسەر ڕووباری دیجلە درێژبۆتەوە بەرزاییەکەی نزیکەی (٧٠٠م) و مادەی پێکهاتەی ئەم شاخە بە زۆری لەتاوێری لم و کۆنگلۆمایت پێکهاتووە، ئەمەش سنوری نێوان ناوچە شاخەکان و ناوچەی لیتەییە کە سێ ڕووبار ئەم زنجیرە شاخە دەبڕێت ئەوانیش (دیجلە و روخانە (عوزیم) و سیروان (دیالە)).

## ئاووهەوا:

ولأتی عێراق خاوەنی ئاووهەوای هەمەچەشنە، ئەم جیاوازیەش لەئاووهەوا بەپێی ناوچە جیاوازەکانی ولأت بە جوانی دەردەکەوێت. بەشێوەیەکی گشتی عێراق دابەش دەکرێت بۆ سێ هەرێمی ئاووهەوایی:

١) ناوچەی شاخاوی: ناوچەکانی باکوری عێراق خاوەنی ئاووهەوای دەریایی ناوەڕاستە و لەبەرئەوەش زۆربەی ناوچەکانی بە گژوگیا و دارستانی بەڕوو داپۆشراوە. ئەم ناوچەیە زستانی سارد و درێژ و پر بەفرە و هاوینی مامناوەندی و گەرمە.

٢) ناوچەی ناوەڕاست و باشوری ڕۆژئاوا : لە باکوری ولأت بەرەو باشوور هەوا گەرمتر دەبێت، لەباشور و باشوری ڕۆژئاوا ولأت دەکەوێتە ژێرکاریگەری بای گەرم و وشکی سعودیەوە. هاوینی گەرم و وشکە و درێژخایەن، گەرمترین مانگەکانی لەنیسان دەستپێدەکات تا ئەیلول. خاکی لمی و بای گەرم و سوتێنەر، ڕێگرە لەبەردەم گەشەی ڕووەك و نیشتەجێبوونی دانیشتوان، لەبەرئەوە ناوچەکانی ڕۆژئاوای عێراق جگە لەچەند ناوچەیەکی بچوك دانیشتوانی تێدا نییە.

٣) ناوچەی باشوری ڕۆژهەلأت: لەناوچەی باشوری ڕۆژهەلأت، لەگەڵ شێداری ئاووهەوا کە لەئاووهەوای کەنداوی فارسیەوە سەرچاوە دەگرێت، هۆرو زۆنگاو زۆربەی خاکی ئەم ناوچەیەی داپۆشیوە، پلەی گەرما بەرزە بەجۆرێك دەگاتە (٥٠°س) لەتایبەتمەندی ئەم ناوچەیە هاوینی گەرم و زستانی مامناوەندیە، مەودای پلەی گەرمی وەرزانە و ڕۆژانە زۆرە. لەزستاندا بەهۆی هەلکردنی بای سارد و وشك بە تایبەت لەشەودا بۆتەهۆی ئەوەی کە سەرما کاریگەری لەسەر مرۆڤ جێبهێڵێت.

باران لەعێراق بەپێی هەلومەرجی گشتی باشوری ڕۆژئاوا ئاسیایە، بەمجۆرە زۆرترین بری باران لەزستاندا دەبارێت ئەم ڕێژەیەش بەپێی بەرزی لەئاستی رووی دەریاوە جیاوازە.

لەناوچە شاخاویەکانی باکور ڕێژەی دابارین زۆرترە وەك لەسەرجەم ناوچەکانیتر کە لەهەندێك شوێندا بری باران لە (١٠٠٠ملم) زیاترە. لەو ناوچانەی ناوەڕاست تا بەرزایی (٥٠٠م) بری بارانی سالأنە دەگاتە (٣٠٠ملم) و لەدەشتاییەکانی باشوور بری بارانی سالأنە لەنێوانی (١٢٠ تا ٢٥٠ملم) داية .

لەعێراق لەنیوەی دووەمی مانگی مایس تا سەرەتای مانگی ئەیلول باران نابارێت و بەوەرزی وشک ناودەبرێت.

## ڕووپۆشی ڕووەکی:

عێراق کە بەشێکە لەئاسیا و کەوتۆتە باشوری ڕۆژئاوای ئەم کیشوەرەوە، وەك باقی ناوچەکانیتر، خاوەنی گژوگیای ئستێبسە، کە بەهۆی تایبەتمەندی ناوهەوای خۆجێی سیستەمی ڕووپۆشی ڕووەکی جیاوازە، لەو ناوچانەی ناوهەوای دەریای ناوەڕاستە ڕووەکی دەریای ناوەڕاست دەڕوێت.

جۆرەکانی ڕوپۆشی ڕووەکی بەروبوومی کشتوکاڵی لەباشورەوە بۆ باکور دەگۆڕێت، لەناوچەکانی باکوری ڕۆژهەلات سنەوبەر و بەرو و مازو و عەرعەر دەڕوێت، لەناوچەکانی ئستێبس تەنیا لەوەرزی بارانبارینەدا گژوگیای کورت دەڕوێت کە لەبارە بۆ لەوەڕاندنی مەڕو ماڵات.

## دەرامەتی ئاو:

دەرامەتی ئاوی سەرزەوی لەعێراق بۆ چوار جۆر دابەش دەکرێت : ڕووبارەکان، دەریاچە و هۆرەکان، بەنداوەکان و ئاوی کەناری عێراق لەسەر کەنداوی فارسی.

ڕووبارەکان:

ڕووبارەکان بە بەهاترین بەشی عێراق دادەنرێت، کە ژیانی ئابووری ئەم وڵاتەی لەڕابردوو و ئەمڕۆدا دابینەدەکات، بەتایبەتی بەشی دەشتەکانی نێوان دووڕووبارە (دەشتی لیتەیی). گرنگی ئەم دەشتانە کە درێژکراوەکەی لەناو خاکی ئێراندایە، بەهۆی بوونی دوو ڕووباری گەورەی دیجلە و فوراتەوەیە کە بەسەرانسەری ئەم وڵاتەدا دەڕوات. سەرەڕای ئەم دوو ڕووبارە، چەندین ڕووباری بچوکیتر لەم وڵاتەدا هەیە، کە زۆربەیان دەڕژێنە ناو ئەم دوو ڕووبارەوە (زۆربەیان دەڕژێنە ناو ڕووباری دیجلەوە چونکە لەناو خاکی عێراق هیچ ڕووبارێك نارژێت ناو ڕووباری فوراتەوە ـ وەرگێڕ). وە لە ئەنجامی یەکگرتنی ئەم دوو ڕووبارە ڕووباری شتولعەرەب دروست دەبێت.

دیجلە: ئەم ڕووبارە لەچیاکانی تۆرۆس و چیاکانی باشوری ڕۆژئاوای دەریاچەی وان لە خاکی تورکیا (لە کوردستانی تورکیا ـ وەرگێڕ) هەڵدەقوڵێت، درێژیەکەی نزیکەی (١٧١٨کم) کە نزیکەی (١٤١٨) کیلۆمەتری لەخاکی عێراقدایە و باقیەکەی دەکەوێت خاکی تورکیاوە.

یەکەمین سەرچاوەی ئاوی دیجلە لەنزیك شاری دیاربکرە کە لەبەرزایی (١٠٠٠ تا ١٥٠٠) مەترە. دووەمین سەرچاوەی دیجلە باتمان سویە، کە لەناوچەیەك هەڵدەقوڵێت کە بەرزیەکەی لەنێوان (٢٠٠٠ تا ٣٠٠٠)مەتردایە. ئەم دوو لقە لەنزیك (جفن Ceffen) یەکدەگرن، دوای یەکگرتنی بە درێژایی (١٠٠کم) ڕێدەکات و دەگاتە سنوری سوریا، دیجلە هێڵی سنوری تورکیا و سوریا لەلایەك و عێراق و سویا

لەلایەکیتر پێکدەهێنێت. لەکاتی سنووربەندیدا بەجۆرێك ڕێکخراوە کە سوریا بە مەبەستی سوود وەرگرتن لە ناوی ئەم ڕووبارە کەنارکەوتووە و ناتوانێت بەتەواوی سوودی لێوەرگرێت.

دیجلە لەسنوری عێراق تا موسڵ بەناو بان وگردەکاندا دەڕوات بە دۆڵی قووڵ لەناوچەی موسڵ دەوردراوە. لەموسڵ دیجلە بەناو دەشتە پان و کەم بەرزەکاندا دەڕوات، بەهۆی کەم بەرزی دەشتەکانەوە لەناستی ڕووبارەکەوە بە باشی سوود لەناوەکەی وەردەگیرێت، بەڵام لەناوچە بەرزەکان کارەکە سنورداره. لەخوار موسڵەوە یەکەمین لقە ڕووباری تێدەرژێت بەناوی زێی گەورە*. زێی گەورە لەناوچەیەك لەنێوان دەریاچەی وان و دەریاچەی ورمێ لەتورکیا هەڵدەقوڵێت ڕێدەکات بەرەو باشوری ڕۆژئاوا تادەگاتە سنوری عێراق .

سەرچاوەکانی زێی گەورە لەناوچەی شاخاوی سەختەدایە و بەکەڵکی کشتوکاڵی نایەت و دانیشتوانی تێدا نییە یان کەمە. ئەم بارودۆخە وایکردووە ناوی زێی گەورە تەنیا لەعێراق سودی لێوەربگیرێت.

لقێکیتر کە دەڕژێتە ناوی ڕووباری دیجلەوە زێی بچوکە. زێی بچوك لەشاخەکانی زاگرۆس لەئێران هەڵدەقوڵێت بە دۆڵی قووڵ و ناوچەی کەم دانیشتواندا دەڕوات.

ڕووبارێکیتر کە دەرژێتە ناو ڕووباری دیجلەوە ڕووباری ڕوخانەیە (عوزیم). دوای ئەو ڕووباری سیروانە (دیالە) کە بە چەند کیلۆمەترێك لەخوار بەغداوە دەرژێت ناو ڕووباری دیجلەوە. ڕووباری سیروان لەو ناوچە شاخاویانەی کە بۆکشتوکاڵ و نیشتەجێبون ناشێن لەشاخەکانی زاگرۆس لەناو ئێران هەڵدەقوڵێت.

ڕووباری دیجلە لەخوار بەغداوە لێژیەکەی کەم دەبێتەوە و ناوەکەی بڵاو دەبێتەوە و زیاد لەپێویست پێچاوپێچی تێدەکەوێت. ئەم حاڵەتە لەکوتەوە تا عەمارە بەرچاو دەکەوێت.

فورات : فورات لەناوچەکانی نێوان دەریاچەی وان و دەریای ڕەش لەبازنەی پانی ($٤٠^{\circ}$) باکور هەڵدەقوڵێت. سەرچاوەی ئەم ڕووبارە لەدوولقی سەرەکی پێکدێت کە بریتیە لە(فورات سو و مرادسو). مرادسو کە لەئەنجامی توانەوەی بەفرەوە دروست دەبێت، لەنزیکی ئەرزروم دوای بڕینی (٤٥٠کم) لەگەڵ لقەکەیتری کە فورات سویە یەکدەگرێت. فورات لە خارپوت لە (٤٠٠)کیلۆمەتری ڕۆژئاوا دەریاچەی وان لەبەرزاییەکانی (٢ تا ٣) هەزار مەترەوە دەستپێدەکات و بە ئاراستەی باشوری ڕۆژهەڵات دەڕوات، پاشان بەرەو باشوری ڕۆژئاوا بادەداتەوە, بەناو دەربەندێك لەشاخەکانی حیلوان لە(٢٠٠کم) سنوری تورکیا و سوریا دەبڕێت و پاشان دێتە ناو خاکی سوریاوە. فورات لەخاکی سوریادا بەرە سنوری عێراق لێژ دەبێتەوە

*) یەکەمین لق کە دەرژێتە ناو ڕووباری دیجلەوە لەناو خاکی عێراق ڕووباری خابوورە لە پێشخابور کە بەشاری زاخۆدا تێدەپەرێت، نەك زێی گەورە ــ وەرگێر.

بە قوڵایی کەم و پانی زۆر لەقانم دێتە ناو خاکی عێراقەوە. فورات لەناوخاکی عێراق تادەگاتە رومادی (٣٥٠کم) دەبڕێت، لەرومادیەوە دەگاتە دەلتای گەورەی دیجلە و بەناو دەشتی بەپیتی لیتەییدا کە ڕووبەرەکەی (١٠٠) هەزار کم٢ دەڕوات.

فورات ڕووبارێکی درێژ و ئاوەکەی زۆرتر لەبەرزەوەندی تورکیا دایە. درێژی ڕووباری فورات لەخاڵی یەکگرتنی فورات سو و مراد سو تا تێرژانی بە شتولعەرەب نزیکەی (٢٣٢٠کم) کە زۆرترین بەشی لەعێراقدایە و دەگاتە (١٢٠٠کم) وە (٦٧٥کم) دەکەوێتە خاکی سوریا و (٤٤٥کم) دەکەوێتە خاکی تورکیاوە.

زۆرترین بەشی ڕووباری فورات بەکاری کەشتیوانی نایەت بەهۆی تەنکی (کەم قوڵی) ئاوەکەی، چەند لقێك لەم ڕووبارە جیادەبێتەوە، کە سێ لقی بەرەو ڕووباری دیجلە شۆڕ دەبێتەوە (بەناوەکانی ویسفیە و سقلاویە و ئەسکەندەریە ـ وەرگێڕ)، دولقیتر بە ناوی (حللە و هندیە) کەدواتر لە خوار شاری سەماوە یەکتر دەگرنەوە.

شەتولعەرەب (ڕووباری ئەروندرود) : لەباکوری شاری بەسرە لەناوچەیەك بە ناوی (قورنە) دیجلە و فورات یەکدەگرن و شەتولعەرب پێکدەهێنن. درێژی شەتولعەرەب لەقورنە تا کەنداوی فارسی (١٨٥کم) و پانیەکەی لەکاتی خێزاودا (مد) لە (١٠٠٠م تا ١٥٠٠م) دەبێت، بەڵام پانیەکەی لە ڕاستیدا (٥٠٠ تا٧٠٠) مەترە و قوڵیەکەی لە (١٠ تا ١٥) مەتردایە، لەبەرئەوە کەشتی گەورە دەتوانێت بێتە ناوەوە.

شەتولعەرەب ڕووباری کارونی تێدەڕژێت کە گەورەترین و درێژترین ڕووباری ئێرانە کە لەشاخەکانی ئێران لەبەرزایی (٥٠٠٠م)ەوە هەڵدەقوڵێت سەرچاوەکەی بەفری شاخەکانە.

شەتولعەرەب تا (٨٠)کم سەرەتای بە ناو خاکی عێراقدا تێدەپەڕێت و باقیەکەی سنوری نێودەوڵەتی ئێران و عێراق پێك دەهێنێت کە لەم بەشەیدا پێیدەوترێت ڕووباری (ئەروندرود).

## دەریاچە و هۆڕەکان:

بەشی زۆری ئاوی دیجلە و فورات دەڕژێت ناوچەیەکی بەرفراوانەوە بە ناوی هۆڕ و زۆنگاوەکان. ڕووبەرێکی فراوان وەك دەریاچەی هاوبەش لە دەمی چونەناوەوەی بۆ کەنداوی فارس پێکهاتووە کە ڕووبەرەکەی (٨٢٨٨کم٢) لە وشکترین وەرزی ساڵدا، بەڵام لەوەرزی بەهارو کاتی لافاو دەگاتە (٢٨٤٩٠کم٢)

هۆڕ یان زۆنگاوە فراوانەکان دیمەنێکی سروشتی دەشتە لیتەییەکانی باشوورن، فراوانترین هۆرەکانی عێراق بەشێوەی سێگۆشە کەوتۆتە نێوان هەرسێ شاری (عمارە، ناصریە و قورنە) بە ناوچەی هۆڕ و زۆنگاوەکان ناسراوە.

یەکێك لەگەورەترین هۆرەکانی عێراق هۆری حەمارە کە بەشێکی زۆری ئاوی رووباری دیجلە دەڕژێتە ناویەوە و لەرێگای کەناڵێکەوە بەناوی (گەرمەت علی) دەڕژێتە شەتولعەرەبەوە.

لەناو خاکی عێراق دەریاچە هەیە، کە گرنگترینیان دەریاچەی حەبانیەیە لەباشوری رومادی، ئەم دەریاچەیە لەرێگای کەناڵێکەوە ئاو لەرووباری فورات وەردەگرێت، دوو رێگای دەرچونی هەیە کە هەردووکیان لەژێر کۆنترۆڵدایە. لەکاتی پێویستدا دەرگای دەرچوون دەکرێتەوە یەکێك لەو دەرگایانە رێگایەکی ئاوی لەدەریاچەکەوە دووبارە ئاو دەگێرێتەوە بۆ ناو رووباری فورات لەباکوری فەلوجە.

رێگای دووەمیان لەباشوورە کە لەکاتی پێویستدا ئاوی زیادەی دەریاچەکە دەنێرێت بۆ دەریاچەی رەزازە (ابودبس) کە کەوتۆتە باشوری دەریاچەی حەبانیە و باکوری رۆژئاوا کەربەلاوە.

دەریاچەیەکیتر ناوی دەریاچەی سرسارە کە ئاوی دۆڵی سەرساری تێدەرژێت و سەرچاوەی ئاوی دۆڵی سەرسار لە چیای شەنگارەوە دێت و لەلایەکیترەوە لەرێگای لقێك لەرووباری دیجلە ئاو بۆ ئەو دەریاچەیە دەنێردرێت. دەریاچەیەکیتر هەیە بەناوی دەریاچەی نەجەفەوە.

سوود لەدەریاچەکانی حەبانیە و سرسار وەردەگیرێت بۆ رێگرتن لەمەترسی لافاوی دیجلە و فورات، ئاوی زیادە دەنێردرێت بۆ ئەم دوو دەریاچەیە و لەکاتی ئاسایدا ئاوەکەی لێوەردەگیرێتەوە. ئەم کارەی کە لەم دریاچانە جێبەجێ دەکرێت زیاد لەپێویست جێگای گرنگی پێدانە و دەبێتە هۆی کەمبونەوەی زەرەر و زیانەکانی لافاو لەوڵاتدا.

## بەنداوەکان:

بەمەبەستی بەرزکردنەوەی ئاوی رووبارەکان و سوودلێوەرگرتنیان لەبواری کۆکردنەوەی ئاو و بەرهەمهێنانی ووزەی کارەبا، بەنداوەکان دروستکراون کە بۆتە هۆی دروست بوونی دەریاچە لەپشتی بەنداوەکان کە هەریەکەیان گرنگی خۆی هەیە.

بەنداوە گرنگەکانی عێراق بریتیە لە[1]:

١) بەنداوی موسڵ: بەنداوی موسڵ لە(٥٨کم) باکوری شاری موسڵ دروستکراوە لەناوچەی ئاسکی موسڵ لەسەر رووباری دیجلە دامەزراوە. درێژیەکەی دەگاتە (٣٥٠٠م) و بەرزیەکەی (١١٣)م بەرزی لەئاستی رووی دەریاوە (٣٣٦)م توانای ئاو وەرگرتنی (١٣,٣ ملیار م٣) درێژی بەنداوەکە (٧٥کم) و پانی (١٠کم) رووبەرەکەی (٥٠٢٠٠کم٢).

[1] ) نوسەر ئاماژەی بۆ چەند بەنداوێك کردبوو بەلام زانیاریەکانی کەموکوری و هەڵەی زۆری تێدابوو بۆیە من بەهۆی ئەوەی کە پسپۆڕم لە بواری جوگرافیادا و لەرێگای چەند سەرچاوەیەکی زانستیەوە ئەو باسەی سەرەوەم نوسیوە. وەرگێڕ.

٢) بەنداوی دوکان : بەنداوی دوکان لە (٦٠كم) ڕۆژئاوای شاری سلێمانی دروستکراوە لەناوچەی تەنگەبەری دوکان لەسەر ڕووباری زێی بچوك دامەزراوە . بەنداوەکە کۆنکریتییە بەرزی لەئاستی ڕووی دەریاوە (٥١١)م توانای ئاو وەرگرتنی (٦,٨ ملیار م٣)

٣) بەنداوی دەربەندیخان: بەنداوی دەربەندیخان لەناوچەی تەنگەبەری دەبەندیخان لەسەر ڕووباری سیروان دامەزراوە، درێژییەکەی دەگاتە (٥٣٥م) و بەرزییەکەی (١٢٨)م بەرزی لەئاستی ڕووی دەریاوە (٥١١)م توانای ئاو وەرگرتنی (٣ ملیار م٣) .

٤) بەنداوی حەمرین: بەنداوی حەمرین لەسەر ڕووباری دیالە (سیروان) دروستکراوە توانای ئاو وەرگرتنی (٢,٥ ملیارم٣)

٥) بەنداوی سامەڕا کە لەسەر ڕووباری دیجلە لەنزیك شاری سامەڕا دروستکراوە .

٦) بەربەستی هندیە ئەم بەربەستە کۆنترین بەربەستە لەعێراق کە لەساڵی (١٩١٣) لەسەر ڕووباری فورات دروستکراوە.

٧) بەربەستی کوت لەساڵی (١٩٣٩) لەسەر ڕووباری دیجلە دروستکراوە و لەئێستادا ئەم بەربەستە ڕۆڵی ڕێکخستنی و دابەشکردنی ئاو دیجلە دەبینێت لەکەناڵەکانی عمارە و غراف و حسینیە و دوجەیل.

## ئاوی کەناری عێراق لەسەر کەنداوی فارسی:

عێراق لەباشوورەوە لەڕێگای کەنداوی فارسیەوە دەگاتە دەریا و ئاوی ئازاد، بەڵام عێراق تەنیا وڵاتی کەناری کەنداوە کە کەمترین سنوری ئاوی هەیە، ئەم مەسەلەیە یەکێکە لەکێشەکانی عێراق کە لەڕووی ئابووری، پەیوەندی، سەربازی و ستراتیجیەوە بەجۆرێکە کاریگەری لەسەر ڕفتاری سیاسی - سەربازی ڕژێمی عێراق بەجێهێشتووە.

کەناری عێراق لەسەر کەنداوی فارسی لەدەمی فاو لەناودرێژگەی شەتولعەرەبەوە دەستپێدەکات تا لەبەندەری ئوم قەسر لەکۆتایی خۆر عبداللە و سنوری کوێت کۆتاییدێت، کە درێژییەکەی دەگاتە (٤٨كم)*. تەنیا بەندەری گرنگ و شیاو بۆ چوونە ناوەوەی عێراق لەم کەنارە بەندەری ئوم قەسرە.

## تایبەتمەندیەکانی دانیشتوان :

دانیشتوانی عێراق بە درێژایی مێژوو، بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی زۆری بەخۆیەوە دیوە. لەنێوان سەدەی هەشتەم و دوازدەیەم، عێراق و بەتایبەتیش بەغداد ناوەندی گەشەکردنی شارستانیەت بووە و لەسایەی ئەم گەشەکردنەدا ئەم ناوچەیە دانشتوانێکی زیاتر لەدانیشتوانی ئێستای هەبووە کە هەندێك بە (١٥ تا ٢٩) ملیۆنی دەخەمڵێنن.

---

*) بەپێی سەرچاوە جوگرافیە عیراقیەکان سنوری دەریایی عێراق لەسەر کەنداو (٦٥كم)ە . نوسەر لە بەشیی دووەمی ئەم باسەدا سنوری ئاوی عێراق بە (٥٥كم) داناوە کە پێموایە ئەوەش هەڵەیە. ــ وەرگێڕ.

کەمبوونەوەی دانیشتوان لەسەدەی سیازدەیەم بە هێرشی مەغۆلەکان دەستپێدەکات کە کوشت وکوشتاری خەڵك و وێرانی شار و گوندەکانی لێکەوتەوە، لەم سەردەمەدا سیستەمی ئاودێری کە توانای بەخێوکردنی ئەم ژمارە زۆرەی دانیشتوانی هەبوو وێران کرا.

لەسەردەمی عوسمانیەکاندا بەهۆی دواکەوتووی کۆمەڵگاوە، پێکهاتەی دانیشتوانی عێراق گۆڕانی بەسەرداهات. ئەم گۆڕانکاریە لەسەدەی شازدەهەمەوە دەستی پێکرد و لەهەرسێ ویلایەتی موسڵ، بەغدا و بەسرە بەردەوامی هەبوو. ئەم سێ ویلایەت وەك ناوچەیەکی کەم دانیشتوان و دواکەوتووی سەردەمی عوسمانی دەژمێردرا. لەماوەی سەدەی هەژدەیەم وڵاتی عێراق کەمتر لە (١,٣) ملیۆن کەس بوو.

لەدوای ڕزگاربوونی عێراق لەساڵی (١٩٣٢) ئەفسەرانی بەریتانی دانیشتوانەکەیان بە نزیکەی (٣,٥) ملیۆن کەس خەملاندوە. لەیەکەمین سەرژمێریدا کە لەساڵی (١٩٤٧) ئەنجام دراوە، دانیشتوانی عێراق (٣,٨) ملیۆن کەس بووە. لەسەرژمێری ساڵی (١٩٥٧) دانیشتوانی عێراق گەیشتۆتە (٦,٣) ملیۆن کەس و لەساڵی (١٩٦٥) گەیشتۆتە (٨) ملیۆن کەس و لەساڵی (١٩٧٧) گەیشتۆتە (١٢) ملیۆن کەس.

بەڵام دوا سەرژمێری کە لەعێراقدا ئەنجامدرابێت لەساڵی (١٩٨٧) دابووە، بەپێی ئەو سەرژمێریە دانیشتوانی عێراق (١٦,٢٧٨,٠٠٠) کەس بووە*، کە بەراورد بە سەرژمێری پێشوو (٣٥,٣٪) زیادی کردووە. بانکی جیهانی لە نیوەی دووەمی ساڵی (١٩٩٢) دانیشتوانی عێراقی بە (١٩,٣) ملیۆن کەس خەملاندووە.

ڕێژەی گەشەی دانیشتوان لە عێراق بەپێی سەرژمێری ساڵی (١٩٧٧)، بریتیبووە لە(٣,٢٪) بەڵام لەسەرژمێری ساڵی (١٩٨٧) کەمبۆتەوە بۆ ڕێژەی لە (٣,١٪).

پێکهاتەی دانیشتوانی عێراق وەك هەموو وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان بەپێکهاتەی لاو دادەنرێت بەجۆرێك کە لەساڵی (١٩٨٧) نزیکەی (٥٧٪)ی دانیشتوان تەمەنیان لەخوار (٢٠) ساڵەوەیە. حکومەتی عێراق هیچ وەختێك بەرنامەی کەمکردنەوەی دانیشتوانی جێبەجێ نەکردووە. ئەم کارە بە تایبەت لەماوەی جەنگی عێراق و ئێران بەهۆی پێویستی بە هێزی لاوان بۆ بەرەکانی جەنگ بەریلێنەدەگیرا، و یەکێك لەئامانجەکانی حکومەتی عێراق ڕکەبەرایەتیە لەگەڵ دانیشتوانی ئێراندا.

پێکهاتەی گروپی تەمەن لەعێراق لەماوەی ساڵانی (١٩٥٧-١٩٨٧) بەجۆرەی خوارەوەیە:**

---

* ) ژمارەی دانیشتوانی عێراق لە ساڵی (١٩٩٥) نزیکەی (٢٢,١٤٤,٠٠٠) کەس بووە و بەپێی خەملاندنی ساڵی (٢٠١٠) کە بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق دانرابوو ژمارەی دانیشتوانی عێراق بە نزیکەی (٣٢) ملیۆن کەسە دانراوە- وەرگێڕ.

** ) ) نوسەر تەنیا ئاماژەی بۆ یەکساڵ کرد بوو، بەڵام من لەبەر گرنگی بابەتەکە بۆخوێنەران ئەم خشتەیەم بۆ هەرچوار سەرژمێریە سەرەکیەکەی عێراق دروست کرد - وەرگێڕ.

| گروپی تەمەن | ١٩٥٧ | ١٩٦٥ | ١٩٧٧ | ١٩٨٧ |
|---|---|---|---|---|
| (٠-١٩) گروپی تەمەنی بچوك (منداڵ) | ٥٢,٧ | ٥٥,٩ | ٥٧,٤ | ٥٦,٩ |
| (٢٠-٦٤) گروپی تەمەنی مامناوەندی (کارکەر) | ٤٢ | ٣٨,٨ | ٣٨,٤ | ٣٨,٣ |
| لە (٦٥) زیاتر گروپی تەمەنی گەورە (پیر) | ٥,٣ | ٥,٣ | ٤,٢ | ٤,٨ |

عێراق یەکێکە لەو وڵاتانەی کە هێزی کار لەدەرەوە دەهێنێت، هێزی کار زۆرتر لەوڵاتە عەرەبیەکانەوە دەهێنێت، بەشی سەرەکیان لەبواری بیناسازی و کشتوکاڵیدا دەخرێنەکار. لەماوەی جەنگی عێراق ئێراندا بەهۆی پێویستی زۆر بە هێزی سەربازی ژمارەی کارگەرانی دەرەکی گەیشتە (٢) ملیۆن کەس. بەڵام دوای وەستانی شەڕ، ئەم ژمارەیە دابەزی بۆ یەك ملیۆن کەس، ئەوانیش دوای هێرشی عێراق بۆ سەر کوێت و هێرشی هاوپەیانان بە سەرۆکایەتی ئەمەریکا بۆ سەر عێراق ئەم وڵاتەیان جێهێشت. تاپێش تێکشکانی عێراق لەکوێت هێزی کاری عێراقی لەبواری کشتوکاڵ (٣٥٪)، کارگوزاری (٣٥٪)، بیناسازی (١٧٪) و پیشەسازی (١٢٪) بوو. پیشەسازی نەوت لەعێراق نزیکەی (٢٪) هێزی کاری ئەم وڵاتەی خستبووە کار.

## دانیشتوانی شار و گوند:

لەدوای جەنگی دووەمی جیهانی ڕەوتی شارنشینی و گەشەکردنی شارەکان لەبواری زیادبوونی دانیشتواندا بە ئاشکرا دیاربوو. لەساڵی (١٩٤٧) دانیشتوانی شارەکان لەعێراق ڕێژەی (٣٩٪) ی دانیشتوانی پێکدەهێنا، لەکاتێکدا دانیشتوانی گوندەکان ڕێژەی لە (٦١٪) بوو، ڕێژەی گوندنشینان لەساڵی (١٩٦٥) دابەزی بۆ (٥٦٪) و لەساڵی (١٩٧٧) بووە (٣٦٪) وە لەساڵی (١٩٨٧) نزمبۆوە بۆ (٢٩,٥٪). لەنێوان ساڵی (١٩٧٧ تا ١٩٨٧) ژمارەی دانیشتوانی شار لە (٧,٦) ملیۆن کەسەوە بەرز بووەوە بۆ (١١,٥) ملیۆن کەس ئەمە لەئەنجامی کۆچی خەڵك بۆ شارەکان کە لەگەڵ دەستپێکردنی شەڕی ئێران و عێراق ڕوویدا کە زۆربەیان کەوتونەتە ناچەکانی نزیك مەیدانی جەنگەوە. کۆچی بەکۆمەڵی لەگوندەکانی سەر بە پارێزگای بەسرە و میسان لەهەموو ناوچەکانیتری عێراق زۆرتربوو. ڕێژەی دانیشتوانی گوند بەرامبەر شار لە بەسرە لەساڵی (١٩٦٥) (٣٧٪) بوو بەڵام لە ساڵی (١٩٨٧) دابەزی بۆ (١٢٪)، لەپارێزگای بەغداد لەساڵی (١٩٦٥) نزیکەی (٤٨٪) بوو بەڵام لەساڵی (١٩٨٧) دابەزی بۆ (٧٪)، بەجۆرە دانیشتوانی گوندنشین لەزیقار لەساڵی (١٩٨٧) (٤٩٪) و لەپارێزگاکانی دیالە و سماوە (٤٨٪) بووە ئەمانە بەرزترین ژمارە گوندنشینە لەساڵی (١٩٨٧)*. لەهەندێك ناوچەش ژمارەی شارنشینیش

*) ژمارە گوندنشین لەپارێزگاکانی هەرێمیش هەر لەکەمبوونەوەی بەرچاودا بووە بۆنموونە ژمارەی گوندنشین لەشارەکانی دهۆك و هەولێر و سلێمانی و کەرکوك لەساڵی (١٩٥٧) ڕێژەی (٨٢,٨٪) و (٧٣,٢٪) و (٧٤٪) و (٦١٪) بووە بەڵام لەساڵی (١٩٨٧) بەم شێوەیەی خوارەوە کەمیکردووە (٢٥,٤٪) و (٢٢,٧٪) و(٢٩٪) و (٢٦٪) یەکبەدوای یەك، دواتر بەهۆی پرۆسەی ئەنفال بەدناوەوە لەساڵی (١٩٨٨)

کەمیکردووە، بۆ نموونە شاری بەسرە لەساڵی (١٩٧٩) نزیکەی (٨٠٠,٠٠٠) کەس بووە بەڵام لەدوای هەڵگیرسانی شەر ژمارەکەی کەمیکردووە. بە درێژی ماوەی شەر لەگەڵ ئەوەی دانیشتوانی بەسرە کەمیکردووە بەڵام ژمارەی دانیشتوانی شاری بەغدا گەیشتۆتە (٣,٦) ملیۆن کەس.

بەشێوەی گشتی تا پێش هەڵگیرسانی شەرِ دژی ئێران کۆمەڵگای عێراق لەحاڵەتی گەشەکردنی شارنشینی بووە. بەجۆرێك کە بەغدا و بەسرە زۆر گەشەیان کردووە، بەڵام گەشەکردنێکی نا هاوسەنگ کە چەندین گەرەك لەئەنجامی کۆچ لەماوەی نێوان ساڵانی حەفتاکان و هەشتاکان دروست بوون. لەسەردەمی حکمی عبدالکریم قاسم و بەتایبەتی لەماوەی نێوان ساڵان (١٩٦١ تا ١٩٦٣) زۆر نموونەی نەگونجاوی نیشتەجێبوون دروست بوو، کە لەهەلومەرجێکی زۆر خراپدا ژیانیان بەسەر دەبرد لە نموونە ئەو شارانە وەك (مدینە الثورة و النور) لەبەغدا.

پێش دەستپێکردنی شەرِ گەرەکی (الثورة) بنیات نرایەوە، دانیشتوانی ئەم گەرەکە شیعە و کۆچکەرانی ناوچەکانی باشوور بوون، کە زۆربەیان جوتیار و دوکاندار و بازرگانی وورده و یان بەلەمەوانی هۆرەکانی باشوور بوون.

لەلایەکیترەوە لەساڵی (١٩٥٠) شەپۆلێك لەکۆچی جولەکەکان بەرەو ئیسرائیل دەستپێکرد و جێگاکەیان بەخێرای لەلایەن عەرەبەکانەوە پرکرایەوە بەتایبەتی عەرەبە شیعەکان.

پێکهاتەی دانیشتوانی شار لەعێراق بەرەبەرە گەشەیکرد و هاوکات لەگەڵ بە حکومەتی بوونی خوێندن (واتە خوێندن بەخۆرایی) و گەشەی بازرگانی و پیشەسازی شار، چینی ناوەندی دروست بوو.

بەرزبوونەوەی دەرامەتی نەوت لەحەفتاکاندا بووە هۆی خێرابوونی گەشەی بیناسازی و شارەکان. ئەمەش خۆی بووە هۆی ئەوەی کە گوندنشینەکان لەبرسێتی و هەژاریدا دەژیان ڕاکێشێتە ناو شارەکانەوە تا لەبواری کاری نا پیشەیدا کار بکەن.

### پێکهاتەی خێڵەکی دانیشتوان:

دانیشتوانی عێراق و بەتایبەتی کۆمەڵگا گوندیەکانی ئەم وڵاتە پێکهاتەی خێڵەکیان بەهێزە، کە بە درێژایی سەدەکان بەردەوامی هەبووە و ئیستاش هەر بەردەوامە. مەسەلەی خێڵایەتی لەناوچە دووردەستەکانی گوندەکانی باکوری رۆژئاوا و هۆرەکانی باشور زۆرتر پاڵپشتی لێدەکرێت.

بوونی ئەم جۆرە لەپێکهاتە خێڵەکیە واهەست دەکرێت زۆرتر بەهۆی نائەمنی و ناسایشی لەدوای رووخانی خەلافەتی عەباسیەوە دروست بوو بێت. هەرچەندە ناتوانین فراوانخوازی و هێرشی نەتەوەکانی تر لەبەرچاو نەگرین.

---

بەهۆی روخاندنی سەرجەم گوندەکانی کوردستانەوە ژمارەی گوندنشین لەهەرێمی کوردستان نزیك بووەوە لە (سفر) و دوای راپەڕینی ساڵی (١٩٩١) و رزگاربوونی بەشێکە خاکی کوردستان دوبارە گوندەکان ئاوەدان بوونەوە ـ وەرگێر.

لەنەبوونی دەسەڵاتی ناوەندی و کۆمەڵگەی شاری نوێ و باڵادەستی کۆمەڵگا لەژێر چەتری جەنگاوەر و باڵادەستی تاکدا بۆ یەکەی بچوك دابەش دەبێت. لەم جۆرە هەلومەرجەدا گەورەپیاوی خێڵ وەك چینی جەنگاوەر دەرکەوتوون لەم ڕەوشەدا سەرۆکی خێڵ سەرۆکی جەنگاوەری بەدەوییە لەجیاتی کشتوکاڵی.

لەماوەی سەدەی نۆزدەیەمدا، جێگرتنەوەی دەسەڵاتی خێڵ گۆڕا، کە تارادەیەك سیستەمی خێڵەکی لەرزان.

لەقۆناغی دەسەڵاتی بەریتانیادا قۆناغی پاشایەتی کە دەستکردی ئەوان بوو، لەکاتێکدا کە لاوازبوونی خێڵ وەك یەکەیەکی کۆمەڵایەتی بەردەوام بوو، بەهێزکردنەوەی دەسەڵاتی لاوازی سەرۆك خێڵ (شیخ) گرژی و گرفتی لەگەڵ خۆی هێنایەوە. ئینگلیزەکان لەم بوارەدا بۆچوونیان هەبوو، بۆ دەستگەیشتن بە سەرچاوەکانی کشتوکاڵی عێراق ناوەندی دەسەڵات لەناوچە گوندیەکان و دور لەشارەکان دروست بکەن تا ئاسایشی پێویست لەبەرژەوەندی خۆیان دابین بکەن و هەرجۆرە خەباتێکی سیاسی لەلایەن ئەم گروپانەوە سەرکوت بکەن. سەرەڕای عێراق، ئەمانە بۆ جێگیر کردن و بەردەوامی بە سیاسەتی خۆیان لەناو میرنشینەکانی کەنداویش هەمان هەنگاویان نا.

بەڵام مێژووی عێراق شایەتی شەڕ و ملململانێی گروپەکان و ڕووبەڕووبونەوە بۆ ناوەندگەرایی سیاسی بووە و بەگشتی لەدەشتەکانی نێوان دوو ڕووبار کە بەسەرچاوەی بەرهەمهێنانی خۆراك دەژمێردرێت، لەنێوان شار و خێڵەکان کارەسات هەبووە. بەجۆرە هەر کاتێك دەسەڵاتی ناوەندی نەتوانێت دەستی بە تۆڕی ناو بگات و کورت بێنێت، لەئەنجامدا کەرەسەی خۆراکی کەم دەبێت خێڵەکان بۆ پەیداکردنی خۆراك هێرش دەکەنە سەر شارەکان. لەماوەی (٦٠٠) ساڵدا لەسەردەمی ڕووخانی عەباسیەکانەوە تا کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم دەسەڵاتی حکومەت لەعێراق سست و بێتوانا بووە و دەسەڵاتی خێڵ خودموختاری خۆی هەبووە. لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەم، سەرزەمینی عێراق بەگشتی هاوشێوە بووە و بە تایبەتمەندی نەژادی و ئاینی و نەتەوەیی خۆیەوە و یارمەتیدەر نەبووە بۆ دروست بوونی حکومەت یان دەسەڵاتی ناوەندی، لەئەنجامدا دەتوانین بەشێکی گرنگ لەتێڕوانین و خواستەکانی حکومەتە هاوچەرخەکانی عێراق لەدروستکردنی دەوڵەت/نەتەوە لەناو پێکهاتەی پەرشوبڵاوی کۆمەڵایەتی ئەو وڵاتەدا و دروستکردنی وەفاداری و ئاراستەکردنی کۆمەڵگا بە ئاراستەی شناسی نەتەوەیی زانیوە، لەگەڵ کودەتای ساڵی (١٩٥٨) ڕۆڵی خێڵەکی وەك سەرەکیترین یەکەی سیاسی/سەربازی کۆمەڵگای عێراقی گۆڕاو ووردەوردە لاواز بوو.

## پێکهاتەی نەتەوەیی و ئاینی و زمانی دانیشتوانی عێراق:

بەپێی ئەو ئامارانەی لەعێراق کراوە و خراوەتەڕوو، ناتوانرێت بە تەواوەتی پشتی پێببەسترێت. بەپێی ئەو ئامارەی لەساڵی (١٩٨٧) کراوە، (٧٦٪) ی دانیشتوانی عێراق عەرەبە و (١٩٪) ی کوردە و ئەو باقیەی کە دەمێنێتەوە و دەکاتە (٥٪) بریتیەلە (تورکمان، مەسیحی، ئێرانی، ئیزیدی و جولەکە)*.

ئاینی ئیسلام ئاینی ڕێژەی (٩٠ ـ ٩٥٪) دانیشتوانی ئەم وڵاتە پێکدەهێنێت.

دانیشتوانە عەرەبەکەی وڵات بۆ دوو مەزهەبی سونی و شیعی دابەش دەبێت. ئاماری حکومی ژمارەی شیعەکانی عێراق بە (٥٥٪)ی دانیشتوانەکەی دادەنێت، بەڵام زۆربەی چاودێران ئەم ژمارەیە بەکەم دەزانن و ڕێژەی شیعەکان بەرزدەکەنەوە بۆ (٦٥٪).

بە درێژیی مێژووی عێراق شیعەکان لەڕووی سیاسیەوە بەگشتی لاواز و لەڕووی ئابووریەوە دواکەوتوو بوون. لەسەرەتای سەدەی شازدەیەم کە عوسمانیەکان هاومەزهەبی خۆیان لەڕووی خوێندەواری و هەلی کارەوە لەبەرچاوگرت، بەپێچەوانەوە شیعەکانیان لەگۆڕەپانی سیاسی فەرامۆشکرد و کەنارخران، لەبەرئەوە هەرچەندە ژمارەی دانیشتوانی شیعە زیاتر لەنیوەی عێراق پێکدەهێنن، بەڵام پلەی سیاسی و کارگێری کەم بایەخیان بەدەستەوە بووە. لەبواری ئابووریشدا بە لەبەرچاوگرتنی ژمارەی بازرگان و ملکدارەکان، شیعەکان هەمیشە وەك جوتیار و کرێکار دەرکەوتوون. بەجۆرە لەنیوەی دووەمی حەفتاکاندا هەنگاوەکان و ڕەوتی ئابووری حکومەت کاریگەری باشی لەسەر شیعەکان هەبوو و ئەم هەنگاوانە بووەهۆی ئەوەی بەشێك لەشیعەکان بگەنە چینی ناوەڕاستی کۆمەڵگە.

مەسیحیەکان لەعێراق نزیکەی (٥٪)ی دانیشتوانی عێراق پێکدەهێنن، کەنیسەی (چالدین Chaldean) گەورەترین کەنیسەی عێراقە و نزیکەی (٦٠٠) هەزار ئەندامی هەیە. گروپی بچوکتری مەسیحی وەك ئەرسۆدەکس و کاتۆلیکی سوری: ئەرمەنی، ئەرسۆدەکسی یۆنانی و ئاشوری هەیە.

کۆمەڵگای جولەکە لەعێراق مێژووی چەندین هەزار ساڵیان لەم وڵاتەدا هەیە، سەرژمێری ساڵی (١٩٤٧) ژمارەی جولەکەکانی بە (١١٨) هەزار کەس خەمڵاندووە، کە لەبەغدا، بەسرە و موسڵ کۆبوونەتەوە. دوای دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل تا ساڵی (١٩٦٠) تارادەیەك زۆربەی دانیشتوانی جولەکەی عێراق بەرەو ئیسرائیل کۆچیان کرد و ئەمڕۆ نزیکەی (٥٠٠٠) کەس لەعێراق نیشتەجێن.

---

*) ئیزیدی ئاینە نەك نەتەوە ، چونکە ئیزیدیەکان کوردی ڕەسەنن و جیاواز نین لە نەتەوەی کورد، بەڵام نوسەر بۆیە کەوتۆتە ئەو هەڵەیەوە چونکە هەر لەسەردەمی ڕژێمی بەعسەوە تاوەکو ئەمڕۆش هەوڵێك هەیە و دلبرانی کوردی ئیزیدی و شەبك و فەیلی لە کورد بەمەبەستی کەمکردنەوەی ژمارەی کورد لە عێراقدا. وەرگێڕ

ئێرانیەکان پێشتر دانیشتوانی زۆریان لەشارە پیرۆزەکانی نەجەف و کەربەلا و بەسرە پێکدەهێنا کە ئەم ژمارەیە بەگشتی تا ساڵەکانی (١٩٧١-١٩٧٢) هەروەها لەساڵەکانی (١٩٧٩-١٩٨٠) لەعێراق دەرکران. لەساڵی (١٩٨٧) ژمارەی ئێرانی نیشتەجێ لەعێراق (١٣٣٠٠٠)کەس خەملێنراوە.

ئیزیدیەکان گروپێکن کە پەیوەستن بە کوردەکانەوە و لەناوچەی دەوروبەری شاخی شەنگار نیشتەجێن، بە زمانی عەرەبی و کوردی قسەدەکەن. ئەمانە کۆمەڵگایەکی داخراون و لەرووی کۆمەڵایەتیەوە هەتا ژنوژنخوازی لەناو کوردەکانیشدا ناکەن.

تورکمان نزیکەی (١,٤٪) دانیشتوانی عێراق دەبێت، لەناوچە نیمچەشاخاویەکان دەژین و بەتایبەت لەشارەکانی کەرکوك و هەولێر و موسڵ، تورکمانەکان لەڕووی مەزهەبەوە سونە و لە چینی مامناوەند دەژمێردرێن. ( لە عێراق تورکمانی شیعەش هەیە ــ وەرگێڕ).

دانیشتوانی کوردەکان زیاتر لە (٣) ملیۆن کەس دەبێت زۆربەیان مەزهەبی سونین و ڕێژەی (١٣٪)ی دانیشتوان پێکدەهێنن*. ئەمە نەتەوەیەکی گرنگە و لەشاخەکانی باکوری ڕۆژهەڵات و شاخەکانی زاگرۆس دەژین. ئەمانە بە زمانی خۆیان واتە کوردی قسە دەکەن و لەڕووی کلتوریەوە بەتەواوەتی لەعەرەبەکان جیاوازن و لەهەوڵدان شوناسی خۆیان لە عەرەبەکانی عێراق بپارێزن.

بەهۆی شەڕ و پێکدادان لەنێوان کوردەکان و حکومەتی ناوەندی زۆر لەکوردەکان وەك شیعەکان بەرەو شارەکان کۆچیان کردووە شاری سلێمانی شارێکە تەواو کوردیە و هەولێر زۆرینەیە و شاری کەرکوکی نەوتی نیوەی زیاتری دانیشتوانەکەی لەکورد پێکهاتووە.

لەڕووە زمانەوە لە (٧٥٪)ی دانیشتوانی عێراق بە زمانی عەرەبی قسە دەکەن. باقی دانیشتوانەکەی بە زمانەکانی کوردی و تورکمانی و فارسی قسە دەکەن. سەبارەت بە کوردەکان و تورکمان لەناوچە گشتیەکانیش بە زمانی خۆیان قسە دەکەن بەڵام فارسی تەنیا لەناو خێزانەکاندا قسەی پێدەکرێت.

### ناوەندەکانی کۆبوونەوەی دانیشتوان:

جگە لەناوچە شاخاویەکانی باکوری ڕۆژهەڵات کە ڕێژەی بەفر و بارانی ساڵانە بە پێی پێویست لێدەبارێت، دانیشتوانی عێراق لەنزیکی کەنار ڕووبارەکان نیشتەجێن، لەو جێگایانە کە ژمارەی زۆری شار

---

*) (تێبینی نووسەر بەهۆی بەکارهێنانی دوو سەرچاوەی دژ بەیەك کەوتۆتە هەڵەوە لە لاپەڕەی پێشوو دەڵێت کوردەکان جگە لە ئیزیدیەکان ڕێژەی (١٩٪) ی عێراق پێکدەهێنن بەڵام لێرەدا دەڵێت (١٣٪) وە لە چەند پەرەگرافێك خوارتر دەڵێت ژمارەی ئەوانەی بە زمانی عەرەبی قسە دەکەن دەگاتە (٧٥٪) مانای وایە ئەوەی دەمێنێتەوە دەکاتە لە (٢٥٪) ئەم ژمارەیەش بە دڵنیاییەوە نزیکەی نەتەوەی کوردە و بەشێکی کەمی تورکمان و مەسیحیە کە هەردوکیان پێکەوە ناکاتە (٥٪)، هەرچەندە نوسەر ئاماژە بۆ فارسیش دەکات بەڵام وەك خۆی دەڵێت تەنیا لەناو خێزانەکاندە بەشێوەیەکی سنووردار قسەی پێدەکرێت.ئەمەش هەڵەیەکە نوسەر وەك توێژەرێکی بە سەلیقە نەدەبوایە بکەوتایەتە ئەم هەڵەیەوە. جگە لەوەی کە دەزانین ئەمە هەڵەیەکی ئاشکرایە بەڵام بەپێی پەیڕەوی ڕاستگۆیی لە وەرگێڕاندا وەك خۆی دامان بەزاندووە تا خوێنەر خۆی سەرپشك بێت لە هەڵسەنگاندن - وەرگێڕ).

به درێژایی مێژووی عێراق دروست بووه کۆبوونەتەوە. لەسەدەی بیستەمدا، دەسەڵاتی سیاسی و ئابووری بە شێوازێکی بەرچاو تەنیا لەسێ شاردا کۆبۆتەوە ئەوانیش (بەغدا، بەسرە و موسڵ). هەریەکە لەم ناوەندی شارانە خاوەنی شوێنی ستراتیجیە کە مێژوویان بۆ چەندین سەدە پێش ئێستا دەگەڕێتەوە و رۆڵی گرنگی لەناوچەکەدا هەبووە. هەروەها ئەم سێ شارە، تەنیا ناوەندی شارن کە ژمارەی دانیشتوانیان لەملیۆن تێپەڕیوە.

بەغدا کەوتۆتە نێوان سەرەڕێگای باکور و باشووری عێراقەوە و دیجلە بەناویدا دەڕوا و ئاودێری ئەم ناوچەیە بەشێوەیەکی بەرفراوان دەکات. ئەم شارە باڵادەستە بەسەر ناوچەکانی دەوروبەری خۆیدا. بەشێوەیەکی باو بە ناوەندی بازرگانی و پەیوەندییەکان دەژمێردرێت، خێڵە عەرەبییەکان لەبیابانەکانی باشوری رۆژئاواوە پەیوەندی بەردەوامیان لەگەڵ بەغدا و نەجەف و کەربەلا هەیە. لەرابردوویەکی نزیکدا ئێرانیەکان لەرۆژهەڵاتەوە پەیوەندی بەردەوامیان بەم ناوەندەوە هەبووە.

موسڵ وەك ناوەندێکی بازرگان کەوتۆتە نێوان کوردستان و جزیرە لەلایەك و حەڵەب و دەریای ناوەڕاست لەلایەکیترەوە. کەوتۆتە باکوری عێراقەوە و دانیشتوانە عەرەبەکەی لەڕووی فەرهەنگی و ئابووریەوە لەعەرەبی سوریەوە نزیکترن تا باشوری عێراق.

بەسرە بەهۆی ئەوە کەوتۆتە سەر بەندەر زیاتر ڕوو لەکەندای فارسی و نیمچەکیشوەری هندستانە. لەدەیەی دووەمی حەفتاکاندا، ناوچەکانی باشوری دەوروبەری بەسرە گرنگی زیاتری لەژیانی ئابووری عێراقدا پەیداکرد. چونکە بیرە نەوتی ڕمێلە و ئەو بۆریە نەوتەی کەرکوك بە بەسرەوە دەبەستێتەوە کەوتۆتە ئەم ناوچەیەوە.

## بارودۆخی ئابووری عێراق :

بنەمای ئابووری عێراق لەسەر نەوت و کشتوکاڵ و ئاژەڵداری وەستاوە. لەسەرەتای پەنجاکانی سەدەی بیستدا ئەم وڵاتەش وەك سەرجەم وڵاتانی کەنداو لەژێر دەسەڵاتی کەرتی نەوتدا بوو و دەرامەتی وڵات ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەڕێگای ناردنەدەرەوەی نەوتەوە دابین دەکرا. پێش دەرکەوتنی نەوت کشتوکاڵ بە تەنیا بنەمای سەرەکی ئابووری وڵات و هەم وەك داهاتی نەتەوە و هەم وەك فاکتەری سەرەکی بەکارخستنی هێزی کار دەژمێردرا. بە هاتنەناوەوەی کەرتی نەوت بۆ ناو ئابووری وڵات، کشتوکاڵ ڕۆڵی سەرەکی خۆی لەدەستدا، بەجۆرێك لەساڵی (١٩٨٠) پشکی کشتوکاڵ لەپێکهاتەی بەرهەمی نەتەوەدا گەیشتە لە(٨٪)، هێزی کار لەم بەشەدا لەهەمان ساڵدا لە(٤٣٪) کەمیکردووە.

گەر سەرنج لەدەرامەتی نەوت بدەین. ڕژێمی عێراق لەسەرەتای گرتنەدەستی دەسەڵاتەوە هەوڵیداوە بارودۆخی ئابووری وڵات ڕێکبخات و بگات بە ئامانجی حزبی بەعس لەڕێی ئیشتراکی کردنی

ئابووریەوە. لەم بوارەدا چەندان کارگەی بچوك و گەورە کە لەژێر کۆنترۆڵی سەرمایەداراندا بوو خۆماڵی کرد و بازرگانی دەرەکیشی خستەژێر کۆنترۆڵی حکومەتەوە.

لەسەرەتای حەفتاکان و لەگەڵ بەرزبوونەوەی نرخی نەوت قۆناغی زێرینی ئابووری عێراق دەستیپێکرد، لەسەرەتای ئەم دەیەدا حکومەت توانی بەشێوەی وڵاتێکی دەوڵەمەندی نەوتی لەگۆرەپانی نێودەوڵەتی دەرکەوێت و لەپیشەسازی نەوتدا پێشکەوتنی بەرچاو بەدەست بهێنێت. لەدوای ئەوە لەماوەی قۆناغێکی کورتدا لەسایەی دۆلاری نەوتەوە توانای کاروباری پیشەسازی، کشتوکاڵی و تەندروستی ئەنجامی باش بەدەست بهێنێت و هەنگاو بۆ فراوانکردنی لایەنی پیشەسازی وڵات بنێت. بەجۆرێك کە پێش جەنگی عێراق ئێران، دەرامەتی نەوت بەجۆرێك بەرز بووبوەوە کە لەساڵی (١٩٧٩) گەیشتبووە (٢٣)ملیارد دۆلار. هەروەها بەرهەمی نەتەوەی ئەم وڵاتە گەیشتە ئاستێکی نموونەی کە (٣١)ملیارد دۆلار بوو. لەڕووی بەرهەمی نەوت لەنزیێك، عێراق لەساڵی (١٩٨٠) بەرهەمی ڕۆژانەی گەیشتە (٣,٧٤) ملیۆن بەرمیل کە لەپلەدا لەدوای عەرەبستانی سعودیەوە بوو. هەموو ئەم فاکتەرانە یارمەتی عێراقیدا تا بتوانێت لەساڵی (١٩٨٠) بودجەکەی بگەیەنێتە (١٧,٧) ملیارد دۆلار. کە ئەم ژمارەیە دوو ئەوەندی ساڵی (١٩٧٨) بوو. کە بووە هۆی پەرەپێدانی ئابووری و کۆمەڵایەتی.

لەگەڵ دەستپێکردنی جەنگی عێراق ئێران و لەناوچوونی ئەو گەنجینە بە بەهایە لەلایەك و بەرکەوتنی گورزی کاریگەر لەبەشە جیاوەزەکانی ئابووری لەلایەکیترەوە، ئابووری عێراق لەباروودۆخێکی گەشەکردووەوە بۆ باروودۆخێکی نەویسترا (خراپ) گۆڕا. بە جۆرێك لەکۆتایی شەڕدا ڕێژەی قەرزەکانی سەر عێراق گەیشتە (٥٠) ملیارد دۆلار. بە دەسپێکردنی جەنگی کەنداوی دووەم و هێرشی هاوپەیمانان کە لەئەنجامی هێرشی عێراق بۆ سەر کوێت و داگیرکردنی دروست بوو، زۆر لەبەشە جیاوازەکانی ئابووری ئەم وڵاتە وێران بوو، لەئەنجامی گەمارۆی ئابووری لەلایەن ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان و نەفرۆشتنی نەوت بۆ چەندین ساڵ، باروودۆخی ئابووری و ئاستی گوزەرانی خەڵکی عێراق زۆر خراپبوو بە جۆرێك کە لەم ساڵانەی دوایدا داهاتی تاکەکەس گەیشتۆتە نزمترین ئاستی داهاتی تاکەکەس لەجیهاندا.

**کشتوکاڵ :**

ناوچەی کەناری ڕووبارەکانی عێراق، شوێنی هەڵهاتنی کۆنترین شارستانیە کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ لایەنی کەم بۆ هەزارەی چوارەمی پێش زایین واتە کاتێك نەتەوەکانی ئەکەد و سۆمەر لەبەشێکی باکور و باشوری دەڵتای دیجلەو فورات نیشتەجێبوون. لەبەرئەوە کشتوکاڵ لەزەویە تەختەکانی عێراق، هەروەك ئەمڕۆ کاتێك توانای جێبەجێکردنی هەبووە کە سەرچاوەی دڵنیای ئاودێری زەویەکان لەبەر دەستدابووبێت و پێشکەوتنی ئەو شارستانیەتانە بەتەواوەتی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەرچاوە گرنگ و

ژیانبەخشەی دیجلە و فورات. داستانی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و ژینگە لەناوچەی دەشتەکانی عێراق، خۆی یەکێکە لەباشترین زنجیرەی زانیاریەکان کە دەتوانێت لەهەر ناوچەیەکیتری جیهان نموونەی ئەمە ببینین.

لەناوزێلی ڕووباری دیجلە و فورات، زۆرترین بڕی داباربن دەگەڕێتەوە بۆ ناوچە شاخاوی و ناوچە بەرزونزمیەکان کە بەرزاییەکانیان لەتورکیا و ئێران دەگاتە (۱۵۰۰-۳۰۰۰م).

لەعێراق، لەناوچەکانی بەغدا تا باشور دەشتی لیتەیی و نیشتەنی هەیە، کە تایبەتمەندیەکەی بریتیە لەلاوازی توانای ڕێکردنی ئاوی سەرزەوی و بوونی زۆنگاو، کە زۆرترین ڕووەکی ئەم ناوچانە ڕوەکی گەرمەسێرە.

بە درێژایی مێژوو چەند فاکتەرێکی سروشتی هەڕەشە بووە لەسەر توانای مرۆڤ و بەرقەرارکردنی ژیانێکی سەرکەوتوو لەسەر زەویە نزمەکانی دیجلە و فورات، لەم بارەیەوە چوار مەترسی گشتی بوونی هەیە لەسەر ژیانی مرۆڤ کە بریتین لە:

١) لافاو کە بەزۆری بەشێوەی لەناکاو و وێرانکەر ڕوودەدات.

٢) وشکەسالی کە بەرەبەرە و بەشێوەی توندوتیژ بەسەر مرۆڤ و سەرچاوەکاندا دەسەپێت.

٣) زیاد بوونی ڕێژەی خوێ (شۆرەکات) کە لەئەنجامی ئەمەدا توانای بەرهەم کەم دەبێتە.

٤) زیادبوونی گڵ و دروستبوون و کەڵەکەبوونی چینێك لە قوڕ بە درێژایی ڕۆژگار، کە دەبێتە هۆی لەناوبردنی کارایی تۆڕی ئاودێری کە دەسکردی مرۆڤە.

بەهۆی هەلومەرجی ئاووهەوایی و حەوزی ئاوگر، دووجۆر چالاکی کشتوکاڵی لەعێراق هەیە: یەکێکیان کشتوکاڵی دێمە کە بەهۆی بارانەوە لەناوچەی باکور دەکرێت و ئەویتریان کشتوکاڵی بەراوە کە پشت بە ئاودێری دەبەستێت لەناوچەکانی ناوەڕاست و باشور.

باشترین بەرهەمی ناسراوی عێراق و گەورەترین سەرچاوەی داهاتی وڵات دوای نەوت خورمایە، کە عێراق یەکێکە لەگەورەترین بەرهەمهێنەرانی خورما لەجیهاندا. خورما بە شێوەی گشتی لەناوچەکانی باشور و دەوروبەری شەتولعەرەب دەڕوێت.

بەشی سەرەکی کشتوکاڵ لەعێراق وەستاوە لەسەر چاندن و دوورینەوەی یەك جۆر بەرهەم. لەو ناوچانەی کە کشتوکاڵی دێم پەیرەوی دەکەن، گەنم لەپێشەوەی بەرهەمە کشتوکاڵیەکانە کە لەوەرزی پایزدا دەیچێنن و لەکۆتایی بەهاردا دەیدورنەوە. لەناوچەکانی ناوەڕاست و باشور کە کشتوکاڵی بەراو دەکرێت زیاتر کشتوکاڵی سەوزە و میوە دەکرێت.

لەناوچەکانی خواروو گەنم و جۆ و دانەوێڵە بە ئاودێری دەکرێت، لەبەرئەوەی جۆ پێویستی بە ئاوی کەمترە و بەرگەی شۆری دەگرێت، بۆیە جۆ وردەوردە جێگای گەنم دەگرێتەوە. ئەم بارودۆخە لەناوچەکانی باشور کە خاکەکەی شۆرە زیاتر ئەنجام دەدرێت.

یەکێك لەفاکتەرە کاریگەرەکانی کە دەبێتە هۆی گۆڕان لەرێژەی بەرهەمی کشتوکاڵ لەعێراقدا بری بارانە کە وەك کێشەیەك بۆ کشتوکاڵی ئەم وڵاتە سەیردەکرێت. بەوەی کە بەرهەمی کشتوکاڵی لەدەیەکانی (١٩٧٠ تا ١٩٩٠) تارادەیەك پاریزگاری لەئاستی مامناوەندی جێگیر کردوە، بەڵام زەوی کشتوکاڵی وردەوردە بەرەو کەمبوونەوە چووە. بە تێروانیین لەرێژەی هاوردەی بەرهەمە کشتوکاڵیەکان و مادەی خۆراکی ئەم مەسەلەیە بەجوانی روون دەبێتەوە. لەدەیەی شەستەکاندا عێراق لەبارەی بەرهەمە کشتوکاڵیەکان و مادەی خۆراکی توانای خۆبژێوی هەبووە. لەدەیەی (١٩٨٠) ئەم رێژەیە گەیشتۆتە لە(٣٣٪)، لەسەرەتای دەیەی (١٩٩٠) هاوردەی مادەی خۆراکی (١٥٪) ی هەموو هاوردەی وڵاتی پێکهێناوە.

بەشێوەی گشتی عێراق لەرابردودا وا پیشاندەدات کە لەجێبەجێکردنی پلانی کشتوکاڵیدا سەرکەوتوو نەبووە. زەوی بەجدی نەچێنراوە و زەوی چێنراوی وڵات و توانای بەرهەمی بە زەوی وڵاتانی دراوسێ بەراورد ناکرێت (یەکسان نابێت). کەمی توانای بەرهەم لەعێراق دەگەرێتەوە بۆ کۆمەڵێك فاکتەری سروشتی و کۆمەڵایەتی و ئابووری لەوانە پەیرەویکردنی شێوازی کۆنی بەرێوەبردنی زەوی. سەرەرای ئەو فاکتەرانە، چاکسازی کشتوکاڵیش کاریگەری هەبووە لەسەر پلانی کشتوکاڵی لەعێراقدا. قۆناغی یەکەمی ئەم هەنگاوە لەساڵی (١٩٥٨) دەستیپێکردووە، بەڵام بەربەرەکانیە سیاسیەکانی ئەو کاتە لەبەرامبەر ئەم پرۆژەیە دابەشبوونی زەوی دواخست و کێشەی زۆری رووبەروو بۆتەوە.

## پیشەسازی:

پەرەسەندنی پیشەسازی لەعێراق زۆرتر پەیوەستە بە ساڵانی دوای (١٩٦٠)وە، کە حکومەت رەوتی پەرەپێدانی پیشەسازی و بەرنامەی سەرمایەگوزاری لەناوچە جیاوازە جوگرافی و خەڵکە جیاوازەکاندا راگەیاند، هەرچەندە کۆبوونەوەی پیشەسازی لەدەوروبەری بەغدا (بەهۆی بازار و هێزی کار) و بەسرە (بەهۆی سوودی هاوردە و ناردەنی، کەرەسەی خاو و دەسکەوتنی نەوت و گاز) بووە. بەڵام کارگە و پیشەسازی بەرهەمهێن لەبەشە جیاوازەکانیتر وڵات کە شیاوی نیشتەجێبوونە دابەشبووە.

پیشەسازی رستن و چنین بەهۆی راکێشانی بازارەوە بەدرێژایی رۆژگار گرنگی پەیدا کردووە و بەیارمەتی رووسیا چەندین کارگە لەوڵات بەتایبەتی لەموسڵ دامەزراوە و گەیشتۆتە قۆناغی بەرهەمهێنان. لەبەسرە پیشەسازی چەك، توانەوەی ئاسن، پەترۆکیمیایی و کارگەی بەرهەمی پۆڵا هەیە. لەدەوروبەری بەغدا و زبیر چەکسازی و پیشەسازی چیمەنتۆ هەیە، جگەرە، کارەبا و ئاو زۆرتر لەبەغدا جێگیرکراوە.

## پیشەسازی نەوت و گاز:

عێراق لەساڵەکانی پێش دەسپێکردنی شەڕ ڕۆژانە (٣,٥) ملیۆن بەرمیل نەوتی بەرهەم دەهێنا، کە (٢,٥) ملیۆن بەرمیلی دەنارده دەرەوه. پیشەسازی نەوت لەساڵی (١٩٥٠) لەعێراق نیشتمانی بووه و ئەم وڵاتە لەساڵی (١٩٧٠) هەشتەمین وڵاتی بەرهەمهێنی نەوت بووه و لە ساڵی (١٩٧٨) دووەم وڵاتی بەرهەمهێنی نۆپیك بووە، بەرێژەی لە (١١٪) بەرهەمی هەموو وڵاتانی ئۆپێکی بەرهەمهێناوه. زۆرترین بەرهەمی نەوتی عێراق لەبیرەکانی بەسرە و بیرەکانی باشوری ڕۆژئاوای کەرکوك دەردەهێنرێت. عێراق بۆ فرۆشتنی نەوتی خۆی و جێبەجێکردنی پرۆژەی گەورە، ڕێکەوتننامەی زۆری لەگەڵ وڵاتانی ڕووسیا، فەرەنسا، یابان، ڕۆمانیا، هەنگاریا، برازیل و یۆنان بەستووە بەمەبەستی دامەزراندنی پرۆژەی نەوتی و پاڵاوگە.

پاڵاوگەکانی عێراق لەدۆرە، بیجی، حدیسە، کرکوك، خانەقین و قیارە جێگیرکراوە و توانای هەموو پاڵاوگە نەوتیەکانی عێراق یەکسانە بە (٧٠٠) هەزار بەرمیل لەڕۆژێکدا.

بڕی نەوتی یەدەگ لەعێراق بە (١٠٠) ملیارد بەرمیل دەخەملێنرێت، کە ڕێژەی یەدەگی دڵنیایی دەگاتە (٦٠) ملیارد بەرمیل و یەدەگی چاوەڕوانکراو دەگاتە (٤٦) ملیارد بەرمیل.

ڕێژەی گاز لەعێراق بەپێی ووتەی وەزارەتی نەوتی عێراق نزیکەی (٨٢٠) ملیار پێ سێجا خەملێنراوە، سەرچاوەی گازی سروشتی زۆرتر لەدەوروبەری ڕمێلە، زوبیر و کەرکوك لەباکوری عێراق کۆبۆتەوە.

## گواستنەوە و گەیاندن و ڕێگاکانی پەیوەندی:

گواستنەوە و گەیاندن وەك یەکێك لەبەشە زۆر چالاکەکانی ئابووری عێراق لەدەیەی نەوەدەکان دەژمێردرێت و بەشێکی گرنگ لەبودجەی پەرەپێدانی وڵات بۆ ئەم بەشە تەرخان کراوە. بەپێی ئەو بەڵگانەی خوارەوە گواستنەوە و گەیاندن بۆ حکومەت گرنگی زۆری هەبووە:

لوجستیك بە یەکێك لەلیستە گرنگەکانی حسابی عێراق دەژمێردرێت لەماوەی جەنگ لەگەڵ ئێراندا.

حکومەتی عێراق گەیشتۆتە ئەو بڕوایەی کە ناهەمواری و خراپی لەگواستنەوە و گەیاندندا پەرەپێدان لەبواری پیشەسازی سنوردار دەکات و یەکێکە لەکۆسپە سەرەکیەکانی بەردەم پێشکەوتن.

حکومەت پێیوابوو کە تۆڕێکی گواستنەوە و گەیاندنی فراوان ڕۆڵی سیاسی گرنگ لەپەیوەندی و بەیەکەوەبەستن لەناوچەکەدا دەبینێت و هەروەها ئامادەیی حکومەتی ناوەندی لەدوردەترین ناوچەی وڵات زیاد دەکات.

بەپێی ئەو بەڵگانەی ئاماژەی بۆکرا، ڕژێمی عێراق بەرنامەی داڕشتووە بۆ فراوانکردن و پەرەپێدانی تۆڕی پەیوەندیەکان وەك هێڵی ئاسنین، ڕێگای قیرتاو، ڕێگای ئاسمانی و گواستنەوە و گەیاندن لەڕووبارەکاندا.

تۆڕی پەیوەندی عێراق، ئەمڕۆ لەبەغداوە بە ئاراستەی باکوری ڕۆژئاوا و باشوری ڕۆژهەلات درێژەی هەیە، بەغدا خاڵی بەیەکەوەبەستنی کەرکوك و موسڵ لەلایەك و بەسرە لەلایەکیترەوەیە. لەدەیەی (١٩٩٠) حکومەت هەوڵی زۆری داوە تا هەرچی زۆرترە بەغدا بەدەشتەکانی حەوزی ڕووباری فوراتەوە ببەستێتەوە.

ڕێگای قیرتاو: فراوانبوونی ڕێگا لەعێراق بە دروستکردنی ڕێگاکانی کەنارە ڕووبارەکانی دیجلە و فورات دەستپێکرد. جادەی هێڵی خێرا (ئۆتۆبان) شانبەشانی هەردوو ڕووبار تا کوێت و سعودیە درێژ دەبێتەوە. هەروەها شارەکانی وڵات لەبیابانی ڕۆژئاوا و هەروەها بەدرێژایی ڕووبارەکان تا سوریا و لەڕێگای موسڵەوە تا تورکیا و لەباکور بۆ ئێران درێژ دەبێتەوە.

درێژی جادەی قیرتاو لەعێراق لەماوەی ساڵانی (١٩٧٩ تا ١٩٨٥) نزیکەی (٢٢٣٩٧)کم بووە واتە دوو ئەوەندەی ساڵانی پێشوو زیادی کردووە جگە لەوەی (٧٨٠٠کم) ڕێگای پلە دوو زیادیکردووە.

هێڵی ئاسنین: عێراق خاوەنی دوو تۆڕی هێڵی ئاسنینە، هێڵی یەکەم لەبەغدا و موسڵ تا سنوری سوریا درێژەی هەیە و لەم ڕێگایەوە دەبەسترێت بە تۆڕی هێڵی ئاسنی تورکیاوە. هێڵی دووەم کە هێڵێکی تەواو ناوخۆییە کە بەغدا بە بەسرەوە دەبەستێتەوە. درێژایی هێڵی ئاسنین لەعێراق دەگاتە (٢٠٢٩)کم. پێش هێرشی عێراق بۆسەر کوێت عێراقیەکان دانوسانیان لەگەڵ تورکیا و کوێت و عەرەبستانی سعودی هەبوو بۆ خستنەکاری پرۆژەیەك کە دیزاینکرا بوو بۆ دامەزراندنی هێڵی ئاسنین کە ئەم چوار وڵاتە بەیەکەوە ببەستێت، کە لەڕاستیدا بەگەڕخستنی هێڵی ئاسنی ئەوروپایە بە کەنداوەوە.

بەندەرەکان و ڕێگا ئاویەکان: گەیشتنی عێراق بە ئاوی کەنداو لەڕێگای ئەو کەنارە تەسکەی کە درێژیەکەی تەنیا (٤٨کم). ئەم هێڵی کەنارە توانای ئابووری و سەربازی زۆر کەم و نالەبارە تا ئەو شوێنەی کە بۆ فراوانکردن و کارایی بەندەرەکان هەروەك بەندەری فاو و بەکر و ئوم قەسر کە لەماوەی دوو تا دوازدە میل لەکەنارەوە دوورە وەزۆرتر ڕۆڵی ترمینالی نەوتی دەبینن.

بە شێوەیەکی گشتی واقعیەت عێراق ئەوەیە کە توانای بەندەری کەمی هەیە و ئەمەش کاریگەری لەسەر ئاستی بازرگانی دەرەکی عێراق هەیە، ئەمەش بۆتەهۆی بادانەوەی بەلای وشکانیدا لەڕێگای سوریا و تورکیا و ئەردەنەوە. سەرەڕای بەندەری بەسرە لەکەنداو، کە چەند جارێك فراوانکراوە، بەندەرێکی تازەیتر لە ئوم قەسریش دروستکراوە تاوەکو فشار لەسەر بەندەری بەسرە کەم بکاتەوە.

بەسەرنجدان لەوەی کە ئاستی گەیشتنی عێراق بە کەنداوی فارس لەسەردەمی جەنگ لەگەڵ ئێراندا زۆر کەم بووەوە، چالاکی بەندەری لەدەیەی نەوەدەکاندا بەشێوەی جدی کەم بووەوە. بەدرێژایی جەنگی ئێران عێراق ئەم ڕووبارە (شەتولعەرەب ـ وەرگێڕ) پڕبۆتەوە لە مادەی تەقینەوە و ئامێر و کەلوپەل و بەلەمی نقومبوو، بۆیە توانای کەڵك لێوەرگرتنی لەبار و کارا نییە، پێش دەستپێکردنەوەی کەشتیوانی لە شەتولعەرەب پێویستە ڕووبارەکە لەبەلەم و کەلوپەلی نقومبوو پاککرێتەوە، ئەم کارەش چەندین ساڵ دەخایەنێت.

سەبارەت بە ڕێگای ئاوی ناوخۆیی، دەوڵەت لەهەوڵدایە کە دیجلە و فورات بە شارێگای سەرەکی گواستنەوە و گەیاندنی وشکانییەوە ببەستێت و پەرەییبدات، بەڵام بەهۆی قورسی و گەورەیی پرۆژەکە و تێچوونی زۆرەوە تا ئێستا سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەست نەهێناوە.

هەڵبەت بە پاککردنەوە و لێدانی کەناڵی کەشتیوانی کە لەبەشێکی ڕووباری دیجلە لەباشوری بەغدا ئەنجام دراوە، توانای گواستنەوە لەئاستێکی سنورداردا لەنێوان بەغدا و عەمارە بەدەستهاتووە.

ڕێگای ئاسمانی : تا ساڵی (١٩٨٨) عێراق دوو فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی هەبوو، لەبەغدا و بەسرە، سێیەمیان لەلایەن کۆمپانیایەکی گەورەی فەرەنسیەوە لەبەغدا دروست دەکرێت. ڕێگای ئاسمانی عێراق پێش هێرشی هاوپەیمانەکان بۆ سەر عێراق پێکهاتبوو لە (٣٠) فڕۆکەی ئەنتونوف و ئایلوشینی ڕووسی و (١٤) فڕۆکەی بۆینگ و ژمارەیەك فڕۆکەی بچوکی نەفەربەر. بەهۆی گەمارۆی ئابووری و قەدەغەکردنی فڕین لەسەر عێراق لەلایەن ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکانەوە، فڕینی فڕۆکەی دەرەکی بۆ ئەم وڵاتە و فڕینی فڕۆکەی عێراقی بۆ دەرەوە تارادەیەك لەکارکەوتووە. هەروەها بەهۆی دروستکردنی ناوچەی دژە فڕین لەباکور و باشوری وڵات، لەڕووی کردارییەوە فڕینی ناوخۆیی وەستاوە.

### قەرز و زیانەکانی هەردوو جەنگ :

جەنگی عێراق ئێران تێچونێکی زۆر لەسەر عێراق کەوت. لەساڵی دووەمی جەنگدا هەموو تێچونەکەی گەیشتە (٢٣,٦) ملیارد دۆلار. لەگەڵ ئەوەی عێراق پێشبینی کردبوو کە جەنگ لەگەڵ ئێران دوای ماوەیەکی کورت تەواو دەبێت و سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت، بەڵام ئەم پێشبینیە هەڵە دەرچوو. بۆ ڕێگرتن لەنارەزایەتی ناوخۆ بەهۆی زەرەری زۆر کە بەر هێزی عێراقی کەوتبوو، حزبی بەعس شێوازی وای هەڵبژارد کە تێچونی زۆری بۆ دروست کرد. ئامانجی ئەوە بوو کە زیانی مرۆیی چ لەبەرەکانی جەنگ و چ لەپشتی بەرەی جەنگ بەکەمترین ئاست بگەیەنێت. لەبەرەکانی شەڕدا حکومەت هەوڵیدا سوودی زیاتر لەئامێری جەنگی وەرگرێت (کە لەهێرشەکاندا زۆربەی ئەوانە لەناوچوون)، هەروەها لەپشتی بەرەکانی شەڕەوە هەزاران دۆلار دەدرا بە خێزانی ئەو سەربازانەی لەشەڕدا دەکوژران. سەرەڕای ئەوە سوود وەرگرتن

لەکرێکارانی بیانی لەجێگای ئەو کرێکارە عێراقیانەی ڕەوانەی بەرەکانی جەنگ دەکران بۆ ئەوەی خەڵکی لەبواری خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی و ئابووری کەموکورتیان نەبێت.

لەبارەی ئەو زەرەر و زیانانەی کە بەر عێراق کەوت لەئەنجامی جەنگی عێراق ئێراندا، ژمارەیەکی وردمان لەبەر دەستدا نییە. بەڵام دامەزراوەیەکی یابانی بە ناوی ئابووری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست توێژینەوەیەکی کردووە لەماوەی ساڵانی (١٩٨٠ تا ١٩٨٥) زیانەکانی عێراقی لەماوەی جەنگدا بە (٢٢٦) ملیارد دۆلار داناوە.

دوای ئەوەی جەنگی عێراق ئێران بۆ جەنگێکی فراوان گۆڕا و یارمەتی وڵاتانی کەنداو بەهۆی دابەزینی نرخی نەوتەوە لەدەیەی هەشتاکاندا کەمبۆوە. عێراق بۆ دابینکردنی تێچوونی قورسی جەنگ ڕوویکردە وڵاتانی ڕۆژئاوا. لەساڵی (١٩٨٨) ئامارێکی وردمان لەبارەی قەرزەکانی عێراقەوە لەبەردەستدا نییە، بەڵام پسپۆران پێیانوابوو کە لەساڵی (١٩٨٦) ڕێژەی قەرزەکانی سەر عێراق گەیشتۆتە (٥٠) ملیارد دۆلار. ئەم بڕە تا (٨٠) ملیارد دۆلاریش چاوەڕوان دەکرێت. نزیکەی (٣٠) ملیارد دۆلاری قەرزی عەرەبستانی سعودی و کوێت و باقی میرنشینەکانی کەنداوە کە بەشێکی زۆری ئەمانە دروست بووە بەهۆی فرۆشتنی نەوتی خاوەوە لەبەرژەوەندی عێراق.

تێکچونی هاوسەنگی تەرازووی بازرگانی عێراق لەدەیەی نەوەدەکاندا بووەهۆی ئەوەی ئەم وڵاتە زۆرتر پەنا بۆ پێویستی دەرەکی بەرێت بە مەبەستی پڕکردنەوەی کەموکوڕیەکانی. هەندێك لەقەرزپێدەرانی ڕۆژئاوا بە مەبەستی ئەوەی حکومەت عێراق لەڕووی ئابووریەوە خۆی لەسەر پێ ڕاگرێت تاوەکو بتوانێت قەرزەکانیان بۆ بگێڕێتەوە بەردەوام بوون لەسەر قەرز پێدانی ئەم وڵاتە، بەڵام هەندێك لەوانە وردەوردە خۆیان لەبازاڕی عێراق کێشایەوە و هەندێك لەقەرزەکانیان هەڵپەسارد.

کشانەوەی ئەو وڵاتانە بووەهۆی ئەوەی وڵاتانی وەك کۆریای باشور، بەرازیل، هندستان، یۆگۆسلاڤیا و تورکیا لەهەوڵی بە پەلەدابن بۆ پڕکردنەوەی شوێنی ئەو وڵاتانە و کاڵاکانیان بنێرن بۆ عێراق، یەکێتی سۆڤێتیش قۆڵی لێهەڵماڵی لەڕێگای شمەك و کارگوزاریەوە قەرزی درێژخایەن بە عێراق بەخشی.

لەگەڵ دەستپێکردنی جەنگی دووەمی کەنداو قۆناغێکیتر لەزەرەرو زیانی گەورە بەر عێراق کەوت. لەم جەنگەدا زۆر لەدەزگا و دامەزراوە سەرەکیەکانی ئەم وڵاتە وێرن بوو، لەگەڵ دەستپێکردنی گەمارۆی ئابووی نەتەوە یەکگرتووەکان لەسەر عێراق، هەموو بەشە ئابووری و خزمەتگوزاریەکان وڵات توشی زەرەری گەورە یان کاولبوون بووەوە.

## ئاسۆیی ئایندەی ئابووری عێراق :

بەشـێوەی گـشتی لـەماوەی بیـست سـاڵی جـەنگ و گـەمارۆی ئـابووری ڕێکخـراوی نەتـەوە یەکگرتوەکان ئەو زەرەرەی بەر عێراق کەوتووە زیاترە لـە (١٠٠٠) ملیـارد دۆلار، ئەمـەش چـەندان سـاڵی پێویستە تا بارودۆخی ئابووری عێراق بگەڕێتەوە باری ئاسایی خۆی.

ئابووری عێراق لەگەڕانەوەی بـۆ بـازاڕی جیهـانی نـەوت، بـەخێرایی دەگۆڕێـت بـۆ هاوردەکـارێکی گرنگی بەرهەمی کشتوکاڵی و پیشەسازی.

لەئێـستادا، (سـاڵی ٢٠٠٢ ـــ وەگێڕ) ئاینـدەی ئـابووری عێـراق نائمێـدوارە. هـەتا کۆتایهـاتنی گەمارۆی ئابووری ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان دواکەوێت، پیشەسازی و ژێرخانی ئابووری و کشتوکاڵی ئەم وڵاتە وێرانتر دەبێت و عێراق لەئایندەدا زۆرتر دەکەوێتە ژێر دەسـەڵاتی هێـزە دەرەکیەکانـەوە. کاتێـك گەمارۆی ئابووری نەمێنێت، عێراق بنیاتنان و پەرەپێدانی پیشەسازی نەوت کە زەرەری زۆری بەرکـەوتووە دەخاتە ئەولەویەتی کارەکانیـەوە، چونکە ئـەم پیـشەسازیە بـە گـرنگترین و تاکـە سەرچاوەی دابنکردنـی دەرامەت بۆ بنیاتنانەوە و پەرەپێدانی بوارەکانیتر دەژمێردرێت.

سروشتیە کە عێراقێکی لاواز، لەهەنگاونانی بـۆ بەرهـەمهێنان و فرۆشـتنی هەرچـی زیـاتر نـەوت ئەگـەر لەچوارچێـوەی بەرنامـەی نۆێیکـدا نـەبێت، سیـستەمی کـاری لەناوچـەکەدا ڕووبـەڕووی مەترسـی دەکاتەوە. هەروەها دوای کۆتایی هاتنی گەمارۆی ئابووری، عێراق بە جدی هەوڵی خـۆی دەخاتـە کـار بـۆ بنیاتنانەوەی تایبەتمەندی خۆی و هەڵوەشاندنەوەی بڕیارە سەپێنراوەکان بەسەریدا.*

## بارودۆخی عێراق لە سەردەمی جەنگی سارددا :

تا پێش دەیەی حەفتاکان، عێراق بـەهۆی سـنوری ئـاوی کەنـداوی فارسـی، شـوێنە جوگرافیەکـەی نەیتوانی لەشەڕی عەرەب ئیـسرائیلدا وەك وڵاتانی میسر، سوریا و ئەردەن ڕاستەوخۆ بچێتە جەنگەوە، لەو گرنگیە تایبەتەی هەیەتی سوودمەند نەبوو، لەڕاسـتیدا ڕۆڵی (پەراوێزی) بینی. تەنیا لەدەیەی حەفتاکانـدا بوو دوای گەمارۆی ئابووری نەوتی عەرەبی لەسـاڵی (١٩٧٣) و زیادبوونی دەرامەتی نەوتی، هەوڵیـدا وەك هێزێکی هەرێمی دەرکەوێت.

بۆ گەیشتن بەو ئامانجە لەڕێگای واژۆکردنی پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ یەکێتی سـۆڤێت پێشوو، هەوڵیدا سوپای عێراق کـە تـا ئـەو کاتـە وەك سـوپایەکی دژەشـۆرش دەژمێـردرا بـە دەسـتی دەسـەڵاتەوە ڕێکبخات، لەبەر ئەم هۆیە چـەکی زۆری کـڕی و یەکـەی زرێپۆشـی و لوجـستی لەسـوپادا لەسـەر بنـەمای پەروەردەی سوپای ڕووسی دامەزراند.

---

*) ئەمە ڕاستە هەروەك دەبینین ئێستا عێراق دوای هەڵوەشاندنەوەی زۆریەی بڕیارەکان لەهەوڵی جدیدایە بۆ دەرچوونی لە بەندی ژمارە (٧) . وەرگێڕ.

سێ ڕووداوی گرنگ لەساڵانی (١٩٨٠-١٩٨٧) لە ناوچەکە بووەهۆی دەرکەوتنی سەرۆکی عێراق بۆ گەیشتن بە دەسەڵاتێکی هەرێمی لەناوچەکە و زەمینەی گونجاوی ڕەخسان بۆ گەیشتن بەم ئامانجە، ئەو سێ ڕووداوە گرنگە بریتیبوو لە:

* ڕێکەوتننامەی کامپدیڤد لەنێوان میسر و ئیسرائیل، کە بووە هۆی گۆشەگیرکردنی میسر لەجیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا. لەکاتێکدا میسر وەك گرنگترین وڵاتی جیهانی عەرەب وابوو، بەشێوەی کاتی پێگەی خۆی لەدەستدا، لەبەر ئەوە بۆشایی باشتر بۆ مانۆڕی سیاسی عێراق دروست بوو.

* داگیرکردنی ئەفغانستان لەلایەن یەکێتی سۆڤێتی پێشووەوە، کە عێراق تارادەیەك ناڕازی بوو لەم هێرش و داگیرکاریە، ئەمەش وایکرد متمانەی وڵاتانی ڕۆژئاوا زورتر بەلای خۆیدا ڕاکێشێت.

* سەرهەڵدانی شۆڕشی ئیسلامی لەنێران لەساڵی (١٩٧٩) کە لەهەموو ڕووداوەکانیتر گرنگتربوو، وە بووە هۆی بەریەککەوتنی تەرازوی هێز لەناوچەکەدا بەتایبەت لەنێوان ئێران و عێراقدا. عێراق لەهەوڵدا بوو لەم بەریەك کەوتنی هێزانە سوود وەرگرێت، هەرلەبەر ئەمەبوو هێرشی خۆی دەستپێکرد بۆ سەر ئێران لەپێناوی بەدەستهێنانی دەسەڵات بەسەر هەموو شەتلعەرب و ناوچەی خوزستان کە پێویست بوو بۆ گۆڕینی بۆ هێزێکی هەرێمی. جەنگی هەشت ساڵە، لەگەڵ هەڵبەزوودابەزیەکەیدا لەکۆتایدا نەیتوانی ئامانجەکانی عێراق بەدەست بهێنێت. ئەم وڵاتە هەروەك چۆن لەسەرەتای جەنگدا گەیشتنی بە ئاوی نێودەوڵەتی سنوردا بوو، وە بۆ پەیوەندیکردن بە جیهانی دەرەوە و گواستنەوەی نەوت و کاڵا پیشەسازیەکان ناچار بوو وابەستەی تۆڕی گواستنەوە و گەیاندنی وڵاتانی دراوسێ بێت.

لەجیاتی وەگرتنی وانە و عەقڵ بەهۆی سەرنەکەوتنی لەجەنگدا و پیشاندانی نیەت پاکی لەسیاسەتی دەرەکیدا دوای کۆتاییهاتنی شەڕ ئامانجی بەدەستهێنانی ڕێبەرایەتی ناوچەکە لەلایەن عێراقەوە هەر بەردەوام بوو، بۆیە ئەمجارەیان پەلاماری کوێتیدا و ئەم لەشکرکێشیەش کێشەیەکی گەورەی بۆ ئەم وڵاتە دروست کرد. هەرچەندە تێکشکانەکانی عێراق بووەهۆی پاشەکشێکردنی لەمەیدانی هەرێمی و نێودەوڵەتیدا، بەڵام لەبەرئەوەی عێراق هەمیشە وەك ئەکتەری سیاسیە خاوەنی بایەخ و گرنگی خۆیەتی بۆیە عێراق بۆ گەیشتن بە هێزێکی هەرێمی هەنگاویتری ناوە کە هەندێکیان ئاماژەی بۆ کراوە.

## پێشکەوتنی عێراق لە بواری چەکی ئەتۆمیدا:

یەکێك لەئامانجەکانی حیزبی بەعس دوای گرتنەدەستی دەسەڵات لەعێراق، گۆڕانی بوو بۆ دەسەڵاتێکی خاوەن ئەتۆم لەناوچەکەدا. لەم بوارەدا بە درێژایی جەنگی ئێران عێراق، پێشکەوتنی باشی بەخۆیەوە بینی. بەتێڕوانین لەوەی کە سەرچاوەی زانیاری ڕۆژئاوا لەبەردەستی چالاکی ئەتۆمی عێراقدا بوو، هیزی ئەتۆمی ئەم وڵاتە یەکەمجار لەسەرەتای جەنگی عێراق ئێراندا لەلایەن فڕۆکە ئیسرائیلیەکانەوە بۆردمان کرا، بەڵام دوای بنیاتنانەوەی دەرکەوت بۆ دەستەیەك لەرێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان کە

عێراق زۆر لەوە زیاتر کە چاوەڕوان دەکرێت گەشەی داوە بە چەکی ئەتۆمی. بەپێی بۆچوونی هەندێك لەپسپۆرانی سیاسی و سەربازی، ئەگەر هێرشی هاوپەیمانان بۆ سەر عێراق ئەنجامنەدرایە و پشکنینی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان لەم ولاتە بەدوای مەسەلەی ئەتۆمی نەبوایە، ئەم ولاتە بەزوویی دەبوو بە خاوەنی چەکی ئەتۆمی.

باریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا ئاشکرایکرد، کە ڕژێمی عێراق بۆ دروستکردنی چەکی ئەتۆمی و جێگیرکردنی تەنیا (٢ تا ٨) مانگی پێویستە و سوودی لەبارمەتی (١٥٠٠٠) پسپۆری ئەتۆمی وەرگرتووە.

مك جۆرج باندی کە یەکێك بوو لەڕاوێژکارانی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمەریکا، سەبارەت بە پرۆژەی چەکی ئەتۆمی عێراق و بارودۆخی ناوچەکە دەریدەخات کە ئۆپەراسیۆنی گەردەلولی بیابان، دنیای ئەتۆمی بە ئاراستەیەك سازدا و بەرەو دنیایەکی ئامنتر و جێگیرتر برد. لەم بارەیەوە هێزی هاوپەیمانان لەکاتی هێرشی ئاسمانیدا بۆ سەر عێراق بۆردومانی بنکەی ئەتۆمی عێراق بوو بە یەکێك لەئامانجە سەرەکیەکانیان. سەرەڕای ئەوەش عێراق لەبواری تەکنەلۆجیای سەربازیدا پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆیەوە بینیبوو. ئەم کارەش بووەهۆی ئەوەی زەمینە بۆ بەدەستهێنانی چەکی ئەتۆمی لەڕێگای بەکارهێنانی کۆمپیوتەرەوە زۆر پێشکەوتوو بوو بۆ ئەنجامدانی ژمێریاری پەیوەست بە خێرایی و وردی زیاتر سود لە تەکنەلۆجیای تازە وەرگیرا کە لەبنکە و تیشکی لیزەر بۆ پیتاندنی یۆرانیۆم سوودوەرگیرا.

## پێشکەوتنی عێراق لەبواری چەکی کیمیایی و بایەلۆجیدا :

یەکێکیتر لەو دەزگایانەی کە عێراق بۆ بەدەستهێنانی بالادەستی ناوچەیی هەوڵی بۆ دەدا، چەکی کیمیایی و بایەلۆجی بوو، هەوڵەکانی لەبواری دەسکەوتنی ئەم چەکە ئاسانتر بوو بە بەراور بە چەکی ئەتۆمی. لەماوەی جەنگی عێراق ئێراندا، عێراق بەشێوەی بەرفراوان ئەم چەکەی دژی هێزەکانی ئێران و کوردەکانی عێراق بەکارهێنا، بە شێوەیەك کە لەکاتی بەکارهێنانیدا لەشاری هەڵەبجە هەموو ئەوانەی لە شارەکە مانەوە شەهید بوون، لە ئەنجامی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەلایەن عێراقەوە، مەسەلەی چەکی کیمیایی وەك چەکی کۆکوژ بەکارهێنانی بەپێی پرۆتۆکۆلی جنێف (١٩٢٥) قەدەغەکراوە، بۆ جارێکیتر هەوڵدرا لەکۆنفرانسی چەك دامالین لەجنێف، کۆنفرانسێك ببەسترێت بە مەبەستی قەدەغەکردنی ئەم چەکە. بەلام تا ئەو جێگایەی کە لەو کاتەدا لەدژی بەرژەوەندی زلهێزەکان بوو، ئەم دانوسانە بە ئەنجام نەگەیشت.

دوای ئەوە چەندین هەنگاویتر بۆ قەدەغەکردنی بەکارهێنانی ئەم چەکە لەلایەن فەرەنسا و ئوستralیاوە نرا، کە ئەنجامێکی ئەوتۆی نەبوو، بەلام لەدوایدا لەژێر فشاری گشتی نێودەوڵەتیدا کۆنفدراسیۆنی کۆمەڵی بۆ هەڵوەشاندنەوەی تەواوی ئەم چەکە بەسترا.

لەئەنجامی کرداری پشکنین لەعێراق، دەرکەوت کە ئەم وڵاتە چالاکی بۆ بەدەستهێنانی چەکی بایەلۆجی هەبووە. بەپێی ئەو لێکۆڵینەوانە دەرکەوتووە کە پێنج وڵاتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست خاوەنی چەکی بایۆلۆجین کەیەکێك لەو وڵاتانە عێراقە.

## پێشکەوتنی عێراق لەبواری موشەکی دوورمەودا :

لەم دوو دەیەی دوایدا گواستنەوەی تەکنەلۆجیای موشەکی دورمەودا لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست تایبەتمەندی خۆی هەبوو. عێراقیش لەو وڵاتانەی ناوچەکە بوو کە سوودی لەگواستنەوەی ئەم تەکنەلۆجیایە وەرگرت و لەرێگای هاوکاری وڵاتانی وەك ڕووسیا، ئەرجەنتین و میسردوە. بە جۆرێك کە ئەو پێشکەوتنەی لەم بوارەدا بەدەستیهێنا بوو، لەکاتی جەنگی عێراق ئێران دژی شارە گەورە و بچوکەکانی ئێران بەکاریهێنا، لەکۆتایی جەنگدا کاریگەری گەورەی لەبەرژەوەندی عێراق هەبوو. هەروەها لەجەنگی دووەمی کەنداو عێراق هەوڵیدا لەرێگای بەکارهێنانی ئەم چەکەوە ئامانجەکانی لەئیسرائیل و عەرەبستانی سعودی بپێکێت.

بە شێوەیەکی گشتی لەکۆتایی جەنگی عێراق ئێران و لەئەنجامی ئەو پێشکەوتنەی عێراق لەبواری پەرەپێدانی چەکی ئەتۆمی، کیمیایی، بایەلۆجی و موشەکی دورمەودا بەدەستیهێنا بوو، ئەم وڵاتەی وەك هێزیکی هەرێمی دەرخست، بەجۆرێك ئەگەر لە جەنگی دووەمی کەنداو نەشکایە و چاودێری و پشکنینی چەکەکانی و تێکشکاندنی نەکرایە، ناوچەکە و ئێران ڕووبەڕووی کێشەی زۆر دەبوونەوە.

## شوێنی عێراق لەجیۆستراتیجی وشکانی پێش کۆتاییهاتنی جەنگی سارد :

پێش هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤێت، عێراق وەك باڵی ڕاستی یەکێتی سۆڤێت بوو، کە وەك فشار بۆ سەر ڕۆژئاوا لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەردەکەوت، جیۆستراتیجی یەکێتی سۆڤێت لەسەر ئەو بنەمایە جێگیر ببوو کە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەدوو لاوە (باڵەوە) گەمارۆ بدرێت. باڵێکیان ئازەربایجانی ئێران، عێراق، سوریا، ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاستە و باڵەکەیتر ئەفغانستان، ئێران و دەریای عومان تا گەرووی هورمز دەخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە.

عێراق و سوریا دوو وڵاتی گرنگ بوون لەستراتیجی یەکێتی سۆڤێتی پێشوودا، کە بە بەڵگەی جیۆستراتیجی بوونەتە شوێنی پارێزگاریکردنی ئەم زلهێزە. لەکۆتایدا لەلایەن عەرەبەکان بەبەڵگەی جیوپۆلەتیکی کە زۆرتر لەمەسەلەی پەیوەند بەکوردەکانەوە سەرچاوەدەگرێت گرنگیان زیاتر بوو. بەهەمان ئاراستە نفوزی تیۆری سەربازی عێراق بۆ یەکێتی سۆڤێت جێگای سەرنج و گرنگی بوو، هەوڵیدەدا کە بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی خۆی گۆڕانکاری پێویست لەم تیۆرەدا ئەنجامبدات.

لەتیۆری سەربازیدا زیاتر لەچوار بابەت جێگای سەرنج بوو کە بریتیبوو لەشوێنی جوگرافی، توانای سوپایی، ئامادەکردنی چەك و کەلوپەل و ڕاهێنان.

بە سەرنجدان لەوەی کە شوێنی جوگرافی عێراق پێکهاتووە لەبەرزیونزمی و دەشتایی، بەهێزکردنی هێزی زرێپۆشی عێراق زیاتر دەکەوێتە ژێر چاودێری رووسیەکانەوە. بۆیە عێراق لەرووی توانای زرێپۆشی و ژمارەی تانکەوە بووە یەکێك لەولاتە بەهێزەکانی رۆژهەلاتی ناوەراست، بەجۆرێك ئەم ولاتە بووە خاوەنی (٢٠٠٠) تانکی رووسی، لەگرتنەبەری ئەم سیاسەتە، رووسیەکان هەموو تێبینیە ستراتیجیەکانیان لەبەرچاوگرت بەشێوەیەك لەبارودۆخێکی قەیراناویدا رووسیەکان ئەو توانایەیان هەبوو کە کەموکورتی عێراق لەکاتی پێویستدا پربکاتەوە.

لەلایەکیترەوە بەهۆی کەمی کەناراوی عێراق لەسەر کەنداوی فارسی، چەك و کەرەسەکان بەجۆرێك دابنکران کە لەگەڵ بارودۆخی جوگرافی ئەم ولاتەدا بگونجێت. بەم هۆیەوە سوپای عێراق رووە و هێزی وشکانی و ئاسمانی رۆیشت بەهۆی پێویستی ستراتیجی هەموو شتێك لەخزمەتی هێزی وشکانیدا بوو. راهێنانی هێزەکان چ لەرووی تاکتیك و چ لەرووی تەکنیکەوە بەپێی بنەمای پەروەردەی هێزی رووسی راهێنران.

هەنگاوێکیتر کەنرا هاوناهەنگی نێوان ئامانجی ستراتیجی و ئامانجی جیوپۆلەتیکی بوو. لەکاتێکدا لەرابردوودا کوردەکان وەك ئامرازی دەستی رووسەکان بوون*، بەلام لێرەدا یەکێتی عێراق بۆ یەکێتی سۆڤێت گرنگی تایبەتی خۆی هەبوو. ئەم هەلە بۆ رژێمی عێراق دروست بوو کە بەئارەزووی خۆی کوردەکان سەرکوت بکات و لەناویان بەرێت. ئەم سیاسەتە بەتەواوی لەگەڵ سیاسەتی رۆژئاوا و بەتایبەتی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ مانەوەی یەکێتی خاکی عێراق هاورابوو، لەبەرامبەر ئەمەدا عێراق و روسیا کۆمەکی کوردەکانی ئێرانیان دەکرد. بەشێوەی گشتی بەپێی ئەوەی هەرلایەکیان کاریگەری لەسەر جیوپۆلەتیکی ئەویتر هەیە، لێرەدا ناکۆکی لەنێوان جیوپۆلەتیك رۆژئاوا و جیۆستراتیجی رۆژهەلات دەکەوت.

---

* ) کورد هیچ وەختێك ئامرازی دەستی رووسەکان نەبووە، بەپێچەوانەوە ئەوەندەی کورد لەدەستی روسیا و یەکێتی سۆڤێت زەرەری کردووە ئەوەندە قازانجی نەکردوە، بەلام نوسەر ئەم ئاماژەیەی زۆرتر بۆ سەردەمی کۆماری مهابادە، هەرچەندە کوردەکان لەو سەردەمەش هەر لەلایەن رووسەکانەوە پشتیانتێکرا و لەبەرامبەر سوپای ئێرانی بێپشت و پەنا مانەوە ـ وەرگێر.

## توێژینەوە لەڕۆڵی جیوپۆلەتیکی عێراق لەسیاسەتی دەرەوەی ئەو وڵاتەدا:

عێراق وەك یەکێك لەوڵاتە گرنگەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، خاوەنی گرنگی جیوپۆلەتیکی تایبەتە. ئەم وڵاتە کەوتۆتە یەکێك لەگرنگترین شوێنە جوگرافیەکانی جیهانەوە. لەقوناغی جیاوازی مێژوودا جێگای سەرنجی کۆمەڵی جیهانی بووە، بەتایبەتی زلهێزەکانی جیهان.

هەڵکەوتەی جوگرافی کەبریتیە لەڕووبەری زەوی، بەرزیونزمی، ئاووهەوا، شوێنی وڵات و شێوەی زەوی، لەڕاستیدا بەیەکێك لەبنەما گرنگەکانی هێز دەژمێردرێت. هەندێك لەبیرمەندان و زانایانی زانستی جیوپۆلەتیك کە زانیاریان لەسەر بارودۆخی جوگرافی و سیاسی وڵاتان هەیە. لەوبڕوایەدان کە بارودۆخی جوگرافی لەڕاستیدا هەموو سیاسەتی وڵاتێك دیاریدەکات. لەوانە دەتوانین ئاماژە بۆ ماکندەر لەبەریتانیا و هاوسهۆفەر لەئەڵمانیا بکەین.

هەروەها پسپۆران و زانایانیتری بواری سیاسەت لەوانە جوگرافیزانی سیاسی بەناوی (سپایکمن)، پرۆفیسۆر (هانسمورگانتا) و توێژەری ئەڵمانی (ڕۆدلف ئاشتاین) و (گیروفیشر) هەڵکەوتەی جوگرافی وەك یەکێك لەو فاکتەرانە دادەنێن کە هێزی وڵاتی لەسەر بیناکراوە.

ناپلیۆنیش لەوبڕوایەدایە کە سیاسەتی دەرەوەی هەر وڵاتێك بەپێی بارودۆخی جوگرافی ئەو وڵاتە دیاریدەکرێت.

بەپێی ئەم بۆچونانەی سەرەوە دڵنیاین، کە فاکتەری جوگرافی لەدیپلۆماسی و ستراتیجی جەنگدا کاریگەری هەیە و بەهۆی ئەوەوە دەتوانین پێشبینی بکەین کە ئایا خاکی وڵاتێك دەبێتە مەیدانی ململانێ یا وەك سەرزەمینێك دەبێتە جێگای ڕێزگرتن.

وڵاتی عێراق لەڕووی پێگەی جوگرافی تایبەتی خۆیەوە، هەم سەرنجی ئەوانیتری بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە و هەم بۆتەهۆی دروستکەری ڕوودا و کارەسات کە ڕاستی بۆچوونی لایەنگرانی جیوپۆلەتیك دەسەلمێنێت.

## جیوپۆلەتیك و نەوت:

بوونی یەدەگی نەوت لەعێراق لەگەڵ شوێنی جیوپۆلەتیکی عێراق لەسەر ئاستی ناوچەکە و دەوروبەر گرنگی زۆری پێبەخشیوە. عێراق وەك یەکێك لەوڵاتانی ناردنەدەرەوەی نەوت، دەتوانێت کاریگەری زۆری لەسەر بازاری جیهان هەبێت و هەروەها بۆ بەگەڕخستنی پیشەسازی ئەو وڵاتانەی پێویستیان بەنەوتە فرۆشیارێکی سەرەکیە. نەوت خوێنی پیشەسازی مودیرنە، عێراق کەوتۆتە گرنگترین ناوچەی نەوتیەوە کە دەتوانین وەك بەشێك لەدڵی ناوچەی کەنداوی فارس ئەم خوێنە بسوڕێنێت. بەهۆی بوونی سەرچاوەی گەورەی نەوت لەعێراق، ئەو توانایەی بە عێراق بەخشیوە کە بتوانێت لەگۆڕانکاریە جۆراوجۆرەکاندا کە لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ڕوویداوە ڕۆڵی هەبێت. نەوت بۆتە هۆی دروست بوونی هەندێك

لەوڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، نەوت کاریگەری هەبووە لەسەر دیاریکردنی سنوری سیاسی لەوشکانی و لەناودا. چونکە نەوت لەبەهێزکردنی ناهاوسەنگی جوگرافی دەرامەت ڕۆڵی گەورەی بینیوە، لەگۆڕانی هاوسەنگی هێز لەناوچەکە زۆر کاریگەر بووە. جارێك بزوێنەری ناکۆکی نێوان دراوسێکان و جارێك بۆتە جێگای هاوکاری لەناوچەکەدا، نەوت کە بەشادماری ژیانی بەشێك لەقۆناغی نوێی پیشەسازی دەژمێردرێت، بۆیە گرنگیەکی نێودەوڵەتی بەم ناوچەیە بەخشیوە.

لەخاکی عێراقدا (بەهۆی زۆر بیرەکان و کەمی قوڵیان و ڕێژەیەکی زۆر لەڕووبەرێکی بچوکدا، کنەو پشکنین و گەڕان بەدوای نەوتدا تێچوونی کەمە) و هەروەها (توانای بەرهەمی چاڵە نەوتەکان زۆر بەرزە) بۆنموونە لەعێراق تێکڕای ناوەندی بەرهەمی هەر چاڵە نەوتێك (١٣٤٨٠) بەرمیل نەوتە لەڕۆژێکدا، لەبەرامبەردا تێکرایی بەرهەمی چاڵە نەوتێك لەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا تەنیا (١٧) بەرمیل نەوتە لەڕۆژێکدا.

## گرنگی جیوپۆلەتیکی عێراق :

سێر ویلسون فەرمانداری گشتی سیاسی ناوچەکە لەساڵانی داگیرکردنی عێراق لەلایەن بەریتانیاوە، سەبارەت بە گرنگی ستراتیجی عێراق وتویەتی «کلیلی تەواوی ناوچە ستراتیجیەکان لەبەغدایە و ئێمە بە داگیرکردنی عێراق توانیمان خەنجەر لەجیهانی ئیسلام بدەین و بەم ڕێگایە دەتوانین ڕێبگرین لەکۆبوونەوەی موسڵمانان لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەدژی ئێمە. بۆ ئێمە سەلمێنراوە کە سیاسەتی ئێمە لەکاتی ئاشتیدا دەبێت پارێزگاری لەم وڵاتە بکەین، چونکە بۆ ئێمە (میسۆپۆتامیا) وەك بزمارێك وایە، کە چاودێری هەموو وڵاتانی ژێردەستی بەریتانیا لەناوچەکەدا دەکات. بۆیە نابێت لەگەڵ وڵاتانی عەرەبی یان وڵاتانی ئیسلامی یەکبگرێت، بەڵکو دەبێت بە ئەندازەی پێویست لەوانەوە دووربێت».

وادەبینرێت ئەمڕۆش ڕۆژئاوا و لەسەروویانەوە ئەمەریکا توانیویەتی پەی بە گرنگی ستراتیجی و شوێنی جوگرافی عێراق بەرێت و بەهەمان ئاراستە ڕێبگرێت لەیەکێتی نەتەوەیی مسلمانەکانی ناوچەکە، تاڵانی و باڵادەستی بەسەر سەرچاوەکانی نەوتدا لەکەنداوی فارس، بە تاکتیك و شێوەی جۆراوجۆر عێراقی توشی زەلیلی و داماویکردووە و هەوڵدەدات کە عێراق وەك وڵاتێکی نەفرەتلێکراو لەناو وڵاتانی ناوچەکە پیشانبدات و بەم شێوەیە ئەو بزمارەی کە دەتوانێت چاودێری هەموو وڵاتانی ناوچەکە بکات، کۆنترۆڵی بکەن.

لەدوای جەنگی دووەمی کەنداو و تێکشکانی عێراق لەلایەن هێزی هاوپەیمانانەوە بە سەرۆکایەتی ئەمەریکا، عێراق دووبارە وەك ناوچەیەکی ستراتیجی بۆ ڕۆژئاوا کەوتە ژێردەست و کۆنترۆڵی ئەوانەوە، بۆئەوەی لێرەوە بگەن بەم ئامانجانەی خوارەوە:

١) کۆنترۆڵی ئاشتی عەرەب ئیسرائیل.

٢) ڕێگرتن لەکاری ویستی عێراق بۆ نرخدانان و خستنەڕووی ڕاستەوخۆی نەوت.

٣) پیشاندنی عێراق وەك سەرچاوەی مەترس تا بەوهۆیەوە بۆ هەمیشەیی لەناوچەکە بمێننەوە.

٤) ڕێگرتن لەبڵاوبوونەوەی شۆڕشی ئیسلامی ئێران کەوەك مەسەلەی کۆتایی و چۆنیەتی فشار خستنەسەر کۆماری ئیسلامی لەناوچەکە دەتوانین ئاماژە بۆ:

- بوونی ئەمەریکا لەناوچەی کەنداوی فارسی و ئامادەیی لەسەر بەشێکی خاکی عێراق لەوانە لەناوچەی کوردنشینی باکوری عێراق.

وا دەبینرێت لەچەندین لاوە، کوردستانی عێراق دەتوانێت زەمینەسازی و ڕێخۆشکەری ئەمەریکا بێت لە ناوچەکە لەم ڕێگایانەی خوارەوە:

١) بەهێزکردنی ناسیۆنالیزمی کوردی و بەڵێنی دروستکردنی (کوردستانی گەورە) و سەربەخۆیی کوردەکان لەلایەن ئەمەریکاوە و لەئەنجامدا فشار خستنەسەر وڵاتانی ناوچەکە.

٢) هەژاری فەرهەنگی: نەخوێندەواری یان کەم خوێندەواری زۆربەی خەڵکی کورد نەبوونی فەرهەنگێکی بەهێز لەناو خەڵکیدا، زەمینەیەکی لەبار بۆ جێبەجێکردنی پلانەکانی ئەمەریکا دێنێتەدی.*

٣) نیشتەجێبوونی کوردەکان لە نزیك سنورەکان و دوریان لەناوەندەوە وایکردووە کە دوژمنانی عێراق بتوانن بە ئاسانی بچنەناویانەوە و لەڕێگای سۆز و هەستەوە ئەمانە دژی حکومەتی ناوەندی هانبدەن و ناوچە سنوریەکان بۆ وڵاتانی دراوسێش ناتارام بکەن.

هەنگاوەکانی ئەمەریکا دوای جەنگی دووەمی کەنداو بووە هۆی گەڕانەوەی ئاسایش بۆ کوردستانی عێراق و هەروەها دیداری سەرکردە کوردەکان لەگەڵ سەدام حسین، بەلای هەندێکەوە گومانی دروستکرد، کەدوای چەند مانگێك کوردەکان ڕێکخران و کوردوستانێکی سەربەخۆ دروست بوو.

هەروەك چۆن کەسێکی سادە، بێئاگایە لەمەسەلە ئاڵۆزە جیوپۆلەتیك و میکانیزمی سیستەمی جیهانی. لەبەرئەوە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئاگادارە کە دروستکردنی کوردستانی سەربەخۆ بەواتای بەدیهێنانی زەمینەیەك بۆ گۆڕانکاری لەسنورەکان و زنجیرەیەك کردار و پەرچەکردار کە هەموو

---

* ) ئەوەی کەوایکردووە کوردەکان ئومێدیان بە ئەمەریکا بێت، ئەوە نەخوێندەواری و هەژاری فەرهەنگی کوردەکان نییە، بەڵکو ئەوە دڕندەی ڕژێمە ناسیۆنالستی و فاشیەکانی عێراق و ئێران و تورکیا و سوریایە کە بەشێوەیەکی نامرۆڤانە و نائینسانیانە هەڵسوکەوت لەگەڵ هاوڵاتیە کوردەکانی خۆیاندا دەکەن، کەهەتا مافی قسەکردن و خوێندنیش بەزمانی دایك بەکوردەکان ڕەوانابینن، ئومەر ئەگەر وەك کەسێکی بێلایەن سەردانێکی ناوچە کوردیەکانی کوردستانی ئێران بکات دەزانێت ئەو ناوچەیە لە هەرێمێکی کۆلۆنیال دەچێت نەك لەبەشێك لەخاکی ئێران سەبارەت بە سوریا و تورکیا ئەو خراپترە. بەڵام عێراق لەدوای شەری کەنداوی دووەم و تاڕادەیەك ئازادی بەدەست هێنا لەبەشێکیدا و دوای ڕوخانی سەدام باروتۆخەکە گۆڕانی بەسەردا هاتووە بەڵام هێشتا بەتەواوی ئومێد بەخش نییە، ئەگەر کوردەکانی بەشەکانیتریش چاویان لەدەستی ئەمەریکابێت ئەوا ئومەر و هەموو هاوڵاتیەکی ئێرانی و تورکی و سووری دەبێت بزانێت ئەوە تاوانباری سەرەکی حکومەتەکانیانە نە هەژاری فەرهەنگی کوردی ـ وەرگێڕ.

ولاتـانی ڕۆژهـەلاتی ناوەڕاسـت تابەشـێك لەباشـوری ڕووسـیا و ڕۆژئـاوا و ڕۆژهـەلات دەریـای قـەزوین دەگرێتەوە.

خالێکیتر کە پێویستە لەبارەی گرنگی جیوپۆلەتیکی عێراق بەلای ڕۆژئاواوە بووترێت ئەوەیـە کـە (ئەگەر لەسەر نەخشە سەیر پێکهاتەی نەتەوە مسلمانەکان بکەین، ئەوا عێراق کەوتۆتە ناو دلّی جیهـانی ئیـسلامی و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستەوە و لەڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دوو ڕەوتی هەیە، یەکێکیان نەتەوەی عەرەب و ئەویتریان ناعەرەب وەك تورك، فارس و کورد، تەنیا ناوچەیەك کە ئەم دوو ڕەوتە بەیەکەوە ببەستێتەوە عێراقە).

لەو ڕووەوە کە عێراق خالّی پێکەوە گرێدانی نەتەوە عەرەبەکان و نـا عەرەبیـەکان بـووە و دەبێت، لەئەنجامی لێکۆلّینەوە لەم پەیوەندیە، هەروەك سـەرەتای ئیسلام لەوانەیـە پەیوەندیـەکی قـوڵی هـەبێت و هەرەشـەبێت بـۆ سـەر بەرژەوەنـدی ڕۆژئـاوا لەناوچـەکەدا، بـۆ ڕۆژئـاوا گرنگـی جیوپۆلـەتیکی ناوچـەکە و لەناویشیاندا عێراق زۆرتر دەبێت.

* * *

بەسەرنجدان لەتایبەتمەندی گشتی جیوپۆلەتیکی عێراق وەك لەپێشەوە باسکرا، دەتوانیین بگەینـە ئەو ئەنجامەی کە عێراق شوێنی جیوپۆلەتیکی گرنگی لەناوچەکەدا هەیـە و بەوپێیـە عێـراق نـەك تـەنیا لەناوچەکە دەتوانێت ڕۆلّی سەردکی بگێڕێت، بەلّکو لەگۆڕەپانی جیهانیشدا دەتوانێت خۆی بنوێنـێ. بـەلام وادەبینرێـت بـەهۆی ئـەو تایبەتمەندیانـەی سـەرەوە عێـراق هەسـت دەکـات تـەنیا لەیـەك لاوە ڕووبـەڕووی تەنگانەی بەهێز دەبێتەوە و وەختێك بتوانێت بەناڕاستەی دەرکەوتوو لەتایبەتمەندی گشتی خۆی، بۆ بـەرەو پێشبردنی ئامانجەکانی خۆی کاربکات کە بتوانێت هـەتا تواناکـانی لەبەشـێك لەپـشتی سنورەکانی خـۆی لەناوچەکانی باشور یان باشوری ڕۆژهەلات بالادەست بکـات. بـۆ تیـشك خـستنەسەر خواسـت و چـۆنیەتی ئامانجەکانی عێراق لەڕووی ئەهێشتنی کێشەکانی ئەمڕۆیەوە لـەدوو باسـی داهـاتوودا، لەتایبەتمەنیـەکانی جیوپۆلەتیکی عێراق لەژێر ناونیشانی عێراق و دراوسێکانی دەیخەینە بەرباس و لێکۆلّینەوە.

## لێکۆلّینەوەی جیوپۆلەتیکی لەولاتانی دراوسێی عێراق :

### (أ) سوریا و جیوپۆلەتیکی عێراق :

سوریا و عێراق لەکۆنەوە و لەچەندین لاوە لەنێوانیانـدا نـاکۆکی هەیـە. یەکـەمین نـاکۆکی نێـوان عێراق و سوریا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتـەی ڕێکـەوتن و پەیوەنـدی لـەنێوان ئـەم دوو ولاتـەدا هـەبوو، بـەلام ناکۆکبوون لەبۆچوونی ئایدیۆلۆجی و چۆنیەتی تێڕوانینەکان لەئامانجەکانی حزبی بەعس. عێراق بە پڕۆژەی یەکێتی عەرەب کە بەشێك بوو لەدروشمەکان و بنەمای حزبی بەعس، داوای یەکێتی لەسوریا دەکرد. بـەلام

سوریا لەبەرامبەردا وەڵامی نەرێنی هەبوو و هەتا لەجێگیرکردنی پەیوەندی ئاسای لەگەڵ عێراقدا گومانی هەبوو. لەبەرئەوە نەیویست لەگەڵ عێراق یەکێتی دروست بکات لەم بارەیەوە خۆپاریزی هەڵبژارد.

بەشێکیتر لەناکۆکیەکانی نێوان هەردوو وڵاتی عێراق و سوریا لەراستیدا لەناکۆکی سیاسیەوە سەرچاوە دەگرێت. ئامادەیی چالاکی سوریا لەگۆرەپانی گفتوگۆکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و وەستانەوەی لەبەرامبەر ئیسرائیل و نائامادەیی چالاکی عێراق لەهاوکاری و هاوەردی کێشەی فەلەستین و لایەنگیریکردنی عێراق بۆ ئەو گروپ و کۆمەڵە لوبنانی و فەلەستینیانەی کە پەیوەندیان لەگەڵ سوریادا باش نییە، بووەتەهۆی دەرکەوتن و زیادکردن و فراوانبوونی ناکۆکیەکان لەنێوانیاندا.ناکۆکییەکتر لەنێوان عێراق و سوریادا لەسەر رێژەی ئاوی رووباری فوراتە کە لەخاکی سوریاوە دێتە ناو عێراقەوە.

بەهۆی بوونی ئەو جیاوازیانەی سەرەوە، وا چاوەروان ناکرێت لەئایندەدا گۆرانێك لەپەیوەندی نێوان ئەم دوو وڵاتەدا روویدات، بەڵام بارودۆخێکی بێ شەر بەردەوام درێژە دەکێشێت. بۆیە دەبێت عێراق باش بزانێت دراوسێیەتی لەگەڵ سوریادا لەرووی جوگرافیەوە ناتوانرێت بگۆردرێت تاوەکو بۆ بەدەستهێنانی ناوچەی جوگرافی ستراتیجی هەنگاو بنێت. ئەمە لەکاتێکدایە عێراق چەندین دەیەیە سیاسەتی خۆی بەگشتی بەرەو کەنداو چرکردۆتەوە.

### (ب) تورکیا و جیوپۆلەتیکی عێراق :

تا کۆتاییهاتن و هەڵوەشاندنی ئیمپراتۆری عوسمانی، عێراق و تورکیا بەشێکبوون لەئیمپراتۆری عوسمانی. بەدوای هەڵوەشاندنی ئیمپراتۆری عوسمانی، تورکیا کە میراتگر و ناوەندی ئیمپراتۆری عوسمانی بوو، لەساڵی (١٩١٩) لەکۆنگرەی نەتەوەیی بریاری لەپرۆژەیەکی پەیوەست بە سنوری خۆیدا، لەم پرۆژەیەدا (ولایەتی موسڵ)ی بەبەشێك لەخاکی خۆی دادەنا. سەرەرای ئەوەش تورکەکان ناوچە کوردنشینەکان بە بەشێکی تورکیا دەزانن، بەڵام بەپێی پەیمانی (سایکس-بیکۆ) کە لەساڵی (١٩١٦) واژۆکراوە، ولایەتی موسڵ دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی فەرەنسیەکانەوە، لەساڵی (١٩١٨) فەرەنسیەکان ئەم ناوچەیەیان گەرانەوە بۆ بەریتانیەکان لەبەرامبەر کەناری چەپی رووباری راین و مافی ئیمتیاز لەنەوتی موسڵدا.

بە دوای ململان و دانوسانی نێوان تورکیا و فەرەنسا سەبارەت بە کێشەی موسڵ، کێشەکە خرایە بەردەم کۆمەڵەی گەلان و لەرۆژی (١٦ کانونی یەکەمی ١٩٢٥) کۆمەڵەی گەلان بریاری خۆیدا بە لکاندنی ئەم ولایەتە بە وڵاتی عێراقەوە. تورکیا هەرچەندە لەسەرەتادا نارازی بوو لەجیاکردنەوەی موسڵ لەخاکەکەی، بەڵام لەساڵی (١٩٢٦) بەپێی رێکەوتنێك کە لەنێوان تورکیا و بەریتانیا بەسترا (هێڵی برۆکسل) وەك سنوری نێوان تورکیا و عێراق دیاریکرا و رێکەوتن لەسەری. پەیوەندی تورکیا و عێراق تا چەندین ساڵی دواتر واتە تا گرتنەدەستی دەسەڵات لەلایەن (عبدالكريم قاسم)ەوە باشبوو. لەو کاتە

بەدواوە تورکیا بانگەشەی خۆی بۆ خاوەندارێتی موسڵ خستەڕوو. تورکیا بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی چەندین جار بەبیانووی سەرکوتکردنی کوردەکان تا قووڵایی چەندین کیلۆمەتر هاتۆتە ناو خاکی عێراقەوە.

لەماوەی جەنگی عێراق ئێران و لەماوەی جەنگی عێراق و کوێتدا، تورکیا بە هەمان بیانووی سەرەوە هاتە ناو خاکی عێراقەوە و ئەم هەنگاوەی تورکیا ناڕەزایی زۆر لێکەوتەوە بەتایبەتی وڵاتە دراوسێکانی تورکیا.

لەبەر ئەوە وا چاوەڕوان دەکرێت عێراق، بەهۆی ئەو پێگەیەی لەڕووی جیوپۆلەتیکیەوە هەیەتی، سیاسەتێکی محافزکارانەی لەبەرامبەر تورکیا هەبێت.

ستراتیجی محافزکارانەی عێراق لەبەرامبەر تورکیا، لەلایەك دەگەڕێتەوە بۆ داواکردنی تورکیا بۆ بەشێك لەخاکی عێراق (ولایەتی موسڵ)، لەلایەکیترەوە عێراق بۆ ناردنەدەرەوەی نەوتی خۆی چەندین ساڵە لەگەڵ تورکیا ڕێکەوتننامەی واژۆکردوە، لەبەرئەوە پێویستی بە تورکیایە. سەرەڕای ئەوە تورکیا وەك وڵاتێکی گەورەی ناوچەکە، بەپێی ئەو توانا بەهێزە ئابوری و سەربازییەی هەیەتی دەتوانێت لەبەرامبەر زۆر لەخواستەکانی عێراق بەباشی بووەستێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا تورکیا ئەندامی پەیمانی ناتۆیە، بۆیە لەکاتی هێرشی عێراق بۆسەر ئەم وڵاتە تەنیا ڕووبەڕووی تورکیا نابێتەوە بەڵکو ئەندامانی پەیمانی ناتۆش بەرچەکرداریان دەبێت.

کارتێکیتر کە تورکیا لەڕێگایەوە دەتوانێت فشار بخاتە سەر عێراق کوردە بەرهەڵستکارەکانی دژی عێراقە، کە یەکێك لەهۆیەکانی ڕازیبوونی ڕێکەوتننامەی جەزائیر ساڵی (١٩٧٥) لەنێوان عێراق و ئێران هەمان مەسەلەی کورد بوو کە ئێران یارمەتی دارایی فراوانی بۆ کوردەکان کردو بەهێزیکردن و کوردەکان چەندینجار عێراقیان لەڕووی سەربازیەوە تێکشکاند، لەبەرئەوە عێراق ناچاربوو ڕێکەوتننامەی جەزائیری (١٩٧٥) واژۆ بکات.

لەبەرئەوە تورکیاش لەکاتی پێویستدا دەتوانێت ئەم کارتە بە باشی بەکاربهێنێت. بەسەرنجدان لەم باسانەی سەرەوە دەتوانین بڵێین پێگەی جوگرافی عێراق لەبەرامبەر تورکیادا خۆی بە قەرزار دەزانێت بۆیە بە پێچەوانی سیاسەتی هێرش بردن بۆسەر وڵاتانی دراوسی لەباشور، ستراتیجێکی محافزکارانەی لەبەرامبەر تورکیا لەباکور گرتۆتەبەر.

### (ج) عەرەبستانی سعودی و جیوپۆلەتیکی عێراق :

عەرەبی بوون، ئەندامێتی و ئامادەیی هەردوو وڵاتی عێراق و عەرەبستانی سعودی لەڕێکخراوە عەرەبی و هەرێمیەکاندا دەتوانین وەك فاکتەرێك سەیری بکەین، کە پەیوەندی ناهاوتای هەردوو وڵات لەکاریگەری فاکتەری جیوپۆلەتیکی، هاوسەنگ بکات.

واژۆکردنی ڕێکەوتننامەی سنوری نێوان عێراق و عەرەبستانی سعودی لەساڵەکانی (١٩٢٢، ١٩٣٨، ١٩٧٥، ١٩٨١) ئەو داستانەمان پیشاندەدات کە سنوور دەتوانێت وەك کوانوی قەیران لەپەیوەندی عێراق و عەرەبستانی سعودی ڕۆڵ ببینێت.

هاتوچۆی کاڵا قاچاخەکان و هاتوچۆی خێڵە بیاباننشینەکان بۆ خاکی یەکتر و ناوچەی بێلایەن (کە ئێستا نەماوە) لەو فاکتەرانە بوون کە بۆتە هۆی دروستکردنی ناکۆکی و ململانێی لەنێوان هەردوو وڵاتدا. سەرەڕای ئەمانە دوو فاکتەری گرنگیتر وەك داواکردنی زەوی و لکاندی کوێت لەلایەن هەردوو وڵاتەوە و هەروەها ڕاگەیاندنی ناوچەی (حسا) وەك خاکی عێراق، گرژیەکانی نێوان ئەم دوو وڵاتەی لەهەموو فاکتەرەکانیتر زیاتر کردووە.

ناوچەی حسا تاساڵی (١٩٠٣) لە ژێردەستی ئیمپراتۆری عوسمانیدا بوو. لەم ساڵەدا ابن سعود بە هاوکاری بەریتانیا ئەم ناوچەیەی داگیرکرد و عێراق کە خۆی بە جێنشینی ئیمپراتۆری عوسمانی دەزانێت سەبارەت بەم ناوچەیە داوای دەکات، لەسەردەمی ملیك غازیدا عێراق پروپاگەندەی بۆ ئەم ناوچەیە وەك بەشێك لەخاکی کوێت ناودەبرد.

بانگەشەکردنی زەوی و لکاندنی کوێت لەلایەن هەردوو وڵاتەوە عێراق و عەرەبستانی سعودی لەوانەیە لەهەموو شتەکانیتر زیاتر جێگای ناکۆکیان بێت و گرژی دروست کردووە لەسەر پەیوەندیەکانیان. هەلکەوتەی وڵاتێکی بچوکی وەك کوێتی دراوسێی عێراق و عەرەبستانی سعودی، هەم بەهۆی بچووکی ڕووبەر و نەبوونی قوڵایی ستراتیجی و هەم بەهۆی هەلکەوتەیەکی ستراتیجی ناوچەیی و خاوەنی گرنگی جیۆئیکۆنۆمی، بۆ هەردوو وڵات جێگای گرنگی پێدان و هەستیاریە. لەڕاستیدا عێراق و عەرەبستانی سعودی لەتێڕوانینی جیوپۆلەتیکی خۆیان ئەم ترسەیان هەیە کە ئەگەر یەکێکیان دەستبگرێت بەسەر کوێتدا (کەخاوەنی گرنگی جیوپۆلەتیکی و ستراتیجی و جیۆئیکۆنۆمی گەورەیە) هەرەشەی ڕاستەقینەیە بۆ سەر بەرژەوەندیەکانی وڵاتەکەیتر.

### لێکۆڵینەوەی لە کاریگەری جیوپۆلەتیکی عێراق لەسەر وڵاتانی دراوسێ :

جەنگێك کە لەساڵی (١٩٩٠) بەناوی جەنگی دووەمی کەنداو ڕوویدا، بووە هۆی تێکدانی ئاسایش ونارامی لەناوچەکەدا و دروستکردنی بەرەیەك لەجیهاندا بە سەرۆکایەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەبەرامبەر عێراقدا.

ئەم جەنگە نەك تەنیا زەرەری گەورەی بۆ میللەتی عێراق هێنا، بەڵکو بووەهۆی دەستتێوەردانی زلهێزەکان و ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان لەم کێشەیەدا. ڕۆژئاوا بە سەرکردایەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەژێر پەردەی ئەنجومەنی ئاسایش، لەبەرامبەر هەرەشەی بەرژەوەندی ئیستعماری هێزە باڵادەستەکان عێراقی ناچار بەکشانەوە لەکوێت و ڕازیبوون بە بژاردنی زەرەرەکانی کوێت کرد، کە تا

ئەمڕۆ (٢٠٠٢) بەدەستیەوە دەناڵێنێت. پرسیار ئەوەیە کە چۆن و بۆچی عێراق هێرشی کردەسەر کوێتی دراوسێی؟ چۆن دەتوانیت ئەم ڕووداوە هەڵسەنگێنێت؟ ڕەگی وڕیشە و هۆکاری هێرشکردنی عێراق بۆ سەر کوێت کە بووە هۆی ڕاکێشانی هێزی دەرەکی بۆ ناوچەکە لەکوێوە هاتووە؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە پێویستە لێکۆڵینەوە لەتەواوی تایبەتمەندیە جیوپۆلەتیکیەکانی عێراق و کوێت بکەین.

**(أ) کوێت و جیوپۆلەتیکی عێراق :**

دوای ئەوەی عێراق لەپرۆژەی یەکێتی عەرەب (کە لەکاتی پەیوەندیکردنی سوریا بەم پرۆژەیەوە عێراق دەیتوانی دەستی بگات بە دەریای ناوەڕاست) شکستی خوارد، ڕوویکردەوە سنوری کەنداوی فارسی، کوێتی بە یەکێك لەبەربەستەکانی بەردەمی خۆی بۆ سوودوەرگرتن لەئاوی کەنداو دەزانی. عێراق کە خۆی بە جێنشینی ئیمپراتۆری عوسمانی دەبینی بانگەشەی ئەوەی دەکرد کاتێك عێراق بەشێکبووە لەئیمپراتۆری عوسمانی کوێت بەشێکبووە لەعێراق، لەبارەی بانگەشەی عێراق سەبارەت بە پاشکۆیەتی کوێت بۆ عێراق، سەرکردەکانی عێراق لەماوەی ساڵانی (١٩٢٠ ـ ١٩٥٨) سوودیان لەرەوشی ئاشتیانە وەردەگرت.

لەگرنگترین ئەو ڕەوشانەی کە عێراق لەماوەی ساڵانی (١٩٢٠ ـ ١٩٥٨) بۆ پاشکۆیەتی کوێت بەخاکی خۆیانەوە بەکاریان دەهێنا بریتی بوو لە:

١- خۆبەدورگرتن لە یەکلایکردنەوەی ناکۆکیە داراییەکان.
٢- مەسەلەی قاچاغی شمەك لەکوێتەوە بۆ عێراق .
٣- خۆبەدوورگرتن لەدانانی هێما سنوریەکان.
٤- دروستبوونی جەنگی سارد.
٥- خواستی بەدەستهێنانی ئیمتیازاتی سیاسی و ئابووری.
٦- بیانووی نەگەیشتنی ئازادانە بۆ کەنداوی فارسی.
٧- ئارەزوی کۆنترۆلکردنی دورگەکانی وەربە و بۆبیان.
٨- مەرجدارکردنی دابینکردنی ئاوی شیرین.
٩- داواکردنی پەیوەندیکردنی کوێت بە یەکێتی عێراق و ئەردەنەوە.

لەساڵی (١٩٥٨) و دوای هاتنەسەر حکمی عبدالکریم قاسم و دوای ئەوانیش هاتنی بەعسیەکان: خواستی داواکردنی عێراق بۆ کوێت زۆرتربوو. بەجۆرێك کە لەساڵی (١٩٦١) هێزەکانی عێراق لەدوای شەش ڕۆژ لەبانگەوازی سەربەخۆیی کوێت، لەسەر سنوری ئەم وڵاتە کۆبوونەوە. زعیم عبدالکریم قاسم لەبەیاننامەیەکی ڕادیۆیدا بەڵگەی پاشکۆیەتی کوێت بە عێراقەوە و دیاریکردنی کوێت وەك بەشێك لەولایەتی بەسرە لەسەردەمی ئیمپراتۆری عوسمانیدا ڕاگەیاند. لەدرێژەی بانگەشەی عێراق بۆ کوێت

لەساڵی (١٩٧٢) عێراق داوای کەڵك وەرگرتن و بەکارهێنانی هەردوو دورگەی وەربە و بۆبیان کرد و لەوکاتە بەدواوە پەنای بۆ شێوەی جیاوازی ئاشتیانە و ناناشتیانە برد بەمەبەستی گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی لەڕێگای داواکردنەوە. لەدواترین هەنگاوی عێراق لەبارەی سیاسەتی هێرشبەرانەی خۆی لەم ناوچەیەدا، داگیرکردنی کوێت بوو لە (٢/٨/١٩٩٠). لەدوای داگیرکردنی کوێت، عێراق ڕووبەڕووی نیدانە و نارەزایەتی بووەوە لەلایەن وڵاتان و کۆمەڵەی جیاواز و ئەنجومەنی ئاسایشەوە، لەکۆتاییدا بووە هۆی دروستبوونی بەرەیەکی گەورە لەوڵاتانی جیاواز بەسەرکردایەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، بۆ تێکشکاندنی عێراق. بۆچوونەکان وایپیشاندەدەن کە مەبەستی عێراق لەلکاندنی کوێت بەخۆیەوە دوو ئامانجی سەرەکی هەبووە.

یەکەم: کوێت یەکێکە لەوڵاتە بەرهەمهێنە گەورەکانی نەوتە لەجیهاندا و یەدەگی دڵنیایی نەوتی کوێت لەساڵی (١٩٨٤) نزیکەی (٩٠) ملیار بەرمیل نەوت بووە. داگیرکردنی کوێت و عەمبارە نەوتە گەورەکەی ئەم وڵاتە لەلایەن عێراقەوە دەتوانێت دەرامەتی عێراق بە ئاراستەیەکی بەرچاو زیاد بکات.

دووەم: عێراق بەو کەنارە ناویە کەمی خۆی کە لەسەر کەنداوی فارسیە ناتوانێت ڕۆڵی سەرەکی لەکەنداودا ببینێت. لەبەر ئەوە عێراق، کوێتی وەك کۆسپی سەرەك سەر ئەم ڕێگایە دەبینێت. عێراق ئەگەر بتوانێت دەسەڵاتی بەسەر کوێت یان لایەنی کەم دورگەکانی وەربە و بۆبیاندا هەبێت، سەرەڕای ئەوەی کە دەتوانێت بە ئاسانی ناردەنی نەوتی خۆی ڕەوانە بکات، هۆکارێکیشە بۆ فراوانکردنی کەنارەکانی لەسەر کەنداو بەمەش عێراق دەتوانێت ڕۆڵی گرنگتر لەکەنداودا ببینێت.

سەرەڕای ئەو بابەتانەی سەرەوە، کوێت دەتوانێت ناوچەیەکی ستراتیجی و جیۆستراتیجی بێت بۆ عێراق تا لەم ڕێگایەوە بتوانێت، جگە لەبەرزکردنەوەی توانای دەریایی خۆی، سوودمەندیش دەبێت لەهێزی بەرگریکردن. بە درێژایی جەنگی عێراق ئێران هێزی دەریایی عێراق بەهۆی نەبوونی شوێنی جیۆستراتیجی گونجاو، بە تەواوی قەتیسبووە و توانای بنیاتنانی سەربازی خۆی نەبووە. لەبەرئەوە عێراق هەمیشە بانگەشەی حاکمیەتی ڕەهای بۆسەر ڕووباری شەتلعەرەب (ئەروەند رود) و دورگەکانی وربە و بۆبیان کردووە تا بتوانێت ئازادانە دەستی بگاتە کەنداوی فارسی.

لەقەیرانی شەتلعەرەب لەساڵی (١٩٦٩)دا بۆ یەکەمینجار هێزی سەربازی عێراق لەکوێت جێگیر بوو. حکومەتی عێراق بەبیانووی ئاسایش بە فەرمی داوای لەکوێت کرد ڕێگە بدات بە هێزەکانی عێراق لەخاکی کوێت جێگیربن تا لەکاتی ئەگەری هێرشی ئێران بۆ ئوم قەصر لەوێوە بەرگری بکەن.

لە(تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٨٨) یەکەکانی سوپای عێراق تا قوڵایی (٢٠کم) چوونە ناو خاکی کوێتەوە. بەپێی دانوسانەکانی نێوان هەردوو وڵات و پاشەکشێی هێزەکانی عێراق و دووبارە دانوسانەکانی ساڵی (١٩٨٩)، سەدام حسین خۆی بە دووردەگرت لەواژۆکردنی هەرجۆرە ڕێکەوتنێك لەم بارەیەوە.

لەساڵی (١٩٨٤) دوای ئەوەی کە هێزەکانی ئێران چوونە ناو خاکی عێراقەوە، فشاری حکومەت عێراق لەسەر کوێت بۆ پێدانی دورگەکانی وەربە و بۆبیان و ڕێگادان بە جێگیرکردنی هێزی سەربازی عێراق لەسەر دورگەی بۆبیان زیادیکرد. کوێت بە ناچاری لەم بارەدا ڕازیبوو لەسەر جێگیرکردنی هێزی عێراقی لەسەر دورگەی بۆبیان و هێزە سەربازیەکانی عێراق لەسەر ئەم دورگەیەوە هێرشیان دەکردە سەر هێزەکانی ئێران لەناوچەکەدا.

بەمجۆرە دورنیە کە عێراق بەردەوامبێت لەسەر بانگەشەکانی خۆی بۆ کوێت بەمەبەستی گەیشتن بە بارودۆخێکی ستراتیجی لەبار، لەهەرجۆرە هەنگاوێك درێخی ناکات. هەرچۆنێك بێت گۆڕانکاریە نەنجامدراوەکان لەبواری تەکنەلۆجیا و پەیوەندیەکان و ئەزمونی جەنگەکانی ڕابردوو سەلماندییەتی، هەر کاتێك ولاتێك خاوەنی هەلکەوتەیەکی ستراتیجی بێت، هیچ کاتێك ناتوانێت خۆی لەگۆڕانکاریەکانی جیهان بەدوربگرێت و بەواتایەکیتر گۆشەگیربێت، بۆیە بەناچاری دەبێتە بەشێك لەستراتیجی سەربازی.

ئەم بارودۆخە بەتەواوی بۆ ستراتیجی سەربازی عێراق ڕاستە، کە کوێت بە بەشێك لەستراتیجی سەربازی و هەتا ئابووری خۆی دەزانێت.

بە هەرحاڵ تایبەتمەنی جوگرافی و جیوپۆلەتیکی عێراق لەم ناوچەیە بە تەواوی سیاسەتی دەرەکی ئەم ولاتەی خستۆتە ژێر کاریگەری خۆیەوە، بەجۆرێك کەوتۆتە ژێر جەبرگەرایی (حتمیەتی) ئەم سیاسەتەوە، لەئێستادا، عێراق لەسەر گۆڕەپانی نیودەوڵەتی دوچاری کەنارگیری و گەمارۆی ئابووری و سەربازی بۆتەوە.

**(ب) ئێران و جیوپۆلەتیکی عێراق :**

پەیوەندی ئێران و عێراق نەك تەنیا دوای هەڵوەشاندنی ئیمپراتۆری عوسمانی، کە ولاتی عێراقی لێدروست بووە، بەلکو هەتا پێش ڕووخانی ئیمپراتۆری عوسمانی کە عێراق بەشێك بووە لەو ئیمپراتۆرە، بەرزیونزمی زۆری بەخۆیەوە بینیوە.

چلەپۆپەی توندو تیژی پەیوەندیەکانی عێراق لەگەڵ ئێران، لەجەنگی عێراق ئێراندا ڕوویدا و لێکۆلەرەوان و پسپۆڕانی سیاسی و یاسایی بۆچونیان هەبوو لەسەر ناکۆکی نێوان عێراق و ئێران و هەروەها هۆکاری سەرەکی هێرشی عێراق بۆ سەر ئێران چۆن لێکدەدەنەوە؟ بۆ وەلام دانەوەی ئەم پرسیارە کە بۆچی سەرکردەکانی عێراق لەگەڵ ئەوەی چەندین ڕێکەوتننامە لەنێوانیاندا هەیە، وەك ڕێکەوتنی (١٩٣٧) و ڕێکەوتنی دراوسێیەتی (١٩٧٥) ی جەزائیر، کەچی لەساڵی (١٩٨٠) ڕێکەوتننامەکەی هەڵوەشاندەوە و هێرشی کردە سەر خاکی ئێران؟ پەیوەندی ئێران و عێراق لەو سەردەمەدا کەوتە ژێر ناکۆکی سنوری، بەتایبەت لەسەر (شەتلعەرەب ـ ئەروەندرود).

بارودۆخی ئەو کات دەتوانین بەجۆرە گوزارشتی لێبکەین، کە لەوانەیە فاکتەری جوگرافی گرنگترین فاکتەربێت لەفۆرمەلەبوونی پەیوەندی نێوان ئەم دوو وڵاتەدا. چەمکی دوانەی ستراتیجی عێراق بەرامبەر ئێران، لەهەڵکەوتەی جوگرافی ئەم وڵاتە لەکۆتای باکوری ڕۆژئاوای کەنداوی فارسی، بە ڕێرەوێکی باریک دەگاتە هێڵی کەشتیوانی نێودەوڵەتی.

لەرووی مێژووییەوە، گفتوگۆ لەسەر ڕاڕەوێکی باریك رووباری ئەروندرود (شەتلعەرەب) کە کاتێك ئیستعماری دەرەکی لەبەر دابینکردنی بەرژەوەندی خۆی لەم ناوەچەیە بوونی هەبووە، دەرکەوتنی ناوبەناوی ئەوان زۆرتربوو و پەیوەندی دوو دەوڵەتی هاوسنوری بۆ ئەم ڕاڕەوە باریکە خستە ژێر کاریگەرییەوە.

### تایبه تمەندیەکانی ڕوباری ئەروندرود (شەتلعەرەب) :

ڕووباری ئەروندرود ناوێکی تازەیە، کە لەدوای یەکگرتنی ڕووبارەکانی دیجلە و فورات دروست دەبێت، وشەی ئەروند رود لەڕاستیدا ناوێکی کۆنی ئێرانی ڕووباری دیجلەیە.

لەفەرهەنگی فارسی دکتۆر معین دیجلە لەزمانی پارسی کۆندا ئاوای دەناسێنێت واتە (توند، تیژ، چالاك، دلێر، زۆر، شکۆ، شانوشەوکەت).

شەتولعەرەبیش ناوێکی تازەیە و بۆ یەکەمینجار ناسر خسرەو لە(٢٨١ـ٣٩٤) لەسەفەرنامەکەیدا بەکاریهێناوە، عێراق لەوەرگرتنی ناوی ئەروند رود بەم ڕووبارە سنوریە تاساڵی (١٩٧٥) سەرپێچی دەکرد. بەڵام لەم ساڵەدا بەپێی زانیاری وەرگیراو لەڕێکخراوی جوگرافیای وڵات بە پێی ڕێکەوتنی نێوان هەردوو حکومەتی عێراق و ئێران بە فەرمی حکومەتی عێراقیش ناوی (ئەروند رود) بۆ ئەم ڕووبارە قبوڵ کرد.*

شەتلعەرەب یەکێك لەفراوانترین ڕووبارەکانی جیهانە، کە هەتا بەرەوخوار بڕوات فراوانتر و قوڵتر دەبێت. پانی شەتلعەرەب لەنێوان (٤٠٠ تا ١٢٠٠) مەترە درێژیەکەی لەقورنەوە تا ناوەڕێژگە لەفاو (١٨٥)کم کە (٨١) کیلۆمەتری سنوری هاوبەشی عێراق و ئێرانە. لەناو شەتلعەرەبدا چەندین دورگەی تێدایە کە بەناوبانگترینیان بریتیە لە: ئابادان، مینو، شگیگ، حاج صلبوخ، ام الرصاص، دلجانیە، سندبادی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات ، ام الگویل فیاج، ام الخصاصیف، شمشویە، معاویە، محلە بلیانیە و برارین. عێراق بە درێژایی ئەم ڕووبارە دوو بەندەری گرنگی ستراتیجی بەناوەکانی بەسرە و فاو هەیە.

بەسرە گرنگترین و گەورەترین بەندەری عێراقە و دووەم شارە لەگەورەیدا دوای بەغدا. ماوەی بەندەری بەسرە تا کەنداو نزیکەی (١٥٠کم). بەندەری فاویش کەوتۆتە دەمی ڕووباری شەتلعەرەب و کۆتایی نیمچەدورگەی فاوەوە. ئەم دورگەیە بۆ عێراق بەهای ستراتیجی هەیە، بۆیە عێراق هەوڵیداوە تا

---

*) نوسەر لێرەوە بەدواوە تەنیا ناوی (ئەروەند ڕود) بۆ ڕووباری شەتلعەرەب بەکاردەهێنێت لە نوسینەکەیدا، بەڵام من لە دوای ئەو ڕونکردنەوەیەوە ڕووباری شەتلعەرەب بەکاردەهێنم بۆ ئەوەی خوێنەر توشی هەڵە نەبێت، ئەوەی لەپێشیشەوە بەکارهێنراوە بۆ ئەوە بووە کە خوێنەر شارەزایی لەو ناوەش هەبێت. وەرگێڕ.

کۆتایی سوود لەم دورگەیە وەربگرێت . بەڵام بەهۆی کەمی کەنار و کەم قوڵی (تنکی) ناوەکەی، کەشتی گەورە ناتوانێت لەکەناری فاو لەنگەر بگرێت.

### گرنگی شەتلعەرەب:

شەتلعەرەب بە درێژایی مێژووی خۆی گرنگی لەڕادە بەدەری هەبوو. ڕۆڵی شەتلعەرەب بە درێژایی جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی بۆ هێزی هاوپەیمانان زۆر گرنگ بووە و لای هیچ کەسێك نەزانراو نییە. بەشداریکردنی عوسمانیەکان لەجەنگی یەکەمی جیهانیدا وای لەهێزی هاوپەیمانان کرد بەخێرایی ناوچە نەوتیەکانی سەر بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەدەوروبەری شەتلعەرەب وەك بەندەری فاو و بەسرە بخەنە ژێر دەستی خۆیانەوە، بەمجۆرە و بەهۆی بەرقەراری ئاسایشی کەشتوانی لەڕووباری شەتلعەرەب دەستیانکرد بە تاڵانکردنی سەرچاوە نەوتیەکان، لەکاتی جەنگی دووەمی جیهانی هاوپەیمانان لەڕێگای شەتلعەرەبەوە کەلوپەلی سەربازیان بۆ یەکێتی سۆڤێت ڕەوانەدەکرد. لەماوەی جەنگدا زیاتر لە (٥٠) ملیۆن تەن چەك و کەلوپەل و کەرەسەی خۆراك و دەرمان لەبەندەرەکانی سەر شەتلعەرەب بەتاڵکراو ڕەوانەی یەکێتی سۆڤێت کرا.

شەتلعەرەب گرنگترین ڕێگای گەیشتنی عێراقە بۆ سەر کەنداو. عێراق لەم ناوچەیە تەنیا (٤٨)کم کەناری لەگەڵ کەنداوی فارسی هەیە و ئەمەش هەموو شیاوی سوود لێوەرگرتن نییە، ناردنە دەرەوەی نەوت و بارکردن و گواستنەوەی کاڵاکان لەڕێگای شەتلعەرەبەوە بۆ عێراق کارێکی ستراتیجیە، چونکە سوود وەرگرتن لەهێڵی بۆری لەوشکانی و لەڕێگای خاکی وڵاتانی ترەوە تێچونێکی زۆری بۆ عێراق دروستکردووە. سودوەرگرتن لەم ڕێگا ناویە بۆ ناردنە دەرەوەی نەوت دڵنیاتر و کەم مەسرەفترە.

گرنگترین کانە نەوتەکانی عێراق لە(زبێر و ڕمیلەیە) کە کەوتۆتە دەوروبەری شەتلعەرەبەوە. مەیدانی نەوتی زیقار لەباکوری ڕۆژئاوا بەسرە گەشەیکردووە و سەرەکیترین دامەزراوەی گازی سروشتی عێراق لەناوچەی باشور ئەم وڵاتە کەوتۆتە نزیك شەتلعەرەبەوە. عێراق بەهۆی ناکۆکیەکانی پەیوەست بە شەتلعەرەبەوە، بە دوای ئەلتەرناتیفێکدا دەگەڕێت تا ناردنەدەرەوەی نەوت توشی گرفت نەبێت. لەم بارەیەوە هەنگاوی ناوە بۆ ڕاکێشانی بۆری تەرمینالێ لەسەر فاو لە(خورالامیە)، بەڵام بە هۆی نزیکی ئەم ناوچانە لەدەمی شەتلعەرەبەوە ئەمەش لەبەردەم مەترسیدایە. داگیرکردنی بەندەری فاو لەلایەن ئێرانەوە لەکاتی جەنگی عێراق ئێراندا ئەم ڕاستیەی سەلماند.

بەزانینی گرنگی ستراتیجی و ئابووری شەتلعەرەب دەتوانین پەیپەوبەرین بۆچی عێراق بۆ کۆنترۆڵکردنی تەواوی ئەو ڕێگا ئاویە، سیاسەتی هێرشبەری گرتۆتە بەر.

**شەتلعەرەب و پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئێراندا :**

دوای پارچەپارچە بوونی ئیمپراتۆری عوسمانی و لەدایکبوونی وڵاتی عێراق، بەریتانیا لەو باوەڕەدا بوو کە ئێران سەربەخۆیی عێراق بە فەرمی دەناسێت. حکومەت ئێران مەرجی سەرەکی بۆ بەرەسمی ناسینی عێراقی بەستەوە بە ڕێکەوتنێکەوە کە عێراق بەرەسمیەت مافی ئێران لەسەر شەتلعەرەب بناسێنێت. بەدانانی دڵنیایی لەلایەن حکومەت بەریتانیا ئەم داوایە قبولکرا و حکومەت ئێرانیش عێراقی بەرەسمی ناسی.

دوای بەرەسمی ناسینی عێراق لەلایەن ئێرانەوە، هەردوو وڵاتی عێراق و بەریتانیا هیچ هەنگاوێکی پراکتیکیان سەبارەت بە پەیمانەکەیان نەنا. حکومەت ئێران کە هەستی بە هەڵەی خۆی کرد، لەیاداشتی ژمارە (٣٢٧٦) مێژووی (١ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٣١) ئاگاداری حکومەت عێراقی کردەوە کە نوێکردنەوەی سنور پرۆتۆکۆڵی (١٩١٤) لەلایەن ئێرانەوە بەتاڵە و ئەوە بەرەسمی ناناسێت و لەو مێژووەوە بەرکەوتی تازەی سنوری ئاڵۆزی و نارونی پەیوەندیەکان زیادی کرد.

بەدوای دانوسانی زۆر لەنێوان سەرانی هەردوو لادا و ڕاکێشانی مەسەلەکە بۆ بەردەم کۆمەڵەی گەلان، ڕێکنەکەوتن تاساڵی (١٩٣٦)، سەرئەنجام لەحزیرانی (١٩٣٧) پەیماننامەیەکی ڕەسمی لەنێوان وەزارەتی دەرەوەی ئێران و عێراق واژۆکرا. حکومەت عێراق لەساڵی (١٩٣٧ تا ١٩٥٠) هەموو کاروباری ڕووباری شەتلعەرەبی بەدەستەوەگرت و بچوکترین شتی بۆ ئێران نەهێشتەوە و دەرامەتی دەوڵەمەندی ئەم ڕووبارەی بە هەر جۆرێك دەیویست بە پێچەوانەی پرۆتۆکۆڵ و پەیماننامەکان بەکاریدەهێنا. لەبەرامبەردا ئێران نارەزایەتی دەربڕ و ڕایگەیاند کە تەنیا حکومەت عێراق کاروباری ئەم ڕووبارە دەبات بەڕێوە و بڕیاری لێدەدا.

دوای گرتنەدەستی دەسەڵات لەلایەن عبدالکریم قاسم پەیوەندی نێوان عێراق و ئێران بەشێوەیەکی گشتی تێکچوو و دەسەڵاتدارانی عێراقی و ڕۆژنامەکانی ئەو وڵاتە جەنگی ساردی ڕاگەیاندنیان دژی ئێران دەستپێکرد. لەبەرامبەر سیاسەتی قۆرخکاری عێراق لەسوود وەرگرتنی لەو ڕووبارە شای ئێران لەچاوپێکەوتنێکدا لە (٢٨/تشرینی دووەم/١٩٥٩) ووتی (ڕووبارێك کە لەنێوان سنوری وڵاتدا بێت نابێت تەنیا یەك لایان سوودی لێوەرگرێت یان پلەو پایە و حاکمیەتی تەنیا بۆ لایەکیان بێت). لەوەڵامدا عبدالکریم قاسم لەچاوپێکەوتنێکدا رونیکردەوە کە (ڕێکەوتنی ساڵی ١٩٣٧ بەسەر عێراقدا سەپێنراوە کە حکومەت عێراق نزیکەی پێنج کیلۆمەتر لەشەتلعەرەب وەك بەخشیش داوە بە دراوسێکەی خۆی .... عێراق کاتێك ئەم بەخشیشەی ئەنجامداوە کە هەلومەرجەکەی دژوار بووە و لەژێر فشاردا بووە. قاسم لەدرێژەی چاوپێکەوتنەکەیدا هەڕەشەی کرد بۆ گێڕانەوەی خواستەکانیان. لەساڵی (١٩٦٩) وەزارەتی دەرەوەی عێراق سەفیری ئێرانی لەبەغدا بانگهێشت کرد و پێیووت کە شەتلعەرەب بەشێکە لەخاکی عێراق

داواکاره نێران لەکاتی هاتنەناوەوەی کەشتیەکانی بۆ ناو ئەم رووبارە ئالاّی خۆی لەسەر کەشتیەکان داگرێت.

لەوەلاّمی ئەمەی سەرەوەدا وەزیری دەرەوە رایگەیاند ( دەولّەتی شاهنشای ئێران لەرووباری شەتلعەرەب شتێك جگە لەناسینی هێلّی نیودەولّەتی واتە هێلّی تالوگ* یان هێلّی ناوەراست بەرەسمی ناناسێت و قبولّی ناکات)

لەدرێژەی ئەم گفتوگۆ و دەمەقالێیەدا ئێران هەنگاوینا بۆ هەلّوەشاندنەوەی رێکەوتنی (١٩٦٩)، حکومەت عێراقیش لە (٢٩/٤/١٩٦٩) لەنەنجومەنی ئاسایش شکاتی کرد. دوای ئەو رووداوە پەیوەندی هەردوو ولاّت ئالّۆز بوو. حکومەت عێراق لەرێگای تاوانبارکردنی ئێرانیەکانەوە وەك تابوری پێنجەم هەزاران ئێرانی لەبارودۆخێکی نا مرۆڤانەدا لەخاکی خۆی دەرکرد و دەستیگرت بەسەر مولّك و مالّیاندا، هەموو ئەیارەکانی شای وەك پەناهەندە وەرگرت و توانای فراوانی خستە بەردەستیان بۆ خەباتکردن دژی شا. لەم بارودۆخەدا عێراق رایگەیاند کە خوزستان عەرەبستانە و بەشێکە لەعێراق و ئێران بە زۆر داگیریکردووە، وە بۆ جیاکردنەوەی لەئێران، بەرەی ئازادیخوازی لەحوزیرانی (١٩٦٩) پێکهێنا. ئێرانی تاوانبارکرد بە بەشداریکردن لەکودەتایەکی سەرنەکەوتوودا. دوای چوونە ناوەوەی هێزەکانی ئێران بۆ دورگەکانی تنبی گەورە و تنب بچوك و ئەبوموسا لەسالّی (١٩٧١) حکومەت عێراق پەیوەندی دیپلۆماسی لەگەلّ ئێران پچراند. لەو مێژووەوە تا سالّی (١٩٧٤) چەندین جار ئێران و عێراق یەکتریان بە بەزاندنی سنور و هاتنەناو خاکی یەکترەوە تاوانبارکردووە. بارودۆخی سەرەوە شکایەتی عێراقی لێکەوتەوە لەئەنجومەنی ئاسایشی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان کە ئەنجامێکی باشی بۆ یەکلاکردنەوەی ناکۆکیەکان لێنەکەوتەوە و رێکەوتننامەی جەزائیر کە لەئەنجامی دانیشتنی دوولایەنە و چەند لایەنە بوو لەئەنجومەنی ئاسایش لەسالّی (١٩٧٥) لەنێوان هەر دوو ولاّت بەسترا.

**رێکەوتننامەی باشی دراوسێیەتی ( حسن جوار ) جەزائیر ( ١٩٧٥ ):**

حکومەت عێراق لەدوای ناکۆکی سنوری، ئەنجامی هەرجۆرە هەولّ و هەنگاوێکی ئاشکراو نهێنی دژی ئێران، بە هیچ یەکێك لەئامانجەکانی خۆی نەگەیشت، بەهۆی نیەت پاکی ئێران و بالاّدەستی سەربازی ئێران بۆ بەرقەرارکردنی ئاگربەست لە (٧/مایس/١٩٧٤) رەزامەندی لەسەر دانوسانی راستەوخۆ دەربری. ئەمە لەکاتێکدابوو کە کوردەکانی عێراق بەهۆی پالّپشتی راستەوخۆ و کاریگەری رژێمی ئێرانەوە، چەندین هێرشیان بۆ سەر هێزەکانی عێراق دەسپێکرد و عێراق چاوەروانی هەلێکبوو بۆ رزگاربوون لەو قەیرانەی کە

*) تالوگ (Talweg) زاراوەیەکی ئەلمانیە و لە دوو وشە پێکهاتووە (Tal) واتە دۆلّ و(weg) رێگا بەسەر یەکەوە واتا (رێگای دۆلّ) کە ئەمەش قولّترین هێلّی بنی رووبارەکەیە (وەرگێر).

بەهۆی کوردەکانەوە تێیکەوتبوو. دەستپێکردنی دانوسانی ڕاستەوخۆ لەگەڵ حکومەت ئێران کە بەشێوەیەکی کاریگەر پارێزگاری لەکوردەکان دەکرد، بووە جێگای خۆشبنی سەرانی عێراق.

لە (نیسانی ١٩٧٥) لەکاتی کۆبوونەوەی ئۆپێك لەجەزائیر، سەدام حسین جێگری سەرۆك کۆماری عێراق لەگەڵ شای ئێران دیدارێکیان ڕێکخست. سەبارەت بە شەتولعەرەب ڕازیبوون لەسەر هێڵی تالوگ وەك ڕێگاچارەی سنوری ڕووباری هەردوو وڵات لەسەرتاسەری ڕووباری ناوبراو، هەروەها ڕازی بوون لەقۆرخکاری ئابووری ئیمتیازاتی گشتی بە ئێران بدات.

سەدام حسین لەواژۆکردنی ڕێکەوتننامەی جەزائیردا واقعبینی سیاسی پیشاندا و حکومەتی خۆی لەزۆر لەو کێشانەی ڕووبەڕووی بۆتەوە بەخشی، هەلێکی زێرینی بەدەستهێنا تا لەبەهێزکردنی هەمەلایەنی وڵاتی عێراق و سوپاکەی هەنگاوی کاراو فراوان بنێت. بەهۆی ئەمەوە واژۆی پەیماننامەی جەزائیر کۆتایی بەکارەکانی هێنا و سەرئەنجام ناکۆکیە سنوریەکانی لەگەڵ ئێران تەواو بوو. واژۆی ڕێکەوتننامەی جەزائیر لەلایەن عێراقەوە تەنیا تاکتیکێك بوو تا لەهەلێکی گونجاودا بتوانێت بە ئامانجەکانی خۆی بگات، هێرشی ساڵی (١٩٨٠) ی عێراق بۆ سەر ئێران و داگیرکردنی چەندان کیلۆمەتر لەخاکی ئێران بەرهەمی ئەو تاکتیکە بوو.

## تەنگەبەری جیوپۆلەتیکی و هەڵوەشاندنەوەی ڕێکەوتننامەی جەزائیر :

مەلیك فەیسەڵ پادشای عێراق لەوەڵامی (تقی نەبەوی) وەزیری ئێران لەبەغدا کە خواستی دانوسانی دوولایەنەی ئێران و عێراق بوو بەبێ ئامادەیی وڵاتی سێیەم، لەوەڵامدا وتبووی, شەتولعەرەب وەك تاکە دەرچەی عێراق بۆ دەریای ئازاد گرنگی تایبەتی بۆ ئەم وڵاتە هەیە.

دەسەڵاتدارانی عێراق لەساڵانی دوایدا، چەندینجار باسیان لەتەنگەتاوی عێراق کردبوو بۆ گەیشتن بە کەنداوی فارسی ناڕازیبوونیان لەهەلومەرجی جوگرافیایی ئاشکرا کردبوو.

نارەزایەتی عێراق لەبارودۆخی جوگرافیایی خۆی، وایکرد ئەم وڵاتە کۆمەڵێك هەلومەرجی گشتی وەك لاوازی ناوخۆی ئێران، نەبوونی هێزی هەرێمی، نا خۆشحاڵی بلۆکی ڕۆژئاوا لەئێران و توانا سەربازیەکانی عێراق بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی لەدەست نەدات. هەر لەبەر ئەم هۆیانە بوو سەدام حسین لە (١٧ئەیلول) بە فەرمی ڕایگەیاند کە ڕێکەتننامەکە هیچ بەهایەکی یاسایی نییە و دەبێت شەتولعەرەب بگەڕێتەوە ژێر دەسەڵاتی عەرەب. سەرباری ئەوەش وتی: ئیمە بڕیارمانداوە کە بە زۆر هەموو زەویەکانی خۆمان بەگێڕینەوە و شەتولعەرەب دەبێت شوناسی عێراق و عەرەبی بۆ بگێڕینەوە و بە تەواوی بخرێتە ژێردەستی عێراقەوە.

سەدام بەچەند بەهانەیەکی بێبنەما کە بەگشتی لەڕووی یاساییەوە هیچ بەهایەکی نەبوو. ڕێکەوتننامەی جەزائیری هەڵوەشاندەوە تا بتوانێت جەنگ لەدژی ئێران هەڵگیرسێنێت و ڕێگا بۆ گەیشتن

به نامانجەکانی بکاتەوە. بە هێرشی عێراق بۆ سەر ئێران و سەپاندنی شەری هەشت ساڵە لەگەڵ هەموو ئەو زیانە مادی و مەعنەویانە، کاتێك نەیتوانی بارودۆخی جوگرافی خۆی باش بکات، ڕووی کردە کوێت و لەساڵی (١٩٩٠) ئەم وڵاتەی داگیر کرد. هەنگاوە توندوتیژ و دوژمنانەکەی عێراق لەبەرامبەر شەتولعەرەب بەجۆرێك کێشەی دروستکرد (هەتا دەرەوەی ناوچەکەشی گرتەوە) کە دەتوانین بڵێین ( ئەو کێشانەی لەسەر شەتولعەرەب دروست بوو،) زیاتر سەرنجی نێودەوڵەتی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە).

**لێکۆڵینەوە لەهەڵکەوتەی عێراق لەستراتیجیە ناوخۆییەکاندا :**

**سیاسەتی تورکیا لەبەرامبەر باکوری عێراق (هەرێمی کوردستان) دوای جەنگی دووەمی کەنداو:**

تورکیا لەهاوکێشەی گەمارۆی نێودەوڵەتی سەر عێراق دوای (گەردەلولی بیابان) خۆی بە گەورەترین زیان لێکەوتوو دەزانی نەك لەرووی ستراتیجی ئەمنی و هاوسەنگی هێزی ستراتیجی ناوچەکە، بەڵکو لەرووی ئابووریەوە. تورکیا بارودۆخی ستراتیجی ئەمنی و هاوسەنگی هێزی ستراتیجی ناوچەیی دوای ڕووخانی یەکێتی سۆڤێت بەنیازبوو خۆی ڕۆڵی سەرەکی لەناوچەکەدا و هاوئاهەنگی لەگەڵ جیهان ببینێت، چونکە شوێنی ستراتیجی و گرنگی لەپێشینەی ئەم وڵاتە (وەك بەربەست لەبەردەم نفوزی کۆمۆنیستی) لەستراتیجی ڕۆژئاوا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا دووبارە بۆی دەگەڕێتەوە، بەڵام دوای هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤێت ڕۆڵی نێودەوڵەتی تورکیا کەمبۆوە، لەگەڵ دروستبوونی قەیرانی سیاسی بۆ ئەم وڵاتە، ئارەزوەکانی بۆ هاتنەناوەوەی بۆ ناو کۆمەڵگای ڕۆژئاوا و وەرگرتنی وەك ئەندام لەناو ڕێکخراوی یەکێتی ئەوروپا و بازاڕی هاوبەشی ئەوروپا لەبەینچوون، قەیرانی پەیوەندیبوون و شناس (فکری ـ ئایدیۆلۆجی) کە لەسەردەمی کەمال ئەتاتورکەوە سەریهەڵداوە زیادیکرد. چونکە ئەتاتورك تورکیای سکولار (علمانی) (بچوك و بەهێزی پێباشتربوو لە گەورەو لاواز). سەرەڕای قەیرانە ناوخۆییەکان، ئاسایش و ئابووری تورکیا و هەروەها گۆڕان و گۆڕانکاری سیاسی و فکری لەناوخۆدا کە بووە هۆی گەشەکردن و هەستانەوەی بزوتنەوەی جیهانی ئیسلامی لەکۆتایی دەیەی حەفتاکاندا، زیاتر بەهێزبوو. هەندێك لەگوزارشتە وەرگیراوەکان لەسەرچاوە فەرمیەکندا باس لەوە دەکەن کە هەرەشەی سەرەکی ناوخۆی تورکیا بزووتنەوەی بنیاتگەری ئیسلامی ئەم وڵاتە و خەباتی کوردەکانە. چونکە گروپی بنیاتگەرە ئیسلامی خاوەنی سەرچاوەی دارایی زۆرن و ئەندامەکانیان دەسەڵاتی زۆریان لە بەڕێوەبەرایەتیە حکومیەکاندا هەیە. هەروەها بەپێی ووتەی نجم الدین ئەربەکان ( بە درێژی دەساڵ دوای کودەتای ساڵی (١٩٨٠) دەسەڵاتدارانی تورکیا نزیکە (٤٠) هەزار کەسیان بەتۆمەتی پەیوەندیان بە بزوتنەوە ئیسلامیەکانەوە خستۆتە زیندانەوە). ئەم ڕاستیە لەکۆتایدا بووە جێگای نیگەرانی زۆری سیاسیەکانی تورکیا و دەسەڵاتدارانی ئەم وڵاتەی ناچارکرد بەرەو ڕەفتاری سیاسەتی نایاسایی بەرێت. بەجۆرێك

لەناوچەکەدا پەنابەرن بۆ ڕفتاری توندوتیژی و هەوڵیاندا بۆ بەدەستهێنانی ڕۆڵی تازە لەناوچەکەدا، بە پێچەوانەی سیاسەتی باو لەناوچەکە بەنابەرنە بەر وەسیلەی دوژمنکارانە دژ بە وڵاتانی دراوسێ وەك سوود وەرگرتن لەجەنگی ناو بەشێوەی دور لەلۆجیك و پەیماننامە نێودەوڵەتیەکان کاریان دەکرد. تورکیا هەروەها لەرێگای هەنگاونان بۆ تێکدانی مەیدانەکە لەناوچەکە پەلەیکرد لەچوون بەرەو ئیسرائیل و بەکەڵك وەرگرت لە (لاوازی سیاسی) لەباکوری عێراق بۆ بەشەرهاتن لەم یاریەدا بەشێوەی جیاواز سوودی وەرگرت. شتێك کە بەبڕوای تورکیا لەبەرژەوەندی بەدیهێنانی خواستەکانیەتی بە ئامانجی ناوخۆیی و دەرەکی ڕایدەکێشا. تورکیا لەبینینی ئەم ڕۆڵەدا بارودۆخ و بەرنەنجامێکی بەرچاوی هەبووکە گرنگترینیان بریتیەلە:

١- عێراقێکی لاواز دەتوانێت کەلێنی ئاشکرا لەهاوسەنگی هێزەکانی ناوچەکە دروست بکات هەروەك ئەوەی ئەزموونەکان سەلماندویانە ( ئەگەر عێراق لاوازبێت دوو کەلێن دروست دەکات: یەکەم هاوسەنگی پێویست لە سێکوچکەی عێراق و تورکیا و ئێران تێکدەچێت ـ شتێك کە ببێتە هۆی دەست تێوەردانی زیاتری ڕۆژئاوا لەناوچەکە بەزەرەری عەرەبەکان تەواو دەبێت ـ دووەم کەلێن لەبەرەی ململانێی عەرەب ـ ئیسرائیل دروست دەبێت).

٢- هەروەك چۆن دەوڵەتی تورکیا لەلاوازی عێراق کەڵك وەردەگرێت، لەبارەی دژەعەرەب و ئیسلام، ئەمەریکای هاوکاریشی لەمە سوودوەردەگرێت، ئەم بابەتە ئەمەریکای بەئاشکرا هانداوە بۆ پاراستنی ڕۆڵی تورکیا لەباکوری عێراق هاوبۆچوونی ئاشکرا لەبارەی دانانی پشتێنەی ئەمنیەوە، ئەمە چەندینجار لەلایەن ڕابەرانی ئەمەریکاوە بەرچاو دەکەوێت، هەروەها ئامادەیی ئەمەریکا لەمانۆڕە سەربازیە هاوبەشەکانی تورکیا و ئیسرائیل پیشاندنی ئەم پارێزگاریە. سەرەڕای ئەوانە سەرکردەکانی تورکیا لەهەوڵدان لەرێگای پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بۆ ئەمەریکا لەبنکەی ئەنچەرلیك پارێزگاری ئەم وڵاتە بەلای سیاسەتە تازەکەی خۆیاندا ڕاکێشن.

٣- سەرکردایەتی تورکیا لەلاوازی جیهانی عەرەب و ئاوابوونی دەسەڵاتیان، چ لەپەیوەندیان لەگەڵ یەکتردا و چ لەخەباتیان دژ بە ئیسرائیل، سوودمەند بووە. (ئەگەر عەرەبەکان لەم ڕووەوە تەبابن، تورکیا نەیدەتوانی چالاکی دوژمنکارانە وەك ئێستا دەبینێت بکات).

بابەتی یەکێتی عەرەبەکان بە ڕێکەوتنەکان لەوانە ڕێکەوتننامەی (غەزە اریحا) دوای ئەوە ڕێکەوتننامەی (وادی عربە) و پێشتریش ڕێکەوتننامەی کامبدێڤد و کارەساتی جەنگی عێراق ئێران و قەیرانی کوێت کەلێنی گەورەی تێکەوت. لەبەرامبەردا، عەرەبەکان هەڵی لاواز لەبەردەمیاندا هەیە لەرێگای پەیماننامەی هەرێمیەوە بۆ دروستکردنی هاوسەنگی لەناوچەکەدا، بۆ بەهێزکردنی لایەنی ستراتیجی خۆیان سوودیان لێوەرنەگرتووە، لەوانە بزوتنەوەی ئیسلامی و ئێرانی ئیسلامی کە بەوتەی یەکێك لە بیرمەندانی عەرەب ( ئەمڕۆ بارودۆخەکە بە پێچەوانەی ئێرانی سەردەمی شاهنشایە بەڵێنە

سیاسیەکانی ئەم وڵاتە، بەڵێنە سیاسیەکانی عەرەبەکانی دەیەی پەنجا و شەستەکانمان بیردێننەوە). خاڵی جوڵانەوەی تورکیا لەپرۆژەی دوژمنکارانەی خۆی دژی عەرەبەکان لەم بوارەدا پەرەیسەندووە، لەکاتی بەریەککەوتنی دوو لایەندا، فاکتەری دەرونی لەم بوارەدا رۆڵە گرنگ دەبینێت: چونکە (وێنەی تورکیا لەنەندێشەی نەتەوەی نویێ عەرەب وێنەیەکی باش نییە، هەردوو لا هەروەك چۆن لەفەلسەفەی رۆژئاوادا هاتووە روبانکردۆتە فکری ناسیۆنالستی. ناسیۆنالیزمی عەرەب، تاکەکان بە دور لەپەیوەندیان بەخەلافەتی ئیسلامی، بەتایبەت ئەگەر ئەم پەیوەندیە بەلایەنی بالآیی نەژادێك لەسەر نەژادێکیتر بەکاربهێنرێت رووله بانگەشەی عەرەبی بوون کردووە و تورکەکانیش لەکۆتایی ئیمپراتۆرەکەیان و پێش کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی و دوای ئەمیش لەوباوەڕەدا بوون کە عەرەبەکان ئەوانیان لەبەرامبەر رۆژئاوا بە تەنیا بەجێهێشتووە). دوژمنایەتی تورکیا لەبەرامبەر عەرەب لەتوێژینەوەیەکدا کە (دکتۆر داقوقی) بە سوود وەرگرتن لەبڵاوکراوەکانی تورکیا لەماوەی سێ مانگی کۆتایی ساڵی (١٩٩٣) و سەرەتای (١٩٩٤) کردویەتی لەبەراوردکردنی بابەتەکانی پەیوەست بە عەرەب و ئیسرائیل، ئەنجامیداوە بە روونی دەردەکەوێت. لەم توێژینەوەیەدا (روون بۆتەوە کە بڵاوکراوە گەورەکان و نەتەوەگەراکان لەدژی عەرەبەکان کاردەکەن و ستایشی کارەکانی ئیسرائیل دەکەن. نوسەر ئاماژە دەکات کە ئەو بڵاوکراوانە لەو ماوەیەدا حەفتا جار وەسفی خراپ لەبارەی عەرەبەوە بەکاردەهێنێت، لەکاتێکدا هیچ وەسفێکی خراپ دژی ئیسرائیل و زایۆنیزم بەکارناهێنێت. هەروەها لەبەرامبەر دوو وەسفی باش بۆ عەرەب و بیست و حەوت وەسفی باش بۆ ئیسرائیل دەکات، واتە چواردە بەرامبەر یەك. ئەگەر بە زمانی ژمارە قسە بکەین وێنەی ئیسرائل لەبڵاوکراوەکانیاندا حەفتا پلە باشترە لە وێنەی عەرەب) ئەم بەڵگانە و هۆکاریتری ناوخۆیی و دەرەکی، هەلی بۆ تورکیا رەخساندووە کە سیاسەتی بەرخورد لەگەڵ جیهانی عەرەب و ئیسلامی بکات و باکوری عێراق لاوازترین ئەڵقەی دەرکەوتنی سیاسەتی دوژمنکارانەی بێت. ئەم سیاسەتە لەبەرامبەر باکوری عێراق (هەرێمی کوردستان) لەسەر بنەمای هاوکێشەیەکی گونجاو دروست نەبووە. بەڵکو لەچەندین رەگەزی جێگیر و گۆڕاوەوە سەرچاوەی گرتووە. رەگەزی جێگیری سیاسەتی تورکیا لەباکوری عێراق رێگرتنە لەدروست بوونی دەوڵەتی کوردی، ئەم کارەش تورکیا لەم قۆناغەی مێژوودا لەرێگای دانوسانەوە یان کۆبوونەوەی خولی رووە و هاوئاهەنگی ناوچەیی لەگەڵ سوریا و ئێران رۆیشتووە بەتایبەتی (لەدوای بەستنی کۆنگرەی نیشتمانی عێراق لەسەلاحەدین لەساڵی (١٩٩٢) و قبولکردنی پرۆژەی فیدراڵی بۆ عێراق). بەڵام بەشێك لەرەگەزە ناجێگیرەکانی سیاسەتی تورکیا لەبەرامبەر باکوری عێراق (هەرێمی کوردستان)* ئاماژە بۆ سێ ئەگەر دەکەین لەخوارەوە:

---

*) نوسەر زاراوەی باکوری عێراقی بەکارهێناوە بەڵام من لەجیاتی باکوری عیراق، زاراوەی (هەرێمی کوردستان)م بەکارهێناوە ـ وەرگێر.

١) ئەگەری پێوەلکاندن و داگیرکردنی ئەم بەشی عێراق بەشێوەیەك كە لەماوەی حەوت ساڵی رابردوودا لەدەرکەوتنە ئاشکراکانی تورکیا و رفتاری سیاسی - سەربازی ئەم وڵاتەدا وەك پرۆژەی کۆنفدراسیۆنی ئۆزال و سیاسەتی بەتورککردن و پرۆژەی (پشتێنەی ئەمنی) لەناو خاکی عێراق خواستی ئەنجامدانی چاککردن و گۆڕینە لەسنوری خۆی لەگەڵ عێراقدا.

٢) ئەگەری دووبارە گێڕانەوەی کوردەکان بۆ باوەشی حکومەتی ناوەندی لەبەغدا بەشێوەی پێویست، کە تورکیا ئەم نیازەی پیشانداوە و لەچەندین جێگا ئەم کارەی کردووە. بەتایبەتی کە بۆی دەرکەوت دۆسیەی عێراق بۆ ماوەیەکی نادیار بە هەڵواسراوی دەمێنێتەوە، لەهەمانکاتدا قەیرانەکە لەرێگای دەستێوەردانی ڕاستەوخۆی سەربازی یان هاوئاهەنگی و هاوپەیمانی لەگەڵ کوردەکانی عێراق چارەسەر بکات و بنکەی ئەو حیزبە (پ.ك.ك) لەسنوری تورکیا و عێراق بپێچێتەوە.

٣- ئەگەری سێیەم هاوپەیمانی لەگەڵ کوردەکان لەدوو دیدگاوە، یەکێکیان شکستهێنا، کە هاوپەیمانی بوو لەگەڵ کوردەکان بۆ لەناوبردنی پارتی کرێکارانی کوردستان، لەئەنجامدا تورکیا بەدوای ئەڵتەرناتیفێتردا دەگەڕا، لەوانە دروستکردنی جۆرێك لەفاکتەری هاوسەنگی لەسیاسەتی خۆیدا لەبەرامبەر هەرێمی کوردستان.

جوڵانەوەی سیاسی تورکیا لەسنوردارکردنی ئەم ئەگەرانە بۆ هەڵبژاردنی میکانیزم و فەراهەمکردنی ئامرازی پێویست و سوودوەرگرتن لەکات بۆ ئەنجامدانی ئامانجێکی سیاسی لەچواچێوەی ئامانجە ئەمنیەکانیدا بوو. ئەم ئامانجە شتێك نییە جگە لەلەناوبردنی پارتی کرێکارانی کوردستان وەك یەکێك لەبەکێشەترین ئامانجەکانی سەرکردەکانی تورکیا، کە بەبێ ئەوە ئەستەمە بگەن بە ئارەزووە گەورەکەیان .

**پرۆژەی ئۆزال:**

ئەو شێوانەی لەبیری دەوڵەتی تورکیادایە بە مەبەستی داگیرکاریانەی ئەم وڵاتە لەبەرامبەر بارودۆخی هەرێمی کوردستان چەند جۆرێکە: ئەوەی کە بە پرۆژەی ئۆزال ناسراوە ئەم پرۆژەیە تیۆرێکە کە ڕاستەوخۆ دوای (نۆیەراسیۆنی گەردەلولی بیابان) ناونرا. ئەم پرۆژەیە لەرووی بەرنامەی گشتی و قۆناغیەوە هاوشێوەی سیاسەتی (تورك سازیە). جیاوازی نێوان ئەم دوانە ئەوەیە کە سیاسەتی تورك سازی ئامانج و هەنگاوە بۆ مەیدانی تورکەکانی (تورکمانەکانی)عێراق، لەکاتێکدا پرۆژەی ئۆزال گرنگی دەدات بە بەرکەوتن لەگەڵ کوردەکان بەشێوەی پۆزەتیف و جلەوگرتنیان و پاشان لکاندنیان بە خاکی وڵاتی تورکیاوە، بەرخوردی تورکیا لەگەڵ ئەم پرۆژەیە جدی بوو ئەم مەسەلەیە لەدانوسانەکانی لەگەڵ هاوپەیمانەکەی کە حکومەتی ئەمریکایە، باسکراوە. نسخەی یەکەمی ئەم پرۆژەیە لەرۆژنامەی حوریەت ناوا باسی دەکات (کۆنفدراسیۆنی کە جێگای تێڕوانینی ئۆزال بوو سەبارەت بە عێراق سێ هەرێمی

عەرەبی، تورکی و کوردی یەکسان لەمافدا پێکدەهێنرێت کە ناوچەی کوردی پێکهاتووە لە هەردوو پارێزگای سلێمانی و هەولێر و ناوچەی تورکی پێکهاتووە لە موسڵ و کەرکوك، دواتر لەپرسیارێکی نوسەر و بیرمەندی تورك (جنگیزجاندار) لە (٢٠/٢/١٩٩١) کە لەنۆزالی کرد، ڕوونیکردەوە کە نامانجیان تورکەکان نییە بەڵکو کوردەکانی عێراقە).

نۆزال لەدوای ئەوەوە دەریخست کە ئامانج لەپێشنیازکردنی ئەم پرۆژەیە، یەکەم دروستکردنی کۆنفدراسیۆن بۆ عێراق نییە و هەروەها ئامانج لەم پرۆژەیە تەنیا تورکمانەکانی عێراق نییە، بەڵکو پرۆژەکەی کوردەکانیش دەگرێتەوە. ئەو دەیەوێت لەرێگای میکانیزی یارمەتی بەوان ڕایانکێشێت بۆ ناو وڵاتی تورکیا لەماوەیەکی درێژی کۆنفیدراسیۆنەکەدا لەگەڵ کوردەکانی تورکیا کۆیانکاتەوە و ئەو ئامانجە بەدەستبهێنێت. بۆیە نۆزاڵ بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی ناچاربوو نسخەی یەکەمی پرۆژەکەی کە ئاماژەی بۆکرا ناونیشانی قۆناغی سەرەتایی وەگرت و ناوەرۆکی ڕاستەقینەی پرۆژەکەی ئەو لکاندنی تورك و کوردەکانی عێراق بوو بە تورکیاوە، دەربڕینەکانی نۆزال سەبارەت بە کوردەکانی عێراق ڕوون و ئاشکرابوو. بڵاوکراوەی الحیاتی لبنانی بەم جۆرە لەزمانی ئەوەوە دەڵێت ( تورکیا دەبێت پەیوەندی توندوتۆڵ لەگەڵ کوردەکان بگرێت، ئێمە دەبێت بچینە ناو هەرێمی کوردستانەوە ئەگەر پێویست بکات (٣٠ تا ٤٠) ملیۆن دۆلار بەوان بدەین، بۆیە دەبێت ئەم کارە بکەین و ئەوان بۆ لای خۆمان ڕاکێشین). لەوەڵامی ئەو پرسیارەی کە ئایا ئەگەری دروست بوونی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی هەیە، نۆزال لەوەڵامدا وتی قسەیەك لەم بارەیەوە بەڕاست نازانم چونکە هەرچی بوترێت بەهەڵە لێکدەدرێتەوە. نۆزال بەشێوەیەکی بەهێز ئاماژە دەکات کە دەبێت هەموو ئەڵتەرناتیفەکان لەوانە فیدراسیۆنیش بە شێوەیەکی ئاشکرا باسی لێوەبکرێت. لەو ئاگادارکردنەوەیدا ئەگەر تورکیا گرنگی بە گۆڕانکاریە بەردەوامەکانی عێراق نەدات، دوچاری هەڵەی گەورە دەبێت و لەوەش زیاتر ئەگەر لەبابەتێکدا نەبین کە بتوانین گرنگی بە ڕەوتی عێراق بدەین، ئەوا ڕووبەڕووی هەڵەی گەورە دەبینەوە ئەگەر لەڕووداوێکدا نەبین کە بتوانین کاریگەری لەسەر یەکێك لەدوو لایەنی ناکۆك لەعێراق جێبهێڵین بابەتی ئێمە بێمانا دەبێت، هەروەها دەبێت واقعی بین و توانای کاریگەریمان لەڕووداوەکان هەبێت و پێویستە لەگەڵ کوردەکان پەیوەندی باشترمان هەبێت. بە بۆچوونی نۆزال تورکیا دەوڵەتێکی گەورەیە و ئەگەر ناڕازیبێت بە دروستبوونی دەوڵەتێك لەباکوری عێراق (هەرێمی کوردستان)، ئەو وڵاتە ناتوانێت درێژە بە مانەوەی بدات، کەواتە بۆ دەبێت کوردەکان بکەینە دەرەوە و بۆ پارێزگاریان لێنەکەین و بکەونە ژێر پارێزگاری خەڵکانیترەوە).

دوای مردنی نۆزال ڕابەرانی تورکیا ناوەڕۆکی ئەو پرۆژەیە ئەوەندەی پەیوەندیدارە بە یارمەتی مادی لەرێگای مانگی سوری تورکیەوە جێبەجێیانکرد، هەرچەندە دابەشکردنی یارمەتیەکان زیاتر ئەو تورك و کوردانەی دەگرتەوە کە دۆست و هاوڕابوون لەگەڵ دەسەڵاتدارانی تورکیادا. یارمەتیە مرۆڤ

دۆستانەکەی مانگی سوری تورکی تا ساڵی (١٩٩٥) لەماوەی دووجاردا گەیشتە (٢٥,٥) ملیۆن دۆلار، بەڵام زەمینەیەکی باشی لەنێوان تورکەکان و کوردەکانی عێراق دروست نەکرد. لەگەڵ ئەوەی پارتی دیموکراتی کوردستان بە سەرۆکایەتی مسعود بەرزانی و یەکێتی نیشتمانی کوردستان بە سەرۆکایەتی جەلال تاڵەبانی، شانبەشانی تورکیا دژی پارتی کرێکارانی کوردستان کەوتنە جەنگەوە، لە (تشرینی یەکەمی ١٩٩٢) رێکەوتنێکی نەمنیان لەگەڵ تورکیا واژۆکرد، رێکەوتن کە (٧٠) خاڵی سنوری لەنێوان هەردوولادا دیاریبکەن، بەڵام هاوسەنگیەکە پەیوەستە بە تێپەربوونی کاتەوە، بەتایبەت دوای شەڕی ناوخۆ (شەڕی براکوژی) هەردوو حیزی سەرکی گۆڕانیان بەسەردا هات. لەدوای ئەوەوە ئەنقەرە دەستیکرد بە تۆمەتبارکردنی جەلال تاڵەبانی بە پەنادان و یارمەتیدانی ئەندامانی پارتی کرێکارانی کوردستان و هەتا هەندێکجار مسعود بەرزانیش ئەم تۆمەتی بەردەکەوت. هەرەشەکانی تانسۆچیلەر لەمسعود بەرزانی لەکاتی یادەوەری پەنجاساڵەی دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان، بەهۆی ئامادەبوونی عوسمان ئۆجالانی برای عبدالله ئوج ئالان سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان لەوکۆبونەوەیەدا زیاتربوو، فشارەکانی تورکیا بەرامبەر مسعود بەرزانی زیادیکرد. وا بەرچاودەکەت کە مسعود بەرزانی لەکۆڕی کوردیدا بەهۆی هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئەنقەرە کەوتبێتە ژێر فشارەوە، هەروەك ئەوەی کە یەکێك لەنوسەران ئاماژەی بۆ دەکات (شتێکی سەرسوڕهێنەر نییە کە هێزەکانی مسعود بەرزانی دەستبخەنە ناو دەستی تورکیاوە و خیانەت لەبرا کوردەکانی خۆیان بکەن).

هەروەها هاتنەناوەی چەندجارەی سەربازانی تورکیا بۆ هەرێمی کوردستان، لەگەڵ بۆردومانی ئاسمانی کوێرانەی ناوچە کوردنشینەکان بەگومانی بنکە و بارەگاکانی پارتی کرێکارانی کوردستان، مسعود بەرزانی دەخاتە بارودۆخێکی نەویستراوەوە و ئەو والێدەکات تا تورکیا لەرێگای ( کۆچ و هەڵاتنی زۆرەملێی مەدەنیەکانی ناوچەکە بەهۆی بۆردومانی تۆپخانەکانەوە) تۆمەتبار بکات.

ئەگەر پەیوەندی تورکیا لەگەڵ جەلال تاڵەبانی لەژێر کاریگەری چەندین کێشەدابوو، هاوپەیمانیشی لەگەڵ مسعود بەرزانی دوچاری چەندین بارودۆخی ناهەموار بوەوە. پەیوەندی تورکیا بە جەماوەری خەڵکی کوردی عێراق لەمە خراپتربوو، چونکە خەڵکی کوردستانی عێراق بەشێوەی بەردەوام دەکەوتنە بەر هاتنەناوەوەی هێزە سەربازیەکانی تورکیا و بۆردومانی کوێرانەی تۆپخانە و هێزە ئاسمانیەکانەوە، بەجۆرێك لەهێرشێکدا زیاتر لە (١٥ هەزار) کورد ماڵ و لانەیان بەجێهێشت و ئاوارە بوون.

بەمجۆرە دەرکەوتنی یەکەم نسخەی پرۆژەی ئۆزال لەدروستکردنی هاوکاری نێوان تورکیا و کوردەکانی عێراق ( تەنها نوسخە بوو کە بتوانێت پارێزگاری هێزی ئەمەریکی لەتورکیا دابین بکات) لەسەرەتادا شایەتی قۆناغێکی باش بوو لەم قۆناغەدا بە ووتەی تاڵەبانی (حکومەتی کوردی پاراستنی شریتی سنوری دەگرێتە ئەستۆی خۆی بۆ رێنەدان بە هیچ جۆرە هێرشێك لەخاکی خۆیەوە بەرەو تورکیا).

مسعود بـەرزانی دوای هەڵوەشـاندنەوەی (ناوچـەی ئـارام) لـەباکور، بەردەوامیـدا بـە هاوپـەیانێتی لەگـەڵ ئەنقەرەدا، لەکاتێکدا پەیوەندیەکانی لەگەڵ جەلال تاڵەبانی پـچڕابوو و گەیـشتبووە قۆنـاغی دوژمنایـەتی. لەدوای ئەمـەوە هەسـتیاری (حـساسیەتی) کوردەکان لەبەرامبەر توکیا، بەتایبەت دوای ڕاگەیاندنی ناوچـەی پشتێنەی ئەمنی لەهەرێمی کوردستان لەلایەن تورکیاوە و درێژەدان بە سیاسەتی تورکـسازی ئەمـە بـەدوو ناوڕدانـە واتـە ناوڕدانەوەیـەك بـەلای تورکمانـەکانی عێـراق و ناوڕدانەوەیـەك بـەلای کوردەکـانی عێـراق زیادیکرد.

ئەنقەرە لەم سیاسـەتانەوە بـەبێ ڕاگەیانـدن نیـازی داگیرکەرانـەی درێـژە پێـدا ... دیـارترینی ئـەم دەربڕینانە و بزوێنەرترینیان قسەکەی سلێمان دمیرل بوو لەسـاڵی (١٩٩٥) کە ووتـی سـنوری ئێمـە لەگـەڵ عێراق هەمان هێڵی نەوتە، سنوری تورکیا لەشوێنێك کۆتایی دێت کە نـەوت کۆتـایی بێـت، ئـەم سـنورانە زانایانی زەوی ناسـی (جیۆلۆجی) دیاریدەکەن و پەیمانی نیشتمانی گرنتیەتی، بەپێی پەیمانی لـۆزان، موسـڵ بەر عێراق نەکەوتووە و بەبەشێك لەتورکیا دەژمێردرێت).

## سیاسەتی تورکسازی:

سەرەڕای ئەو پلانە تیۆریانەی کە بەرپرسانی تورکیا بۆ هەڵسوکەوتیان لەگـەڵ هـەرێمی کوردسـتان دیاریانکردووە، لەبواری کرداریشدا (پراکتیکدا) بوونی هەیە کە ماهییـەتی ترسـناکی ئـەم هەڵـسوکەوتانە نیگەرانی ڕاستەقینەی دروست کردووە، کـە هاوڕایـە لەگـەڵ ماهیـەتی داگیرکارانـەو پاشـکۆکردنی خـاکی عێراق، ئەم نموونە کردارییانە کە بەشێوەی سیاسەتی تورکـسازی خۆی دەنوێنێت لەدوای ڕزگاربوونی هەرێمی کوردسـتان لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی بەغدا مانەوەی وەك ناوچەیەکی پارێزراو پەیڕەویکرا.

تورکیا بۆ ماوەی نزیکەی حەوت ساڵ، هەوڵیدا ئامادەی بەرچـاوی لەناوچـەی هـەرێمی کوردسـتان هەبێت. ئەم ئامادەییە ڕەهەندی سـەربازی و کلتوری جۆراوجۆری وەرگرت، بەبیانووی مەسـەلەی مرۆیی یان سیاسی یان لـەژێر نـاوی شناسـی نەتـەوەیی ئەنجامـدراوە. دوای هـەڵگرتنی هـەنگاوی گـرنگ و هەسـتیار لەبواری (تورکسازی) ئەنقەرە چارەیەکی نەدۆزیەوە جگە لەوەی کە بەشێوەی ئاشـکرا لـەدەربڕینی سیاسـی سـەبارەت بە (تیرۆریزم) وەك تەنیا فاکتەر بـۆ چـونەناوەوەی هـەرێمی کوردسـتان مەسـەلەی تورکمانـەکانی عێراقی وەك مەسەلەیەکی مرۆیی هێنایە پێشەوە کـە دەبێت لەبارەیانـەوە کارێـك ئـەنجام بـدات. تانـسۆ چیللەر لەساڵی (١٩٩٦) کاتێك کە سەرۆك وەزیران بوو، چەندینجار ئاماژەی بۆ ئەم بابەتـە کردبـوو. ئـەو دەریخست کە (تورکیا لەپەیوەندی بەهەرێمی کوردستانەوە دوو مەسەلە ڕەچاو دەکات کە بریتیـە لەخـەبات دژی تیرۆریـزم و پاراسـتنی تورکمانـەکان، لەبەرئـەوە جیهـان ئاگـادار دەکاتـەوە لەپێویـستی پاراسـتنی یەکپارچەی خاکی عێراق و مافی ژیانی تورکمانەکان و سـوودمەندبوون لەئازادی و یەکسانی لەناوچـەکەدا، بە مەبەستی پاراستنی ئاشتی جیهانی).

لەماوەی نزیك بە حەوت ساڵ توركیا كۆمەڵێك كرداری ئاشكرا و نهێنی لەهەرێمی كوردستان ئەنجامدا و وای لەچاودێرانی سیاسی و لێكۆڵەرەوان كرد ئەم جۆرە كارانە بە (توركسازی) ناوبەرن. كردارێك كە لەچوارچێوەی بەرنامەیەكدا كە بە چەند قۆناغێك و بە هێواشی بەڕێوەدەچوو و نەدەكەوتە ژێر كاریگەری پلانی تێڕوانی سیاسی توركیا و گۆڕینی هەلومەرجی سیاسییەوە. (پڕۆژەی توركسازی) لەوانەیە بەشێوەی بنەمای گۆڕاو لەسیاسەتی توركیادا بەمەبەستی چەند لایەنەبێت، كە ئەگەر لەكاتێكدا گۆڕان لەبارودۆخی سیاسی عێراق و ناوچەكە ڕوویدات، ئەم پڕۆژەیە قۆناغێكی هەنگاونانی پێویست بێت بۆ قوتدانی هەرێمی كوردستان و داگیركردنی، بەمەرجێك كە فاكتەری گۆڕاو لەسیاسەتی توركیا لەسایەی گۆڕانكاری ئایندەدا كە ئەوكارە بخوازێت. ئەم پڕۆژەیە لەهەمانكاتدا پڕۆژەیەكی پێویستە وەك ئەڵتەرناتیڤێك جگە لەداگیركردن، كە دەتوانێت توركمانەكانی عێراق وەك تابووری پێنجەم یان دەزگایەك لەدەزگاكانی سیاسەتی توركیا لەئایندەی عێراقدا بەكاربهێنێت*.

هەروەها ئەگەر سەرنج لەكارەكانی توركیا لەهەرێمی كوردستان بدەین ئەم پڕۆژەیە لەسێ بواری گشتی فەرهەنگی- پەروەردەیی، سیاسی و ئاسایشی پێشكەوتنی بەخۆوە بینیوە، لەهەر قۆناغێكدا بە ناونیشانێكی جیاواز و وەك بیانویەكی مرۆیی خراوەتەكار كە بەم شێوەیەی خوارەوەیە.

**(١) بواری فەرهەنگی- پەروەردەیی:**

ئەم بوارە بە كۆڵەكەیەكی سەرەكی لەفكری توركیادا دەژمێردرێت، چونكە مەیدانێكە كەلێیەوە لەشوناسی نەتەوەیی وەك هاندەرێك بۆ ڕاكێشانی توركمانەكانی عێراق و گۆڕینی ئاراستەی فەرهەنگی نەتەوەییان بەلای فەرهەنگی نەتەوەیی و ناوەندی لەتوركیا سوودی لێوەردەگیرێت، ڕواڵەتەن ئەم بیركردنەوەیە بۆ تێكەڵكردنی فەرهەنگە لەڕێگای قوتابخانە، زانكۆ، زمان و سیستەمی فێركاریەوە جەختی لێدەكرێتەوە. بەمجۆرە لەماوەی دوو ساڵدا واتە لەساڵی (١٩٩٣ تا ١٩٩٥) توركیا لەڕێگای هەندێك ڕێكخراوی سیاسی توركیەوە لەعێراق هەستا بە دامەزراندنی ژمارەیەكی زۆر لە قوتابخانە، یەكێتیەكان، كردنەوەی خولی فێركردن و خولی فێربوونی زمانی توركی. یەكێك لەڕۆژنامەكانی پەیوەندیدار بەم ڕێكخراوانە، لەفهرستی كارەكانی ڕێكخراوەكەی خۆیدا ناوی (٢١) بواری چالاكی فەرهەنگی هێناوە لەچوارچێوەی بەرنامەیەكی فێركاری كە جێگای تێڕوانینی تایبەتی توركیایە. یەكێك لەو چالاكیان (دامەزراندنی ١٥ قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی و كۆرسی زمانی توركی لەسەر ئاستی جیاواز بۆ كوڕان وكچان لەهەولێر، دهۆك و كفری). ئەم قوتابخانانە هەوڵدەدات بە فێركردنی (زمانی توركی بە پیتی لاتینی، بەسوود وەرگرتن لەهەمان سیستەمی فێركردن كە لەقوتابخانەكانی توركیادا هەیە)، لەساڵی

---

* ) توركیا توركمانەكانی بەگشتی و بەرەی توركمانی بەتایبەتی وەك تابوری پێنج لەكوردستان پێش ڕووخانی سەدام بەكارهێنا و ئێستاش دوای ڕوخانی وەك فاكتەرێك بۆ دژایەتی كوردەكان لەناوچە دابڕاوەكان بەگشتی و كەركوك بەتایبەتی بەكاردەهێنێت. وەرگێڕ

(١٩٩٧) بەشێوەیەکی زۆر بەرچاو زیادی کردووە. ( لەم قوتابخانانەدا مامۆستای تورکی یان تورکمانی عێراق لەخولی چڕوپڕ و بەپیتی لاتینی لەسەر سیستەمی پەروەردەی تورکیا وانە دەوترێتەوە و ژمارەی ئەم قوتابخانانە تا ئەمڕۆ لەبیست قوتابخانە بۆ هەموو قۆناغەکانی خوێندن تێپەڕی کردووە).

سەبارەت بە یەکێتیە پیشەییەکان، ژمارەیان لە (١٠) یەکێتی زیاترە کە لەسێ شاری هەرێمی کوردستان واتە هەولێر، دهۆك و کفری هەیە. سەرەڕای ئەوە دەتوانین ئاماژە بۆ کردنەوەی چەندین باخچەی ساوایان بکەین و ناردنی مامۆستایانی قوتابخانە سەرەتایی و ناوەندیەکان بۆ تورکیا بکەین. لەناونەوەدا بڕیار دراوە (کورسی خوێندن بۆ تورکمانەکانی عێراق لەزانکۆکانی تورکیا زیاد بکرێت).

جێبەجێکردنی ئەم پرۆژە فەرهەنگیانە جەختکردنەوەی سەرسەخت و بەردەوامی تورکیایە، بۆ بەدیهێنانی ئامانجە بەرچاوەکانی بەپێی بەرنەمەکەی، بەبێ گوێدانە ئەوەی ئاراستەی گشتی سیاسی و گۆڕانکاریەکانی بەرامبەر عێراق، یان هەمەجۆری فۆرمی سیاسی تورکیا لەبەرامبەر دۆسیەی هەرێمی کوردستان چی دەبێت. لەوانەیە لەرێگای ئەم جەختکردنەوەیەوە گرنگی ئامانجی دورمەودای تورکیا بەرچاو بکەوێت و جیاوازی ناکات کە ئایا ئامانج تەنیا پەوەستە بە عێراقەوە یان بەنیەتی سیاسی گشتی تورکیاوە لەناوچەکەدا. بەم شێوەیە بەئاشکرا دیارە کە تورکیا سوورە لەسەر ئەوەی لەرێگای عێراقەوە بگات بە ئامانجەکانی. عێراق وەك مەیدانێکی لاواز و زەبرخوارد بەبۆچونی تورکیا هەلی لەبارو گەورە بۆ مانۆڕ و هێرشی تورکیا فەراهەم دەکات.

**( ٢ ) بواری سیاسی:**

لەوانەیە ئەوەی هەوڵە فەرهەنگیەکانی تورکیا بۆ تورکمانەکانی عێراق تەواو دەکات، مەیدانی سیاسی بێت. بەو جۆرەی کە سیاسەتی تورکیا لەگۆڕەپانی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی تایبەت بووە بەهاوکاری و پەیوەندی بە تورکمانەکانەوە و سیاسەتمەدارانی تورکیا هەوڵی زۆریان داوە بۆ دروستکردنی پارت و هاوپەیمانێتی و ڕێکخراوەی هەمەجۆر لەگۆڕەپانی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقدا کاری زۆری بۆکردون و هەوڵیداوە هەموویان لەیەکهێزدا وەك بەرەی تورکمانی کۆکاتەوە تابتوانێت ئەمانە بە ئاراستەی هێڵی سیاسی گشتی حکومەت تورکیا لێخورێت. دەرکەوتنی بابەتی ئەم بەرەیە پیشاندەدات کە بەهەوڵی تورکیا خۆیان ڕێکخەن و بەشداری بکەن لەپرۆژەی سیاسی پەیوەست بەهەرێمی کوردستانەوە و ڕازیبن بە ڕۆڵێك کە لەدەرەوەی توانای ڕاستەقینەی ئەم بەرەیەدا بووە، بزووتنەوەی بەرە بە جۆرێك جێگای سەرنج بوو کە لەگەڵ گۆڕانکاری سیاسەتی تورکیا سەبارەت بە مەسەلەی عێراق هاوئاهەنگ بوو. گۆڤاری (مطالعات عراق) میکانیزم و ئامانجەکانی پەیوەندی تورکیا لەگەڵ ئەم بەرەیەدا (بەرەی تورکمانی ـ وەرگێڕ) لە کۆمەڵێك بابەتدا کورت کردۆتەوە کە بەشێکیان لە خوارەوە باسدەکەین:

١) بەشدارییپێکردنی تورکمانەکان لەدانوسانەکان و ئاشوریەکان وەك چاودێر بە مەبەستی ئەوەی پیشانیبدات کە هەرێمی کوردستان بە تەواوی ناوچەی کوردنشین نییە، بەڵکو تورکمان و ئاشوریش لەم ناوچەیە دەژین، وێنەیەك کە کوردەکان پیشانیدەدەن کە ئەم ناوچەیە بەتەواوی کوردنشینە هەڵوەشێنێتەوە.*

٢) دەستێوەردان و سەرنجی تورکیا چ لەبارەی مەسەلەی عێراق بەشێوەی گشتی و چ لەبارەی مەسەلەی کورد بەتایبەت لەرێگای رۆڵی بەرەی تورکمانی عێراقەوە، کارێکی ئاشکرا و بەرچاوە. چونکە ئەم دەستێوەردانانە لەژێر ناوی پاراستنی تورکمانەکانی عێراق و ئەنجامدانی کاری مرۆڤدۆستانە خۆی دەنوێنێت. تورکیا خۆی تەنیا وەك پارێزەی تورکمانەکان ناساندووە و ئەم مەسەلەیەی هەرجارە لەرێگایەکی سیاسیەوە بانگەشەی بۆ دەکات.

٣) تورکیا بەبەشداری پێکردنی تورکمانەکان لەژێر ناوی کۆمەڵگای تورکمانی هەوڵیداوە زەمینەی سیاسی بەچالاکیەکانیان ببەخشێت و بەئاراستەی پارێزگاری نەتەوەگەرایانەی تورکمان، بەبێ ئەوەی ناچاربێت لەرێگای هێزەوە ئەمە دەرخات کە لەوانەیە ئەم وڵاتە توشی دەردەسەری بکات و دەستگرتن بەسەریدا و چەکدارکردنیان کێشە بۆ بەرژەوەندیەکانی تورکیا دروستبکات.

٤) بەرەی تورکمانی عێراق لەراستیدا پەنجەرەیەکی کراوەیە بەروو تورکیادا تا باروودۆخی ناوخۆی کوردەکان بەتایبەت پەیوەندیان بە پارتی کرێکارانی کوردستان چاودێری بکات و هەروەها زیاد کردنی نفوزی تورکیا لەناوچەکە و پەیوەندی نهێنی نەوان بە پارتە کوردیەکان و واقعیەتی سیاسی دەگرێتەوە.

کاری سیاسی تورکیا لەمەیدانی تورکمانەکانی عێراق، تەواوکەری جێبەجێکردنی پرۆژەی تورکسازیە و دەزگای سیاسیە بۆ راپەراندنی ئەم پرۆژەیە لەمەیدانی فەرهەنگیدا. لەبەرئەوە تورکیا بەشێوەیەکی نائاسایی لەهەوڵی جلەوکردنی هەموو گروپە جیاوازەکان و لقە سیاسیە تورکمانەکانی عێراقدایە. لەم رێگایەوە تورکیا خۆی پێکهاتەیەکی نەتەوەیی تازەی دروستکردووە دواتر لەرێگای رێکخستنیانەوە ئەم ژمارە گروپ و پێکهاتانەی لەژێر یەك ناودا کۆکردۆتەوە و کە هەمان بەرەی تورکمانی عێراقە. لەناو ئەم بەرەیەدا ناوی جیاواز و ئیئتلافی هەمەچەشنی تێدایە کە پێگە و ئەندازەی هەریەکێکیان جیاوازە. پارتی نیشتمانی کوردستانی عێراق (ساڵی ١٩٩٤ دامەزراوە)، پارتی یەکێتی تورکمان (ساڵی ١٩٩٤دامەزراوە)، پارتی برایەتی تورکمان (ساڵی ١٩٩٢ دامەزراوە)، بزوتنەوەی دیوکراتی تورکمان (ساڵی ١٩٩٤ دامەزراوە)، بەرەی تورکمان (ساڵی ١٩٩٥ دامەزراوە)، لەگەڵ هەندێك

---

*) کورد و پارتی کوردی هیچ وەختێك نەیانووتوە ئەم ناوچەیە بە تەواوی کوردنشینەو هیچ کەمینەیەکی تێدانییە بەپێچەوانەوە لەپەرلەمانی کوردستان کورسی کۆتا بۆ کلدۆئاشوری و تورکمانەکان تەرخانکراوە. بەڵام ئەوەی جەختی لێدەکرێتەوە کوردستانی بوونی ئەم هەرێمیە بە هەموو پێکهاتەکانی وەك کورد و تورکمان و کلدۆ ئاشوری عەرەبی رەسەنەوە. وەگێڕ.

گروپی بچوك كه خۆيان هەڵوەشاندەوە لەناو يەكێتیەكدا لەگەڵ يەكتر ئیئتلافیان دروستكرد. شایانی باسە هەوڵە سیاسیەكانی توركیا بۆ جڵەوكردنی توركمانەكانی عێراق، هەموو چالاكیە سیاسیەكانی توركمانەكانی نەدەگرتەوە، بەتایبەت ئەو هێزە سیاسیانەی لەژێر ئاڵای بزووتنەوەی ئیسلامیدا (فكری ئاینی) خۆيان ڕێكخستبوو، كە خاوەنی ڕێكخراوی سیاسی تایبەت بوون وەك يەكێتی ئیسلامی توركمانی عێراق. ئەم ڕێكخراوە بەناوی ئیسلامی لەژێر ناونیشانی سیاسی و ئايدۆلۆجی بۆ بەدەستهێنانی مافی توركمانەكان كاردەكات و تێكەڵبوونی لەگەڵ توركیا ڕەددەكاتەوە، داوای تايبەتمەندی نەتەوەيی خۆی دەكات لەژێر شوناسی گەلی عێراقدا.

**( ٢ ) بواری ئاسایشی ( ئەمنی ) :**

توركیا هەوڵیداوە بزوتنەوەی ئیسلامی خوازەكان (مەبەستی بزوتنەوەی ئیسلامی توركمانیە) لەڕێگای هاوئاهەنگی كردنی هەنگاوەكانی (توركسازی) لەڕەهەندە فەرهەنگی، سیاسی و ئاسايشیەكان پەراوێز بخات. بەمجۆرە توركیا لەڕێگای هاتنەناوەوەی سەربازی بەردەوام بۆناو باكوری عێراق (هەرێمی كوردستان) و پارێزگاریكردن لەبەرەی توركمانی ڕۆڵی (ئەمنیەتی) بۆ ئەنجامدانی كاری توركسازی لەڕێگای دروستكردنی بنكەی سەربازی و ئاسايشی و ئامادەيی هەمیشەيی و جێگیری هێزەكانی توركیا لەباكوری عێراق (هەرێمی كوردستان) و دروستكردنی باڵی سەربازی بەرەی توركمانی ئەنجام دەدات. ئەم بەرەیە تواناكانی (ئامادەيی ڕاستەوخۆی توركیا لەهەرێمی كوردستان لەڕێگای ڕاوێژكارانی سەربازی، پەروەردەكاران، كۆمیتەی هاوئاهەنگی، میكانیزم و كەلوپەلی سەربازی فەراهەم دەكات و ئەم بەرگە بۆ لایەنی پێویستی ئاسايشی توركیا پێویست وگرنگە). مەیدانی ئەمنی وەك بەرگێك بۆ پاراستنی هەنگاوەكانی توركسازی پراكتیكی كە ئەم هەنگاوانە تەنیا مەیدانی توركمانەكانی عێراق ناگرێتەوە بەڵكو مەیدانی كوردەكانیشی گرتۆتەوە. ئەمكار لەڕێگای هاندانی ئەو كەسانەی نارەزويان هەیە سوود لەئەسل ونەسەبی خۆيان وەرگرن وەك تورك سوودمەند دەبن لەيارمەتیە تايبەتەكانی توركمانەكان. ئەم بارودۆخە وايكرد (هەزاران خێزانی كوردی عێراق هاندا تا خۆيان وەك ڕەچەڵەكی تورك پیشانبدەن و لەلای مانگی سوری توركی بە مەبەستی وەرگرتنی كۆمەكی مادی و يارمەتی خۆراكی خۆيان ناونوس بكەن. ئەم كارە تەنیا لەناونوسیندا كۆنەكرايەوە، بەڵكو كۆمیتەی تايبەت بۆ ئامادەكردنی دۆسیە و پاڵپشتیكردنيان هەنگاوينا كە ئەمانە بۆ فەراهەمكردنی بەرەو داواكاری ئايندەی توركیا لەم ناوچەيە سوودیان لێوەرگرن).

سەرەڕای ئەوەش، تەلەفیزیۆن هەر ڕۆژە چەندين سەعات بەرنامەی بۆ توركمانەكانی عێراق بڵاودەكردەوە. بۆ تەواوكردنی ئەم كارانە توركیا هەوڵدەدات بە دابەشكردنی نەخشەی كۆنی توركیا و

بەکارهێنانی پارەی تورکی کاربکرێت*. هەنگاوێك لەم بارەیەوە هاوکاتبوو لەگەڵ درێژەدان بە نەخشەی تورکیا بۆ لەناوبردنی پارتی کرێکارانی کوردستان.

## ڕوبەڕووبونەوە لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستان:

سەرکردەکانی تورکیا لەدەربڕینە سیاسیەکانیاندا لەشێوەیەك بۆ بەرکەوتن لەگەڵ هەرێمی کوردستان دەیانخستەڕوو، بە هیچ جۆرێك قەیدوبەندیان لەسەر داواکردنی مێژووی و نیەتی تورکیا بۆ داگیرکردن یا لەهەندێك بواردا لکاندنی خاکی عێراق یان ئارەزوو بوون بۆ ڕاستکردنەوەی سنوری عێراق و تورکیا دانەدەنا. بەڵام هەموو کاتێك بەڵگەی هاتنەناوە، جەنگەکان، هێرشی بەردەوامی ئەوان هەرێمی کوردستان ڕاوەدونانی پارتی کرێکارانی کوردستان بووە. بەوتەی ئەوان ئەو پارتە لەڕێگای شەڕی پارتیزانی بەردەوام لەگەڵ هێزی تورکیا دێتە ناو ئەم وڵاتەوە و لەناوچە کوردنشینەکانی سەر سنوری عێراق بنکە و بارەگایان دامەزراندووە و وەك هێزی پشتیوانی بەرەی شەڕ سوودی لێوەردەگرن بە ئازادانە مانۆڕو تدریب و پلانەکانیان دادەڕێژن.

لەساڵی (١٩٩٠) مەسەلەی بوونی هێزی ئەم پارتە لەهەرێمی کوردستان وەك یەکێك لەگەورەترین کێشە بۆتە جێگای باس و لێکۆڵینەوە. پێش ئەم مێژووە ڕێکەوتنی ئەمنی لەنێوان ئەنقەرە و بەغدادا هەبوو، کە مۆڵەتی بە ئەنقەرە دەدا بۆ شوێنکەوتنی شۆڕشگێڕانی پارتی کرێکارانی کوردستان تا قوڵایی (١٥کم) بێتە ناو خاکی عێراقەوە. هەڵبەت دوای کشانەوەی دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی بەغدا لەهەرێمی کوردستان بەدوای گەردەلولی بیاباندا ڕاگەیاندنی ئەم ناوچەیە وەك ناوچەی پارێزراو (منطقةامن)، ژمارەیەك لەهێزەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان لەم ناوچانە کۆبوونەوە ئەم کارەش بووە جێگای نیگەرانی ئاسایشی تورکیا و بەڵگەی دایە دەست تورکیا کە هێرشی سەربازی ڕێکخراو و گەورە بکاتە سەر هەرێمی کوردستان. لەهەر هێرشێکیدا بۆ سەر ئەم پارتە تورکیا بانگەوازی ئەوە دەکات کە بنکە و بارەگاکانی ئەم پارتەی وێرانکردووە و هەزاران کەسی لەئەندامەکانی کوشتووە. وادەبینرێت لەحەوت هێرشی گەورە لەماوەی حەوت ساڵی ڕابردوودا پێگەی سەربازی و سیاسی تورکیا لەشەڕدا، پڕ لەنیگەرانی و سەرگەردانی و ناکۆکی بووە. چونکە:

١) ئاشکرایە کە سیاسەتی تورکیا لەسەر ئەوەبووە کە شەڕی خۆی لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستان کە لەبنەمادا جەنگی ناوخۆیە بگۆڕێت بۆ ڕەهەندی گرنگی ئاسایشی (ئەمنی) بەسوود وەرگرتن لەو فرسەتەی کە هەرێمی کوردستان وەك مەیدانی شەقبردوو بۆ چوونەناوە و دەستتێوەردان سوودی لێوەرگرێت و بیگوێزێتەوە بۆ دەرەوەی وڵات. تورکیا بە تێپەڕبوونی کات تێگەیشت ئەمکارە زۆر دژوارە

---

*) لەدوای هەڵوەشاندنەوەی بەهای پارەی (٢٥) دیناری چاپی سویسری لەلایەن حکومەت عێراقەوە، حکومەت تورکیا لە (١٩٩٣/٥/٢) بڕیاریدا ڕێگەبدرێت بە بەکارهێنانی لیرەی تورکیا لەلایەن کوردەکانەوە لەهەرێمی کوردستان. ڕۆژنامەی الحیاه (١٩٩٣/٥/٣).

بەهۆی ئـالۆزی پێکهاتـەی دانیـشتوانی کوردستان و شـارەزایی گریلاکـانی پـارتی کرێکـارانی کوردسـتان لـەکاتی ڕووبەڕووبونـەوەیان لەناوچـە شـاخاویەکانی کوردسـتان و دژواری ناوچـەکە بـۆ سـەربازە تورکـەکان لەکاتی ئەنجامدانی کاری سەربازی، کە کەوتۆتە دەرەوەی خاکی خۆیانەوە لەم ڕووە (لەبەرژەوەندی تورکیادا نییە کە کێشەکانی خۆی بگوێزێتەوە دەرەوە، بەڵکو دەبێت بەدوای ڕێگا چارەدا بگەڕێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەناو تورکیادا).

٢) لەگەڵ بوونی پەیوەندی نەتەوەیی نێوان کوردی تورکیا و کوردی عێراق و یەکێتیان لەمەسەلەی (سەربەخۆیی) و هەستی هاوبەشیان لـەبارەی زڵـم و سـتەمەوە کـە لەسـەریان دەکرێـت، ڕابـەرانی تورکیـا توانیویانە لەسایەی ئەوەی کە کوردەکان بیسەلمێنن کە ئاسایش لە (ناوچەی ئامینە) دروست بووە، لەنێوان کوردەکاندا درز و کەلێن دروستبکەن. کوردەکانی عێراق ڕازیـابن بە دەسـتتێوەردانی ڕاسـتەوخۆی تورکیـا لەناوچـەکەیان. بـەڵام تورکیـا توانیویـەتی کوردەکـانی عێـراق (یـەکێتی نیـشتمانی کوردسـتان و پـارتی دیموکراتی کوردسـتان) بەنوێنـەرایـەتی لـەهێزی تورکیـا ڕایانکێـشێتە نـاو شـەڕەوە دژی پـارتی کرێکـارانی کوردستان. دوای هەموو ئەم جەنگە بە هێزانە کە لەنێوان کوردی عێراق و کوردی تورکیا ڕوویدا کێشەکە کۆتـایی نـەهاتووە و تارادەیـەك قـەیرانی سـەرەکی و ئـالۆزی پەیوەسـت بـەکوردەکان دروسـت بـووە و کاریگەریەکەشـی لەئاینـدەدا دەردەکـەوێت. کوردەکـانی عێـراق ئـەم مەسـەلەیەیان پـێش تورکیـا هەسـتپێکردووە لەکاتێکدا تورکیـا هەمیـشە پەیوەنـدی لەگـەڵ ئەمانـە بەرێـژەی ئامـادەیی کوردەکـان بـۆ هاوکاری تورکیا لەشەڕدا دژی پارتی کرێکـارانی کوردسـتان ڕێکخـستووە و بەشـێك لـەکوردەکانی عێـراق لەماوەی ساڵانی ڕابردوودا بۆ ئەمکارە گوێڕایەڵ بوون.

٣) شکستهێنانی هێزە کوردیەکانی عێراق بۆ یەکلاکردنەوە و چارەسـەری بارودۆخەکـە لەهـەرێمی کوردسـتان و بـەردەوامی هێرشـی تورکیـا کـە لەلایـەن هەنـدێك لـەم هێزانـەوە پارێزگاریـان لێـدەکرا، دەربڕینـەکانی بەرپرسـانی تورکیـا لەڕوونکردنـەوەی هەریـەك لەهێرشـەکان زیانـەکانی سـوپای خۆیـان بەشاراوەیی دەهێشتەوە و زیادەڕۆییـان دەکـرد لەزیانـەکانی پـارتی کرێکـارانی کوردسـتان. بڵاوکراوەکـانی تورکیاش بەهەمان شێوە (زیادەڕۆیی دەکەن لەبڵاوکردنەوەی زیانی گیانی).

لەلایەکیترەوە، ئەم دەربڕینانە ئاماژەی مەزەندە و گومانی خۆشـبینی و بەدبینیـە، کـە کاریگـەری نەگەتیفی لەسەر ورەی سـەربازانی سـوپای تورکیـا هـەبوو کـە فەرمانـدەکانیان لەهـەر هێرشـێکدا بۆسـەر هەرێمی کوردستان بەڵێنی کۆتایی شەڕ بە سەربازەکانیان دەدەن.

٤) مەسـەلەی پارتی کرێکارانی کوردستان لە دیدی چاودێرانەوە یەکێکە لەکێشە ئەمنیـەکان، کـە جەنگ لەناو خاکی عێراقدا ئەمە چارەسەر و یەکلا ناکاتەوە و دەبێت ڕێگاچارەی نـاوخۆیی و ڕیـشەیی بـۆ بدۆزرێتـەوە و مـافی نەتـەوەیی و ئـاینی و فەرهـەنگی کوردەکـان و کەمینـەکانیتری تورکیـا کـە لەلایـەن

سیستەمی علمانی ئەتاتورکەوە گیرۆدەبوون، بدرێت. ڕووبەڕووبوونەوەی پارتی کرێکارانی کوردستان و حکومەت تورکیا بۆ ماوەی پازدە ساڵە درێژەی هەیە و دەیەها هەزار کەس گیانیان لەدەستاوە و لەساڵی (١٩٨٤)ەوە تائێستا (١٨ هەزار لە شۆڕشگێرانی کورد و ٨ هەزار کەس لە سوپا کوژراوە). بەپێی وتەی بەرپرسانی تورکیا زەرەری مادی دەگاتە (٢٠) ملیارد دۆلار، ژمارەی زەرەری مادی و مرۆیی هەرچەندێك بێت، دەوڵەتی تورکیا تا ئێستا لەهەوڵدایە ئەم قەیرانە ئەمنیە بگوێزێتەوە دەرەوە و ڕێگاچارە و چارەسەرکردنی بخاتە مەیدانی وڵاتانی دراوسێوە. مەبەست لەناردنی قەیران بۆ وڵاتانی دراوسێ بۆ گەیشتنە بە ئامانجێتر. هەروەك ئەوەی کە پسپۆران دەڵێن ئەنقەرە لەکۆتایدا هیچ چارەیەکی نییە جگەلە دانوسان لەگەڵ ئەم پارتە (کە سەرکردەکان و ئەندامانی لەناو جوتیاران و کرێکارانی هەژار و وردەبۆرژوا دروستبوون. ئەمانە بۆخۆیان تیۆرێکیان داناوە کە لەتێڕوانینی نەتەوەیی و چەپی توندڕەو پێکهاتووە کە ئەندامانی ئومێدەوارن بە زووترین کات ئیمپریالیزم و سەرمایەداری بڕوخێت و لەجێگای وڵاتی کرێکاران و جووتیاران بۆ کورد دروست بێت، لەسەر بنەمای ئەم باوەڕە هەموو کوردەکانی تورکیا و دەرەوەی تورکیا دەیانەوێت پەیوەندی بکەن بەم شۆڕشەوە و لەژێر ڕابەرایەتیەکەیدا کۆببنەوە).

هەرچۆنێك بێت، قەیرانی ئەمنی کە ئەم پارتە دروستیکردووە، وای لەتورکیا کردووە داوای یارمەتی لەدەسەڵاتدارانی عێراق بکات و کوردەکان لەڕێگای لێکتێگەیشتنەوە بەلای خۆیدا ڕاکێشێت.

### تورکیا ... دەسەڵاتی حاکمی عێراق وەك ئەڵتەرناتیفێك:

هەروەك ئاماژەی بۆکرا، ئەنقەرە لەلاوازی حکومەتی عێراق سوودوەردەگرێت بۆ درێژەدان بەمانەوەی سیاسی/سەربازی خۆی لەهەرێمی کوردستان و ئەم لاوازیەی دەوڵەتی عێراق و گەمارۆ نێودەوڵەتیە و گۆشەگیری سیاسی ئەم وڵاتە یارمەتی تورکەکانی داوە درێژە بە سیاسەتی دوولایەنە یان سیاسەتی فرە جەمسەر بدەن، بەبێ ئەوەی ببێتە هۆی تووڕەبوونی عێراق. چونکە حکومەتی عێراق لەبەرامبەر هەنگاوەکانی تورکیا و ئارزوو بۆ درێژەدان بە پەیوەندی لەگەڵ ئەنقەرەدا لەم بارووددۆخەدا ، هەتا لەکاتی هاتنەناوەوەی تورکیا بۆ ناو خاکی عێراق، جگە لەبێدەنگی هیچ چارەیەکیتری نییە. بۆیە زۆرجار عێراق لەکاتی هاتنەناوەوەی تورکیا بۆناو خاکی عێراق لەباکور یان بێدەنگ دەبوو یان نارەزاییەکی نەرمی دەنواند. هەندێك لەپسپۆران لەو باوەڕەدان (حکومەت عێراق لەبەرامبەر ئۆپەراسیۆنی سەربازی تورکیا لەهەرێمی کوردستان نارەزایەتی توندی نەبووە، بەڵکو لەبەرامبەر زۆرترینی ئەم ئۆپەراسیۆنانە بێدەنگ بووە). تورکەکان بە پشت بەستن بەم بارودۆخە، بەرژەوەندی ئابووری خۆیان بەرێوەدەبەن و بەشێوەی بەردەوام جەخت لەوە دەکەنەوە، لەگەڵ ئەوەی یارمەتیان لەئەمەریکا و وڵاتانی کەنداو وەرگرتووە لەبەرامبەر پەیوەستبوون بە گەمارۆی ئابووری سەر عێراق، بەرژەوەندیە ئابووریەکەیان بەهۆی گەمارۆی ئابووریەوە توشی زەرەربووە. ( بەجۆرێك کە حکومەت سعودی ئاگادارکردەوە کە دەبێت بە بەهای (١,١)

ملیۆن دۆلار نەوت بە خۆرایی بە تورکیا بدات و حکومەت کوێت (٩٠٠) ملیۆن دۆلاری پێببەخشێت، تورکیا دەریخست کە نزیکەی (٢٧) ملیارد دۆلار زەرەری بەرکەوتووە و ڕێژەی بازرگانی لەگەڵ عێراقدا (دابەزیوە بۆ نزیکەی ٢٠٠ملیۆن دۆلار لەساڵێکدا، لەکاتێکدا پێش گەمارۆی ئابووری لەسەر عێراق نزیکەی سێ ملیارد دۆلاربووە لەساڵێکدا). بەوتەی بەرپرسانی تورکیا، (ئەنقەرە پێش قەیرانی کەنداو لەهەر ساڵێکدا لەبەرامبەر گواستنەوەی (٧٠) ملیۆن تەن نەوتی عێراق، ڕێژەی (٢٥٠) ملیۆن دۆلاری باج وەرگرتووە و (١٠٠) ملیۆن دۆلاری لەبەرامبەر خزمەتگوزاری بەندەرەکان وەرگرتووە).

تورکیا بۆ کەمکردنەوەی ئەم زەرەرانە لەسەرەتادا پەیوەندی ئابوری و بازرگانی باشی لەگەڵ بەغدا پاراست و چەندین دەستەی نوێنەرایەتی بۆ دیدار لەبەغدا و دانوسان لەگەڵ بەرپرسانی عێراق و واژۆکردنی چەندین ڕێکەوتننامە نارد. گەورەترین ڕێکەوتننامەی واژۆکراو لەنێوان هەردوو وڵاتدا بۆ ڕاکێشانی {بۆری گواستنەوەی گازی سروشتی عێراق بۆ بەندەری جیهانی تورکیا لەسەر دەریایی ناوەڕاست بە درێژایی (١٣٠٠)کم بەتێچونی (٢,٥) ملیارد دۆلار کە توانای گواستنەوەی (١٠) ملیۆن مەتر سێجای لەساڵێکدا هەیە} . دوای بڕیاری (٩٨٦)ی (نەوت بەرامبەر بە خۆراك) جارێکیتر دوو هێڵی بۆری نەوتی عێراق تورکیا لەڕێگای هەرێمی کوردستانەوە خرایەوە کار. تورکیا بۆ چارەسەرکردنی ئەم دوو هێڵە جەختی زۆری کردەوە و هەوڵی زۆریدا، هەروەها ئومێدەواربوو (هەموو مادە خۆراکیەکان کە عێراق لەچوارچێوەی ئەم بڕیارەدا دەیکرێت ئەو واتە تورکیا پێی بفرۆشێت).

پێش ئەمەش تورکیا پێشەنگایەکی داودەرمانی لەبەغدا کردەوە کە (بەیەکەمین پێشەنگای لەم جۆرە دەژمێردرێت لەدوای سەپاندنی گەمارۆی ئابووری نێودەوڵەتیەوە بەسەر عێراقدا لەساڵی ١٩٩١)دا. لەسەرەتای ساڵی ١٩٩٧ (١٣٠٠ لۆری تایبەت بە کوردەکانی تورکیا ڕۆژانە لەبنکەی سنوری خاپوری نێوان ئەم دوو وڵاتە دەپەڕینەوە بەناو دەسەڵاتی کوردەکانی عێراقدا دەڕۆیشتن بەشێوەی بەرفراوان بۆ گواستنەوەی مادەی خۆراکی و لایەنی فرۆشیار لەهەرێمی کوردستان پارەیان پێدەدرا کە ئەم ژمارەیە لەو سەردەمەدا چەند بەرامبەر بوو. ئەم لۆریانە لەڕێگای گەڕانەوەیان گازوایلی زیادەیان لەتەنکی زیادە باردەکرد و لەتورکیا بە نیوە قیمەت دەیانفرۆشتەوە).

سەرەڕای ئەمە (٣٠٠) لۆریتر ڕۆژانە لەبنکەی سنوری خاپور بۆ بارکردنی مادەی خۆراکی کە عێراق لەچوارچێوەی بڕیاری ژمارە (٩٨٦) ئەنجومەنی ئاسایش بەناوی (نەوت بەرامبەر خوراك) دەکڕدرا لێرەوە تێدەپەڕی.

بەرپرسانی تورکیا چاوی خۆیان لەبەقاچاغ بردنی گازۆیلی عێراق دەنوقاند و لەسەرەتای ساڵدا سیاسەتی کراوەتریان لەگەڵ جوڵەی ئابووری لەناوچەکانی باشوری ڕۆژهەڵاتی تورکیا (کوردستانی تورکیا) پەیڕەویکرد، کە لەساڵی (١٩٨٤)ەوە شایەتی شەڕو پێکدادانی کوردە جیاوازیخوازەکان و دەسەڵاتی

ناوەندی بووە. لەم بوارەدا، دەسەڵاتدارانی تورکیا ڕێگەیاندا کە ڕێژەی جۆری لۆری بچوکی هەڵگری گازوایل لە دوو تەن تا چوار تەن و هەروەها کامیۆنی گەورە کە توانای بارکردنی چوار تەن تا هەشت تەنیان هەیە، بە مەرجێك بۆدیەکانیان دیارو شەفاف بێت بە مەبەستی ڕێگرتن لەبەقاچاغ بردنی چەك.

هەروەها دەسەڵاتدارانی تورکیا لەپایزی ڕابردودا مۆڵەتی کردنەوەی دەروازەی سنوری سەر ڕووباری خاپوری نێوان تورکیا و عێراقیاندا کە ماوەی ساڵانێك بوو بەسترابوو. لەکانونی دووەمەوە ئەم دەروازەیە بیست وچوار کاتژمێر کراوەبوو، لەکاتێکدا پێشتر لەگەڵ ڕۆژئاوابوون بەبیانوی ئەمنی دادەخرا. لەئێستادا (٢٧) هەزار لۆری بەشداری دەکەن لەبارکردن و گواستنەوەی کاڵا لەسنوری نێوان عێراق و تورکیا، لەکاتێکدا ئەم ژمارەیە لەمانگی ئابدا (١٩٩٤) دانەبوو. واتە لەگەڵ کردنەوەی سنوری نێوان ئەم دوو وڵاتە کە بەهۆی جەنگی کەنداو لەسەرەتای ساڵی (١٩٩١) بەسترابوو، (٣٥٠٠) لۆری بوو. ئەم لۆریانە ڕۆژانە (٦٠٠٠) تەن گازۆیل کە دەکاتە (٢,٥) ملیۆن تەن لەساڵێکدا دەگوازنەوە بۆ تورکیا.

لەم ڕووەوە هەر ڕۆژێك نزیکەی دووهەزار تەن مادەی خۆراکی لەڕێگای لۆریەکانەوە کە هەریەکەیان مۆڵەتی (١,٥) تەن باریان هەبوو لەسنورەوە دەهاتنە عێراقەوە. یەکێك لەبەرپرسانی تورکیا بڵاویکردەوە کە ( لایەنیکەم نیوملیۆن کەس گوزەرانیان لەسەر ئەم بازرگانییە) ئەنقەرە لەم پیوەندیە ئابوری/بازرگانیە لەڕێگای بەرخورد بەهەرێمی کوردستان سوود وەردەگرێت، واتە هەرکاتێك قەیرانی ئەمنی پارتی کرێکارانی کوردستان زۆردەبێت بێتوانایی تورکیا لەسەرکەوتن ئاشکرا دەبێت، تورکیا بە ئاراستەی کارگێری سیاسەت و ئارەزووکردن (بەردەوامی سەرۆکاتی سەدام حسین لەعێراق کۆتایی هاتن بە ناکۆکی لەهەرێمی کوردستان) وە خواستی خۆی بۆ (گەڕاندنەوەی عێراق بۆ ناو کۆمەڵگای نێودەوڵەتی و هەوڵەکانیشی لەو بوارەدا ئاشکرایە). تورکیا کوردەکانی عێراقی بانگکرد بۆ (گفتوگۆ لەگەڵ بەغدا) و ئەم گفتوگۆیەی نێوان کوردەکانی عێراق و سەدام حسین، کاتێك گۆڕا بۆ ئامانجێك لەئامانجەکانی سیاسەتی تورکیا لەهەرێمی کوردستان تا ئەو ئاستە گەیشت کە وەزیری دەرەوەی تورکیا بەمجۆرە دانیپێدادەنێت کە (تورکیا لە(٣١ئابی ساڵی ١٩٩٦) گڵۆپی سەوزی بۆ هێزەکانی عێراق هەڵکردبوو تا بێنە ناو شارەی هەولێرەوە). هەڵبەت چیللەر لەم ووتەیەی خۆی پەشیمان بووەوە و کاتێك ڕۆژنامەی نیۆرك تایمز ئەمەی بڵاوکردەوە ئینکاری لێکرد. هەرچەندە چاودێران لەو بڕوایەدابوون داڕێژەری ئەم پلانە بە لایەنگری سیاسەتی تورکیا لەهەرێمی کوردستان هاوئاهەنگە. تورکیا لەهەوڵی گەڕاندنەوەی هەرێمی کوردستان بوو بۆ باوەشی دەسەڵاتی ناوەند لەبەغدا، سەرەڕای پلانەکانی، لەدیدگای گشتییەوە لەمەسەلەی عێراق دەڕوانێت و هەوڵدەدات سەدام حسین لەسەر کورسی دەسەڵات بمێنێتەوە. بلند ئەجەوید کە حکومەتی ئیئتلافی بە پشت بەستن بەنوێنەرانی لایەنگری ئەو بوو. (پرۆژەی ئاسایشی ناوچەیی) ڕاگەیاند کە لە (١٢) بەند پێکهاتبوو بۆ (گێڕانەوەی یەکێتی عێراق) و (هەڵگرتنی گەمارۆی ئابووری و کۆتاییهێنان بە

چەکوشی ئامادە/ پرۆفاید کومفۆرد) پێکهێنانی هێزی سەربازی ئەمەریکی و تورکی لەجێگای. ئەم پرۆژەی ئاسایشیە داوا لەرژێمی دەسەڵاتدار لەبەغدا دەکات بە قبولکردنی دیموکراسی و رێزگرتن لەمافی مرۆڤ بەپێی بریاری (٦٨٨) ئەنجومەنی ئاسایش (لەرێگای گفتوگۆ لەگەڵ نوێنەرانی یاسایی کوردەکان و شیعەکان و تورکمانەکان) و بەردەوامی چاودێری نێودەوڵەتی لەسەر عێراق بۆ قەدەغەکردنی دروستکردنی چەکی ئەتۆمی و کیمیایی و بایەلۆجی و دامەزراندنی شریتی سنوری ئەمنی لەسنوری ناوەوەی عێراق بە رێکەوتن لەگەڵ بەغدادا. ئەجەوید لەپرۆژەکەی خۆیدا (لەئەمەریکا دەخوازێت سیستەمی ئەلەکترۆنی دامەزرێنێت بۆ مەترسی خێرا) بە مەبەستی (لەناوبردنی پارتی کرێکارانی کوردستان و کۆتاییهێنان بە چالاکیەکانیان) و (بەرێوەبردنی ئاشتەوایی لەنێوان عێراق لەلایەك و ئیسرائیل و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەلایەکیترەوە)، دەیویست بە تیرێك چەند نیشانێك بشکێنێت وەك:

١) رزگاربوون لەمەسەلەی پارتی کرێکارانی کوردستان لەرێی هاوئاهەنگی لەگەڵ بەغداوە.
٢) لەهەمانکاتدا پاراستنی فکری پشتێنەی ئەمنی لەناو خاکی عێراقدا.
٣) راکیشانی رەزامەندی ئەمەریکا لەرێگای ئاشتی بەغدا و تەلئەبیبەوە.
٤) لەکۆتایدا بگەن بە ئامانجی گەمارۆدانی ئێران و سوریا لەرێگای ئاسۆیەکی دوورەوە کە لەم سیناریۆیەدا خراوتەروو.

رواڵەتەن ئاشکرا بووە کە ئەم پرۆژەیە لەحساباتی واشنگتۆن کە هەروا سیاسەتی خۆپاریزی دەکات لەبریار وەرگرتن لەبارەی دۆسیەی عێراقەوە، لەئەنجامدا ئەنقەرە لەم رووەوەی رووبەرووی کۆسپ بووەوە، بۆیە مەبەستی خۆی لەدروستکردنی پشتێنەی ئەمنی راگەیاند.

## پشتێنەی ئەمنی:

لەساڵی (١٩٩٥) بەرپرسانی تورك بەدەنگی بەرز باسیان لەپێویستی دامەزراندی (ناوچەی لەمپەری ناوخۆیی) لەناو خاکی عێراق بەشێوەی پشتێنەیەکی سنوری دراوسێی تورکیا دەکرد. ئەم هاوکێشەیە بۆ ئەوان لەحکمی گرنگترین مەسەلە لەقەیرانی پارتی کرێکارانی کوردستان دەژمێردرێت کە لەهەرێمی کوردستان وەك بنکە بۆ هەندێك لەهێزەکانیان سوودی لێوەردەگرن.

لەگەڵ زۆربوونی قەیرانی ئەمنی تورکیا و شکستی هەنگاوەکانی سوپای تورکیا بۆ لەناوبردنی پارتی کرێکارانی کوردستان، تورکیا لەناوخۆ و دەرەوەی تێکشکانی گەورەی بینی لەحەوت هێرشی گەورە بۆ ناو خاکی عێراق لەساڵی (١٩٩١)ەوە، دەنگی تورکیا بەشێوەی ئاشکراو نارەحەت لەساڵی (١٩٩٦)دا بەرزبووەوە و ئامانجی بەهێزیان بۆ دامەزراندنی پشتێنەی ئەمنی لەهەرێمی کوردستان راگەیاند. لەوکاتەدا سەرۆك کۆماری تورکیا، سلێمان دمیرل روونیکردەوە کە (وڵاتەکەی لەدامەزراندنی پشتێنەی ئەمنی لەهەرێمی کوردستان بە قوڵایی (٥ تا ١٥)کم بۆ مەبەستی رێگرتنە لەهاتنەناوەوەی گریلاکانی پارتی

کرێکارانی کوردستان. ئەم دەربڕینانە لەڕاگەیاندنی تورکیادا بۆ دروستکردنی ئەم ناوچەیە و دواتر وازهێنان لێی هاوڕابوو. تورکیا تا (٢٢ ئۆکتۆبەری ١٩٩٧) پابەندبوو بەم پڕۆژەیەوە و لەوکاتەدا سەرکردەکانی تورکیا بەشێوەیەکی لێبڕا و کۆتایی دروستکردنی پشتێنەی ئەمنییان ڕاگەیاند، هەمستان بەکارکردن لەپێناویدا بەبێ گوێدان بە ناڕەزایەتی عەرەبەکان و وڵاتانی ناوچەکە و هەندێك لەناڕەزایەتی نێودەوڵەتی. بەڵام سەبارەت بە ڕۆژئاوا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کە پێشتر لەم بارەیەوە محافزکاربوون، لەکاتی دیداری چیللەر لەواشنگتۆن لەساڵی (١٩٩٦) هاودڵی و پاڵپشتی ڕاگەیاندنی تورکیا بۆ دروستکردنی ناوچەی ئەمنی گۆڕانی بەسەرداهات. لەکاتی ئەم دیدارەدا، وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا کریستۆفەر دەریخست کە ( واشنگتۆن پاڵنەر و فاکتەرەکانی تورکیا بۆ دروستکردنی ناوچەی ئەمنی لەهەرێمی کوردستان هەست پێدەکات). لەسایەی هاوپەیمانێتی تورکیا لەگەڵ ئیسرائیل و پەیوەندیکردنی ئەمەریکا لەڕێگای مانۆڕی سەربازی سێ لایەنەوە و ئامادەبوونی ئیسرائیل لەئۆپەراسیۆنەکاندا ئەم فکرەیەی لەسەر شێوەی پشتێنەی ئەمنی باشووری لبنان وەرگرتووە. کاتێك کە پەیوەندی تورکیا و ئیسرائیل گەیشتە سنوری هاوپەیمانی و دوای ئەوە بۆ چارەسەری کێشەی عێراق لەچوارچێوەی پڕۆژەیەك کە جگە لەئەنقەرە و تەلئەبیب، عەمان و بەغداش (دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام) دەگرێتەوە و هاوئاهەنگی و بڕیارەکان لەژێر چاودێری ئەمەریکا و بەریتانیا ئەنجام دەدرێت و فاکتەری سێیەم بە ناوی پڕۆژەی دانانی پشتێنەی ئەمنی لەهەرێمی کوردستان دەخرێتەڕوو. کە بنەماکەی لەفکری ئیسرائیلەوە سەرچاوە دەگرێت، کە ئیسرائیل تورکیای بۆ سوودوەرگرتن لەم پڕۆژەیە هاندابوو. ئەم پڕۆژەیە بەشێك لەبەرژەوەندییەکانی ئیسرائیل لەناوچەکە جێبەجێدەکات:

١) ئەم پڕۆژەیە دەگۆڕێت بۆ پردی پەیوەندی و کرانەوەی پەنجەرەیەك بەڕووی ئیسرائیلدا، تا لەڕێگایەوە کادران و پسپۆڕانی ئیسرائیلی بەبیانووی ئەوەی کە خاوەنی ئەزموونی پراکتیکی و هونەرین لەم بوارەدا ڕەوانەی تورکیا بکرێن.

٢) بەمجۆرە دروستکردنی هەرناوچەیەکی ئەمنی لەهەرێمی کوردستان، بواری ڕاستەوخۆ بۆ ئیسرائیل لەناوچەی سێگۆشەی جوگرافی دەرەخسێنێت کە بە (دڵی) ستراتیجی ئەمنی دەژمێردرێت. ئامادەیی ئیسرائیل لەم سێگۆشەیەدا تەنیا کەلێنێك بە زەرەری ستراتیجی ئەمنی سوریا و ئێران ناگەیەنێت، بەڵکو بە جێگیرکردنی ستراتیجێکی گرنگ دەژمێردرێت کە ئیسرائیل لەناوەندی بڕیار کە یەکپارچەیی عێراق و تەواوی ناوچەکە لەناو ئامانجەکانیدا جێگیر کراوە. بەتایبەت کە لەتەلئەبیب زۆر لەچەمکەکانی پێشووی لەبواری (ئاسایشی ژیانی ـ ئەمنی حیاتی) گۆڕاوە تا ئەو جێگایەی کە فراوانی ئەو لەسایەی پەرەسەندنی چەکدارکردنی جیهانی هەریەك لەوڵاتانی ئێران، تورکیا، وڵاتانی کەنداو، عێراق و کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست بگرێتەوە.

٣) پشتێنەی ئەمنی لەهەرێمی کوردستان لەوانەیە لەئامانجی خۆیدا، دابەشکردنی عێراق بێت و دواتر دابەشکردنی جیهانی عەرەبی و ئیسلامیش بگرێتەوە. ئامانجێك کە تەلئەبیب سالآنێکی دوورودرێژ تا ئەمڕۆ بۆ ئەنجامدانی کاریکردووە و پرۆژەی جۆراوجۆری بۆ گەیشتن بەم ئامانجە دارشتووە.

٤) تورکیا چاوتێبرینی لەمێژینەی خۆی بۆ عێراق و ئامادەیی بۆ داگیرکردنی هەرێمی کوردستان ناشارێتەوە و سەرکردەکانی تەلئەبیب لەپشتێنەی ئەمنی هەلی گونجاو بۆ هاندانی تورکیا بۆ بەدیهێنانی ئارەزوە داگیرکەرانەکانی و دەستتێوەردانیان لەپرۆژەی پارچەپارچەکردندا دەبینن.

٥) ئیسرائیل لەلایەنی هاتنەناوەوە لەخەباتی سیاسی ناوخۆی تورکیا و بەتایبەت دوای پەرەسەندنی بزوتنەوەی ئیسلامی بە ڕابەرایەتی پارتی رفاه، چالاکی هەبووە و مەبەستیشی ئەوەبووە کە پالپشتی لەو لایەنانە بکات کە ئارەزوی هێرشیان بۆ دەرەوە هەیە بەوەرگرتنی بریاری دژ بە بزوتنەوەی ئیسلامی لەناوخۆدا و لایەنگری لەبەرژەوەندی سوپای علمانی. لەسەر ئەم بنەمایە پرۆژەی پشتێنەی ئەمنی لەهەرێمی کوردستان ئامانجی سوپای تورکیا بەدیدێنێت.

٦) تورکیا هەولدەدات لەململانێی هەرێمی ئیسرائیل ـــ ئێران خۆی لەئاگری ئەم شەڕە هەلقورتێنێ و بە پارێزگاریکردن لەحەزی جیاواز لەناو ئێران و لەهەرێمی کوردستان ناوچەی بەرکەوتن و جێگای ناکۆکی لەگەلّ ئێران دروست بکات. دەبێت بزانرێت تاران هەستدەکات پشتێنەی ئەمنی مانای قەلّی هەیە لەپەیوەندیەکان بەباروودۆخی ئاسایشی دەرەوە لەئایندەدا.

پسپۆری سیاسی (سیلڤیا بۆلینگ) لەم بارەیەوە دەلّێت (ڕووداوەکانی باکور (مەبەستی هەرێمی کوردستانە ـ وەرگێڕ) پیشاندەری نیازیکە بە ئاراستەی دابەشکردنی عێراق. هەنگاوی دەولەتێکی وەك تورکیا لەرێگای هەولدان بۆ دانانی پشتێنەیەکی سنوری ئەمنی لەناو خاکی عێراقدا واتە هاندانی دەولەتێکی وەك ئێرانە بۆ ئەوەی بە هەمانشێوە کارێکی لەو جۆرە بکات لەسەر سنوری خۆی لەگەلّ عێراق، لەم بارودۆخەدا دەولەتێکی وەك سوریا هەولبدات بۆ داواکردنەوەی مافی خۆی لەو ناوچانەی کە تورکیا خستویەتیە سەرخۆی وەك پارێزگای ئەسکەندەرونە).

بەپێی هەموو ئەم بەلگانە (بیرۆکەی پشتێنەی ئەمنی، بیرۆکەیەکی ئیسرائیلیە و ژمارەیەك لەئەفسەرانی مۆساد دایانڕشتووە، لەرێگای دانیشتنی هاوبەش لەنێوان ئەفسەرانی ڕێکخراوی نهێنی سەهیۆنی و ئەفسەرانی ئیستخباراتی سوپای تورکی). بیرۆکەی پشتێنەی ئەمنی ئەگەر لەقولآیی جوگرافی و تایبەتمەندی دانیشتوانەوە سەرنج بدەین، بیرۆکەیەکە بەواتای داگیرکردن لەچەمکی گشتیدا (وەك ئەزمونی باشووری لبنان). هەرچەندە واچاوەڕوان ناکرێت ئەم مەسەلەیە لەڕووی فکری و کرداریەوە سەرکەوتووبێت و قابیلی پیادەکردن بێت بەهۆی تایبەتمەنی تورکیاوە کە:

١- ئەگەر ئامانج لێی ڕاکێشانی تورکمانەکانی عێراقە. ئەم کارە لەڕووی تیۆریەوە لەدەرەوەی بەرێوەبەرایەتی تورکیایە هەروەك چۆن ئەزمونەکان دوای چەندین مانگ لەڕاگەیاندنی پشتێنەی ئەمنی لەهەرێمی کوردستان لەلایەن تورکیاوە ئەم بیرۆکەیە نەیتوانیوە لەگواستنەوەی تورکمانەکانی عێراق لەناوچەکە سەرکەوتوو بێت. سەرەڕای ئەوەی ناوچەی نیشتەجێبونی تورکمانەکان لەم پشتێنەیەوە دوورە، مەگەر ئەندامانی باڵی سەربازی ئەو ڕێکخراوە تورکمانانەی عێراق کە پەیرەو لەتورکیا وەردەگرن لەم ناوچانە نیشتەجێبکەن کە ئەمانیش ژمارەیان زۆر کەمە.

٢) بەمجۆرە ئەم پشتێنەی ئەمنیە بە تێپەڕبوونی کات دەگۆڕێت بۆ پشتێنەی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کوردەکانی عێراق، کە ئەم پشتێنەیە بە داگیرکردنی خاکەکەیان لەلایەن تورکیاوە سەیردەکەن.

٣) دابەشکردنی باشوری لوبنان شکستی ئەم پشتینەیەی بۆ دابنکردنی ئاسایش سەلماندووە. ئیسرائیل ئەم پرۆژەیەی لەلوبنان تاقیکردۆتەوە بەڵام حزب الله لەڕێگایترەوە هێرش دەکاتە سەر ئیسرائیل.

لەبەرئەوە واچاوەڕوان ناکرێت بیرۆکەی پشتێنەی ئەمنی لەئاستی خۆی و بەپێی ئەو هەلومەرج و تایبەتمەندیانەی کە لێی چاوەڕوان دەکرێت بیرۆکەیەکی لەبارو گونجاو بێت، زیاتر بیرۆکەی داگیرکاری تورکیایە بۆ بەشێك لەخاکی عێراق و تەواوکەری چالاکی دورمەودایە لەزەمینەی سیاسەتی تورکسازیدا. بە گوزارشتێکیتر بیرێکە لەئایندەدا مەبەستی خۆئامادەکردن بۆ داگیرکردن دوای جێبەجێکردنی پرۆژەی دابەشکردنی عێراق .

بەرئەنجام:

لەوەی پێشەوە دەردەکەوێت کە سیاسەتی تورکیا لەهەرێمی کوردستان پەیرەوی لەسێ فاکتەری جێگیر دەکات :

١) سوربوونی تورکیا لەسەر لەناوبردنی پارتی کرێکارانی کوردستان بەهەر ڕێگا و بەهایەکبێت.
٢) هەنگاوی بەردەوام بۆ ڕێگرتن لەهەر هەوڵێك بە ئامانجی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی لەهەرێمی کوردستان.
٣) هەوڵی بەردەوامی تورکیا بۆ بەدواداچوونی دەستور و پرۆژەکان کە ئامانجیان داگیرکردنی ئەو بەشەی عێراقە واتە (هەرێمی کوردستان).

ئاشکرایە لەماوەی حەوت ساڵی ڕابردوودا لەسەر بنەمای ئەم سیاسەتە، تورکیا هەر کاتێك هەستی کردبێت لەکۆتاییهێنان بە قەیرانی ئەمنی ناکام بووە و نەیتوانیوە پارتی کرێکارانی کوردستان لەڕێگای سەربازی و سودوەرگرتن لەگورزی سوپای تورکیا بە هەشت سەد هەزار سەربازی و میلیشیا سەرکوتی بکات، ڕوویکردۆتە سیاسەتی داگیرکردن و نزیکبوونەوە لەبەغدا.

لەو جێگەیەی کە قەیرانی ئەنقەرە ئاڵۆز و دژوارە، ڕابەرەکانی بیردەکەنەوە کە ڕێگاچارەی پێویست بۆ ئەم قەیرانە ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازیە کە زیاد لەپێویست لەمەیدانی هەرێمی کوردستان دەبینرێت، چ بە هێرشکردنە سەر دەسەڵاتدارنی وڵاتی سەربەخۆ و چوونەناوەوەی هێزەکانیان بۆ ناو خاکی ئەم وڵاتە یان لەڕێگای ڕاکێشانی ئیسرائیلیەکان بۆ ئەم مەیدانە یان ڕاگەیاندنی پشتێنەی ئەمنی لەهەرکاتێکدا کە توانیبێتیان سوودی لێوەربگرن. بەمجۆرە هەرێمی کوردستان مەیدانێکە (هەمیشە کەوتۆتە بەر هێرش و سنووربەزاندن) کە ئەنقەرە بە بیانوی وەك کوردەکان و تورکمانەکان و (داوای مێژوویی) هەوڵدەدات بۆ بردنی بەشێك لەخاکی ئەم وڵاتە. تورکیا گەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی کە لەبەرامبەر ئەمە هیچ کۆسپ و بەربەستێك بۆ چوونە ناوەوەی خاکی عێراق نییە، بۆیە دەتوانێت ئێرە بگۆڕێت بە مەیدانی ئەزموون بۆ ڕزگاربوون لەکێشە ناوخۆییەکانی و بەدیهێنانی نارەزوی سیاسەتی دەرەکی و دۆزینەوەی ئەخشی تازە و گرنگ لەهاوکێشەکانی ڕۆژئاوا و ئەمەریکادا, بەتایبەت تورکیا دەزانێت لەحساباتی واشنگتۆندا لەڕووی ئەمنیەوە ئێران هەڕەشەیە و ئیسرائیلیش بەگرنتی بۆ ئاسایشی ناوچەکە دەژمێرێت، لەبەرئەوە ئەنقەرە لەڕێگای هەرێمی کوردستانەوە گفتوگۆ لەگەڵ واشنگتۆن دەکات و سوود لەهەموو هۆکارەکان وەردەگرێت.
ئەنقەرە لەهەنگاوی یەکەمدا هەوڵیداوە بەپێی مەوقعیەتی جووڵەئامێز و جەنگخوازانە پەنابەرێت و لەم ڕێگایەوە ڕازیبوونی واشنگتۆن بۆ بینینی ڕۆڵ لەهەرێمی کوردستان لە ڕێگای گفتوگۆی ناڕاستەوخۆ پلان و پرۆژەکانی لەهەرێمی کوردستان لەڕێگای بێدەنگکردنەوە و پاڵپشتیکردنی ئەمەریکاوە بەدەستبێنێت.
تورکیا بۆ سوود وەرگرتنی لەم ڕووەوە دوو کارت بەکاردێنێت، یەکێکیان جەختکردن لەبەرکەوتنی زەرەری مادی گەورە بەهۆی گەمارۆی ئابووری سەر عێراق لەدوای جەنگی کەنداوی دووەمەوە، دووەمیان سوودوەرگرتن لەدامەزراندنی بنکەی ئەنچەرلیك لەناو خاکەکەی کە بۆ پارێزگاریکردنی ناوچەکە و ڕێگرتن لەفڕینی فڕۆکەکانی عێراق لەسەر ئاسمانی ناوچەکە. تورکیا ئەم کارتەیان وەك کارتی (بدە و بسێنە) بەکاردەهێنێت بەئامانجی ڕاکێشانی واشنگتۆن بۆ بە دیهێنانی سیاسەتەکانی لەهەرێمی کوردستان سوودی لێوەرگرێت. تورکیا بۆ سود وەرگرتن لەم کارتە پەنایبردە بەر ڕێگای دەنگدان لەناو پەرلەمانی تورکیادا و بەجۆرێك کاریکرد کە بەئازادی مانۆر بکەن، بەشێوەیەك کە ئەنجومەنی تورکیا هەر شەش مانگ جارێك ئەم مۆڵەتە تازە دەکاتەوە بۆ ڕێگەدان بەسوود وەرگرتن لەبنکەی ئەرنچەرلیك لەلایەن هێزەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە. لەیەکێك لەهەڵسەنگاندنەکاندا کە لەلایەن ڕۆژنامەی تورکی بەزمانی ئینگلیزی بەناوی (تورکیش دیلی نیوز)ەوە ئەنجامدراوە، (لەکۆی (٤٥٠) ئەندامی پەرلەمانی تورکیا (٢٩٣) ئەندام ئامادەبوون و لەم ژمارەیەش (٧٠٪) بەئەخێر دەنگیاندا بە تازەکردنەوەی ڕێکەوتننامەی جێگیرکردنی هێزەکانی ئەمەریکا، بەریتانیا و فەرنسا لەبنکەی ئەنچەرلیك و (١١,٣٪) دەنگی بەڵێیان بە پرۆژەکەدا) ئەم هەڵسەنگاندنە نمونەیەکە لەپەیوەندیەکانی تورکیا لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی

ئەمەریکا پیشاندەدات. ئەگەر سەرنج بدەین لەم ڕاپرسیە کە لەساڵی (١٩٩٢) کراوە، لەوکاتەوە تا ساڵی (١٩٩٨) پەرلەمانی تورکیا هەمیشە بەزۆر ئەم ڕێکەتننامەیەی تازەکردۆتەوە. واتە پەرلەمانی تورکیا (١٠ تا ١١) جار لەنێوانی ڕازیبوون و ڕازینەبوون کە بەرپرسانی تورکیا پێویستیان پێی بووە تازەکراوەتەوە. بەرپرسانی تورکیا توانیویانە لەم ڕێگایەوە خواستەکانی خۆیان لەواشنگتۆن داوابکەن بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەستە بە سیاسەتی تورکیا لەهەرێمی کوردستان لەبەرامبەر ڕازیبوونیان لەسەر مانەوەیان لەبنکەی ئەنچەرلیك، بەوتەی ئەربەکان (واشنگتۆن لەڕێی یاداشتێکی ڕەسمیەوە کە باڵوێزی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا داویەتی بە وەزارەتی دەرەوەی تورکیا، ڕەزامەندی خۆی پیشانداوە لەسەر خواستەکانی تورکیا، لەبەرامبەر دامەزراندنی (هێزی چەکوشی ئامادە) بۆ پارێزگاری لەکوردەکانی عێراق، واشنگتۆن پابەندبوونی خۆی لەسەر (١٢) خاڵ پیشانداوە لەبەرامبەر سووربوون لەسەر مانەوەی هێزی چەکوشی ئامادە). بەڵگەنامەی ناوبراو باس لەکەمکردنەوەی فرینی ئیستخباراتی و زیادکردنی ژمارەی ئەفسەرانی تورکیا لەبنکەی پەیوەندیاکانی زاخۆ و ڕازیبوون بە پێدانی بارودۆخی بازرگانی لەگەڵ عێراق وەك ئەوەی ئەردەن و پێچانەوەی ئۆردوگای پەنابەرانی کورد بەناوی ئەتروش لەهەرێمی کوردستان کە پارتی کرێکارانی کوردستان وەك بارەگا دژی تورکیا سوودی لێوەردەگرێت. هەروەها تورکیا سەرکەوتووبوو لە دامەزراندنی (هێزی تێسرەواندن) بەشێوەیەك کە تورکیا پێشنهادی دەکات. سەرەڕای ئەمە ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری سەبارەت بە تیرۆریزم لەناوچەکەدا لەنێوان ئەنقەرە و واشنگتۆندا و خستنەبەردەستی ئامێری ئەلەکترۆنی پێشکەوتووی ئەمەریکا بۆ تورکیا بۆ دابینکردنی ئاسایش لەسەر سنور و گۆڕینی چەکی کڕاو لەلایەن ئەنکەرەوە، لەڕێکەوتنەکانیتری تورکیایەدا. لەگەڵ هەموو ئەم فشارانەدا لایەنگرانی یۆنان لەکۆنگرێسی ئەمەریکا کۆسپیان دروستکرد لەڕێگای پێدانی ئەم چەکانە لەلایەن واشنگتۆنەوە بە ئەنقەرە. کە بریتی بوو لەکەشتی جەنگی و (١٥) هێلیکۆپتەری گەورە.

تورکیا لەجەنگی (ئیمتیازاتی)دا کە ناوێکە بە بنکەی (ئەنچەرلیك) دەوترێت بردوویەتیەوە، بەدەستێك کارتی هەرێمی کوردستان و بەدەستەکەیتر کارتێك بۆ بەدەستهێنانی خواستەکانیان لەئەمەریکا بەکاردەهێنا، ئەمکارە بە شێوەیەك ڕوون وئاشکرایە، کە لەدوو تەوەرەی (محوەر) سەرەکی لەناوچەکە ئەنجامدراوە، واتە تەوەرەی ئیسرائیل کە ئێران وسوریا ئەووروژێنێت و تەوەرەی هەرێمی کوردستان. تورکیا هەرێمی کوردستانی گۆڕیوە بۆ مەیدانی کراوەی ئیسرائیل و ئەمەریکا، مەیدانی مانۆڕ لەبەرامبەر تورکیا و سوریا، ئێران و سوریا لەستراتیجی ئەمەریکادا وەك دوو ئامانج سەیر دەکرێن کە ئەمەریکا هەوڵدەدات لایەنکان بە ڕێگاچارەی ئیسرائیلی لەناکۆکی نێوان عەرەب و ئیسرائیل ڕازیبکات. بەوتەی (هانی ئەرسەلان) بەپێی توێژینەوەیەك سەبارەت بە تورکیا و ئاسایشی کەنداو ئەنجامیداوە تورکیا لەسەرەتادا ئامادەی بینینی ئەم ڕۆڵە بووە (تورکیا، بەتایبەت دوای هاتنەدەرەوەی هێزی عێراق لەگۆڕەپانی

هاوسەنگی ستراتیجی، لایەنیکەم لەئایندەیەکی پێشبینی کراودا ڕۆڵی ئەمنی لەپاراستنی هاوسەنگی ناوچەکە دەگرێتە ئەستۆی، پێویستە لەم حاڵەتەدا ڕۆڵی عێراق کۆنترۆڵ بکرێت و چاکسازی لەبنیاتگەری ئیسلامی ئێراندا بکرێت تا ڕێبگرێت لەتاران بەو ڕیشە ئیسلامیە ئسولییەوە بگۆڕدرێت بۆ هێزێکی هەرێمی. هەروەها بە هەڵبژاردنی کارتی بردنەوەی شیعەکان لەباشوری عێراق کاریگەری دەبێت لەسەر ئاراستەی ئایندەی عێراق).

ڕۆڵی تورکیا لەدەرگای ئەم دیدگایەوە کە لەساڵی (١٩٩١)ەوە شێوەی گرتووە تێپەڕاندووە، چونکە ئەنقەرە لەم (نامەیەدا) زۆرتری تێپەراندووە و وەك لایەنێکی ناڕاستەوخۆ لەهەوڵەکانی ئاشتی عەرەب ئیسرائیل بەشداری دەکات، بەم مەبەستە لەمەسەلەی عێراق بەشێوەی گشتی و هەرێمی کوردستان بەشێوەی تایبەتی بە سوودوەرگرتن لەکەلێنەکانی بەرەی عەرەبی و ئێرامان و بابەتی نێودەوڵەتی و سەبارەت بە بارودۆخی گشتی جیهانی ئیسلامی سوودی وەرگرتووە، بەبێ ئەوەی دیاریبکات چەند لەبەرژەوەندی ستراتیجی داهاتووی خۆیەتی، کە لایەنگیری لەلایەنی عەرەبی و مسلمانان شاراوەیە و پشتبەستن بە ڕێگاکانی ئەمەریکا و ئیسرائیل کاردەکات.

## بەشی دووەم

# شوێنی ئێران لەستراتیجی جیهانیدا

### شوێنی ئێران لەستراتیجی ئەمەریکادا لە قۆناغی جەنگی سارددا:

### ئێران دوای جەنگی دووەمی جیهانی :

دوای دەسپێکردنی جەنگی دووەمی جیهانی، ئێران تووشی ناجێگیری سیاسی، ئابووری و کۆمەلآیەتی بوو. ئێستا دەبێت لێکۆڵینەوە و بەدواداچون بۆ ناوەرۆکی ئەو قەیرانانە یان ئەو کەناڵانە بکەین، کە لەرێگای ئەم کەناڵانەوە کاریگەری لەسەر بچوکترین جوڵەی وڵاتی ئێران بەجێهێشتوە. هەستیارترین بەش لەم بوارەدا رۆژئاوای ئێران پێکیدەهێنێت. هێزە ئیستعماریەکان هەرکاتێك بیانەوێت ئێران لەسەر ئاستی ناوخۆیی و هەرێمی دوچاری قەیران بکەن و ناارامی بۆ دروست بکەن و لەو رێگایەی هەڵبژاردووە لایدەن و بەلارێدابەرن. ئەم کەناڵەی کەوتۆتە رۆژئاوا ئێرانەوە کە هاورایە لەگەڵ سنوری رۆژئاوا وڵات بە درێژایی (١٨٠٠)کم کە نزیکەی (١٣٥٠)کم لەگەڵ عێراق و ٤٥٠کم لەگەڵ تورکیا ) دیاری دەکرێت هەڵیدەبژێرن. ئایا جوڵەی ئەم کەناڵە زۆرتر روو لە باکورە یان باشوور؟

لەبەرئەوە لەهەر لێکۆڵینەوە و بەدواداچونێکی جیوپۆلەتیکی و توێژینەوە لەهەرەشە دەرەکیەکانی ئێران بکرێت کە پەیوەست بێت بەم کەناڵەوە وڵاتی عێراق دێتەناوەوە و لەبەرامبەردا لەعێراقیش هەر کات پسپۆران بیانەوێت لەهەمان بواردا لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون بکەن ناوی ئێران دێتە ناو باسەکەوە. کەواتە هەڵبژاردنی ئەم کەناڵە لەلایەن رۆژئاواوە بێهۆ نییە. ئێستا ئیمە نەمانەوێت لەهەنگاوی یەکەمی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا ئەو خاڵانە بناسێنین کە لەم ناوچەیە هەستیار و مەترسیدارن، وە بتوانین بەسوودوەرگرتنی پێویست لەم خاڵە هەستیارانەی ئەم کەناڵە، سیاسەتی دەرەکی خۆمان (ئێران) دارێژین*.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا قسە لەسەر ئەو زانیاریانە ناکەین کە پەیوەندی بە رابردووی دوورەوە هەیە. بەلآم ئەوەی پێویستە بزانرێت ئەوەیە کە ماوەیەکی زۆر ئیمپراتۆری عوسمانی لەسنوری ئەوناوچانە (کەناڵانە) دەسەلآتدار بووە، بەلآم سەبارەت بەوەی بۆچی ئیمپراتۆری عوسمانی نەیتوانیوە ئەم کەناڵە ببڕێت

---

*) نوسەر لەبەرئەوەی خۆی ئێرانیەو پێدەچێت نزیکبێت لە ناوەندی بڕیارەوە بۆیە زۆرتر زاراوەی سیاسەتی خۆمان یان ئیمە یان وڵاتمان ... هتد لەمبابەتانە بەکار دەهێنێت بەلآم من کلێشەی نووسینەکە دەگۆڕم بۆ سیاسەتی ئێران یان وڵاتی ئێران و لەم بابەتانە بەبێ ئەوە هیچ کاریگەریەك بکاتە سەر مانا و چەمکی نوسینەکە - وەرگێر.

جێگای باسی ئێمە نییە، لەبەرئەوەی ئیمپراتۆری عوسمانی توانای ئەوەی هەبوو لەڕۆژهەلاَت ئەم کەناڵە بجولێنێت، بەلاَم مەبەستی نەبوو.

خاڵی گرنگ ئەوەیە نابێت لەژێر کاریگەری هەست و سۆزدا بڕوانینە ئەم مەسەلەیە. هەندێك لەتوێژەران لەو باوەڕەدان کە عوسمانیەکان توانای ئەوەیان نەبووە بەئاراستەی ئەم کەناڵە بجولێن، بەلاَم ئیمپراتۆری عوسمانی دەسەلاَتی بالاَی ناوچەکەبوو و توانای ئەوەی هەبووە بەلْقان داگیربکات و تا نەمسا و دڵی مەجەرستان پێشڕەوی بکات.

عوسمانیەکان لەو سەردەمەدا دەیانگوت ئێمە ئەم بەشەمان پێویست نییە. ئەوان توانیبوویان ماوەی بیست ساڵی تەواو بەشێك لەئازربایجان، کوردستان (مەبەست سنەیە - وەرگێر)، کرماشان، هەمەدان و لوڕستان کە هەموو بەشەکانی ئەم کەناڵی پێکدەهێنێت بخەنە ژێر دەستی خۆیانەوە.

مەبەستی ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیە ئەوەیە کە دەربیخەین ئاڵۆزترین و کێشەدارترینی ئەم ناوچەیە دەکەوێتە سنوری نێوان ئێران و عێراقەوە بەتایبەتی لەناوچەی (٤٠٠-٥٠٠)کیلۆمەتری ئەم سنورە. ئامانجی ئێمە ئەوەیە ئەم ناوچە هاوبەشە بناسێنین کەهەم بۆ ئێران و هەم بۆ عێراق بە خاڵی لاواز دادەنرێت تابتوانین، ناسینی ستراتیجی ناوچەیی و ستراتیجی جیهانی بە سوودوەرگرتن لەم بازنەیە لەڕووی دابنکردنی ئاسایش و ناسینی ڕووی هاوبەشی ئێران و عێراق دەرخەین. ئەم بابەتە ناکرێت و نایەتەدی مەگەر هەردوو ولاَت پەیڕەوی لەیەك بنەمای ستراتیجی بکەن کە ئەمەش خاڵێکی زۆر گرنگە. ئیمە ناتوانین سەبارەت بە عێراق مۆدێلێکی ستراتیجی تایبەت دیاریبکەین کە جێگای ڕەزامەندی عێراق نەبێت و عێراقیش مۆدێلێك دیاربکات کە لەگەڵ ئێران هاوئاهەنگ نەبێت لەلایەن ئێرانەوە قبوڵ ناکرێت. لەبەرئەمەیە ئەم ستراتیجانە ناخرێتە بواری جێبەجێکردنەوە.

لەراستیدا ئێمە ئەمانەوێت بەلێکتێگەیشتنی هاوبەش، لایەنی هاوبەشی مۆدێلێکی ستراتیجی دیاریبکەین تا بتوانین ڕێبگرین لەدەرکەوتنی کەلێنی جیوپۆلەتیکی. تائێستا کاربەدەستانی هەردوو ولاَت هەوڵیانداوە دیدگاکانی خۆیان لەگەڵ یەکتر نزیك بکەنەوە. بەلاَم ولاَتی ئێران لەسەردەمی جەنگی ساردا، هەم لەبازرگانی دەریایی ڕۆڵی سەرەکی بینیوە و هەم لەبنەمای ستراتیجی یەکێتی سۆڤێت، کە ئامانجی گەڕانەوەبووە لەبواری بەرگریەوە بۆ بواری هێرشبردن. ئەمە بنەمای ستراتیجی ڕووسیا و دواتر یەکێتی سۆڤێت و ئەمڕۆش گەیشتوە بە ڕووسیا، لەبەرئەوە ئێران کەوتۆتە ناوەندی کرۆکی توندوتیژی ئەم ململانێیەوە، بۆیە هەم بلۆکی ڕۆژهەلاَت (سۆڤێت) و هەم ڕۆژئاوا چاویان لەسەر ئێرانە و ئارەزوی گەیشتنیان هەبووە بۆناو ئەم ولاَتە و هەمیشە لەچاوەڕوانی هەلێکدا بوون تابتوانن لەبارەی ئامانجی ستراتیجی خۆیانەوە کاربکەن. بەداخەوە بەهۆی بوونی ئەم هەلومەرجانە و شوێنی هەستیارەوە هیچ کاتێك سیاسەتی ناوخۆی ئێران لەگەڵ سیاسەتی دەرکیدا هاوئاهەنگ نەبووە. لەم بوارەدا سیاسەتمەداران

ناراستەیان بۆ سیاسەتی ناوخۆ نییەو سیاسەتی دەرەکیان سەربەخۆ دەگرنەبەر. لەبەرئەم هۆیە هەتا کاتێك کە ئێران لەلایەن هێزە جیهانیەکانەوە پشتیوانی لێدەکرا، هیچ کێشەیەك بۆ سیاسەتی ناوخۆ دروست نەدەبوو. بەلأم کاتێك هێزی دەرەکی بەهەر شێوە و لەژێر کاریگەری هەر ناوێکدا، یان نەگەیشتووە بە ئامانج یان بە ئامانج گەیشتووە بەلأم لەئاستی چاوەڕوانکراودا نەبووە، لەئەنجامدا لەنێوان سیاسەتی ناوخۆ و سیاسەت دەرەکی ڕووبەڕووی کێشە بۆتەوە و بۆیە لەسیاسەتی دەرەکی دوچاری زیان گەورەبۆتەوە و نەتوانراوە قەرەبووی ئەو زیانە بکرێتەوە.

لەم ماوەیەدا، ئێران بۆ سێ دەیەی ئاشکرا لەچەمکی ستراتیجی لەناو ئەزموندا دیاریدەکرێت. دەیەی (پەنجا، شەست و حەفتاکان)، ئێمە لەدەیەی حەفتاکان سودمان وەرگرتووە و زۆر گرنگە. ئێستا ئێمە دەمانەوێت لێکۆڵینەوە لەسەر ئێران لەم دیدەوە بکەین. بەجیا دەبێت لەچوار دەیەی ئێران بکۆڵینەوە، چونکە لەکرداردا دەبینین سێ دەیە لەئێران تاقیکردنەوەبوو و دەیەی چوارەم شوێنی سوود لێوەرگرتن بووە. لێرەدایە کە دەبینم ڕووی هاوبەش لەنێوان ئامانجەکانی ڕۆژئاوادا هەیە، جیاوازی نییە کام وڵات سەرکردایەتی ڕۆژئاوا دەگرێتە ئەستۆ. سەردەمانێك بەریتانیا سەرکردایەتی ڕۆژئاوای لەئەستۆدا بوو، لەدەیەی چلەکانەوە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەم ئەرکەی گرتۆتە ئەستۆ.

لەمەیدانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئێران، دەسەڵاتی ڕۆژهەڵاتیش ئامادەیی هەبوو، کە بنەمای ئەم سەبر و چاوەڕوانیە بووە، لەکاتێکدا لەستراتیجی ڕۆژئاوادا سەبر و چاوەڕوانی جێگای نییە. لەبارەی سیاسەتی بلۆکی ڕۆژهەڵاتەوە دەتوانین نموونە پیشان بدەین، ڕووسەکان نزیکەی (٢٥) ساڵ لەپشتی دەروازەی چوونە ژوورەوە بۆناو ئەفغانستان چاوەڕێیان کرد، لەدەیەی حەفتاکان هێرشیان بۆ کرد. ڕووسەکان بەبڕوای خۆیان (٢٥) ساڵ هەڵوێستەیان کرد. لەکاتێکدا ڕۆژئاوا هیچ کاتێك لەستراتیجی خۆیاندا چاوەڕێ ناکەن، دەبێت سەرنج بدەین کە شوێنی وڵاتی ئێران چۆنی بووە کە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات سێ دەیە لەچاوەڕوانیدا بوون. ئێمە هیچ مۆدێلێك لەدنیادا نابینین کە ناوچەیەك لەنێوان ئامانجی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات لەسەر وەخت ڕێکەوتنی بۆچونیان هەبێت، بۆچی؟ لێرەدا پێویستی بەڕوونکردنەوە هەیە. دەبێت بزانین کە هەر ستراتیجێك بەپێوەری جیهانی دەبێت چوار کۆڵەکەی هەبێت: (ئامانج، شوێن، کات، جێبەجێکردن) ئامانج دیاریکراوە، شوێنیش دیاریکراوە، کاتە کە لەنێوان هەموو ئەمانەدا جیاوازی دروست کردووە. کات لای ڕووسەکان کاتی قەیرانبوونی ناوچەیە. بەبڕوای ڕووسەکان ستراتیجی ئەوان لەستراتیجی جیوپۆلەتیکی تا ستراتیجی سەربازی و ئایدیۆلۆجی، کاتێك جێبەجێ دەکرێت کە ناوچەکە نائارامبێت، بە پێچەوانەوە ڕۆژئاوا بۆ جێبەجێکردنی ستراتیجەکانی خۆیان پێویستیان بە ئەمن و ئاسایش هەیە، بۆیە هەمیشە بەدوای ئەم ڕەوشەدا دەگەڕێن، بۆ پیادەکردنی سیستەمی نوێی جیهانی لەئەورووپا، ئەوان دەریانخست تا ناوچەی بەلکان ئاسایش نەبێت ئەم سیستەمە شیاوی پیادەکردن نییە. بالکان کرۆکی

نانارامی ئەوروپایە هەم لەناو یەکێتی و هەم لە دەرەوەی یەکێتیدا. بەڵگەکان دەریدەخەن لەدوای چاکبوون و ڕێکخستنی بارودۆخی بەلکان و ئاسایشی ئەوروپا، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئامانجی دوایی دەبێت. چونکە سێ ناوچە ڕۆڵی لەگۆڕانی بنەمای سیستەمی جیوپۆلەتیکی جیهاندا هەیە. بەلکان بۆ یەکێتی ئەوروپا، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بۆ یەکێتی ئاسیا، باکوری ئەفەریقا بۆ یەکێتی ئەفەریقا. کاتێك بۆ هەردوو زلهێزی جیهانی و بلۆکی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات جێگای گرنگی پێدان بووە، بە پێچەوانەی یەکترەوە کاریانکردووە، ئەوەیان کەلایەنی ئاسایشی بووە چاوەڕوان ماوەتەوە و ئەوەیان کە لایەنی قەیران بووە هەم لەچاوەڕوانیدابووە. بارودۆخێکی تایبەت تەنیا لەولاتی ئێراندا بووە. هەروەك لەو گۆڕانكاریەی دوای کە تێبینیکرا سەرۆك کۆماری ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەم بارە پاشەکشێی کرد، ئەم پاشەکشێیە لەترسی ئێران نەبوو، بەلکو بۆئەوەی لەرێگای بەدەستهێنانی سادەتر و ئاسانتر و کەم مەسرەفتر بە ئامانجە ستراتیجیەکانی خۆی بگات، نابێت واهەست بکرێت ئەوانە بۆ پەیڕەوەی لە خواستەکانی ئێمە، ڕەوشەکانی خۆیان دەگۆڕن و دەکەونە ژێر کاریگەری ئامانجەکانی ئێمەوە.

ئەمڕۆ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هیواش هیواش بەرەو ئامانجی ستراتیجی خۆی هەنگاو دەنێت، پێشینەی نییە کە ئەم زلهێزە جیهانیە لەبەرامبەر ولاتێك ئەوندە خوێنسارد بێت. هەروەك ئەوەی کە بەجۆرە بلاوکراوەتەوە دوای هاتنەسەر دەسەلاتی بیل کلینتۆن وەك سەرۆك کۆمار، ئەو بڕیاری بە ئەندامانی ئەنجومەنی ئاسایشی خۆیدا، لەدیاریکردنی تیۆرە ستراتیجیەکانی ئەمەریکا، ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بخەنە پێشەوەی توێژینەوەکان و لەناو ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا بارودۆخی ئێران دیاری بکەن. لەسەدەی (٢١) مەیدانی سەرەکی یاریکردن لە (ئۆراسیا)یە و لەئۆراسیاش ئاسیا و لە ئاسیاش ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستیش ئێران گرنگی تایبەتی خۆی هەیە.

لەبەرئەوە بە لەبەرچاوگرتنی شوێنی ولات لەهەلومەرجی نێودەولەتیدا، پێویستە لەدانانی مۆدێل و پرۆژەی ستراتیجیدا بەپەلە کارنەکرێت، شوێنی ئێران شوێنێك نییە کە بەپەلە کاری بۆ بکرێت، لەبەر ئەم هۆیە نابێت تەنیا سەرنج دەوروبەری خۆی بدرێت بەلکو دەبێت لەسەرەتادا سەنج لەجیهان بدرێت و پاشان ناوچەکە و دراوسێکانی و دواتر و لەکۆتایدا خۆی (ئێران) بخرێتە بەر سەرنج. جیهانی بیرکەینەوە و هەرێمی کاربکەین و ناوچەیی تێڕامێنین. ئەم شێوە بیرکردنەوە پلەداریە دەبێت ببێتە جێگای سەرنج و تێبینی. ئێستا سەرنجمان لەدەیەی پەنجاو شەستەکاندا، و بەدواداچون بۆ دەیەی چلەکان دەکەین. لەدەیەی چلەکان و کۆتاییەکانی مەسەلەی شوێنگرتنەوەی دەسەلات باوی بوو، کەرەزاشا لێخراو محەدی کوڕی جێگای گرتەوە، لەسەرەتای پەنجاکاندا مەسەلەی خۆماڵیکردنی نەوت باشترین نمونەی ئەم گۆڕان و وەرچەرخانەبوو. لەدەیەی پەنجاکان ڕکەبەرێك بۆ ئێران لەلایەن بلۆکی ڕۆژهەلات دانرا کە پێگەیەکی باشی هەبوو، ئەویش میسری سەردەمی جەماڵ عبدالناصر بوو کە ئەوان لەبەرامبەر ئێران بەهێزیان دەکرد.

لەدەیەی شەستەکاندا جەنگی عەرەب و ئیسرائیل ڕوویدا و داواکردنی ئێران بە ڕاگەیاندنێك بۆ بەستنی کۆنفرانسێك بۆ سەرانی وڵاتانی ئیسلامی سەبارەت بە سوتاندنی مزگەوتی ئەقصى لەلایەن ئیسرائیلەوە لەساڵی (١٩٧٥) (بە دەستپێشخەری مەغریب، عەرەبستانی سعودی و ئێران)، لەم بوارەدا ئێران کەوتە بووتەی تاقیکردنەوەوە، گۆڕانکاری بەرچاو لەم قۆناغەدا ڕوویدا کە ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەدا مەبەستمان لەباسکردنی ئەو گۆڕانکاریانە نییە.

ئێران لەدەسپێکی دەیەی پەنجاکاندا لەڕووی پراکتیکیەوە کەوتبووە چوارچێوەی جیۆستراتیجی ڕۆژئاواوە، واتە یەکەمین سەنگەری بەرگری ڕۆژئاوا هاوجووتە لەگەڵ بەرزاییەکانی باکوری ئێراندا، یەکەمین سەنگەری بەرگریی ڕۆژئاوا لە بەرامبەر ئۆراسیاش لەگەڵ هەمان ئەوەرە هاوجووتە، واتە هەموو قەڵەمڕەوی ئێران دەکەوێتە ژێر چەتری بەرگری ڕۆژئاواوە، بنکەی ئاسمانی مشهد، وێستگەی ڕاداری شهرئاباد مشهد، وێستگەی ڕاداری پێشکەوتووی بهشهر بۆچاودێری باشوری یەکێتی سۆڤێت، وێستگەی ڕاداری بابلسر، بنکەی ئاسمانی تەوریز، هەموو ئەمانە لەسەر ئەم بنەمایە دامەزران.

سەرەڕای ئەوە هەموو شریتی کەناری ئێران لەکەنداوی فارسی و دەریای عومان و پێگەکانی ئێران لەبەردەستی ڕۆژئاوادا بوو، پێگەی ئاسمانی دیزەفول، پێگەی دەریایی و ئاسمانی بوشهر، بەندەر عباس، چابهار هەموویان لەخزمەتی دابینکردنی ئامانجەکانی ڕۆژئاوادا بوون. لەبەرامبەر ئەم کارانە ڕکەبەری ڕۆژئاوا (واتە یەکێتی سۆڤێت) ڕووی کردە ناوچەی کەناڵی ستراتیجی و سوودی لێوەرگرت. لەگەڵ ڕاگەیاندنی ئەم پرۆژەیە، برجنسکی، بایەخی ستراتیجی ئەم بەرە ستراتیجیە لەبەرامبەر بایەخی هەموو بەرە ستراتیجیەکانی ئۆراسیا ڕاگەیاند. ئەو پیشانیدا کە سێ بەرەی ستراتیجی لەئۆراسیا هەیە و ئەگەر ڕۆژئاوا نەتوانێت لەم سێ بەرەیە بەرگری بکات، یەکێتی سۆڤێت دەیباتەوە، ڕۆژئاوا بەهەر نرخێك بووە دەبێت بەرگری لەم سێ بەرەیە بکات. ئەم بەرانەش بریتیبوون لەبەرەکانی یەکەم (ڕۆژئاوا و باشووری ڕۆژئاوای ئەوروپا ـ ئەوروپای کەناری)، دووەم ( باشوری ڕۆژئاوا ئاسیا)، سێیەم (باشوری ڕۆژهەڵات و ڕۆژهەڵاتی ئاسیا) بایەخی ستراتیجی ئەم بەرانە بریتیبوون لە : ئەوروپای کەناری (١)، باشووری ڕۆژهەڵات و ڕۆژهەڵاتی ئاسیا(٢)، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست (٣). خودی ئەم ناونانە بە ژمارە (١-٢-٣) گرنگی و بایەخی ناوچەکە دەسازێنێت. برجینسکی لەو باوەڕەدایە کە هەروەك چۆن (٣ = ٢+١) بەهەمان پێوەر گرنگی ستراتیجی {ئەوروپای ڕۆژئاوا + ئاسیای ڕۆژهەڵات و باشوری ڕۆژهەڵات یەکسانە بە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست} کە لەو قۆناغەدا ئێران لەژێر چەتری بەرگری ڕۆژئاوادا بوو، یەکێتی سۆڤێت کە یەکەمین سەنگەری بەرگری هاوجووت بوو لەگەڵ سەروترین سەنگەری بەرگری ئێران، بەهۆی پاراستنی لەلایەن ڕۆژئاواوە نەیدەتوانی لەئێران نزیك بکەوێتەوە. لەبەرئەوە ئێران بۆ ڕێگرتن لەگرژیەکان لەگەڵ دراوسێی باکوری خۆی کە لەلایەك ئەو جێگای هەڕەشەبوو بۆی، ئیمتیازی ئابووری پێدا. چونکە لەچوارچێوەی

پەیمانی سەربازی لەگەڵ ڕۆژئاوا، زلهێزی ڕۆژهەڵات (یەکێتی سۆڤێت) کە دراوسێی بوو لەباکورەوە ڕایدەکێشا بۆ شەڕ و ململانێ، لەکاتێکدا (٢٨٠٠)کم سنوری هاوبەشیان هەیە، ئارەزووی گرژی و کێشەی لەگەڵ ئەم زلهێزەدا نەبوو. لەبەرئەوە ئێران دەرهەق ئامانجی ستراتیجی و سەربازی خۆی ناچار بە هاوکاری بوو لەگەڵ یەکێتی سۆڤێت کەزیاتر لایەنی ئابووری دەگرتەوە: پڕۆژەی نەوت و گاز و ووزە، هاوردەی چەکی ڕووسی، توانەوەی ئاسن و دەیان پڕۆژەی ئابووری تر بەهاوئاهەنگی ڕۆژئاوادا، لەگەڵ یەکێتی سۆڤێت دامەزرا بەمەبەستی نەهێشتنی گرژی و ئاڵۆزیەکان لەناوچەکەدا. ڕۆژئاوا لەگەڵ ئەوەی پەیوەندیەکانی لەگەڵ یەکێتی سۆڤێتدا سنورداربوو، بەڵام ئێران ڕۆژئاوای ئاگادارکرد بووەوە کە یەکێتی سۆڤێت دراوسێی ئێرانانە و ناچارە سازش لەگەڵ دراوسێکەی بکات. یەکێتی سۆڤێت تائەو ئاستە ڕازی بوو.

لەم هەلومەرجەدا ڕۆڵ و ئەرکی ئەوان چی بوو؟ ڕوسەکان ناچاربوون بۆ جڵەوکردنی ئێران و دروستکردنی کۆسپ هەنگاوی لەوشێوەیە بنێن.

لەناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست سێ وڵات بەشێوەی گشتی و دووان بە شێوەی تایبەتی بەشێکی تەواوکەری یەکێتی سۆڤێت بوون. لەکاتێکدا یەکێتی سۆڤێت دەیتوانی ناوچەکانی باکوری ڕۆژئاوا ئێران داگیربکات، باشوری ڕۆژهەڵاتی تورکیاش بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە ( مەبەستی کوردستانی ئێران و تورکیایە ـ وەرگێڕ) بەڵام ئەم دوو وڵاتە هاوپەیمانی ڕۆژئاوا بوون. تورکیا هەم لەناتۆ و هەم لەسنتودا ئەندام بوو، ئێرانیش ئەندامی پەیمانی سنتو بوو. عێراق و سووریا دوو وڵاتی گرنگتر بوون لەناوچەکە، کە سەربەخۆ بوون لەڕۆژئاوا، لەبەر ئەو هۆیە یەکێتی سۆڤێت هەوڵیدا عێراق بۆ لای خۆی ڕاکێشێت و لەکۆتایی پەنجاکاندا ئەم وڵاتە چووە ناو ستراتیجی ڕووسیاوە. گۆڕانکاری سیاسی دواتری عێراق کاتێک دروست بوو کەبووە بەشێك لەستراتیجی یەکێتی سۆڤێت.

کودەتای عبدالکریم قاسم لە(١٤تەمووزی ١٩٥٨) بەسەر ملیك فەیسەڵی پاشای عێراق و ڕاگەیاندنی حکومەت کۆماری و کودەتای عبدالسلام عارف بەسەر قاسمدا لەساڵی (١٩٦٣)دا واقعێکی خوێناوی بوو لەعێراقدا، لەسەرەتای نیسانی ساڵی (١٩٦٦) عارف لەڕووداوی کەوتنەخوارەوەی فڕۆکەکەی کوژرا و براکە بەناوی عبدالرحمان عارف لەشوێنی ئەو کاروباری وڵاتی گرتەدەست. بەدوای هاتنەسەرکاری (احمد حسن بکر) جنراڵی تکریتی و دواتریش بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات لەلایەن سەدام حسینەوە لەگرنگترین ئەو گۆڕانکاریانە بوو لەعێراقدا. بەهۆی نەمانەوە عێراق لەپەیمانی بەغدا (سیتو) کشایەوە.

تا پێش ئەوکاتەی ئەم پڕۆژە ستراتیجیە فۆڕمەلەبێت، عێراق لەناسایشێکی تەواودا بوو، کێشەی نەبوو، پەیوەندیەکانیشی لەگەڵ ئێراندا باشبوو و ناکۆکیەکی ئەوتۆ لەنێوانیاندا نەبوو، هاتووچۆی نێوان سنورەکان ئاسایی بوو. بەڵام کاتێك عێراق بەرەو تەوەری و فکری حزبی بەعس (کە ئامانجی سۆسیالستی بوو) ڕۆیشت. ئەم فکرە ئاراستەی ئامانجە سەربازیەکانی ئەم وڵاتەی کرد. لەسەر ئەم بنەمایە عێراق و

سوریا لەوکاتەوە خاوەنی جێگیری ستراتیجی و خاوەنی نەگۆڕێکی خۆجێی بوون. نیتر هیچ گۆڕانێکی ناوخۆیی و کودەتای سەربازی ڕوویندا.

سەرانی سەربازی سوریا لەکۆلێجە سەربازیەکانی یەکێتی سۆڤێت ڕاهێنران، بەپەروەردەی سەربازی و تاکتیکی لۆجستی و چەکی ڕووسی ئاشنا بوون و وردە وردە ڕاکێشران بەرەوو یەکێتی سۆڤێت. لەم سەردەمەدا سنوری ئێران و عێراق ئالۆزی تێکەوت و ئارامی جێگیریەکەی کەوتە بەرمەترسی.

لەدەیەی شەستەکاندا بەرەی عەرەبی بەرەیەکی هاوبەشیان هەبوو لەبەرامبەر ئیسرائیلدا. لەکاتێکدا ئێران لەبەرەی ڕۆژئاوادا بوو نەیدەتوانی بە فەرمی بێتەناو ئەم بەرەیەوە و هاوسەنگەری ڕابگەیەنێت.

یەکێکیتر لەپەرشوبڵاوی ئێران لەم قۆناغەدا دابەزین بوو لەسیاسەتی دەرەکیدا. ڕۆژئاوا لەدەیەی حەفتاکان لایەنی زۆری سوودوەرگرتنی لەئێران خستەکار. یەکەم بابەتی نەوت بوو وەگۆڕانکاریەك کە تێداکرا و ئالوگۆڕی دەسەلات لەناوچەکە بە تەواوی هەستیپێدەکرا کە بابەتێکی زۆر ئالۆز بوو، بۆ ڕیشەکانی ئەو ئالوگۆڕانە دەبێت چاوبخشێنینەوە بە ناوەڕۆکی بڵاوکراوەکانی ئەتڵەنتیکدا.

لەدەیەی حەفتاکاندا گۆڕانکاری بازاڕی جیهانی نەوت و بەرزبوونەوەی نرخی نەوتی خاو دیاریکردنی ستراتیجی نەوتی دەخستەڕوو. مستەر جۆن لوی ووتبووی (نرخی نەوتی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دەبێت یەکسانبێت بە تێچونی نەوت لەرۆژئاوا) تەرتیباتێك کە لەکۆتایی دەیەی حەفتاکان لەناوچەکە ڕوویدا، وێنەی ئایندەی ناوچەکەی کێشا.



لیندون جونسۆن سەرۆك کۆماری پێشوتری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا میراتێکی قورس و گرانی بۆ سەرۆك ریچارد نیکسۆن بەجێهێشت : جەنگی ڤێتنام، جەنگی نێوان عەرەب و ئیسرائیل، ئامادەیی یەکێتی سۆڤێت لەزۆر ناوچەی جیهاندا، پەیوەندی ئارۆشن لەنێوان هاوکارەکانی لەپەیمانی ناتۆ، بۆشایی سەربازی لەکەنداوی فارسی، دوا ئامانجی نیکسۆن کۆتاییهاتنە بەجەنگی ئەمەریکا و ڤێتنام، پێگەیشتنی ئاشتی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و ڕێگرتن لەنفوزی زیاتری یەکێتی سۆڤێت لەناوچە ستراتیجیەکان لەسەرانسەری جیهاندا.

یەکەمین مەسەلە لەسیاسەتی دەرەکی لەدەستوری کاری نیکسۆندا، ڕزگارکردنی ئەمەریکا بوو لەشەڕی ڤێتنام. چونکە ڕای گشتی لەئەمەریکا بە توندی نارازی بوو لەدەستێوەردانی سەربازی لەدەرەوەی سنور، ئەگەر بزانین کە لەتوندترین قۆناغی جەنگدا، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا (٥٠٠) هەزار سەربازی بۆ باشوری ڕۆژهەلاتی ئاسیا ڕەوانە کردبوو، توانای ئامادەیی زۆری لەناوچەکانیتر نەبوو. شێوەیەك کە هەڵبژێردرا دانوسانی نهێنی بوو لەنێوان هنری کیسنجری ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی

نیکسۆن لەگەڵ نوێنەرانی ڤێتنامی باکور لەپاریس. بەرووبەڕوو بوونەوەی ئەم هەنگاوانە، کەمبونەوە و هەتا پاشەکشێی تەواوی هێزەکانی ئەمەریکا لەڤێتنام لەپێگەیەکی شایستەدابوو. سەرۆك کۆماری نوێ بەمەبەستی ناراستەکردنی ئەم سیاسەتە نوێیە خۆڕاگری و پاشەکشێی لە (٢٥تەموزی ١٩٦٩) ڕاگەیاند و بەتیۆری (نیکسۆن ـ کیسنجر) ناوی دەرکرد. ئەم قسەیە کە لەکاتی سەفەری نیکسۆن بۆ ئاسیا لەدورگەی گوام باسکرا، کە بە (تیۆری گوام)* یا (ستراتیجی جێگرەوە) ناوی دەرکرد کە بەڵگەی ئەمەش شەڕی بەهێزی ئەمەریکا بوو لەجەنگی ڤێتنامدا. لەگرنگترین بەشی وتەکە دەڵێت:

(گومان دەکەم کاتی ئەوە هاتبێت کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەزەمینەی نزیکی لەگەڵ وڵاتانی ئاسیا بەدوو خاڵ پشت ببەستین: یەکەم ئەوەیە کە ئێمە ڕێز لەهەموو پەیمان و بڕیارەکانی خۆمان بگرین، دووەم تا ئەو جێگایەی کە پەیوەستە بەمەسەلەی ئاسایشی ناوخۆ مەسەلەی بەرگری سەربازییەوە وازهێنان لەو هەڕەشانەی لەلایەن دەوڵەتێکی گەورەی کە خاوەنی چەکی ئەتۆمییە دەهێنین، حکومەت ئەمەریکا میللەتانی ئاسیا هاندەدات کە مەسەلەی ئاسایشی ناوخۆ و بەرگری خۆیان ڕێکبخەن و لێپانراددەبینێت کە خۆیان ئەو بەرپرسیارێتیە بگرنە ئەستۆ).

لەبەرئەوە تیۆری نیکسۆن وەك مۆدێلێکی ڕووبەڕووبوونەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەو ناوچانەدا وەردەگیرێت، کە بەشێکە لەبەرژەوەندیە ستراتیجیەکانی ئەو وڵاتە بەدەستهاتووە. بەپێی ئەم تیۆرە یەکە هەرێمیەکان لەناکۆکی زیاتر بۆ بنیاتنانی ئابوری و سەربازی خۆیان سوود وەردەگرن. ئەم کارە دەتوانێت دەنگدانەوەی جەنگی ڤێتنام و ئەنجامە بریندارکەرەکەی بۆ ئاسایشی نەتەوەیی ئەمەریکا کە ویستی نەتەوەیی ئەمەریکا ناچاری دەستێوەردانی ئەم وڵاتە کرد کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی جەنگی سارد.

تیۆری نیکسۆن سەرەڕای ئەوەی گرنگی دەدا بە دورخستنەوەی هێزی دژە ئەمەریکا لەسەرچاوە نەوتیەکان، بەرامبەر وڵاتانی بەرهەمهێنی نەوتیش، دەستبەکار بوو لەشێوەی بەرگرتن سیاسەتی نرخدانان و شێوەی بەرهەمی سەربەخۆ.

بەشێوەی گشتی تیۆری نیکسۆن لەسەر ئەم سێ پایە سەرەکیەی خوارەوە وەستاوە:

١) پابەندبوونی ئەمەریکا بەبەڵێنەکانی کە لەپەیماننامە و ڕێکەوتننامە جیاوازەکانەوە داویەتی.

---

*) ناوی سەربازگەیەکی دەریایی ئەمەریکایە لەسەر دورگەیەك بەناوی دورگەی گوام لەکەنارەکانی باشوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا لەناو ئۆقیانوسی ئارامدا، ناوی ئەم دورگەیە هاتۆتەناو کلتوری سیاسی کوردیشەوە بەتایبەت لەدوای کارەساتی (٣١ ئابی ١٩٩٦) دوای داگیرکردنەوەی شاری هەولێر لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە بەهاوبەشی لەگەڵ هێزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان، ئەو کەسانەی لەهەرێمی کوردستان لەگەڵ ڕێکخراوە بیانیەکان کاریان دەکرد ژیانیان کەوتە مەترسیەوە بۆیە حکومەتی ئەمەریکا هەموویانی گواستەوە بۆ ئەمەریکا لەڕێگا بۆماوەی چەند مانگێك لەدورگەی گوام جێگیرکران و پاشان دابەشکران بەسەر ویلایەتەکانی ئەمەریکادا ـ وەرگێڕ.

٢) یارمەتی و پشتیوانە هەمەلایەنەی ئەمەریکا بۆ دەوڵەتانی هاوپەیمان یان دەوڵەتانێك کەمانەوەی ئەمانە بۆ ئاسایشی ئەمەریکا یان ناوچەکە پێویستە و لەلایەن هێزێکی ئەتۆمیەوە کەوتونەتە بەر هەڕەشە.

٣) یارمەتی ئابوری و سەربازی ئەمەریکا لەکاتی داواکردنی دەوڵەتێك کە کەوتۆتە بەرمەترسی جگەلە مەترسە ئەتۆمی، بە مەرجێك دەوڵەتی ناوبراو بەرپرسیارێتی سەرەکی بەرگری لەخۆیی لەڕێگای چەك و پێویستیەکانی ئەمەریکاوە بگرێتە ئەستۆ.

هەرچەندە ئامانجی خێرا لەتیۆری نیکسۆن ڤێتنام بوو، بەڵام دەیتوانی لەهەموو ناوچەکانی جیهان بەکاری بهێنێت.

تیۆری نیکسۆن لەگەڵ بەڵێنەکانی ئەمەریکا کورتیهێنا، ئەم وڵاتە لەگەڵ پارێزگاریکردن لەبەڵێنەکان و بەرپرسیارێتی بەرامبەر هاوپەیمانەکانی خۆی کە دابووی بەڵام تارادەیەکی زۆر خۆی ڕەها و ئامادە دەبینیەوە لەهەمانکاتدا بە هێزی داهێنەری هەموو دەوڵەتەکان زیادی کرد.

لەگەڵ ڕاگەیاندنی چونەدەرەوەی بەریتانیا لەرۆژهەڵاتی سوێس و کەنداوی فارسی لەساڵی (١٩٦٨)دا، ئەم بابەتە ناکۆکی لەناو بەریتانیا و نارەزایەتی لە دەرەوە لێکەوتەوە لەوانە وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکە پەرچەکرداری بەهێزی لەبەرامبەر ئەم بریارە پیشاندا، چوونەدەرەوەی تەواوەتی لەکۆتایی ساڵی (١٩٧١) ڕکەبەرایەتی بەهێزی نێوان یەکێتی سۆڤێت و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ زیادکردنی نفوزی خۆیان لەم وڵاتانە دەست پێکرد. تا ساڵی (١٩٧١) کە پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ڕۆژئاوا لەناوچەکە و دابنکردنی ئاسایشی ناوچەکەی لەژێر دەستدابوو. بەڵام لەرێی ڕاگەیاندنی فراوان و حساب بۆکراوەوە هۆیەکانی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوا مەسەلەیەکی بەناوی (ئەمانی دەسەڵات) لەدوای چوونەدەرەوەی بەریتانیا و چۆنیەتی ڕووبەڕووبونەوەی خرایە بەرباس و لێکۆڵینەوە.

دوای چوونەدەرەوەی بەریتانیا لەناوچەکە، ئەرکی پاراستن و چاودێریەکانی بەرژەوەندیەکانی ڕۆژئاوا لەبەرامبەر یەکێتی سۆڤێت خرایە ئەستۆی وڵاتە یەکگرتوودکانی ئەمەریکا، ئەمەریکیەکان بەهۆی (گرێی ڤێتنامەوە) سیاسەتی تازەی ئەمەریکا توشی ترس و نیگەرانی ببوو، نەیدەویست بۆ بەرگری لەبەرژەوەندیە ستراتیجیەکانی خۆی لەناوچەی ناجێگیری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هێزی سەربازی بنێرێت، چونکە لەدووبارە بوونەوەی بیرەوەری شەڕی سوپای ئەمەریکا لەڤێتنام زۆر نیگەران بوون. بۆچوونی گشتی ئەمەریکا بەهیچ جۆرێك سیاسەتێکیان قبوڵنەدەکرد کە ناچاربێت بە ناردنەدەرەوەی سەربازەکانیان بۆ شەرکردن لەدەرەوەی خاکی خۆیان. لەبەرنەوە باشترین ڕێگا بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکا لەناوچەکانی دەرەوە، ئامادەکردنی وڵاتانی دۆست بوو لەجیهانی سێیەم تا لەپێناوی بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکا و بۆ دابینکردنی ئاسایشی ناوچەکە هەنگاو بنێت. (ڤێتنامیکردنی جەنگی ڤێتنام).

بەسەرنجدان لەوەی کاتێک سیاسەتی نیکسۆن لەناوچەی جیاواز لەجیهان بەڕێوەچوو، لەم سیاسەتەدا ئەمەریکا بۆ بەرێوەبردنی مەبەستەکانی خۆی لەناوەندی قەیرانە جیهانیەکاندا، دەبوو تاناستی پێویست سوود لەهێزی خۆجێی ناوچەکە وەربگرێت و خۆی بپارێزێت لەئامادەی (تواجود) ڕاستەوخۆی سەربازەکانی، مەگەر هێزە خۆجێیەکان نەتوانن ڕوبەرووی ئەو هەرەشە و مەترسیە ببنەوە. لەسەر ئەم بنەمایە (ستراتیجی نامادەبوونی ناڕاستەوخۆ و پێسپاردنی بەرپرسیاریتی ناوچەکە بە هێزە خۆجێیەکان) گیرایەبەر.

لەناوچەی کەنداوی فارسی ئەم مەسەلەیە خرایەڕوو کە کام وڵات توانا و ئارەزووی هەیە وەك پارێزەری کەنداو جێگای بەریتانیا بگرێتەوە. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەرچەندە بە تەواوی وابەستە نەبوو بە نەوتی کەنداوەوە، بەڵام بەرژەوەندی لەوەدابوو کە ئەم ناوچەیە نەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی یەکێتی شۆرەویەوە. چونکە کەنداوی فارسی لەرووی ئابوری و سیاسیەوە بە ناوچەیەکی ستراتیجی زۆر گرنگ دەژمێردرێت، ئاشکرایە کە واشنگتۆن نەیتوانی بە ئاسانی ڕۆڵی بەریتانیا بخاتە ئەستۆی خۆی، بۆیە بۆ پاراستنی ئاسایشی کەنداو پێویستی بە هاوپەیمانی ناوچەکە هەبوو. ﴿لەبەرئەوە ئەمەریکا بە زەمینەسازی پێویستی سیاسی-ڕاگەیاندنی و لەسەر بنەمای ستراتیجی تیۆری نیکسۆن/کیسنجر سیاسەتێکی بەناوی (سیاسەتی دوو ستون یان دوو پایە) لە ناوچەکەدا ڕاگەیاند﴾. بەپێی ئەم سیاسەتە، ئێران و عەرەبستانی سعودی وەك دوو ستونی سیستەمی نوێ ئاسایشی ناوچەکەیان وەرگرت. ئێران وەك هێزێکی سەربازی و جەندرمەی ناوچەکە و عەرەبستانی سعودیە وەك ستونی دارایی و وڵاتی دەوڵەمەندی ناوچەکە کە خاوەنی سامانێکی گەورەی نەوت بوو، بەڵام توانای جێبەجێکردنی ڕۆڵی دەسەڵاتی سەربازی گەورەی نەبوو، بەڵکو توانای دارای و سیاسی لەناو وڵاتانی عەرەبدا لەبەرچاو دەگیرا.

نیکسۆن لەو باوەڕەدا بوو کە ئەمەریکا لەرێگای هێز و پەروەردەکردنی ئەم دوو وڵاتەوە دەتوانێت ئاسایش و بەرقەراری ناوچەکە لەدوورەوە کۆنترۆڵ بکات. هەڵبەت ئەم ستراتیجیە لەسەردەمی سەرۆکایەتی ترۆمان و دواتریش لەناوچەکە بەرێوەدەچوو، بەڵام بەجێبەجێکردنی تیۆری نیکسۆن ڕەهەندەکانی ئەم ستراتیجیە فراوانتر بوو. بەسەرنجدان لەم ستراتیجیە ﴿ئەمەریکا بە پێدانی یارمەتی سەربازی/ئابووری بەوڵاتانی دۆست و هاوپەیمانی خۆی لەناوچەکە، ئەم توانایەی فەراهەم کرد کە ئەمانە ڕاستەوخۆ بە سوود وەرگرتن لەئامێر و کەلوپەل و کەسەکان و تواناکای بەردەستی ئەرکی بەرپرسیاریتی بەرگریکردن لەناوچەکە بگرنە ئەستۆ، ئەوەبوو کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەم دوو وڵاتە دۆست و هاوپەیمانەی وەك ئامرازی دابینکردنی ئاسایش لەهەموو ناوچەکە لەرووی سەربازیەوە بەهێزکرد و یارمەتیدان. لەبارەی هەمان سیاسەت و تیۆرەوە بوو کە هەموو توانا ئابووری، تەکنەلۆجی و سەربازیەکان لەواشنگتۆنەوە بەرەو تاران و ڕیاز کەوتەرێ﴾.

نیکسۆن لەدوای ئەمەوە سیاسەتی چوارلایەنی لەناوچەی کەنداو پێشخست بەم شێوەیەی خوارەوە:

١) هاوکاری نزیکی نێوان ئێران و عەرەبستانی سعودی وەك دوو پایەی جێگیری ناوچەکە.

٢) ئامادەیی سەربازی هێزی دەریایی ئەمەریکا بە ڕێژەی کەم لەناستی سێ کەشتیدا (فەرماندەیی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست).

٣) زیادکردنی چالاکی دیپلۆماسی لەناوچەکە و فراوانکردنی یارمەتیە تەکنەلۆجیەکان بۆ ئەم وڵاتانە.

٤) کەمبوونەوەی سەرنجی وڵاتە بچوکەکانی ناوچەکە لەبەریتانیا، بە ئاراستەی دابینکردنی خواستە ئاسایشیەکانیان.

پراکتیك کردنی سیاسەتی نیکسۆن لەکەنداو، پێویستی بەبەهێزکردنی دەسەڵاتە ناوچەییەکانە، واتە شای ئێران و عەرەبستانی سعودی. لەناو ئەم دوو وڵاتەدا ئێران لەبەرامبەر عەرەبستانی سعودی زەمینەی جیوپۆلەتیکی گونجاوتری هەیە و بەهۆی هەلکەوتەی جوگرافیای هەستیاریەوە کە خاوەنی گرنگی ستراتیجی تایبەتە لەناوچەکەدا وەك:

١- دراوسێی یەکێتی سۆڤێتە و سنورێکی دوورودرێژی لەگەڵیدا هەیە.

٢- ناوچەی جیاکردنەوە و بازنەی بەیەکەوەبەستنی هەردوو پەیمانی سیتو و ناتۆ بوو.

٣- هاوپەیمانی ئەمەریکا بوو لەپەیمانی ناتۆدا.

٤- دەسەڵاتی بەسەر کەنارەکانی باکوری کەنداوی فارسی و بەتایبەت گەروی ستراتیجی هورمزدا هەبوو.

٥- خاوەنی دانیشتوانێکی گونجاوە (لەو ٥٥ ملیۆنەی لە وڵاتانی کەناری کەنداوی فارسی دەژین نزیکەی ٣٥ ملیۆنی لەئێراندایە) (بەپێی ئاماری سەرەتای حەفتاکان ـ وەرگێر)

٦- ڕژێمی شای ئێران هەندێك لەو کێشانەی نەبوو. کە ڕژێمی عەرەبستانی سعودی بۆ ئەمەریکای دروست دەکرد لەڕووی چەکدارکردنەوە (لەبەرامبەر ئیسرائیل)دا.

٧- ڕژێمی شای ئێران نیگەرانیەکی کە ڕژێمی عەرەبستانی سعودی سەبارەت بە هەنگاوەکانی ئەمەریکا لەپارێزگاریکردن لەئیسرائیل هەیبوو، نەیبوو.

ئێران دەیتوانی ئەو ڕۆڵە کەتیۆری نیکسۆن بۆ دەسەڵاتداری لەناوچەك لەبەرچاوی گرتبوو ببینێت. لەلایەکیترەوە شا تەنیا پەیوەندیدار بەجێبەجێکردنی ڕۆڵی ئێران نەبوو، بەڵکو پەیوەندی بە جێبەجێکردنی ڕۆڵێتر لەوڵاتانیتری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و نیمچە کیشوەری هندستان هەبوو. تیۆرەکانی ڕژێمی پاشایەتی ئێران دەربارەی مەترسە یەکێتی سۆڤێت پێویستی بەرگرتنی لێی یەکسانبوو بە بۆ چوونەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا. بەمجۆرە پەیوەندی ئەمەریکا لەگەڵ ئامانج و تێڕوانینەکانی ئێراندا یەکسان

بوو. لەبەرئەوە پەیوەندی نێوان دوو وڵات بەرقەرار بوو کە ئیتر نەك پێویستی بە ئامادەیی سەربازی ڕاستەوخۆی ئەمەریکا نەبوو، بەڵکو پارێزگاریکردن لەبەرژەوەندیە گەشەکردووەکانی ئەمەریکا بەکەمترین تێچوون لەلایەن ئێرانەوە دابینەکرا, بەجۆرێك کە هینری کیسنجر لەکتێبەکەیدا بەناوی ساڵانێ لەکۆشکی سپی دەنوسێت ( ئێران لەسەردەمی شادا یەکێك لەباشترین و گرنگترین دۆستانی ئەمەریکا و بەوەفاترین دەوڵەتی جیهان بوو). بەمجۆرە و بەرەبەرە کارپێکردنی تیۆری نیکسۆن بۆ دابینکردنی ئاسایشی ناوچەکە بەگشتی پشتی بە یەك ستون (پایە) ئێران بەست.

﴿ ئیمتیازی سەرەکی ئێران لەهەڵبژاردنی وەك هێزێکی دەریایی جێگای سەرنج بوو ــ یەکەمین وڵاتی کەنداوی فارسی کە هێزێکی دەریایی واقعی پێکهێنابوو. هێزی دەریایی تازەی ئێران، ماهیەتی دەسەڵاتی ئێرانی لەناوچەکەدا بەقووڵی گۆڕی، بەوەی کە لەساڵانی پێشوودا بەگشتی هاتوهاواری ئێران دەربارەی بەرژەوەندیەکانی ئەم وڵاتە داوای دەسەڵاتی واقعی دەکرد. (سێ کەشتی شکێن، چوار کەشتی پارێز، چوار بەلەمی تۆپهاوێژ، بیست بەلەمی گشتی، کۆمەڵێك کەشتی مینی، بەلەمی هێرشبەر و کەشتی پشتیوانی، هێزێکی دەریایی کە پێکهاتووە لەسێ فرۆکە و دوو دەرزەن یان زیاتر هەلیکۆپتەر) ــ بەرزبوونەوەی توانای دەریایی نوێ مەترسی دروستکردبوو، کە لەوانەیە پەروەردە و ئەزموونی تەواوی نەبێت، بەڵام ئێران بەلای کەمەوە دەساڵ پێشتر لەناستی چاودێریکردنی ناوچەیدا بووە، لەکاتێکدا توانای فراوانبوونی دەسەڵات لەدەرەوەی کەنداوی فارسی پێگەیەکی تایبەت بەم وڵاتە دەبەخشێت﴾.

بەڵام شتێك کە زۆر پێویستە دابینکردنی کەرەسەی جەنگی گونجاوە بۆ ئێران، تا بتوانێت ئەم وڵاتە بەهێز بکات بۆ ئەنجامدانی ئەرکی جەندرمەیی و پاسەوانی لەکەنداوی فارسی بەشێوەی گشتی و هێزی سەربازی خۆی ڕێکبخات. هەموو ئەو کەموکوڕیانەی هەیبوو نیکسۆن لەسەفەری بۆ تاران نەیهێشت. لەم پەیوەندیەدا دابینکردنی کەرەسەی جەنگی و پەروەردە و ڕاهێنانی سوپای ئێرانی گرتە ئەستۆی خۆی. بەجۆرێك لەساڵی (١٩٧٢) کە عێراق پەیماننامەی دۆستانە و هاوکاری لەگەڵ یەکێتی سۆڤێت واژۆکرد، ئەم کارە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ پەرچەکردارێك هاندا، ئەوەبوو لەساڵی (١٩٧٢) ریچارد نیکسۆن بەسەرۆکایەتی گروپێکی پایەبڵند لەوانە هنری کیسنجر کە ڕاوێژکاری کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی بوو، لەچاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ شای ئێران لەتاران، ڕازیبوو بە چەکدار کردنی بێسنوری ئێران. ڕەزامەندی دەربڕی لەگۆڕینی فرۆکەی (F١٤-F١٥) لەسەر داوای ئێران.

بەم شێوەیە ﴿لەواشنگتۆن، دیدگا دەربارەی چەکدارکردنی شا بە تەواوی گۆڕا، ئیتر چاودێری ئایزنهاور و کندی و هەتا جانسون لەسەر چەك فرۆشتن وەلانرا، لەماوەی ساڵانی (١٩٥٠ تا ١٩٧١) کۆی فرۆشتنی چەکی ئەمەریکا بە ئێران نزیکەی (١,٨) ملیارد دۆلار بوو. لەکاتێکدا دوای گرتنەدەستی دەسەڵات لەلایەن نیکسۆن، سنوردارکردن خرایە لاوە. داواکردن لە (٨٦) ملیۆن دۆلارەوە لەساڵی (١٩٦٨)

بەرز بووەوە بۆ (١٨٤) ملیۆن دۆلار لەساڵی (١٩٦٩)، لە ساڵی (١٩٧٣)دا لە (٥٠٠) ملیۆن دۆلارەوە بەرزبۆوە بۆ (٢,٥) ملیارد دۆلار. لەو کاتەدا ئێران یەکێکبوو لەگرنگترین کڕیارانی کەرەسەی جەنگی ئەمەریکی.

ڕاستەخۆ دوای بڕیاری نیکسۆن، ڕێکەوتنی قورسی سەربازی بەسترا بۆ بەهێزکردنی سوپای ئێران و پەیداکردنی توانایەك بۆ جێبەجێکردنی ڕۆڵی جەندرمە و پاسەوان کە (ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەسەرەتای ساڵی ١٩٧٠ نزیکەی (٢٠) ملیارد دۆلار چەکی زۆر مۆدێرن و ئاڵۆزی سەربازی بە سوپای ئێران فرۆشت - کە لەکاتی سەرهەڵدانی شۆڕش لەئێران، ئەمەریکا لەپێدانی هەندێك لەو چەکانە خۆی پاراست - لە دوای پلانی سیاسی و فرۆشتنی چەکەکان بوو، هەزاران پسپۆڕ و ڕاوێژکاری سەربازی ئەمەریکایی بۆ گۆڕانکاری و چاکسازی بنەڕەتی لەسوپای ئێران و بەرزکردنەوەی توانا و کارایی سەربازی ئەم ولاتە ڕوانەی تاران کران).

لەناو ئەو کەلوپەلانەدا، ئێران بە تێچوونی نزیکەی (٨٠٠) ملیۆن دۆلار دروستکردنی بەندەرێکی سەربازی لەناوچەی چابهار دەستپێکرد. لەم بنکە گەورەیەدا نەك تەنیا حکمرانی لەسەر دەریای عمان و کەنداوی فارسی دەکرد، بەڵکو کاریگەری لەسەر ململانێکانی ئۆقیانوسی هندیش هەبوو و هەروەها دەیتوانی ڕێبگرێت لەپێشڕەوەی یەکێتی سۆڤێت بەرەو ئۆقیانوسی هندی.

بۆ ئەمەریکا مانەوەی هەلومەرجی یارمەتیدەر کە دوو ولاتی ئەندامی سنتو واتە (ئێران و پاکستان) لەم کاتەدا بەمەبەستی جێگیرکردنی پێگەی خۆی لەکەنداوی فارسی و درێژەدان بە سوود وەرگرتن لەنەوتی ناوچەکە کە لایەنێکی ژیانی (حیاتی) هەبوو. ئەمەریکا بە دەسەلاتی ئێران لەکەنداوی فارسی و هاوکاری ئەو ولاتە بۆ عەرەبستانی سعودی بۆ ڕێگرتن لەتوندڕەوی عێراق، یەکێکیتر بوو لەنامانجەکانی لەناوچەکەدا.

یەکەمین ئەزموونی ئەم سیاسەتە، بە ئەنجامێکی داواکراو کۆتاییهات، بەو مانایەی کە سوپای تەیار و ئامادەکراوی ئێران دەسەلاتی بەهێزی خۆی لەسەرکوتکردنی شۆڕشی کۆمۆنیستی لەعومان بەکارهێنا و سەرکەوتوو بوو لەڕزگارکردنی تاج و تەختی سەڵتەنەت لەم ولاتەدا، کارێك کە هێزە دەرەکیەکانیتر نەیانتوانی بوو لەجیهاندا نازادانە ئەنجامی بدەن.

سیاسەتی دوو ستونی نیکسۆن بۆ ماوەی (١٠) ساڵ درێژەی کێشا، لەساڵی (١٩٧٩) لەگەڵ گۆڕانی ڕژێم لەئێران ئەم سیاسەتە تووشی ناکامی بوو، بۆیە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ناچاربوو کۆتایی بێنێت بەم سیاسەتە و بەدوای ستراتیجێکیتردا بگەڕێت لەناوچەکەدا، هاوکات لەگەڵ ئەوەی ڕژێم لەئێران گۆڕا، یەکێتی سۆڤێتیش سیاسەتی پێشڕەوەی بۆ زیاد کردنی نفوزی خۆی لەناوچەکە هێرشی سەربازی کردە سەر ولاتی ئەفغانستان.

**شۆڕشی ئیسلامی لەئێران و فاکتەری کاریگەر لەگۆڕانی ستراتیجی ئەمەریکا لەناوچەکەدا :**

یەکێك لەگرنگترین بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکا لەکەنداوی فارسی دەسکەوتنی بەردەوام و دڵنیایە لەنەوتی ناوچەکە بەتایبەت بۆ هاوپەیمانە ئەوروپیەکان و یابان، ئەمەریکا بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە گرنگەی خۆی پشتی بە ڕژێمی شای ئێران بەستبوو، شا سەرەڕای جێبەجێکردنی ڕۆڵی بەرپرسیارێتی وەك جەندرمە و پاساوان لەناوچەکە و پارێزگاری لەبەرژەوەندیەکانی ئەمەریکا، بۆ ئەم وڵاتە هەلێکی زێرینی فەراهەم کردبوو کە هێزەکانیان ڕاستەخۆ دەستوەرنەدەنە کەنداوی فارسیەوە. ئەم کارەش بووەهۆی ئەوەی ئەزموونی تاڵی ڤێتنام دووبارە نەبێتەوە و هاوڕا لەگەڵ بەرگرتن لەزیانی گەورەی سەربازی و سیاسی لەئەمەریکا و ئەم وڵاتە بەبێ دەردیسەری و کەمترین خەرجی لەناوچەکە چالاکی بنوێنێت.

ڕوخانی شا و سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران لە(شباتی ١٩٧٩) سیستەمی (بەربەستی باکور) کە بۆ بەربەستکردنی نفوزی یەکێتی سۆڤێت لەرێگای پەیمانی سەربازی سنتو بە پەیوەندی لەگەڵ پەیمانەکانی ناتۆ و سیتو خرابووە بواری جێبەجێکردنەوە، تێکچوو. بەم شێوەیە هاتنەدەرەوەی ئێران و پاشان پاکستان لەپەیمانی سنتو لەساڵی (١٩٧٩) ئەم پەیمانە گرنگە سەربازییە هەڵوەشایەوە و لەبەرئەوە مەکتەبی ناوەندیەکەی کە لەئەنقەرەبوو، بە فەرمی لە(ئەیلولی ١٩٧٩) داخرا. ئێران لەیەکێتی و هاوپەیمانی لەگەڵ ڕۆژئاوا و هەندێك لەوڵاتی ناوچەکە هاتەدەرەوە و پەیوەندی بە بزوتنەوەی وڵاتە بێلایەنەکانەوە کرد و پەیوەندی لەگەڵ ئیسرائیل پچڕاند، دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران قەیرانی بەبارمتە گرتنی ئەندامانی سەفارەتی ئەمەریکی لەلایەن خوێندکارانی ئێرانەوە جەزرەبەیەکی گەورەبوو لەئەمەریکا درا. ڕوودانی شۆڕش لەگرنگترین پێگەی ئەمەریکا لەناوچەکە نەك تەنیا هاوسەنگی هێزی تێکدا، بەڵکو جەمسەرێکی تازەی هێز بەئایدیۆلۆجی ئیسلامی جیا لەئایدیۆلۆجیە باڵادەست و باوەکانی جیهانی هاوچەرخ دروست بوو. ئەم تایبەتمەندیە بەو مانایەبوو کە ئەمەریکا لەو مێژووە بەدواوە بۆ پاراستن و پەرەپێدانی بەرژەوەندیەکانی لەناوچەکە ڕووبەڕووی کێشەی تازە بووەوە.

بەوەی کە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران، وڵاتی ئەمەریکا لەناو ئەو وڵاتانەدا بوو کە حکومەتی تازەی شۆڕشی ئێرانی بە فەرمی ناسی، بەڵام پەیوەندی هەردوو وڵات بە هاتنەدەرەوەی ئێران لەپەیمانی سنتو و دواتر هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکە و هەڵوەشاندنەوەی ڕێکەوتنی سەربازی دوولایەنە و چوونەدەرەوەی ڕاوێژکارە سەربازی و ناسەربازیەکانی ئەمەریکا لەئێران و قبوڵنەکردنی سەفیری تازەی ئەمەریکا لەلایەن حکومەتی کاتیەوە و کەمبوونەوەی پەیوەندی سیاسی لەوڵات بۆ ئاستی فەرمانبەری سەفارەت، خۆبەدوورگرتنی ئەمەریکا لەناردنی ئەو چەك و کەلوپەلە سەربازی و ناسەربازیانە کە پێش شۆڕش لەگەڵ حکومەت ئێران واژۆکرابوو، سەنگەرگرتنی دوژمنانە لەکۆنگریس و هۆیەکانی پەیوەندی گشتی لەلایەن ئەمەریکاوە دژی ئێران و جوڵان و هەنگاوەکانی ئەمەریکا لەهەندێك ناوچەی هەستیاری

ئێران وەك كوردستان* و بلوجستان، پەیوەندیكردنی هەندێك لەكاربەدەستان و سیاسەتمەدارانی ئەمەریكا (وەك نیكسۆن) لەگەڵ شای ڕوخاو و پاشان ڕێگەدان بە شاو خانەوادەی پەهلەوی بۆ ناو ئەمەریكا لەئەنجامی ئەمانە و داگیركردنی سەفارەتی ئەمەریكا لەتاران لەلایەن خوێندكارانی پەیرەوی هێڵی ئیمام و بەبارمتەگرتنی كارمەندانی سەفارەت و هەوڵدانی ئەمەریكا بۆ ئازادكردنیان كە سەركەوتوو نەبوو تێیدا، ووردەوردە پەیوەندیەكەی نێوانیان لەساردیەوە بۆ لێڵی و پاشان بۆ ناخۆشی و سەرئەنجام گۆڕا بۆ شەڕ و دوژمنایەتی ئاشكرا.

سەركەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران گۆڕانكاری ڕیشەیی لەپێگەی ئەمەریكا لەناوچەكە دروست كرد لەگرنگترینی ئەوانە بریتیەلە:

* لەدەستدانی بنكەی هەواڵگری و تێكچوونی بنكەی جاسوسی ئەمەریكا لەناوچەكە.
* هەڵوەشاندنەوەی تەواوی پەیمانی سنتو.
* لەناوچوونی بازنەی پێكەوەبەستنی پەیمانی ناتۆ و سیتو.
* كەمبوونەوەی قەبارەی ناردەنی نەوتی ئێران .
* بەرزبوونەوەی نرخی نەوت لەجیهاندا.
* كەمبوونەوەی ناردەنی كاڵای سەربازی و ناسەربازی بۆ ئێران .
* لەهەمویان گرنگتر ناردنەدەرەوەی شۆڕشی ئیسلامی بۆ وڵاتانیتری ناوچەكە.
* پێگەی حكومەتە دەسەڵاتگەرەكان كەوتنەبەر مەترسی لەناوچەكەدا.
* ئاسایشی گەروی هورمز كەوتە مەترسیەوە.
* لەدەستدانی(جەندرمە و پاسەوانی ناوچەكە) وشكستی سیاسەتەكانی ڕۆژئاوا لەناوچەكەدا.
* سوودوەرگرتنی یەكێتی سۆڤێت بۆ بەدەستهێنانی هەلێك بۆ چونەناو ئەفغانستان.

شۆڕشی ئیسلامی لەئێران بەپێی ووتەی كاربەدەستانی سیاسی ئەمەریكا بەگرنگترین و هەستیارترین ڕووداوی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەدوای جەنگی دووەمی جیهانی بۆ ئەمەریكا دەژمێردرێت. چونكە ڕژێمی شا وەك یەكێك لەپایەكانی دووانەی ستراتیجی ئەمەریكا لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و یەكێك لەستونە سەرەكیەكانی تیۆری نیكسۆن و خاوەنی ئەو گرنگیە بوو كە هەتا پەیوەندی ئەمەریكا بەوڵاتانیتری وەك پاكستان، توركیا و میرنشینە عەرەبیەكانی كەنداو خستە ژێر تیشكی خۆیەوە. لەوكاتەدا شۆڕشی ئیسلامی ئێران ڕێچكەی جێبەجێكردنی ستراتیجی ئەمەریكای تێكدا و

---

*) ئەمەریكا نەك هەنگاوی نەنا بۆ یارمەتیدانی كوردەكان لەكوردستان، بەڵكو بە پێچەوانەوە هەتا ناڕەزایشی دەرنەبڕی بەرامبەر هەموو ئەو تاوانە دڕندە و نامرۆڤانانەی كە دەسەڵاتدارانی شۆڕشی ئیسلامی ئێران لەسەرەتای شۆڕش دژ بە خەڵكی بێتاوانی كورد لەناوچە كوردیەكان ئەنجامیان دا ـ وەرگێڕ.

لەدیدگای ئەمەریکاوە (بۆشایی دەسەڵات)ی هەستپێکراو لەناوچەکەدا دروستبوو کە پێویست بوو هەرچی زووترە ڕووبەڕووی ئەو بارودۆخە ببنەوە.

تێکۆشانی بەردەوامی ئێران لەدژی دەسەڵات و نفوزی ڕۆژئاوا، هەستکردن بەمەترسی سەرهەڵدانی شۆڕشێتر لەناوچەکە، ستراتیجستە ئەمەریکایی و ڕۆژئاواییەکانی واڵیکرد دووبارە بەخێرایی بەسیاسەتی خۆیاندا بچنەوە. ئێران وڵاتێکە کە بەبۆچونی واشنگتۆن دەبێت یەکێك بێت لەستونی سەرەکی و قایمی ئاسایشی ناوچەکە، لەگەڵ زۆری دانیشتوان و بوونی سەرچاوەی گەورەی سامان لەوانە دەرامەتی نەوت و پێگەی تایبەتی جوگرافی هەمووی بەیەکەوە، کێشەی زۆری بۆ دیموکراتخوازە دەسەڵاتدارەکان و دوایش کۆمارییەکانی کۆنگرێسی ئەمەریکا دروست کردووە.

لەژێر ئەم هەلومەرجەدا کە ئەمەریکا (شای ئێران) واتە (جەندرمەی ناوچە)کەی لەدەستچوو، هەموو هەوڵەکانی بۆ ڕێگرتن لەسەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ڕووبەڕووی شکست بووەوە. لەوەڵامی ئەم گۆڕانکارییە خێرایەدا، وڵاتانی ڕۆژئاوا و لەسەروشیانەوە ئەمەریکا ستراتیجی خۆی لەسەر بنەمای ئامانجی نوێ دارشت کە تەواوکەری ئامانجەکانی پێشوویان بوو بەمەبەستی پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان و ڕێگرتن لەڕووخانی ڕژێمەکانیتری ناوچەکە ( ئەم ستراتیجە لەژێر ناونیشانی تیۆری کارتەر ناوی دەرکرد کە لەبەشەکانی دوای باسی دەکەین). کە بەو پێیە یەکەم: دەبێت ڕژێمەکانی وڵاتانی دەوروبەر لەمەترسی ڕوخان ڕزگارکەن و کاریگەرییە گەورەکانی شۆڕشی ئیسلامی لەو وڵاتانە لەبەینبەرن. دووەم: بۆشایی سەربازی کە لەئەنجامی چونەدەرەوەی ئێران لەناوچەکە دروست بووە پڕبکەنەوە. سێیەم: بەشێك لەڕۆڵی سەرەکی بۆ ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنی سەربازی، کە لەسیاسەتی بەرگری ڕۆژئاواوە سەرچاوەی گرتبوو بۆ ئەو وڵاتانە بگێردرێتەوە. پەیڕەوی ئەم ستراتیجیەی ئەمەریکا، سیاسەتی دوو ستونی بەناچاری دەبێت پەنا بۆ سیاسەتی یەك ستونی بەرن. لەبەرئەوە سەرنجی ئەمەریکا بۆ ستونەکەی تر ڕۆیشت، واتە عەرەبستانی سعودی کە دەبوو هەردوو ڕۆڵە سەربازی و داراییەکە ببینێت. چونکە ئەم وڵاتە خاوەنی ڕووبەرێکی فراوان و سنورێکی درێژە لەسەر کەنداو، لەناو وڵاتانی عەرەبی و هەتا ئیسلامی خاوەنی گرنگی سیاسی خۆیەتی، خاوەنی سەرچاوەیەکی نەوتی گەورەیە و پێگە جوگرافیەکەی بەجۆرێکە کە لەخاکی ئەم وڵاتەوە بە ئاسانی ئۆپەراسیۆنی سەربازی دژی هەموو وڵاتانی نیمچەدورگەی عەرەبی و ناوچەکە ئەنجام بدرێت. هەڵکەوتەی کەناری لەسەر دەریای سوور وەك ئەڵتەرناتیفێك بۆ ناردنەدەرەوەی نەوت گونجاوە لەکاتی داخستنی گەرووی هورمزدا.

بەسەرنجدان لەم سیاسەتە (ڕاستەوخۆ جەنراڵ نارنست گریفز بەرپرسی دەزگای ئاسایش، هاوڕا لەگەڵ هارولد براون وەزیری بەرگری ئەوکاتی ئەمەریکا، لەساڵی (١٩٧٩) ڕێگای عەرەبستانی سعودیان گرتەبەر و دانوسانێکی پێویستیان بۆ تەیارکردنی سوپای عەرەبستانی سعودی لەڕووی چەك و ڕاهێنانەوە

ئەنجامـدا و ڕێکـەوتنێکی (٤،٦٣) ملیـار دۆلاریـان واژۆکـرد) کـە لەسـاڵانی ئاینـدەدا کڕینـی کەلوپـەلی سەربازی عەرەبستانی سعودی زیاتربوو.

هەروەها ترسی فەرمانڕەوایانی وڵاتانی باشووری کەنداو لەچاردنوسی وەك ئێران، زیاتر پشتیان بـە سیاسـەتی ئەمـەریکا بەسـت لەناوچـەکەدا. لەبەرئـەوە ئەمـەریکا بەئەنجامـدانی ڕێخۆشـکردنی جیـاوازی سیاسی، ئابوری و بەتایبەت سەربازی هەوڵیدا بەپلەی یەکەم شۆڕشی ئیسـلامی ئێران لەسەرەتاوە سەرکوت بکات، یان لایەنیکەم ڕێی لێبگرێت لەپەڕینەوە و فراوانبوونی بۆ وڵاتانیتر لەناوچەکە.

بەم ڕێوشوینە، ڕۆژئاوا پاریزگاری لەرژێمە زەرەرپێکەوتوەکانی باشوری کەنداو گرتەئەستۆی خـۆی و پرۆژەی (پشتێنەی ئاسـایشی یان ئەمنی) ئەمەریکا لەناوچەکە خستەبواری جێبەجێکردنـەوە، پشتێنەی ئاسایشی لەپاکستانەوە تا میسر درێژ دەبێتەوە بە بۆچونی ڕۆژئاوا بـۆ ڕێگرتنـە لەناردنـەدەرەوەی شۆڕشـی ئیسلامی و کەمکردنەوەی نفوزی یەکێتی سۆڤێتە لەناوچەکەدا، پەیمانی بەرگری دەستەجەمعی بەشێك لەم پشتێنەیە پێکدەهێنێت. پرۆژەی لاواز کردنی کۆماری ئیسلامی ئێران بە هاوئاهەنگی واشـنگتون و هێـزە ئەورووپیـەکان سـەربار خرایـە سـەر (سـتراتیجی بەرپەرچـدانەوە) ڕۆژئـاوا و عێـراق مەئموریـەت کـرا بەسودوەرگرتن لەوتیۆرە و هێرشی سەربازی فراوانی دژی ئێران ئەنجامدا.

## جەنگی عێراق ئێران ( جەنگی کەنداوی یەکەم ) و ڕۆڵی ئەمەریکا :

لێکۆڵینـەوە لەسیاسـەتەکانی کارتـەر و ڕیگـان و وتـەکانی سیاسـەت داڕێـژەرانی ئەمـەریکا پێـشاندەدات شـێوازی بەرکـەوتن و ڕووبەڕووبونـەوەیان لەمەسـەلەکانی ناوچـەکە، تایبەتـە بەشۆڕشـی ئیسلامی ئێران، ڕودانی شۆڕش لەگرنگتری پێگەی لایەنگری ئەمەریکا لەناوچەکە نـەك تـەنیا هاوسـەنگی هێزی تێکدا، بـەڵکو بـەهۆی ڕاگەیانـدنی سـەرەکی سیاسـەتی دەرەکـی ئێـران واتـە (نـە ڕۆژهـەڵاتی و نـە ڕۆژئـاوایی ـــ لاشـرقی، لاغربـی) جەمـسـەرێکی تـازە لەسـەر بنـەمای ئایـدیۆلۆجی ئیـسلامی جیـاواز لەئایدۆلۆجی باڵادەست و باوی جیهانی (کۆمۆنیستی، سەرمایەداری، ...) هاتە ئاراوە.

﴿ئێرانێکی وابەستە بە ئەمـەریکاوە بگۆڕێـت بـە هێزێکـی سـەربەخۆی ڕووبەڕووی ڕوولەگەشـەکردن کـە لـەو بڕوایەدایە (کەنداوی فارسی پەیوەستە بە وڵاتانی دەوروبەریەوە و دەبێت دەستی بێگانەکانی لـێ ببڕدرێـت) ئەم تیۆرە هۆکاری سەرەکی ناکۆکی بوو لەناوچەکەدا، کـە بەشـێوەی جـەنگی سـەپێنراو فـشاری سـەربازی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی دژ بە ئێران دەرکەوت﴾.

لە(١٧ ئەیلولی ١٩٨٠) دوای چەند مانگێك لـەگرژی و قـەیران لەپەیوەندیـەکانی ئێـران و عێـراق بەتایبەت لەسەر سـنوری هـەردوو وڵات، سـەدام حـسین بـە فـەرمی لەچـاوپێکەوتنێکی ڕادیـۆ/تەلـەفزیۆنی لەبەغدا ڕێکەوتننامەی (١٩٧٥ی جەزائیری) دڕاند، واتە ئەم ڕێکەوتنە بەشێوەی یەك لایەن بەتاڵکرایەوە. پێنج ڕۆژ دواتر، هێزەکانی عێراق هێرشێکی بەربڵاویان دەستپێکرد و چوونە ناوخـاکی ئێرانـەوە. سـەرۆکی

عێراق لەوخەیاڵەدا بوو بەهۆی نالەباری و ئالۆزی بارودۆخی دوای شۆڕشی ئیسلامی و لەناوبردنی زۆر لەسوپای ئێران و مەسەلەی بارمتە ئەمەریکیەکان، توانای سەربازی ئێران زۆر لاوازە و داگیرکردنی خاکی ئێران کارێکی ئاسانە، بەڵام چارەنوس و خەملاندن جۆرێکیتربوو هەروەها مێژوو بەجۆرێکیتر وەرچەرخا.

دوای هەڵگیرسانی جەنگ، جیمی کارتەر، سەرۆك کۆماری ئەوکاتەی ئەمەریکا، سەرەتا هێرشی سەربازی عێراق دژی ئێران پرۆتستۆکرد و لەم جەنگەدا بێلایەنی ڕاگەیاند، بەڵام دوای سەرکەوتنی گەورەی ئێران لەخرمشهر، لەساڵی (١٩٨٢) و پاشەکشێی سوپای عێراق لەخاکی ئێران و گۆڕانی هاوسەنگی هێزی سەربازی لەبەرژەوەندی ئێران، سیاسەتی ئەمەریکاش گۆڕانی بەسەردا هات. لەدوای ئەو مێژووە، بەتایبەت کاتێك کە ئێران جەنگی بردە ناو خاکی عێراقەوە حکومەتی تازەی ئەمەریکا (ریگان) بەشێوەیەکی دیارترو ئاشکراتر لایەنگیری لەعێراق کرد. لەلایەکیترەوە سیاسەت و باسی حکومەت ئەمەریکا لەبەرامبەر جەنگی عێراق ئێران سەبارەت بە وڵاتانی عەرەبی کەنداو هاوئاهەنگ و هاوڕابوو.

پرۆژەی ڕیگان بۆ ناوچەی کەنداو بەتەوەرەیەکی ستراتیجی هاوئاهەنگ دادەنرێت بۆ هەموو دەوڵەتەکانی وابەستە بە ڕۆژئاوا لەناوچەکە، کە دروستکردنی سیستەمی بەرگری کە شیاوی پشتپێبەستن و دڵنیاکاربێت، بەشێکی گرنگی ئەم ستراتیجیە پێکدەهێنێت. لەچوارچێوەی ئەم ستراتیجیەدا یەك هەفتە دوای هێرشی عێراق بۆ سەر ئێران، دیفد جۆنز سەرۆکی ئەرکانی سوپای ئەمەریکا لەعەرەبستانی سعودی دیدەنیکرد پێشەکی فرۆشتنی چەند دەزگایەکی فرۆکە لەچوارچێوەی ـ سبد ئاواکس ـ[1] کە پێشتر بڕیاربوو بە ئێران بدرێت، بۆ ئەم وڵاتە دابینکرا لەبەرامبەردا بڕیاربوو عەرەبستانی سعودی ئاسانکاری پێویست بۆ هێزەکانی پەرچەکرداری خێرای ئەمەریکا بخاتە خزمەتی ئەم وڵاتەوە.

بڕیاری ریگان بە فرۆشتنی فرۆکەی ئاواکس بە عەرەبستانی سعودی شێوەیەکیتری شەڕی ئەمەریکا بوو لەکەنداوی فارس. لەدوای ئەوەوە ئەمەریکا بەشێوەی ڕێکخراو چەکدارکردن و تازەگەری لەسوپای عەرەبستانی سعودی و وڵاتانی تری باشوری کەنداو دەستپێکرد و لەبەرامبەر ئەو دۆلارانەی لەئەنجامی فرۆشتنی نەوتەوە دەستیان کەوتبوو.

دەیەی دووەمی شەڕی فراوانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەکەنداو بە جەنگی عێراق ئێران دەستپێکرد. هەرچەندە ڕژێمی عێراق ملکەچی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا نەبوو، بەڵام جەنگکردن لەگەڵ ئێران باشترین دیاری بوو کە دەیتوانی پێشکەش بەسیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکای بکات. ئەسڵی

[1]) سبد ئاواکس کۆمەڵێك لەچەکی سەربازی دەگرێتەوە کە بریتی بوو لەپێنج دانە ئاواکس و شەش فرۆکە سوتەمەنی وەرگر لەئاسمان کە مۆدێلی کی.سی. ٧٠٧ و ١١٧٧ و موشەکی سایدویندەر و کەلوپەلی پێویستی مۆدێرن بۆ بەهێزکردنی توانای فرینی فرۆکەی (ئف ـ ١٥) کە توانای ئەم فرۆکانە لە (٤٥٠) میلەوە بۆ (١٠٠٠) میل زیاد دەکات.

سیاسەتی ئەمەریکا لەم ناوچەیە، هەر لەکۆنەوە، جێگیرکردنی (هاوسەنگی هێزە) لەنێوان وڵاتانی ناوچەکە بەجۆرێك کە:

١- هیچ هێزێکی دوژمن بەئەمەریکا نابێت باڵادەستی لەناوچەکە و سەرچاوە نەوتیەکەی هەبێت.

٢- نەوتی ناوچەکە بەبێ کۆسپ بنێردرێت بۆ جیهانی ڕۆژئاوا.

٣- ڕووبەڕووی نفوزی یەکێتی سۆڤێت ببێتەوە.

٤- هەر وڵاتێك یان گروپێك لەوڵاتەکان، هێزی وڵاتێتر یان گروپێتر لەوڵاتەکان هاوسەنگ بکات.

ئەم مەسەلەیە لەورووەوە جێگای تێڕامانە کە شێوازی تێڕوانینی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ وڵاتانی ناوچەکە و سەرچاوەکانیان و حکومەتەکانیان پیشان دەدات، ئەگەر یارمەتی دانی حکومەتێك تا هێزی سەربازی یان ئابووری زیادبکات، بۆ ئەو مەبەستەیە کە هێزی دەوڵەتانیتر لەناوبەرێت بۆئەوەی هاوسەنگی دروست بکات، هاوسەنگیەك کە تێپەڕینی نەوت لەگەروی هورمز و بەرژەوەندی ستراتیجی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دابینبکات.

هەرچۆنێك بێت جەنگی عێراق ئێران، ڕەوشەکەی جیاوازە و بەتایبەت لێرەدا بەرێگای دەستێوەردانی ئاشکرای سەربازی لەجەنگی عێراق ئێران بەشداریکرد. لەستراتیجی ئەمەریکادا سێ جۆر دەستتێوەردان لەجەنگدا هەبوو:

١- بەڵێندانی دڵنیایی ئەمەریکا سەبارەت بە ئازادی کەشتیوانی لەکەنداوی فارسی و گەروی هورمز.

٢- زەمانەتکردنی ئەمەریکا سەبارەت بە پاراستن و پشتیوانیکردنی ڕژێمی عێراق لەجەنگدا.

٣- پارێزگاریکردن لەهاوسەنگی هێز لەناوچەی کەنداوی فارسی .

بەپێی ئەم خواستانە ئەم وڵاتە (واتە ئەمەریکا) لەسیاسەتیدا هەوڵیدا پەیڕەوی پارێزگاری لەهاوسەنگی نێوان ئێران و عێراق بکات، لەساڵی (١٩٨٠) واتە سەرەتای جەنگ، کاتێك کە وا هەستدەکرا عێراق بەسەر ئێراندا سەردەکەوێت، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەم مەسەلەیە نیگەران بوو کە ڕوخانی ئێران ببێتەهۆی دابەشبوونی ئەم وڵاتە و زەمینەی پێویست بۆ هێرشی یەکێتی سۆڤێت دروستبکات و حزبی تودەی ئێران بتوانێت بگاتە دەسەڵات، بەشێوەی گشتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا وەك هەموو وڵاتانیتری عەرەبی ناوچەکە خۆشحاڵ نەبوون بە گۆڕانی عێراق بۆ هێزێکی سەربازی باڵادەست لەناوچەی کەنداو.

لەلایەکیترەوە، ئەگەری سەرکەوتنی سەربازی ئێرانیش کە زیاتر چاوەڕوانکراو بوو وەك لەسەرکەوتنی عێراق، هەڕەشەبوو بۆ سەر بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکا، لەدیدی ئەمەریکاوە سەرکەوتنی ئێران هەڕەشەی سەربازی ڕاستەوخۆبوو سەبارەت بەعەرەبستانی سعودی و کوێت و وڵاتانیتری کەنداو، کە پشتیوانیان لەعێراق دەکرد. لەبەرئەوە سەرکەوتنی سەربازی ئێران نەك تەنیا هەلی بە ئێران دەدا تا

شۆڕشی خۆی لەڕێگای ڕاگەیاندنەوە بنێرێتەدەرەوە، بەڵکو ئێران بەسەرکەوتنی کۆتایی نمونەیەکی بۆ نوسولیە ئیسلامیەکانی وڵاتانیتر ئیسلامی پیشاندەدا. لەدیدی ئەمەریکاوە بڵاوبونەوەی شۆڕشی ئیسلامی ئێران نەك تەنیا بۆ ڕژێمە لایەنگرەکانی ئەمەریکا، وەك عەرەبستانی سعودی، ئەردەن، میسر و وڵاتانی کەناری باشووری کەنداو هەرەشەی جدی بوو، بەڵکو بە مەترسی بەهێزیش بۆ وڵاتانی نەتەوەیی لایەنگری یەکێتی عەرەب وەك سوریا دەژمێردرێت.

لەم بارەیەوە بۆچونی هنری کیسنجر، داڕێژەری سیاسەتی ئەمەریکا، لەبارەی جەنگی عێراق ئێران دەڵێت:

{سەرکەوتنی تەواوەتی هەریەکە لەدوو هێزی دژ بەیەکە بەرژەوەندی وڵاتانی پیشەسازی هەتا یەکێتی سۆڤێتیش دەخاتە مەترسیەوە. سەرکەوتنی ئێران ئۆقرە و ئارامی سیاسی و ئابوری جیهان ڕووبەڕووی مەترسی دەکاتەوە، بەڵام سەرکەوتنی عێراق وەك هێزێکی پارێزەری تیرۆریزم، کە ئەگەری کەمترە، یارمەتیدەدات بۆ فشار خستنەسەر وڵاتانی میانڕەوی عەرەبی وەك کوێت} .

ئەمەریکا بۆ پەیڕەویکردن لەبۆچونەکانی سەرەوە لەدوای ساڵی (١٩٨٠) تا کۆتایی جەنگ هەنگاوی ئاشکرای ناوە لەپشتیوانیکردنی سیاسی، ئابووری و سەربازی عێراق و بەهێزکردنی ئەم وڵاتە بە هەڵڕشتنی یارمەتی دارایی و چەك لەسەرتاسەری جیهان و لەکۆتایدا ڕێگرتن لەسەرکەوتنی ئێران. یارمەتیەکانی ئەمەریکا بۆ عێراق بریتیبوو لەپێدانی کۆمەکی ئابوری (ئەمەك و نەختینە)، پارێزگاریکردن لەعێراق لەئەنجومەنە ئابوری، سیاسی و سەربازیە نێودەوڵەتیەکاندا، بەتایبەت لەڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان و هەندێك لەبڕیارنامەکانی ئەنجومەنی ئاسایش، لەڕووی پڕۆتستۆکردنی ئێران و لەبەینبردنی شکاتەکانی دژی بەعێراق، پڕۆژەی قەدەغەکردنی فرۆشتنی چەك بەئێران و هاندانی هاوپەیمانەکانی ئەوروپای ڕۆژئاوا بەپارێزگاری کردن لەجێبەجێکردنی ئەم پڕۆژەیە و پێدانی زانیاری بەنرخی سەربازی سەبارەت بەجوڵە و گواستنەوە و ئاڵوگۆڕی هێزە سەربازیەکانی ئێران بەعێراق، دروستکردنی زەمینەی پێویستی سیاسی/سەربازی بۆ دەسپێکردنی جەنگی نەوتبەرەکان لەلایەن عێراقەوە بە ئامانجی کەمکردنەوەی توانای ئابووری ئێران لەجەنگدا و هیتریش.

هەروەها وڵاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو بە درێژایی جەنگی عێراق ئێران لەیارمەتی دارایی، سەربازی و سیاسی بۆ ڕژێمی سەدام حسین درێغیان نەکرد. بەدرێژایی هەشت ساڵی جەنگ گرنگترین کۆمەکەکانی وڵاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو بۆ عێراق بریتیبوو لە:

- پێدانی یارمەتی دارایی بەرچاو بەحکومەت عێراق، بۆ نمونە لەساڵی (١٩٨٢) بەغدا تێکرا نزیکەی (٢٤) ملیارد دۆلاری لەم وڵاتانە وەرگرت بەمجۆرە (١٢ملیارد دۆلار لەعەرەبستانی سعودی، ٦ملیارد لەکوێت، ٤ملیارد لەئیمارەتی عەرەبی و ٢ملیارد لەقەتەر)

- ناردنەدەرەوەی بەشێك لەنەوتی عێراق لەرێگای هێڵی بۆری عەرەبستانی سعودی بۆ سەر دەریای سوور.

- واژۆکردنی رێکەوتنێك لەنێوان ریاز و بەغدا بەمەبەستی دروستکردنی دوو هێڵی بۆری لەناو خاکی عەرەبستانی سعودی بۆ گواستنەوەی نەوتی خاوی عێراق بۆ سەر بەندەری ینبوع لەدەریای سور.

- لەپاشاندا فەراهەمکردن و ئاسانکاری تا لەرێگایەوە بەشێك لەدەرامەتی ساڵانە کە لەناردنەدەرەوەی نەوتی عەرەبستانی سعودی و کوێتەوە دەست دەکەوت بخرێتەسەر حسابی حکومەت عێراق (ئەم هەنگاوە ساڵانە نزیکەی (١,٥) ملیارد دۆلاری بۆ عێراق پەیدادەکرد).

بێگومان، بەبێ پێدانی ئەو یارمەتیانەی سەرەوە، حکومەت عێراق چ لەمەیدانی جەنگ لەگەڵ ئێران و چ بۆ رووبەڕووبونەوەی بارودۆخی ناوخۆی توشی کێشەی گەورە دەبوو، توانای درێژەدانی بەجەنگ لەگەڵ ئێراندا لەدەست دەدا.

بەشێوەی گشتی کۆی یارمەتیە داراییەکانی ئەم وڵاتانە بۆ عێراق لەنیوەی (١٩٨٠) لە (٣٠) ملیار دۆلار زیاتر بوو. *دوای هێرشکردنی عێراق بۆ سەر کوێت پادشای عەرەبستانی سعودی ڕایگەیاند کە وڵاتەکەی لەماوەی هەشت ساڵی جەنگدا (٢٧,٥) ملیارد دۆلاری یارمەتی پێشکەش بە ڕژێمی سەدام حسین کردووە. هەروەها سەفیری کوێتیش لەئەمەریکا لەسمینارێکدا کە لە(١٢ئەیلولی ١٩٩٠) لەدامەزراوەی زانیاری بروگینگر بەستی ووتی: کۆی یارمەتیە نەختینەکانی ئێمە بەوڵاتی عێراق لەجەنگی عێراق ئێراندا (١٤) ملیار دۆلارە. سەرەڕای ئەوەی بەندەرەکانی خۆمان بۆ تێپەڕینی عێراق خستە سەرپشت و هەموو پێویستیە جەنگیەکانیانمان دابینکرد. کۆی قەرزەکانمان یان عێراق هەرچیەکی ناودەنێت لەسنوری (٣٠) ملیارد دۆلار تێپەڕیوە، ئێمە ئەم (٣٠) ملیارد دۆلارەمان وەك یارمەتی لەجەنگ دژی ئێران بەوداوە و هەرگیز وەك قەرزاری لەسەری حسابمان نەکردووە. کەواتە کۆمەکەکانی ئەم دوو وڵاتە بۆ عێراق بە درێژایی جەنگ دەگاتە (٥٧,٥) ملیارد دۆلار. ئەم برە زۆرەی یارمەتی بۆ عێراق پیشاندەری پارێزگاریکردنی وڵاتانی کەنداوە لەسەدام حسین.

شتێکی ئاشکرایە کە هاوپەیمانانی ئەمەریکا بەبێ ڕەزامەندی ئەو وڵاتە ئەم یارمەتیانەیان بەعێراق نەداوە. نامانەوێت کە فرۆشتنی چەك و پێدانی یارمەتی و زانیاریەکان لەلایەن وڵاتانیتری (یەکێتی سۆڤێت، فەرەنسا، بەرازیل، ئەرجەنتین و...) باسبکەین. خاڵێك کە جێگای باسە ئەوەیە کە عێراق لەوجەنگەی لەگەڵ ئێران و شۆڕشەکەی خزمەتی بە ئامانجی ستراتیجی و سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا کردوە. هەرچەندە عێراق بەبڕیاری ئەمەریکا جەنگی دەستپێنەکرد، بەڵام کارەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و هەندێك لەهاوپەیمانەکانی لەناوچەکە ڕۆڵی گرنگی لەهەڵگیرساندنی شەڕدا

بینی. بەشی زۆری سەرچاوەکان یارمەتیاندا لەبەهێز بوونی عێراق، بەهۆی ئەوەوەبوو کە جەنگی لەگەڵ ئێراندا هەڵگیرسان بۆیە یارمەتیاندا و سوودوەرگرتن لەو سەرچاوانە بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان بوو».

ئەگەر سەرنج بدەین کە تاساڵی (١٩٨٦) هەردوو وڵاتی عێراق و ئێران شەش ساڵیان لەجەنگێکی خوێناوی تێپەڕاند بوو، بەوەی کە عێراق لەپارێزگاری هەمەلایەنەی وڵاتانی ناوچەکە و جیهانی ڕۆژئاوا سوودمەندبوو، بەڵام لەبەرامبەر ئێراندا باودۆخێکی خراپی هەبوو، لەبەرئەوە بۆ ڕزگار بوون لەوتەنگەتاویە لەهەوڵدابوو کە شەڕ بگوێزێتەوە بۆ دەرەوەی سنوری خۆی و وڵاتانیتری ناوچەکە لەناگری شەڕەکەوە بگلێنێت. چەکی زۆر پێشکەوتوو کە لەبەردەستی سوپای عێراقدا بوو، توانای بەم وڵاتەدا کە نەك تەنیا لەناوچەی دووردەست لەناو قوڵایی خاکی ئێراندا ئامانج بپێکێت، بەڵکو هێرشیکردە سەر دامەزراوە نەوتیەکانی ئێران وەك دامەزراوەی نەوتی خەرج و هەموو دامەزراوەکانی دەوروبەری کەنداوی فارسی و کەشتیەکان و نەوتبەرە گەورەکان کە لەدورگە و بەندەرەکانی ئێران هاتوچۆیان دەکرد. ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە ناردنەدەرەوەی نەوت بۆ ئێران وەك تەنیا سەرچاوەی دەرامەت و لایەنی ژیانی بوو. لەڕاستیدا بەپێچەوانەی عێراقەوە کە توانای بەکارهێنانی بەندەرەکانی لەدەست دابوو، بۆ ماوەی شەش ساڵ بوو لەناردنەدەرەوەی نەوت لەڕێگای کەنداوی فارسیەوە بێبەش بوو، ئێران بەهۆی باڵادەستی بەسەر گەروی هورمز توانای دابینکردنی ئاسایش بۆ کەشتیەکانی لەدەریادا، بە درێژایی جەنگ بەردەوام بوو لەناردنەدەرەوەی نەوت. ئەو هێرشانەی عێراق بۆ سەر دامەزراوە نەوتیەکان زەرەری گەورەی بە ئابووری ئێران گەیاند. ئێران لەوەڵامی هەوڵەکانی عێراق بۆ فراوانکردنی ڕووبەری جەنگ، هیچ چارەیەکی نەبوو جگە لەفشار خستنەسەر وڵاتانی هاوپەیمانی عێراق وەك وڵاتە میرنشینەکانی کەنداو، بەو ئومێدەی وڵاتانی ناوبراو، وا لەعێراق بکەن واز لەم کارانە بێنێت.

بەهۆی ئەوەی ئێران سوودی لەداهێنراوە جەنگیە زۆر سادە و سەرەتاییەکان وەردەگرت کە کارایییەکی زۆریان نەبوو، بەڵام هەنگاوەکانی لەباری سیاسیەوە زۆر کاریگەر بوو. ڕاستە ئێران سوودی لەئامێری جەنگی ئاسایی وەك تۆپ و چەکی کلاسیکی وەردەگرت لەبەرامبەر کەلوپەلی پێشکەوتووی عێراق وەك (موشەکی کرۆس)، یان موشەکی لەجۆریتر لەبەرامبەر چەتری ئاسمانی ئەمەریکای تەیار بە پێشکەوتووترین ڕادار و سیستەمی ئەلەکترۆنی دژە موشەك، بەڵام نەیتوانی مەترسی گەورە دروست بکات. لەگەڵ ئەو هەموو جوڵە هەمەلایەنەدا، سوپا ئێران نەکەوتە ژێر کاریگەری سیاسی/ڕاگەیاند بەتایبەت لەپەیوەست بە ستراتیجی سیاسی ئەمەریکاوە.

بەو مانایەی کە هەڵدانی ئەو موشەکانەی دروستکراوی وڵاتی چینە بەهەرەشەی دەوڵەتی کوێت، لەدیدی واشنگتۆن نیشانەی نەبوونی ئاسایشی کەشتیە نەوتبەرەکانە لەکەنداو، سیاسەتمەدارانی ئەو وڵاتە

وایـان دەبینـی کـە وڵاتـی کـوێتیش ناچـاربێت داوا لەئەمـەریکا و یـەکێتی سـۆڤێت بکـات کـە کەشـتیە نەوتبەرەکانی بە ئاڵای ئەوانەوە هاتووچۆ بکات تا لەهێرشی سەربازی ئێران پارێزراوبێت.

﴿هەڕەشەی ئێران بۆ داخـستنی گـەروی هـورمز بـووە هـۆی بڵاوکردنـەوەی بەیاننامەیـەك لەلایـەن وەزارەتـی دەرەوە و کۆشـکی سـپی ئەمـەریکاوە، کـە ئـازادی هاتووچـۆی کەشـتیەکان لەگـەروی هـورمز پارێزراوبێت. لە(١٩ تشرینی یەکەم ١٩٨٣) سـەرۆك کۆماری ئەمەریکا ڕایگەیاند: (مـن بـاوەڕ ناکـەم کـە دنیـای ئـازاد بتوانێـت بێـدەنگ بێـت و هەرکەسـێك بیـەوێت گـەروی هـورمز و کەنـداوی فارسـی بـەڕووی هاتووچـۆی کەشـتیەکان لـەم ڕێـڕەوە نێودەوڵەتیـەدا داخـات). ریگـان لەچـاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەییـدا لە(٢٢شـباتی ١٩٨٤) ڕایگەیاند ئێمە بەهیچ جۆرێـك نـاتوانین ڕێگەبـدەین گـەروی هـورمز ببەسـترێت ئـەم ڕێگایە بۆ کەشتیوانی کراوە دەبێت، هەوڵیـدا بـەو هەڕەشـانە ئێـران لەئەگـەری داخـستنی گـەروی هـورمز ئاگادار بکاتەوە، ڕاگەیاندنی لـەم جـۆرە نیگـەرانی زۆری لـەنێوان وڵاتـانی ناوچـەکە و سیاسـەتی جیهـانی دروستکرد﴾.

هەرچەندە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەجەنگی عێراق ئێران بێلایەن بوو، وردەوردە لـەعێراق نزیك بووەوە و لەئێران دورکەوتەوە، لە(نیسانی ١٩٨٤) داومودەزگای حکومەتی ریگان ئێرانیان خستەناو لیستی وڵاتانی تیرۆریستەوە لەتشرینی دووەمی ئەو ساڵەدا پەیوەندی ئەمەریکا و عێراق کە ماوەیەك بـوو پچڕابوو دەستپێکردەوە.

سەبارەت بەداواکەی کوێت بۆ هەڵدانی ئـاڵا لەسـەر کەشـتیەکانی هەرچـەندە ئەمـەریکا بێـدەنگی هەڵبژارد بەڵام یەکێتی سۆڤێت یەکسەر ڕازیبوو، ئەمەریکاش لەساڵی (١٩٨٧) ڕەزامەندی خۆی پیشاندا، لەلایەکیترەوە کەشتیگەلی سۆڤێتی بەمەبەستی پاراستنی ئاسایشی هاتوچۆی کەشـتیەکان هاتـە ناوئـاوی کەنداوی فارسیەوە. بـەجۆرە لەدیـدی حکومـەتی ریگـان و بەرپرسـانی کۆشـکی سـپیەوە، ئـەم گۆڕانکایـە دەبێتەهۆی دروستکردنی مەترس لەدوو ڕووەوە: یەکەم ئامادەیی ڕاستەوخۆی یەکێتی سـۆڤێت لەناوچـەکە، دووەم و گرنگتر، ئامادەیی سیاسی ئەم وڵاتە لەناوچەکە، لەڕاستیدا بە نیـشانەی سـەرکەوتنی دیپلۆماسـی یەکێتی سۆڤێت دەژمێردرێت.

گۆڕانکـاریتر ئەوەیـکـە، لـەدوای ئـەوەوە ئێـران بـووە دوژمنـی هـەرێمی وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکا، بـەڵام عێـراق بـە دۆسـتی تـازەی ئەمـەریکا لەکەنـداو دەژمێردرێـت، ئـەم کـارە بـۆ بەغـدا بەسەرکەوتنێکی تازەی سیاسـی لەجـەنگ دژی ئێـران دەژمێردرێـت هـەروەها بۆچـوونی ئـەم دەوڵەتـە کـە دەیویست سنوری جەنگەکە فراوان بکات لێرەدا بەدیدەهات.

ئەمەریکا لەنیوەی دووەمی ساڵی (١٩٨٧) تاکۆتایی جەنگ ڕۆڵی چالاکتر و فـراوانتری لەجـەنگی عێـراق ئێرانـدا گرتەئەسـتۆ و لەهەنـدێك جێگـادا ڕاسـتەوخۆ لەگـەڵ ئێـران کەوتـە شـەڕەوە. پـڕۆژە و

جێبەجێکردنی سوودوەرگرتنی کەشتییە نەوتبەرەکانی کوێت لەناڵای ئەمەریکا و حیمایەکردنی لەلایەن کەشتی سەربازی ئەمەریکاوە و لەکۆتایدا زیادکردنی کەشتیگەلی سەربازی ئەمەریکا و هاوپەیمانی ڕۆژئاوا لەناوی کەنداودا، هەمووی نیشانەی حەساسیەتی زۆری ئەم وڵاتە و ڕۆژئاوایە سەبارەت بە گۆڕانکاری ناوچەکە و چونیەتی سەنگەر گرتنلێی.

بەمجۆرە جەنگی نەوتبەرەکان ڕوو لەزیادبوون بوو. بە جۆرێك کە (لەساڵی ١٩٨٥ژمارەی کەشتیەکان ٤٧ دانەبوو، لەساڵی ١٩٨٦ بوو بە ١٠٧ دانە و لەساڵی ١٩٨٧ گەیشتە ١٧٨دانە کەشتی نەوتبەر لەناوی کەنداودا کەوتنەبەر هێرشی هەردوولا).

(هەرچۆنێك بێت، شەڕ و بەڵێنە سەربازیەکانی ئەمەریکیەکان لەناوچەکە، ستراتیجی ئەو وڵاتەی بەئامانجی دوولایەنی پارێزگاریکردن لەبەرژەوەندیەکانی ئەمەریکا و پاراستنی ئاسایشی وڵاتانی میانڕەو و دۆستی ئەمەریکا لەناوچەکە ڕاکێشا، لەهەمانکاتدا وەك نیشانەی هەوڵە نێودەوڵەتیەکان دەردەکەوێت بۆ وەڵامدانەوەی هەردوولای بەشەڕهاتوو واتە عێراق و ئێران و فشار خستنەسەریان بۆ کۆتایی هێنان بەو جەنگە کاولکاریەی چەندین ساڵە بەردەوامە).

بە گرنگیدان بەو خاڵەی کە لەدەیەی هەشتاکاندا یارمەتی ڕژێمێکیاندا بۆ لەناوبردنی حکومەت ئێران لەجەنگدا بەشێوەی سەرەکی سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەکەنداو گۆڕا، یارمەتیدانەکە تەنیا لایەنی چەکدارکردن و زانیاریدان و ئابووری نەبوو بۆ عێراق، بەڵکو هێزی دەریایی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەساڵی (١٩٨٧) خۆی بەشێوەی ڕاستەوخۆ بەشداری شەڕی کرد. (وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی هەنگاوینا بە ناردنی هێزی سەربازی بۆ ناوچەکە. ئەو هێزانە لەکەنداو بریتیبوون لە(٣٥) کەشتی جەنگی کە لەکەشتیگەلی ئەفەربەر و کەشتیگەلی موشەکهاوێژ و کەشتی تەیار بەچەکی ئەتۆمی پێکهاتبوو). لەبەرئەوەی هاتنە ناوەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ کەنداو بە ناردنی گەورەترین یەکەکانی سوپای ئەمەریکا بۆ ناوچەکە قەیرانی سەردەمی جەنگی ڤێتنامی دروستکرد.

(یەکەمین ڕووبەڕووبونەوەی سەربازی ئێران لەگەڵ هێزەکانی ئەمەریکا لەکۆتایی (ئەیلولی١٩٨٧) ڕوویدا، کە هەلیکۆپتەرێکی هێزە دەریاییەکانی ئەمەریکا تەقەیکرد لەکەشتیەکی جەنگی ئێرانی بەناوی (ئێران ئاجر) لەناو ئاوی کەنداودا کرد. لە(١٩ی تشرینی یەکەمی) هەمان ساڵ کاتێك موشەکێکی ئێرانی بەر کەشتیەکی نەوتبەری کوێتی کەوت بەناوی (سیتی ئایل سیتی) کە ئاڵای وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای هەڵکردبوو (١٨) سەرنشینی ئاوی بریندار بوون، هێزەکانی ئەمەریکا دوو سەکۆی نەوتی ئێرانیان کە لەناو دەریا بوون تێکشکاند (سەرەڕای ئەم شەڕانە، لەڕووبەڕووبونەوەی بەلەمە جەنگیەکانی ئێران لەگەڵ کەشتیە سەربازیەکانی ئەمەریکا دوو بەلەمی ئێران بە ناوەکانی پەیکان و سەهەند نقومبوون

و بەلەمێکیتریش زەرەری گەورەی بەرکەوت، کە لەئەنجامی ئەم شەڕ و پێکدادانە ژمارەیەک لەسەرنشینەکانی کوژران و بریندار بوون).

بە مەبەستی ڕوونکردنەوەی ئامانجەکانی ئەمەریکا لەکەنداو، ڕیگان لە(٢٣ئەیلولی ١٩٨٧) ڕاستەوخۆ دوای هێرشەکەیان بۆ سەر (ئێران ئاجر) ڕونکردنەوەیەکیاندا کەتێدا دەڵێت: سیاسەتەکانی ئێران هەڕەشەی دروست کردووە کە بەجدی دەتوانێت ئازادی کەشتیوانی و ئازادی هاتوچۆی نەوت لەکەنداو ببڕێت. ئەو کاتە ئامانجی سیاسەتی دەرەکی ئەمەریکای لەسێ خاڵدا ڕوونکردەوە.

١- هێنانەناوەوەی فشاری نێودەوڵەتی بەوەی کە جەنگ بە دانوسان کۆتایی پێبهێنرێت و ئەو زیانانە ڕاوەستێنرێت.

٢- درێژەدان بە پشتیوانی و یارمەتی دۆستانمان و وڵاتانی ناشەڕکەر لە کەنداودا بە مەبەستی بەرگریکردن لە خۆیان لە بەرامبەر هەڕەشەکانی ئێراندا.

٣- بەردەوامبوونی هەوڵی هاوکاری بە وڵاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو و هەموو دۆستەکانمان بە مەبەستی بەرگرتن لە تێکچوونی ئازادی کەشتیوانی وڵاتانی نا شەڕکەر.

دوای ئەم ڕوونکردنەوە فەرمییە، بۆچوونی گشتی ئەوەبوو کە ئامانجی ستراتیجی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دوورخستنەوەی یەکێتی سۆڤێت بوو لە کەنداوی فارسی و بنیاتنانەوەی ئابروی ئەمەریکا لەلای وڵاتانی میانڕەوی عەرەب کە لە ئەنجامی کێشەی (ایران-کۆنترا)* ئابڕوو چوونێکی بۆ دروستبوو﴿.

بە کورتی ڕووبەڕووبوونەوەی هەردوو وڵات (ئێران و ئەمەریکا) تا کۆتایی جەنگی عێراق ئێران درێژەی کێشا، سەکۆنەوتیەکان، بەلەمەکان، کەشتیە ناسەربازیەکان و کەشتیگەلی سەربازی ئێران و هەتا فڕۆکەیەکی مەدەنی ئێرانیش کەوتە بەر هێرشی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا (هەمان هێزی دەریایی ئەمەریکا بوو کە لە جەنگی عێراق ئێران لە بەرژەوەندی عێراق سێیەکی کەلوپەلی دەریایی-سەربازی ئێرانی لە ساڵی ١٩٨٧ تێکشکاند، ئەمەش گورزێکی توند بوو کە بەر هێزی دەریایی ئێران کەوت).

﴿سەیرە کە لە قۆناغی دوایی جەنگدا بەرپرسانی سیاسی ئەمەریکا لە ڕوونکردنەوەی کارەکانی وڵاتەکەیان، ئیتر ئاماژەیان هەتا بۆ (مەترسی یەکێتی سۆڤێت) لە ناوچەکە نەدەکرد. گوزارشتی جۆرج شولتز وەزیری دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە (کانونی دووەمی ١٩٨٧) سەبارەت بە

---

* مەسەلەی (ئێران-کۆنترا) لە ساڵانی (١٩٨٥-١٩٨٦) دوای هەوڵی زۆری بێئەنجامی ئەمەریکا بۆ ئازادکردنی بارمتە ئەمەریکیەکان، لە لبنان، ئەمەریکا و ئیسرائیل پەیوەندی نهێنیان لەگەڵ ئێران بەست کە هەندێك چەك بۆ ئێران بگوێزنەوە ئەم سیاسەتەی ئەمەریکا بە نهێنی بێت، لە بەرامبەر ئێران گۆڕانی بنەڕەتی ڕوویدا. کاتێك ئەمە ئاشکرابوو پەیوەندی ئەمەریکا لەگەڵ وڵاتە دۆستەکانی لە کەنداوی فارسی مەترسی تێکەوت، لە ئەنجامدا سیاسەتی ئەمەریکا دووبارە گۆڕانی بەسەرداهاتەوە و بەردەوامبوو لەسەر پشتگیریکردنی عێراق. (سەرچاوە. جابر، پائول، همان منبع، ص٤١.

ئارەزووی ئەمەریکا بۆ ئامادەیی ڕاستەوخۆی لە کەنداو و دەستتێوەردانی کۆتایی لە جەنگی عێراق ئێران، ئاماژە بۆ سێ بابەت دەکات:

١- پچڕاندنی هاتوچۆی نەوت یان کۆنترۆلکردنی سەرچاوەی وزە لەلایان هێزێکی نادۆست دەتوانێت کاریگەری خراپی لەسەر بازرگانی جیهان و ئابووری ئێمە هەبێت.

٢- هەرکاتێك لەئەنجامی فراوانخوازی ئێران، حکومەتەکانی وڵاتە دۆستەکانمان ڕوخا، یان هێزی دژە ئەمەریکایی لەناوچەکە بەهێز بوو، بەرژەوەندیەکانی ئێمە زەرەری گەورەیان بەردەکەوێت.

٣- وەك بەشێك لەڕێڕەوی ستراتیجی لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەم ناوچەیە دەتوانێت بخرێتە ژێردەستی هێزێکی دوژمن بە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی.

بەجۆرە دەتوانین بڵێین لەدووەمین دەیەی ڕووبەڕووبونەوەی فراوانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەناوچەی کەنداو لەچوارچێوەی تیۆری ڕیگاندا، سیاسەتی ئەمەریکا جەختی دەکردەوە لەسەر لاوازکردن یان ڕوخانی ئێران، بەهێزکردنی دەوڵەتەکانی کەناری باشووری کەنداو، بە هێزکردنی عێراق و سودلێوەرگرتنی بۆ دابینکردنی ئاسایش و تێپەڕنی بێ کۆسپی نەوت لەناوی ناوچەکەدا ﴾.

(بە درێژایی مانگی حزیران ١٩٨٨ عێراقیەکان هاوئاهەنگ لەگەڵ نۆپەراسیۆنی کەشتی جەنگی ئەمەریکا لەکەنداوی فارسی لەسەرتاسەری بەرەکانی جەنگ هێرشیان دەستپێکرد و بە یارمەتی ئەمەریکا نیمچەدورگەی فاو و مجنونی لەئێرانیەکان سەندەوە و چووە ناو خاکی ئێرانەوە).

سەرئەنجام لە( ٣تەموزی ١٩٨٨) لەئەنجامی خستنەخوارەوەی فڕۆکەیەکی مەدەنی ئێرانی لەباشوری گەروی هورمز کە لەبەندەر عەباسەوە بەرەو دوبەی دەچوو لەئەنجامی ئەم کارەدا (٣٠٠) کەس مەدەنی کوژران کە نیشانەی ئەوەیە جەنگ و هێرش بۆ سەر مەدەنیەکان دەستپێکرد و هەوڵی هەمەلایەنەی ئەمەریکا لەبواری سیاسی/ئابوری، سەربازی و نێودەوڵەتی لەلایەك و تەنگەتاوکردنی ئێران لەڕووی پێویستی کەلوپەلی سەربازی و کاریگەری ئەمانە لەسەر بەرەکانی شەڕ لەلایەکیترەوە ناچار بە قبولکردنی ئاگربەست و بڕیاری (٥٩٨)ی ئەنجومەنی ئاسایشی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان لەلایەن ئێران لەمێژووی (١٨تەموزی ١٩٨٨) و عێراقیەکان هەتا دوای ئەو مێژوەش چەندین ڕۆژ دوودڵ بوو لەقبولکردنی.

( خەسارەتی گیانی جەنگی هەشت ساڵی عێراق ئێران بە نزیکەی ملیۆنێك کەس خەمڵێنراوە و خسارەتی مادی ئەو ماوەی جەنگە کەبەر ئێران کەوتووە بەپێی دوایین هەڵسەنگاندن دەگاتە نۆ سەد ملیارد دۆلار، کە یەکسانە بە دەرامەتی پێشبینیکراوی نەوتی ئێران لەماوەی سی تا چل ملیۆن ساڵدا).

بەجۆرە ستراتیجی ئەمەریکا لەکەنداو لەئاکامدا گەیشت بە ئەنجامی خواستراوی ئەو وڵاتە: جەنگی عێراق ئێران کۆتایی هات، یەکێتی سۆڤێت وڵاتی ئەفغانستانی بەجێهێشت، لەهەمووان گرنگتر

ئەوەیە کە بە بۆچوونی ئەمەریکیەکان، تا ماوەیەکی درێژ و لەداهاتوویەکی دووردا لەخاکی ئێران و یەکێتی سۆڤێتەوە هەرشە دروست ناکات بۆ سەر کەنداوی فارسی، چونکە ژێرخانی سەربازی/ئابووری ئێران داڕزاوە لەماوەی هەشت ساڵی جەنگدا، سەرەڕای ئەوەی دوای جەنگیش گیرۆدەبوون بە مەسەلە ناوخۆییەکان و بنیاتنانەوەی کاولکاریەکانی جەنگ. کورتەی باس ئەوەیە کە ئەمەریکا بەهەرسێ ئامانجی خۆی گەیشتووە: فشار خستنەسەر ئێران، دابینکردنی ئاسایشی ناوچەی کەنداو، دەستبەسەراگرتنی تەواو بەسەر سەرچاوەی نەوت و هاتوچۆو گواستنەوەی ئازادی نەوت. لەگەڵ ئەوەی ئەم بارودۆخە بەردەوام نەبوو لەبەربەیانی (٢ ئاب ١٩٩٠) کوێتی پارێزراو لەلایەن ئەمەریکاوە کەوتە بەر هێرشی سەربازی عێراق و لەلایەن ئەو وڵاتەوە داگیرکرا.

## کەلێنە جیوپۆلەتیکیەکانی ئێران و عێراق:

بابەتێك کە شوێنی باسکردن بووە، تێڕوانینێك بوو لەڕۆڵی ئێران و عێراق لەستراتیجی قوناغی جەنگی سارددا. ئێستا دەبێت لێکۆڵینەوە بکەین لەکەلێنە ستراتیجیەکانی ئێران و عێراق، کە بۆ تۆمارکردنی ئامانجە ستراتیجیەکان هەمیشە سوودیان لێوەردەگیرێت؟

ئامانجی ستراتیجی دابەشدەکرێت بۆ ئامانجی نەگۆڕ و گۆڕاو. ئامانجە نەگۆڕەکان لەسەداسەد پەیوەستە بە فاکتەرە جوگرافیەکانەوە. فاکتەری جوگرافی تا ئاستێکی زۆر دروستکەری مێژووی سیاسی وڵاتەکان بووە. واتە کاتێك لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست لێکۆڵینەوە لەناکۆکی سنوری و داواکاری لەسەر سنوور دەکرێت کەمترین وڵات دەدۆزینەوە کە ئەو ناکۆکیەی تێدا نەبێت.

ئێران لەگەڵ عێراق لەشاخی دالامپرداغەوە تا دەمی فاو سنوری هاوبەشیان هەیە کە درێژیەکەی (١٣٣٦کم). بەڵام لەم سنورە، چەند ناوچەیەکی تایبەتە هەیە کە قەیرانی دروست کردووە. لەلایەك بێ لەبەرچاوگرتنی درێژی سنور، یەکێك لەکێشە ستراتیجیەکانی ئێران لەگەڵ عێراق، کەلێنی جیوپۆلەتیکیە کە ئامانجە ستراتیجیەکان دەخوازێت خۆی لەگەڵ ئەم بەشە دیارە ڕێکبخات. ئەم کەلێنانە دەکەونە بەشێك لەناوچەکانی کرماشان، کوردستان (سنە)، ئیلام و خوستانەوە. درێژی سنور لەناوچەکانی ئازەربایجانی رۆژئاوا، کوردستان(سنە)، کرماشان و ئیلام لەهەر یەکەیان (٣٠٠کم) و لەخوزستان کەمێك لە(٤٠٠کم) زۆرترە. ئەم ناوچانە و درێژی سنورەکانیان لەڕووی جوگرافیەوە جیاوازە، ئێران لەکوردستانەوە کەلێنی جیوپۆلەتیکی لەگەڵ عێراق هەیە. واتە ئەم ناوچەیە شوێنێکە کە یەکێتی هەرێمی لەڕووی جیوپۆلەتیکەوە لەلایەن کوردەکانەوە هەیە، لەخوزستان هەم عێراق و هەم ئێران کەلێنی جیوپۆلەتیکیان هەیە. لەکرماشان هەردوو کەلێنی هەم جیوپۆلەتیکی و هەم جیۆستراتیجی هەیە. بە تێڕوانینێك لەجیوپۆلەتیکی ڕابردووی ئێران لەسەردەمی کۆندا، ئاشکرا دەبێت کە لەهێرشی ئەسکەندەرەوە بۆ سەر

ئێران تا چالاکی دیدەوانی لەکۆتایی سەدەی بیستەم، لەجەنگەکانی یەکەم و دووەمی جیهانی، لەیەکەمین جەنگی مۆدیرن تا دواین جەنگی مۆدیرن، ئەم ناوچەیە چارەنووسساز بووە.

ئەمڕۆ کە ئێران دەیەوێت لەگەڵ عێراق دووبارە پەیوەندی ببەستێت، ناوچەی تماس هەر ئێرەیە. ئەم ناوچەیە بەناوی جۆراوجۆرەوە وەك (دالانی ئاسایشی ئێران) و (دالانی کەربەلا) ناویان ناوە. ئێران لەڕووی جوگرافی تەنیا لەیەك ناوچە ئەویش ناوچەی خوسرەویە کە ئەگەری دامەزراندنی پەیوەندیەکی گونجاوی لەگەڵ عێراقدا هەیە. لەناوچەکانیتر لەڕووی پێکهاتەی زەویەکەی توانای پەیوەندیکردنی نییە. تەنیا ڕێگەیەکی گونجاو هەر ئەوێیە. دوا پرۆژەی ڕێگای کەربەلا وەستا، چونکە ڕێگاوبانی پەیوەندی گرنگ نابێت بە درێژایی سنور بکێشرێت (لە ڕۆژهەلاتی ئێران واچاوەڕواندەکرا جادەی خێرا (ئۆتۆبان) بە تەریبی لەگەڵ سنور بکێشرێت کە لەڕووی ئاسایشیەوە هەڵە بوو) باشترین ڕێگای پەیوەندی بە دراوسێی نادڵنیاوە جادەی نفوزیە کە لەسەر سنور دەکێشرێت وە خەسرەوی ئەم حاڵەتەی هەیە.

لەبەرئەوەی ئێران ئامانجی جیوپۆلەتیکی، جیۆستراتیجی و هەم جیۆئیکۆنۆمیکی لەبەرامبەر عێراقدا هەیە. ئێران خاوەنی کانی نەوتی هاوبەشی سنوریە لەگەڵ عێراق، لەقۆناغی جەنگی عێراق ئێراندا، گواستنەوەی نەوتی خاو بۆ پالاوگەی کرماشان کە لەناوچەی (نەفتشا) دابیندەکرا وەستا. هەندێك لەچاودێران لەو باوەڕەدان کە دابینکردنی نەوتی پالاوگەی کرماشان لەنەفتشا لەسەر سنوری ئێران و عێراق، نابوریانە نییە، لەکاتێکدا کە ئێران لەڕۆژئاوا کانی نەوتی هەیە بە دوری (١٠٠کم) لەکرماشانەوە، نابێت لەکانیتر و لەناوچەی زۆر دورتر ئەم نەوتە پەیدابکات. لەکاتێکدا ئەم بیرە توانای دابینکردنی (٢٥) هەزار بەرمیل نەوتی لەڕۆژێکدا هەیە لەم ماوە کورتەدا، بۆچی لەم بیرە سوود وەرنەگیراوە؟

لەخوزستان، ناکۆکی ئێران و عێراق لەسەر شەتولعەرەبە (ئەروەند رود)، کە لەشوێنی تێرژانی ڕووباری (خین) تا دەمی فاو (٨٤کم). لێرەدا هەم ئێران و هەم عێراق لاوازن، کە لاوازی دولایەنەیە, لەم ناوچەیە حکومەتێك دەتوانێت دەسەلاتدار بێت کە هەردوو پەناگای بەسرە و خرمشهری لەبەردەستدا بێت، ئەم دابەشکاریە دابەشکاریەکی حساب بۆکراو بوو، کە میلی ئەو کەناڵەی لەسەرەتادا باسکرا لێرە جێگیرکراوە. بۆ عێراق بە هۆی سنورداری گەیشتن بو ناوی ئازاد، داوای ئیمتیازی زیاتر لەتەنیا ڕێڕەوی ناوی دەمی فاو و شەتولعەرەب دەکات. گەیشتن بە ناوی ئازاد لەبەندەری ئوم قەسر و خۆر عبداللە، بەهۆی ناکۆکی لەگەڵ کوێت و لەڕێگای شەتولعەرەب و دەمی فاو بەهۆی ناکۆکی لەگەڵ ئێران، بۆ عێراق هەمیشە دوو دوانەی کێشەدار بووە.

## ڕێگاچارەی کەمکردنەوەی مشتومڕەکان (کێشەکان):

ئێران و عێراق مانەوەی خۆیان لەدژایەتی یەکتردا دەبیننەوە، کە ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە پەلاماردانی هەرلایەکیان یەکسانە بەلاوازبوونی هەردوولایان. بەڵام کۆسپ و پێشهاتی زەمینی بۆ ئێران بەجۆرێك تیۆرە دەکرێت کە بۆ ئەودیوی سنور بڕوات. لەجەنگی عێراق ئێراندا، ئێران بەرەو بەسرە رۆیشت و عێراقیش سنورەکانی ئێرانی بڕی و بەشێك لەزەویەکانی داگیرکرد، هەرچەندە چەندینجار ئەمە روویدا بەڵام هەمیشە رووبەرووی شکست بووەوە، لەگەڵ ئەوەی سوود لەتەکنەلۆجیای پێشکەوتوو وەردەگرن بەڵام هەر توشی شکست دەبن. کەواتە دەبێت مەسەلە جیوپۆلەتیکی و جیۆستراتیجیەکان چۆن چارەسەر بکرێت. فاکتەری ئەم دووانە یەکێکە، ئەگەر یەکێکیان چارەسەربکرێت، کێشەکەیتریشیان چارەسەر دەبێت. بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە دەبێت لەکوێوە دەست پێبکەین؟ لێرەدا پێویستە سەرنج لەسەرەکیترین فاکتەر بدەین. یەکەمین ڕێکار کە بەدوایەمین ڕێکاریش دەژمێردرێت ستراتیجی سەربازییە. ئەمڕۆ لەجیهاندا گۆڕانکاری ستراتیجی روویداوە، قەڵەمڕەوەی جیۆستراتیجیەکان ناوچە جیوپۆلەتیکیەکانی لەناوخۆیدا کۆکردۆتەوە. بەم پێیە باشتروایە کە مەسەلە جیۆستراتیجیەکان چارەسەرکرێت، بەم شێوەیە، دەتوانین بۆ لابردنی کەلێنە جیوپۆلەتیکیەکان هەنگاو بنێین. باشترین ڕێگایەك کە بتوانێت ئەڵقەیەکی پەیوەندی قایم و محکم دروست بکات بۆ لابردنی کەموکوڕیە جیوپۆلەتیکی و جیۆستراتیجیەکان هەنگاو بنێت بەپێوەرە جیهانیەکان، پەیوەندیکردنی ئابووریە لەنێوان ئەم دوولایەنە بەشەرهاتووەدا یەکێکە لەو مەسەلانەی کەدەبێت گرنگی پێبدرێت. ئەم پێوەندیە ئابووریەیە کە دەبێت لەسەر بنەمای فاکتەری هاوبەش و چاکی ئابووری هەردوو وڵات بنیات بنرێت. کەواتە فاکتەری هاوبەشی ئابووری هەردوو وڵات چییە؟ یەکێکیان ڕوکاریە (سطحی) و ئەویتریان ڕیشەییە. فاکتەری ڕوکاری بۆنموونە بەروبوومی خورما کە بازرگانی جیهانی و پرسوودی هەیە و ڕۆڵی گرنگ و ستراتیجی هەیە ساڵانێکە لەدەستی عێراقدایە. بەڵام لەدوای جەنگی عێراق ئێران و جەنگی کەنداو و گەمارۆی ئابووریەوە ئەمڕۆ بارودۆخێکی گونجاوی نییە. ئێرانیش دەتوانێت لەم بازرگانیە جیهانیەدا بەشداری بکات. وەك چۆن ناوچەکانی شەلمچە و خرمشهر پێش جەنگ بە درێژایی (١٠٠کم) و پانی (٤٠کم) هەمووی بێستانی خورما بوو. لەئەنجامی جەنگی عێراق ئێران زۆر لەو بێستانانەی هەردوو وڵات لەناوچوون و تائێستاش ناوچەکانی پاکنەکراونەتەوە لەمین. لەکاتێکدا شوێن و ئاووهەوا و خاکی ناوچەکە زۆر لەبارە بۆ چاندنی دارخورما و بە سەرمایەیەکی گەورە دەژمێردرێت و دەتوانێت ژمارەیەك کەس بخاتە کار و داهاتێکی زۆر بۆ ناوچەکە پەیدا بکات.

ئێران دەتوانێت لەبواری بەرهەمهێنان و ناردنەدەرەوەی خورما یارمەتی عێراق بدات و لەبازاڕی جیهانی ناردنەدەرەوەی خورمادا پشکی گونجاو بۆ خۆی پەیدا بکات. لەکەرەسە هاوبەشەکانیتر، دەرهێنان، بەرهەمهێنان و ناردنەدەرەوەی نەوتی خاو و بەرهەمە نەوتیەکاندا هاوبەشی بکات. گەورەترین کەلێنی

جیوپۆلەتیکی نێوایان کەلێنی (مەزهەبی/نەتەوەی)یە. نێران جەخت دەکاتەوە لەشیعەکانی عێراق، هەروەها عێراقیش لەسونەکانی ئێران و هەروەها مەسەلەی کوردە لەنێوان هەردوولادا هاوبەشە و چارەسەری ئەم مەسەلانە بەشێوەی سەرپێی نەستەمە. باشتروایە هەردوو ولات لەبواری پەرەپێدانی هاوکاری هاوبەشی ئابووری چالاکی فراوان ئەنجام بدەن. بەخێوکردنی ماسی لەحەوزی دەستکرد و رووبارەکان و ئاوگرە هاوبەشەکان، بەتایبەتی لەوناوچانەی کە ناکۆکی سنوری هەیە دەتوانن لەزەمینەی زیادکردنی دەرامەتی مرۆیی و پەرەپێدانی هاوبەش و کەمکردنەوەی رووبەروبوونەکان و گەشەپێدانی ئابووری هاوڕابن. بۆ ئەمجۆرە هاوکاریانە پێویستی بەهاوئاهەنگی و پلان و جێبەجێکردنی سیستەم هەیە. ولاتی عێراق بەهۆی بەشداریکردن لەدوو جەنگدا (تا نوسینی ئەم کتێبە هێشتا جەنگی سێیەم و رووخانی رژێم دەستپێنەکردووە ــ وەرگێڕ) و گەمارۆی ئابووری بۆ ماوەی (١٠) ساڵ، سیستەمێکی بزێوتری بەبەراورد بە ئێران هەیە.

بۆ نموونە لەکۆمیسیۆنی چارەسەری کێشە سنوریەکان، عێراق خاوەنی تیمکاری سیستەمی و نوێنەری هەمیشەیی و نەگۆڕە، بەلام لەئێران خاوەنی کاری سیستەمی و دیسپلینی کەمترە. هێزی سەربازی ئێران لەناوخاکی عێراقدا هەنگاوینا بۆ دروستکردنی بورجی چاودێری سنوری. ئەگەر لەنێوان هەموو ئۆرگانەکان هاوئاهەنگی هەبێت و هیچ شتێك نەیەتە پێشەوە، بەلام لەکاتی نەبوونی هاوئاهەنگیدا لەنێوان هێزە سەربازیەکان و دامەزراوە ئەمنیەکان و وەزارەتی کاروباری دەرەوە، عێراق دەتوانێت لەم هەلانەی ئێران لەبەرژەوەندی خۆی سوود وەرگرێت. ئەگەر هیچ شتێك نەیەتەپێشەوە لەوشێوەیەدا پاش چەند ساڵێك ئێران داوای زەوی بکاتەوە کە دووبارە دەبێتەوە جێگای ناکۆکی سنوری نێوان هەردوو ولات. لەڕاستیدا، ئەم ڕەفتارانە، خۆیان یارمەتیدەرن بۆ دروست بوونی گرژی لەنێوان ئەم دوو ولاتەدا. ئێران ئەگەر بیەوێت لەگەڵ عێراق سەرمایەگوزاری هاوبەشی هەبێت، دەبێت بە گشتی لەگەڵ یەکتری ناکۆکیان نەبێت. بۆ ئەم مەبەستە پێویستە سەرەتا ڕێکاری لێکۆڵینەوەی دیاریکراو بکرێت. دەبێت ڕێگا بدۆزرێتەوە کەعێراق سوود لەکەنداوی فارسی وەربگرێت. هەلومەرج و ڕێگای سوودوەرگرتن لەبەندەرەکانی ئێران لەبەرامبەر پێدانی کرێ بخرێت خزمەتی عێراقەوە ڕێکەوتننامەیەکی هاوشێوەی سوودوەرگرتن لەناوی هیرمەندی ئەفغانستان بکرێت. لەم بوارەشدا دەبێت ڕێوشوێنێك بگیرێتەبەر کە عێراق سود لەناوچەکانی ژێردەسەلاتی ئێران وەربگرێت وەك ترانزێت. مولەتی بەندەری چابهار بۆ سودلێوەرگرتن لەلایەن ئەفغانستانەوە تاقیکراوەتەوە. ماوەی (١٠تا١٥) ساڵە ئەمکارە ئەنجامدراوە و ئەفغانستان سوودی لەناوچەی ژێر قەڵەمڕەوی ئێران وەرگرتووە. ئێران دەتوانێت لەڕێگای ڕێکەوتنێکەوە بەندەرەکانی خۆی لەبەرژەوەندی عێراق بکاتەوە. زۆربەی ولاتانی دنیا لەم بوارەدا کار دەکەن. دەبێت ڕێگای هەناسەدان بۆ

عێراق دروست بکرێت تاوەکو ڕێگا بگیرێت لەدروست بوونی گرژی و ئالۆزی. عێراق نەوتی هەیە و پێویستی بە دامەزراوەی نەوتیە، پێویستی بەبوارێکە کە بازرگانی دەرەکی خۆی لەسەر ڕێکبخات.

ئەگەر سەرنج بدەین لەدوای کۆتایی جەنگی عێراق ئێرانەوە هەتا ئەمرۆ ئێران نەیتوانیوە سوودی تەواو لەشەتولعەرەب وەرگرێت و لەڕاستیدا پێویستی زۆری بەم ڕێڕەوە ناویە نییە چونکە بەندەری زۆری هەیە و لەهەموو بارودۆخێکدا ناتوانێت سوود لەم ڕێڕەوە وەرگرێت. باشترین ڕێگا ئەوەیە کە هەموو تواناکان شەتولعەرەب بخرێتە بەردەست عێراقەوە. لەئێستاشدا کە ئابووری بەرەو جیهانیبون و سەرمایەگوزاری بەرەو جیهانیبوون دەڕوات، ئێران چۆن دەبێت بچێتەناو ئابووری جیهانەوە و پەیوەندی جیهانی دروستبکات بۆیە دەبێت لەم ڕێگایەوە هەوڵ و کۆشش بدات. ئێمە دەبێت پشت بەخوزستان ببەستین و لەبارودۆخی ئەو بۆ کەمکردنەوەی گرژی وئالۆزیەکان لەناوچەکە سوود وەرگرین.

ئەگەر بمانەوێت ڕووە هاوبەشەکان بەهێزکەین، دەبێت بزانین کە هەر چالاکیەك کە بەدرێژایی ئەم سنورە ئەنجام دراوە کاریگەری لەسەر جیوپۆلەتیکی ئێران بەجێدەهێڵێت. بۆ دیاریکردنی سیاسەتی ناوخۆ و دەرەوە، ئێران دەبێت مۆدێلسازی بکات. هەرسێ وڵاتی ئێران، عێراق و تورکیا دەبێت بزانن کە هەرسێکیان کێشەی سنوریان هەیە. لەئێران و عێراق و تورکیا ناوچە کوردیەکان پەیوەندی جوگرافی بەهێزیان هەیە. بەهای ستراتیجی تورکیا یەکسانە بە بەهای ستراتیجی عێراق و ئێران بە هەمان جۆر کە پێوانەی جیۆستراتیجی جیهانی بەهای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە ئەندازەی ئاسیا و ئەوروپامان لەقەڵەمدا. چونکە (٥٠٪)ی خاکی کوردستان و (٥٠٪)ی دانیشتوانی کوردستان لەتورکیا نیشتەجێن، بەپێی ئەو سەرژمێرییانەی کراوە بۆ دانیشتوانە کوردەکەی دەگاتە (٢١ تا٢٤) ملیۆن کەس. وە (٣٠٪) ڕووبەری کوردستان کەوتۆتە ئێرانەوە و (١٥٪) کەوتۆتە عێراق و ئەویتریشی کەوتۆتە ناو سوریاو هەندێك وڵاتی دراوسێوە.

ڕاستە جیهان پێیناوەتە سەدەی (٢١)، سیاسەتمەداری لەحاڵەتی گۆڕاندایە بەرەو ئابووری مەداری. ئابووری مەداری بەرەو تەوەرەی نەتەوەگەرایی و میللەتگەرایی هەنگاو دەنێت ئەمە واقعیەتێکە نینکاری ناکرێت. ئەوەی لەدەوری ئێمە ڕوودەدات بەرەو ئەو ئاراستەیە دەجوڵێت. ئەگەر ئێمە ئەم ئاسۆیەش لەبەرچاو بگرین، دەڵێن لەبەرژەوەندی ڕەوشی بیرکردنەوەی ستراتیجی جیهاندا نییە کە ئەم سێ وڵاتە کوردەکانیان سەربەخۆ بێت، بەبەڵگەی سیاسی هەموو مەسەلە سیاسیەکان تێکدەدالێت ئەم هاوسەنگی هێزە لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەمجۆرە شێوەی گرتووە. هەرگۆڕانکاریەك لەسنورەکان هاوسەنگیەکە تێکدەدات*. گەر سەرنج لەهاوسەنگی دنیا بدەیە، بەستراوە بەهاوسەنگی ڕۆژهەڵاتی

---

*) ئەو بۆچونەی کە دەڵێن لەبەرژەوەندی ڕەوشی بیرکردنەوەی ستراتیجی جیهاندا نییە کە ئەم سێ وڵاتە کوردەکانیان سەربەخۆ بێت بۆچونێکی تا سەر ئێسقان هەڵەو لەخشتەبەرە بۆ کوردەکان بەڵام بەداخەوە سیاسیە کوردەکانیش زۆرجار ئەم قەوانە لێدەدەن بەمەبەستی گەوجکردنی نەتەوەی

ناوەڕاستەوە، هاوسەنگی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەم شێوە سنورانەوە پەیوەستە. ئەگەر ئەم سنورانە بگۆڕێت گۆڕانی دەسەڵات لەناوەند ڕوودەدات. یەکێك لەگرنگترین بیرکردنەوەی ستراتیجی ئێستا ئەوەیە هەڵهاتن لەناوەند پەردەنەسێنێت. ناوەند دەبێت دەسەڵاتی خۆی لەنێوان ناوچە و هەرێمەکاندا دابەش بکات، بەڵام نەك لەناوسنورە شکاوەکاندا، بەڵکو لەناو سنوری جێگیرکراوی پێشووی وەك (کۆسۆڤۆ لەیۆگۆسلاڤیا). یەکێتی سیاسی نابێت تێکبدرێت. بە سەرنجدان لەشوێنی وەك چیچان و کویبك، پێنج هێزە گەورەکەی جیهان ڕێکەوتن کە لەسەدەی (٢١) سنورە سیاسیەکان نەگۆڕێن*. لەگەڵ ئەوەی یابان لایەنگری گۆڕانی سنورە سیاسیەکان بوو. بەڵام ڕێکەوت کە هاوڕا لەگەڵ هێزەکانیتردا داوای نەگۆڕینی سنوری سیاسی بکات.

## هەڵکەوتەی عێراق لە پێگەی ستراتیجی ناوچەکەدا لەدوای جەنگی سارد:

## بەڵگە ستراتیجیەکانی کۆتایی جەنگی سارد:

لەگەڵ ئەوەی ناکۆکی بۆچونەکانی هەردوو زلهێزە جیهانیەکە گەیشتە چڵەپۆپە کە لەهەر ساتێکدا ئەگەری پێکدادانی سەربازی هەبوو، لەناکاو هەردوو زلهێزەکە مەسەلەی هێرشکردنیان وازلێهێنا و دەستیان بۆ ئاشتەوایی ستراتیجی برد. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم ڕووداوە مێژوویە کە کاریگەری زۆر سەرسوڕهێنەری لەسیستەمی سیاسی نێودەوڵەتی لەسەر ئاستی ناوخۆیی و هەرێمی و جیهانی بەجێهێشت کە دەبێت ئەمە بە دیدێکی ستراتیجی لێکبدرێتەوە.

یەکێك لەبەڵگە سەرەکیەکانی کۆتایی جەنگی سارد و دەسپێکردنی ئاشتی سارد بە بنبەست گەیشتنی ستراتیجی سەربازی دوو زلهێزەکە بوو، چونکە پێش کۆتاییهاتنی جەنگی سارد، (٢٣) وڵاتی ئەندامی پەیمانی (ناتۆ و وارشۆ) نزیکەی (٦٠٠) ملیارد دۆلار تێچونی سەربازیان هەبوو. ئەم تێچوونە زۆرە کە هەر خولەکێك ملیۆنێك دۆلاری بەفیڕۆدەدا، جیهانی بەرەو هەڵدێر و نابووتی دەبرد و چالاکیە زانکۆیی، نابووری، کۆمەڵایەتی و کەلتوریەکانی بەئاراستەی سەربازی دەبرد تا ئەو شوێنەی کە (٢٠٪) دەرامەتی سروشتی و وزەی جیهان بۆ چالاکی سەربازی خەرجدەکرا، نزیکەی (٤٠٪) کەسە پسپۆڕەکانی جیهان دەچونە بواری سەربازیەوە یان بە ئامانجی سەربازی بیریان دەکردەوە. ئەنجامی ئەم ڕەوتە ئەوە بوو

---

خۆیان، وەمن وەك کوردێك نازانم بەچ بەڵگەیەکی سیاسی دەیسەلێنن کە هەموو مەسەلەکان تێکدەچێت بۆچی لەدوای سالآنی نەوەدەی سەدەی ڕابردووەوە دەیان سنور تێکچووە و دەیان دەوڵەت دروست بووە ئەوناوچانەش بەرەو ئارامی زیاتر ڕۆیشتووە وەك وڵاتانی سەر بە یەکێتی سۆڤێت و یۆگۆسلافیا و چیکۆسلافیا ... هتد، هەروەك ئیسماعیل بیشکچی دەڵێت بۆچی نابێت سنوری تورکیا و ئێران و عێراق و سوریا تێکبچێت بەڵام خاك و مرۆڤی کورد پارچە پارچەبێت. وەنازانم بۆچی ئەو هاوسەنگیە تێکدەچێت لەکاتێکدا لەسایەی ئەو هاوسەنگیەدا هیچ وەختێك ئەم ناوچەیە ئارام نەبووە - وەرگێڕ.

* ) ) جیابوونەوەی باشوری سۆدان دروستبوونی دەوڵەتێکی نوێ، یەکەمین گۆڕانە لەسنوری سیاسی جیهان بەپێچەوانەی ئەو قسەیەی سەرەوەیە. وەرگێڕ

که جیهان لەبەردەم مەترسیەکدایە کە بەرەو جەنگێکی بێسنور دەڕوات، بەراوەی سەرکی نەوانەبوون کە بەشداریان نەکرد، ئەمە بۆ دوو زلهێزەکە جێگای قبوڵ نەبوو. بەگوزارشتێکی سادەتر، پێشکەوتنی خێرای تەکنەلۆجیا پەیدابوونی چەکی کیشوەربڕ و سیستەمی کۆنترۆڵی ئەودیوو ئاسۆ و مانگەدەسکردەکانی زانیاری هەردوو زلهێزەکە گەیشتن بە بنبەست. لەلایەك بەرزبوونەوەی تێچونی سەربازی نەك تەنیا بۆ خودی ئەو وڵاتانە و پێکهاتەی ناوخۆییان کاریگەری هەبوو، بەڵکو کاریگەریەکەی لەسەر ڕووە جیاوازەکانی ژیانی مرۆڤی وڵاتە هاوپەیمانەکانیشیان دەبینرا.

ئەم ناراستەگیریە لەچالاکیە پیشەسازی و کشتوکاڵیەکان بەرەو سەربازی بۆ یەکێتی سۆڤێتی پێشوو بەجۆرێك بوو کە کاریگەری زۆر خراپی لەسەر گەشەی ئابووری ئەم وڵاتە بەتایبەت پەیوەست بەئاستی ژیانی خەڵکی و خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی بەجێهێشت. یەکێتی سۆڤێت نەیتوانی وەك وڵاتانی ڕۆژئاوا بەکرانەوەی جیوپۆلەتیکی خۆی ڕێگا لەدەرکەوتنی کارەساتە ناخۆشەکان بگرێت کە لەئەنجامی ئەمەدا گۆڕان لەپێکهاتەی سیستەمی سیاسی نێودەوڵەتی دروستبوو، لەسەرووشیانەوە جیۆستراتیجی و جیوپۆلەتیکی. بۆیە بەداڕوخانی دەسەڵاتی جیۆستراتیجی دەستپێکرد و دیواری بەرلین ڕووخا. ئەم مەسەلەیە بووە سەرەتای قۆناغێکی نوێ لەجیوپۆلەتیك کە وڵاتانی زۆری گرتەوە و دەگرێتەوە.

## کۆتایی جەنگی سارد و هەلومەرجی جیوپۆلەتیکی تازە لەناوچەکە:

کۆتایی جەنگی سارد هاوتابوو بە دوو ڕوداوی گرنگ کە لەگەڵ یەکتر پەیوەندیان هەبوو. ئەم دوو ڕووداوە هەریەکەیان کاریگەری قوڵی لەسەر ناوچەکانی دەوروبەری ئێران هەبوو، یەکەم: سڕینەوەی یەکێتی سۆڤێت وەك یەکێك لەدوو زلهێزە گەورەکەی جیهان لەسەر گۆڕەپانی سیاسەتی نێودەوڵەتی و لەوانەش ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە بەخێرایی ڕوویدا، کە هەندێك لەحکومەتەکانی بۆ دیاریکردنی ئەم ڕووداوە ڕووبەڕووی کێشە بوونەوە. دووەم: هێرشی ڕژێمی بەعس بۆ سەر خاکی کوێت یەکێکە لەوانە، پەیامەکانی ئەم سنور شکاندنە نەك تەنیا جەختکردنەوەبوو لەسەر کۆتایی قۆناغی دوو جەمسەری جیهان و دەسپێکردنی قۆناغێکی نوێ لەپەیوەندیە نێودەوڵەتیەکان، بەڵکو ئەمەریکای وەك تاکە زلهێزی گۆڕەپانی جیهانی دەرخست، بۆ سۆراخکردنی سیاسەتی خۆی لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە لەلایەك دابنکردنی بەرژەوەندیە نەوتیەکانی خۆیی و وڵاتانی هاوپەیمانی و لەلایەکیترەوە بتوانێت سەربەخۆ و ئازادانە کاری زیاتر لەگۆڕەپانی سیاسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەنجام بدات، دەرهەق بەم سیاسەتە بوو کە دانوسانی عەرەب ئیسرائیل جارێکیتر ژیایەوە پێگەی بۆ ئەمەریکا فەراهەم کرد کە بتوانێت سیاسەتەکانی خۆی لەناوچەکە بپارێزێت. بەمجۆرە ئەمەریکا وەك سەردەمی جەنگی سارد نەیدەویست درێژە بە هاوکاریە ستراتیجیە پڕتێچونەکانی بۆ ئیسرائیل بدات. چونکە لەلایەك ڕکەبەری تەقلیدی ستراتیجی ئەم وڵاتە کە یەکێتی سۆڤێت بوو نەمابوو، لەلایەکیترەوە فشارە ئابووریە بەردەوامەکان لەلایەن ڕای گشتی ئەمەریکاوە

قبولّ نەدەکرا، سەرەڕای ئەوە ڕۆڵی چالاکتری ئەمەریکا لەگۆڕەپانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ناچاریکرد هاوسەنگیەك دروست بکات لەپەیوەندی ئەمەریکا لەگەڵ وڵاتانی عەرەبی و ئیسرائیلدا.

سڕینەوەی عێراق وەك هەرەشەی سەربازی ناوچەکە کە ئاشتی و ئارامی دووبارە بە درێژایی زیاتر لەدەیەیەك خستە مەترسیەوە، ئاسۆیی هاریکاری هەرێمی لەحەوزی کەنداوی فارسی بۆ دروستکردنی پێکهاتەیەکی ئاسایشی ڕونترکرد بەراورد بەڕابردوو. ئیسرائیل لەوانەیە بەهۆی ترس و نیگەرانی لەدەستدانی پارێزگاری هەمەلایەنەی ئەمەریکا، هەنگاوینا بۆ بەردەوامیدانی پەیوەندیە لێڵەکانی نێوان ئەمەریکا و ئێران تا لەڕێگای ناساندنی کۆماری ئیسلامی ئێران وەك دوژمنی هاوبەش، گرنگی پەیوەندی ستراتیجی خۆی لەگەڵ ئەمەریکا ئاراستە بکات.

ڕوخاندنی یەکێتی سۆڤیێت و سەربەخۆیی وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست و قەوقازیش بووە هۆی گۆڕانکاری گرنگ لەجیوپۆلەتیکی ناوچەکە لەگۆشە نیگای ئێرانەوە، نەمانی هەرەشەی دراوسێیەکی زلهێز کە ئارەزووی فراوانخوازی بەرەو ئاوەگەرمەکان هەبوو، هەروەها کرانەوەی ڕێگای هاتوچۆی تازە لەناوچەکانی سنوری باکوری ئێران بەرەو ئەوروپا و ڕۆژهەڵاتی دوور و دروستبوونی توانا هاوکاریە ئابووری، بازرگانی و کەلتوریەکان لەگەڵ وڵاتە تازە سەربەخۆکانی باکور لەباشیەکانی هەلومەرجی تازەی جیوپۆلەتیك دەژمێردرێت.

دوای کۆتاییهاتنی جەنگی سارد، عێراق لەقەڵەمڕەوەی جیۆستراتیجی دەسەڵات بەرەو دەرەوە هەنگاوینا، بەبێ ئەوەی سەرنج بدات لەواقعی بارودۆخەکە چەند هەنگاوێکی نا کە لەئەنجامدا گورزی گەورە بەر وڵاتەکەی کەوت. یەکێك لەو بەڵگانەی کە بووە هۆی تێکشکانی سەرۆکی عێراق لەهێرشکردنی بۆ سەر کوێت ئەوەبوو کە هەنگاوەکانی لەدوای جەنگی ساردەوە بەئامانجەکانی ڕۆژئاوا بەتایبەتیش وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەناوچەی کەنداو نەبوونی یەکێتی ناوچەیی بوو، لەهەمانکاتدا ئەم هێرشە هاودەنگ نەبوو لەگەڵ ئامانجە ستراتیجیەکانی ڕۆژئاوادا، سەدام حسین لەئەنجامی تێکشکانی لەجەنگدا دەخرێتە لاوە بەڵام کاریگەری نەگەتیفتر ئەوەبوو کە بنەمای جودایی جیوپۆلەتیکی عێراقی فەراهەمکرد.

دوای ئەم ڕووداوە هەوڵی زۆر خرایەکار لەلایەن ڕابەرانی عێراقەوە تا وا پشانبدرێت عێراق وانەی لەڕابردوو وەرگرتووە و سەبارەت بە ڕێکخستن و هاوئاهەنگی ڕەفتاری جیوپۆلەتیکی خۆی، بەڵام بەهۆی نەبوونی متانەی ڕابەرانی عێراق لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی و ناوچەیی هەوڵەکانیان تا ئەمڕۆ (ساڵی ٢٠٠٢ ــ وەرگێڕ) بێبەرهەم بووە.

هەرچەندە عێراق بەدوای گەڕانەوەدا بوو بۆناو کۆمەڵی نێودەوڵەتی، بەڵام تا ئەوجێیەی کە هێشتا دەستی لەو ئامانجەی کە ببێتە هێزێکی هەرێمی هەڵنەگرتووە، ئەم هەلە بۆ ئەم وڵاتە نەڕەخساوە. چونکە ئامانجی عێراق لەگەڵ یەکێك لەتایبەتمەندیە بنەڕەتیەکانی ئامانجە ستراتیجیەکانی ئەمەریکای دوای

جەنگی سارد بۆ بەرگرتن لەهەوڵی بەدەستهێنانی دەسەڵاتێکی هەرێمی نـاکۆك و ناتەبایـە. ولآتـە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەسەردەمی جەنگی ساردا نەك تـەنیا لەگەڵ هێزە ناوچەییەکان لەناستی جیۆستراتیجی دەریـایی نـاکۆك نـەبوو، بـەڵکو بەشێوەی جیاواز گرنگـی دەدا بـەهێزکردنی ئـەم جۆرە دەسەڵاتانە تا بتوانن لەقەیرانە ڕیشەییەکان لەبەرامبەر جوڵەی زلهێزی ڕکەبەری خۆی ڕووبەڕوو ببنەوە، کە بۆنموونە دەتوانین ئاماژە بۆ ئێران سەردەمی ڕژێمی شا بکەین. بەڵام دوای جەنگی سارد، ئەمەریکا نەك تەنیا لەناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەڵکو لەهیچ جێیەکی دونیا ڕازینیە بەدروستکردنی هێزێکی هەرێمی کە لەگەڵ بەرژەوەندیە ژیانیەکانی ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ناتەبا بێت.

بەرگریکردنی عێراق لەبەرامبەر تیمی پشکنینی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکانی پەیوەست بەداماڵینی چەك لەم ولآتە لەبواری کیمیایی، بایۆلۆجی، موشەك و ئەتۆمی بەهۆی بێمتمانەی و پێنەدانی هەل بەم ولآتە زیادیکرد و تا ئەو کاتەی کۆسپەکان لانەبرێت جودای جیوپۆلەتیك عێراق بەتایبەت ئەوەی پەیوەندی بە کوردەکانی باکوری ئەم ولآتەوە (هەرێمی کوردستان) هەیە بەردەوامی دەبێت.

## سێکوچکەی ستراتیجی عێراق:

بە سەیرکردن لەجوگرافی هەمەلایەنەی ولآتەکان دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە سیاسەتە ئەمنیەکان زیاتر لەهەموویان نوێنەرایەتی هاوسەنگی نێوان سێ دیاردەی گرنگ دەکەن کە بۆ ئەم چەمکە زاراوەی سێکوچکەی ستراتیجی بەکاردەهێنرێت، کە کۆڵەکە سێ کۆچکەی ستراتیجیەکەی بریتیە لە: (بەرژەوەندیەکان، تواناکان و پەیمانامەکان)

سێکوچکەی ستراتیجی بەدوو شێوە دەتوانرێت سوودی لێوەرگیرێت. یا بەشێوەیەك لەناو ولآتێکدا یان بە شێوەی پەیوەندیەکانی نێوان ولآتان، کە ئەم پەیوەنیە لەوانەیە هەرێمی بێت یان نێودەوڵەتی. هەندێك پێیانوایە بە پێکهێنانی سێکوچکەی ستراتیجی بەشێوەی هەرێمی یان نێودەوڵەتی دەتوانرێت زۆر لەبیرکردنەوە ستراتیجیەکان کە لەوانەیە بەشێوەی ڕاستەوخۆ گرفتی هەبێت، لەڕێگای سێکوچکەی ستراتیجی پیادەبکرێت. بۆ نموونە پەیوەندی ستراتیجی نێوان یابان و چین و ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەلایەك و چین و ڕووسیا و یابان لەلایەکیتر لەوانەیە زۆر لەگرفتە ستراتیجیەکان چارەسەر بکات.

عێراقیش بە سەرنجدان لەپێگە ستراتیجیەکەی لەناوچەکەدا سوودمەندە لەم تایبەتمەندیە، بەتایبەت ئەگەر سەرنج لەو گۆڕانکاریانەی دوایی بدەین لەپێوەری ناوچە ستراتیجیەکانەوە شێوەیگرتووە و باروذۆخەکە لەگەڵ هەلومەرجی پێش جەنگی سارد جیاوازە. تاپێش کۆتایی هاتنی جەنگی سارد بنەمای ناوچە ستراتیجیەکان زیاتر لایەنی جیۆستراتیجی هەبوو، لەکاتێکدا ئەمڕۆ بەتەواوی جیوپۆلەتیکی و لایەنی ئابووریەکەی گرنگی زۆرترە. بەم شێوەیە لەئاییندەدا بەهای ناوچە ستراتیجیەکان بەپێی بەرهەمی نەتەوە دەپێورێت، لەگەڵ پشکی تەرخانکراوی بودجەی سەربازی لەتێکڕای داهاتی نەتەوە، پەیوەندی

ڕاستەوخۆی هەیە. واتە هەتا بەرهەمی نەتەوە بەرزبێت بەهای ستراتیجی زۆرتر دەبێت، لەبەرئەوە بەپێی جێگیرکردنی ئەم پێوەرە بەهای ستراتیجی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەوانە ئێران و عێراق بەرزدەبێتەوە، لەڕاستیدا ئەم دوو وڵاتە دەتوانن ڕەهەندی جیاوازی سێکوچکەی ستراتیجی بەهێز و کارا بەدەستبێنن بۆ هەڵسەنگاندنی توانا ستراتیجیەکانی عێراق لەڕەهەندی جیهانیدا، باشترە کۆڵەکە سێ کوچکەی ستراتیجی بەوردی باس بکەین.

**(أ) بەرژەوەندیەکان :**

بەشێکی بەرچاوی لەهەڵسەنگاندنی ستراتیجی نوێ لەم بوارەدایە، کە میللەتێك بە بەردەوامی سوودوەرگرتن لەدەرامەتە بەردەستەکانی کە بۆ ئابووریەکەی زەرور و پێویستە دڵنیایی دەسازێنێت، لەم بارەیەوە بەرژەوەندی هەر میللەتێك لەپێوەری ستراتیجیدا بە دوو شێوە دەتوانین باسی بکەین، یەکێکیان بەپێوەری جیهانی وەك سەرچاوەی وزە بەتایبەت نەوت و گاز کە پێگەیەکی گرنگیان هەیە ئەویتر بەشێوەی ئابووری بەپێی چالاکی ئابووری دانیشتوان و بازار.

ئەگەر بەرژەوەندیەکان بەپێی دیدگای سەرچاوەکانی وزە بخەینە بەرباس و لێکۆڵینەوە بە سەرنجدان لەسێ قۆناغی قەیرانی ووزە لەساڵەکانی (٧٠، ٧٣، ٧٩) عێراق بە هۆی مەبەستبوونی لەجیۆستراتیجیدا هیچ جۆرە کێشەیەك لەڕووی بەرهەمهێنان، دابەشکردن و بەکارهێنانی ووزەوە ڕووبەڕووی ئەم وڵاتە نەبووەوە.

بەگوزارشتێکی سادەتر نەوتی عێراق کە بەرەو بازارەکانی ڕۆژئاوا دەڕۆیشت بەشێك لەدەرامەتەکانی بە چاودێری ڕووسیا بۆ بواری سەربازی خەرجدەکرا و لەم بوارەدا ڕووسەکان جێگای تایبەتی خۆیان هەبوو. ڕووسەکان سەرەڕای چالاکیان لەبەشە سەربازیەکاندا، لەپرۆژەی ناوەدانیەکانیشدا ڕۆڵیان هەبوو. لەبەرئەوەی عێراق ڕۆژانە بڕێکی بەرچاوی لەنەوتی بەرهەمدەهێنا و دەینارددەرەوە، لەڕێگای ئەو داهاتەی دەستیدەکەوت تەکنەلۆجیا ئەتۆمی بەیارمەتی ئەڵمانیا و بەریتانیا و بەتایبەت فەرەنسا گەشەپێدا و لەبەرزکردنەوەی ئاستی توانا سەربازیەکانیدا بەکاریهێنا. ئەم وڵاتە تا ئاستێك هاوسەنگی ڕاگرت بۆ ئەوەی بەرژەوەندیەکانی بپارێزێت. نەوت لەپێشەوەی ئەم بیرکردنەوە ستراتیجیانە بوو، بە پێی بەڵگەکانی سەرەوە بۆ پەیداکردنی بازار ڕووبەڕووی کێشەیەکی تایبەت نەدەبووەوە.

شێوەیەکیتری بەرژەوەندیەکان، دانیشتوانی عێراق دەتوانن بازار لەزۆر بواری جیاواز بۆ وڵاتانی جۆراوجۆر فەراهەم بکەن. دانیشتوانە زۆرەکەی عێراق هاوکات لەگەڵ دەرامەتە زۆرەکەی کە لەبەشی نەوتەوە دەستیدەکەوێت، ئەم توانایە بۆ وڵاتە جیاوازەکانی عەرەب و وڵاتانیتر بەتایبەتی بەریتانیا و فەرەنسا کە ئەم وڵاتە بەبازاڕی خۆیان بزانن تا بەرهەمە پیشەسازیەکانی خۆیانی بۆ بنێرن. هەتا ڕووسیاش دەیویت لەم بازارە بێبەش نەبێت لەڕێی پاراستنی پەیوەندیە سەربازیەکانی خۆی لەگەڵ عێراق و فرۆشتنی

چەك و كەلوپەلی سەربازیەوە و هەندێك بەشی بازاڕی عێراق كە زۆرتر لایەنی بیناسازی و كۆنترۆڵی ئاو و بەنداو و كەناڵ لیدانە پشكی هەبێت.

لەو باسانەیتر كە دەبێت بۆ مەسەلەی بەرژەوەندیەكان زیاد بكرێت. مەسەلەی خۆراك و هاوردەنیەكانیەتی، كە بەسەرنجدان لەژمارەی دانیشتوانی عێراق لەمەسەلە ستراتیجیەكاندا شوێنی تایبەتی هەیە، تا ئەو ئاستەی ئەمرۆ جیهان گەنم بە شمەكێكی ستراتیجی ناودەبات و بەهۆی توانای جوگرافی بەرهەمهێنان و بەكارهێنانیەوە.

بەشێوەیەكی گشتی لەگەڵ ئەوەی دەزانین ئاماجە سەربازیەكانی عێراق لەگەڵ ڕابردوودا گۆڕاوە و دەگۆڕدرێت بەڵام بە بێ پشتیوانی رووسیا نابێت، كە سەردەمانێك لەچوارچێوەی جیۆستراتیجی ئەودابوو. بۆیە ئەم وڵاتە بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەكانی ناچارە پەیوەندی ئابووری خۆی لەگەڵ هەموو وڵاتان هەتا ئەوانەی كە سەردەمانێك دوژمنی پلەی یەكیبوون، پەرەپێبدات.

**( ب ) پەیماننامەكان :**

لەجیهانێكی ئایدیاڵدا دەسەڵاتەكان دەتوانن هەموو بەرژەوەندیە ژیانیەكانی خۆیان بەبێ فراوانكردنی زیاد لەپێویست لەهەموو باروددۆخێكدا تواناكانی خۆیان بپارێزن، لەڕاستیدا هەموو وڵاتان لەڕووی كرداریەوە سنووردارن. بە درێژایی مێژوو، دەوڵەتی زۆر بەم خواستە گەیشتون، كە ئەتوانن ئاسایشی خۆیان بە یارمەتی هاوپەیمانەكانیان دابینبكەن. لەگەڵ پێشكەوتنی پەیوەندیەكان، ئەمرۆ ئیتر هیچ وڵاتێك بەتەنیا ناتوانێت درێژە بە ژیانی سیاسی، ئابووری و سەربازی خۆی بدات، بەڵكو بەرقەراری پەیوەندیەكان و پەیماننامەكان دەتوانن وڵاتەكان بەرەو ئارامی و ئاسایش و پەرەپێدان ئاراستە بكەن.

هەستكردنی ئەم خواستە كە هاوپەیمانەكان كێێن باشە و سنوری دەسەڵاتی ئەم یەكێتیە تا كوێبێت، مەسەلەیەكی زۆر گرنگە، ئەمە سەلمێنراوە، كە ئەگەر وڵاتان بە سەرنجدان لەبنەمای جیوپۆلەتیكی خۆیان لەڕووی پتەوكردنی بەڵێنەكان و پەیمانەكان لەگەڵ دراوسێكانی لەئایندەیەكی دور و نزیك ئەگەر بیەوێت زۆر لەكێشەكانی چارەسەر دەكات و دڵنیا دەبێت لەكاتی دەركەوتنی هەڕەشە و مەترس لەسەر گۆڕەپانی سیاسی، ئابووری و سەربازی بە تەنیا نییە. بەڵام ئەگەر پێچەوانەی بەرقەراركردنی ئەو بەڵێن و پەیمانانە كاریكرد، ئەوا لەوانەیە نائارامی و ناجێگیری زۆر دروستبێت.

وڵاتی عێراق دووەم وڵاتە لەناوچەی باشوری ڕۆژئاوا ئاسیا لەتوانا گونجاوە جوگرافیەكانی سوودمەندە و لەناو وڵاتە عەرەبیەكانی كەنداو پێگەیەكی تایبەتی هەیە. لەبەر ئەم هۆیە بە هەستكردن بە جیوپۆلەتیكی خۆی دەیەوێت سەركردایەتی وڵاتانی ناوچەكە بكات. كەواتە بەهۆی هەبوونی ئەم توانایەوە پەیماننامەكان ئەو تیۆرەی دەكات و لەبەرامبەریشدا پەیماننامەكە بۆ ئەو دەگەڕێتەوە. بەگوزارشتێكیتر هەم خۆی دەخاتە ژێر باری پەیمانەكەوە كە بەو هەلومەرجە جیوپۆلەتیكیە سەرۆكایەتی وڵاتانی عەرەبی

ناوچەکە بکات و لەلایەکیترەوە ئەو پێگە جوگرافیەی هەیەتی بتەوێت یان نەتەوێت ئەوبارە بۆ ئەو دروست دەکات. ئەگەر ئەم پەیماننامەیە بەشێوەیەکی گونجا بەپێی سێ پێوەری ناوخۆیی، ناوچەیی و جیهانی بخرێتە ژێر باس و لێکۆڵینەوەوە، دەردەکەوێت کە عێراق ناتوانێت و نایەوێت بەجیا لەستراتیجیەکان بژی، بۆیە لەگەڵ ئەو سنورەکەمەی لەسەر کەنداوی فارسی هەیەتی بەشێکە لەولاتانی حەوزی کەنداوی فارسی و دەبێت تواناکانی بۆ فەراهەم بکرێت تا بتوانێت نەوتی خۆی لەوێوە بنێرێتە دەرەوە. لەڕاستیدا ئەمە بەڵێنێکە کە دراوسێکانی لەبەرامبەر عێراق هەیانە و ئەگەر ئەم بەڵێنە لەڕێگای دراوسێکانیەوە جێگای سەرنج بێت، عێراق خۆی بە بەڵێندەر دەزانێت لەبەرامبەر ئامانجە ستراتیجیەکانی ناوچەکە کە ئامانج لێی ئاسایشی ناوچەکەیە و دروستکردنی کەشێکی ئارام بۆ پەرەپێدان و روونەدانی پێکدادانی سەربازیە. لەبەرئەوە بەڵێنەکانی عێراق لەناوچەکە لەبەرامبەردایە، بۆیە نابێت چاوەڕوانبکرێت کە عێراق لەڕووی ئامانجی ستراتیجی ناوچەکە هاوکاربێت بەڵام لەبەرامبەردا توانای هەناسەدان و گواستنەوە و هاتوچۆکردنی دەریایی لەکەناوی فارسی نەبێت و خۆی لە تەنگانەدا ببینێت. ئەگەر ئەم بیرکردنەوەیە بۆ ولاتانی ناوچەکە هەستی پێبکرێت زۆر لەکێشەکانی پەیوەست بە ئامانجی سەربازی عێراق چارەسەر دەبێت، لەڕاستیدا ئەم پەیمانانە لەچوارچێوەی هەرێمی و لەناوچەکانی پەیماننامەکانیتردایە.

پەیمانەکانی عێراق کە پەیوەستە بە نێودەوڵەتیەوە ریشەی لەوزەدایە، بەڵام بەگشتی رەوتی ئاشتی رۆژهەلاتی ناوەڕاست هەنگاوەکانی یەکێتی سۆڤێت لەڕاستیدا بەڵێنەکانی عێراقی لەسەر ئاستی جیهان کەمکردەوە، لەبەرئەوە بوو توانای زۆری لەبەردەمدا بوو کە توانای خۆی بە پێچەوانەی رابردووەوە کە زیاتر سەربازی بوو بە ئاراستەی ئامانجی ستراتیجی سیاسی و ئابووری جێگیربکات.

ئەگەر سەرنج لەوکێشانە بدەین، لەبواری ستراتیجی سیاسیدا وابەرچاو دەکەوێت کە عێراق ئامادەیی هاوئاهەنگی پێویستی هەیە و خۆی ملکەچ (ملزم) دەبینێت کە بەئاراستەی ئاشتی رۆژهەلاتی ناوەڕاست هەنگاو بنێت و لەگەڵ دراوسێکانی لەوانە تورکیا، ئێران، کوێت، عەرەبستانی سعودی هەتا ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورتیش بێت ناکۆکیەکان چارەسەر بکات. لەهەمانکاتدا چارەسەری کێشەی شیعە و کوردەکان کە پەیوەستە بە دراوسێکانی لەباکور و رۆژهەلات بکات، لەبەرامبەر هێرشی تورکیا بۆ باکوری عێراق (هەرێمی کوردستان) پەرچەکردارێك پیشانادات، واپیشاندەدات کە کێشەی تورکیا لەگەڵ کوردەکانی خۆی هەسپێدەکات و هاوڕایە. هەموو ئەم بیرکردنەوانە لەم بارەیەوە ئەوەیە کە بتوانێت ستراتیجی ئابووری خۆی رێکبخات و زەمینە بۆ دووبارە ناردنەدەرەوەی نەوتی خۆی ئامادەبکات.

**( ج ) تواناكان :**

بۆ زانینی تواناکان فاکتەرە جۆراوجۆرە پێویستەکان دەبێت لەپاڵ یەکتر دانرێن تا ڕێژەی کارایی و توانای وڵاتێك دیاری بکرێت. ئەو فاکتەرانە بریتین لە شوێنی جوگرافی، بوون و شێوەی دراوسێیەتی، باری ئابووری، دانیشتوان و لەهەمووی گرنگتر دیدی نەتەوەیی و پێکهاتەی سیاسی/کۆمەڵایەتی دانیشتوانە. هەرچەندە لەباس و لێکۆڵینەوەی فاکتەری وەك دیدی نەتەوەیی کە تایبەتمەندی فکری و زهنیە و پێکهاتەی دانیشتوان کە پێکهاتەیەکی ناچونیەکە، دەخوازین ئەم فاکتەرە پلەی کارایی کەمتربێت وەك لەفاکتەرەکانیتر.

تێڕوانین لەوەی کە ئابووری جوگرافی عێراق لەپێشدا مۆدێلێکی دیاری هەبوو، ئەگەر بتوانێت بەپەرەپێدانی کشتوکاڵی، چونیەتی بەجۆرێك لەگەڵ یەکتر تێکەڵ بکات کە حالەتی قۆرخکاری بپارێزێت و ئەوەش پەرەپێبدات، شوێنی تایبەت دەتوانێت پەیدا بکات کە ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر جیوپۆلەتیك بەجێدەهێڵێت.

لەلایەکیترەوە، حزبی بەعس لەگەڵ ئەوەی ڕابردویەکی خراپی هەیە، توانای پێکهێنانی زنجیرەی پلەداری (سلسلە مراتب) هەبووە، ئەم پێکهاتەی زنجیرەی پلەداریە لایەنیکەم لەساڵی (١٩٧٦) تواناو کارایی خۆی سەلماندووە، کەموکوریەکانی لەپێکهاتەی دانیشتوانەوە سەرچاوە دەگرێت. بەڵام زەمینەی لەباری پێکهاتەی حکومەت بە سەرنجدان لەوگۆڕانکاریانە شێوەدەگرێت دەتوانێت لەلای ئامانجی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی پاڵنرێت. هەندێك لەتواناکان چ لەکاتی جەنگ و چ لەکاتی ئاشتیدا دەرکەوتووە کە هەندێك نەرمی تێدایە بۆ نموونە دەتوانین ئاماژە بۆ بنیاتنانەوەی دوای دوو جەنگی گەورە بکەیت کە لەبەرزی پێکهاتەی تواناکانەوە سەرچاوە دەگرێت. بە شێوەیەکی گشتی سەرەڕای هەموو ئەو لاوازیانەی کە تائێستا لەباسەکانی پێشەوە ئاماژەی بۆکرا، پێکهاتەی عێراق پێچەوانەی ئەوەی هەستی پێدەکرێت زۆر تێکنەشکاوە نەرمیەکی زۆری تێدایە کە لەبەرزی تواناکانەوە سەرچاوە دەگرێت.

**ناوچەی کەنداوی فارسی و شوێنی ستراتیجی عێراق :**

ناوچەی باکوری ڕۆژئاوای ئۆقیانوسی هندی کە کەنداوی فارسیش دەگرێتەوە، وڵاتانی کەناری ئەو کەنداوە و ڕێگا دەریاییەکانی، بە یەکێکە لەناوچە زۆر گرنگەکانی جیهان دەژمێردرێت.

گرنگی ئەم ناوچەیە زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ بوونی سەرچاوە دەوڵەمەندەکەی نەوتی کەنداو بەجۆرێك کە زیاتر لە(٣٦٥) ملیارد بەرمیل نەوت لەم ناوچەیەدا هەیە، کە ئەمەش نزیکەی (٦٦٪) دەرامەتی نەوتی جیهان پێکدەهێنێت. هەروەها کەنداو خاوەنی (٧٦) تریلیۆن مەتر سێجا گازی سروشتیە کە لە(٣٠٪) یەدەگی گازی جیهان پێکدەهێنێت، ئەمەش گرنگی تایبەتی خۆی هەیە.

ناوچەی کەنداو بەهۆی بوونی ئەمباری گەورەی نەوتەوە، گرنگترین پێگەی لەستراتیجی جیهانی بەدەست هێناوە، رۆژانە نزیکەی (١٥ تا ١٦) ملیۆن بەرمیل نەوت لەولاّتانی عەرەبستانی سعودی، عێراق، ئێران، قەتەر، ئیماراتی عەرەبی و کوێت لەرێگای گەروی هورمزەوە رەوانەی دەرەوە دەکرێت. ئەم برە نەوتە نزیکەی (٥٠٪) بەکارهێنانی ولاّتانی جیهان جگە لەولاّتانی بلۆکی رۆژهەلاّت پێکدەهێنێت.

بەروبوومی نەوتی ناردەنی کەنداوی فارسی، بۆ ئابووری ولاّتانی رۆژئاوا گرنگی زۆری هەیە، لەبەرئەوە ئەم مەسەلەیە گرنگترین فاکتەر لەهاوکێشە سیاسیەکانی ولاّتانی رۆژئاوا لەکەنداو پێکدەهێنێت.

دەرامەتی بەدەستهاتوو نەوت، سەرنجی جیهانی سەرمایەداری و پیشەسازی بۆ ئەم ناوچەیە راکێشاوە و کۆمپانیا بەرهەمهێن و بازرگانیە نێودەولّەتیەکان بۆ فراوانکردنی نفوزی خۆیان و پێشبڕکێ لەناوچەکەدا تێدەکۆشن. فرۆشتنی بەرهەمی پیشەسازی و بەکاربەری، پاشەکەوت لەبانکەکانی ئەوروپا و ئەمەریکا، فرۆشتنی چەك و پڕچەککردنی سەربازی ناوچەکە و بوونی سەدان هەزار هێزی کاری پسپۆڕی دەرەکی کە بەهۆی دۆلاری نەوتەوە ئەنجامدەدرێت گرنگی ناوچەکەی زیاد کردووە.

ناوچەی کەنداو هەروەك هەموو ناوچەکانی جیهان، کەوتۆتە ژێر کاریگەری بەهێزی گۆڕانکاریە نێودەولّەتیەکانی سەرەتای سالاّنی نەوەدەکانەوە. گرنگترین رووداو بریتی بوو لەهێرش عێراق بۆ سەر کوێت و شکستی عێراق لەو جەنگەدا کە بە (جەنگی دووەمی کەنداو) ناودەبرێت.

## جەنگی دووەمی کەنداو و مەسەلەی ئاسایش لەناوچەکەدا :

لەگەلّ جەنگی دووەمی کەنداو و خۆبەدەستەوەدانی عێراق، هەولّی زۆر بۆ دروستکردن و رێکخستنی ئاسایشی نوێ لەناوچەی کەنداو درا. هەریەکە لەلایەنە بەشەڕ هاتووە و خاون نفوزەکان هەولّیاندا ئەم رەوتە بە ئاراستەیەکدا بەرن لەمسۆگەرکردنی بەرژەوەندیەکانیان بێت، لەناوچەکەدا و پێکهاتەی رێکخستنە نوێیەکە بەجۆرێك بێت کە خۆی رۆلّی لەباری تێدا ببینێت.

هێزە رۆژئاواییەکان و لەسەروشیانەوە ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کە لەئازادکردنی کوێت و هەروەها پاراستنی ولاّتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو بەتایبەت عەرەبستانی سعودی لەبەرامبەر هەڕەشەکانی عێراق رۆلّیان هەبوو، پێویستی مانەوەیان لەناوچەکە وەك هێزێك، زەمینەی خۆشکرد بۆ مانەوەی هێزەکانیان لەناوچەکە ئەمکارەش لەلایەن ولاّتانی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو پشتگیری لێکرا. کۆماری ئیسلامی ئێران کە لەکاتی جەنگی هاوپەیمانان دژی عێراق بێلایەنی هەلّبژارد، دوای جەنگ بۆ ئەوەی بتوانێت رۆلّی ئاسایی خۆی وەك هێزێکی ناوچەیی ببینێت بە ئیازی باشکردنی پەیوەندیەکان بوو لەگەلّ ولاّتانی ناوچەکەدا. ئێران ویستی رێکخستنێك لەگەلّ ولاّتانی ناوچەکە دامەزرێنێت و ئارازیبوو لەبوونی ولاّتانی دەرەکی و بە تێکدەری رێکخستنەکەی ئاودەبردن. ولاّتانی

ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو لەبەردەم دوو هەڵبژاردندا بوون یەکەم بەشدارییپێکردنی هێزە دەرەکییەکان لەڕێکخستنی ئاسایشی ناوچەکە ئەمویتریان بەهێزکردنی هاریکاری ناوچەیی بە دوور لەئامادەیی ڕاستەوخۆی هێزە دەرەکییەکان، چونکە هەریەکە لەم دوو هەڵبژاردنە ئیلتزامێکی بۆ دەوڵەتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو دروست دەکرد، کە زۆر خۆشیان پێنەدەهات، بەشداری پێکردنی وڵاتانی دەرەکی هەرچەندە بۆ ئەوان جێگای دڵنیایی بەرژەوەندییەکانیان بوو، بەڵام نارەزایەتی ئێران و ئەو گروپانەی لێکەوتەوە کە دژی بوونی بێگانەبوون لەم وڵاتانە و ناوچەکەدا. لەم ڕووەوە هەرچەندە ئەو وڵاتانە ئارەزووی بوونی هێزە ڕۆژئاواییەکان بوون لەناوچەکە، بەڵام ئەو ڕاستیەشیان دەزانی کە هەرچۆنێك بێت لەپاڵ دراوسێی بەهێزەکەیان بەناوی ئێران دەژین و دەبێت ڕووی سەربەخۆیی خۆیان بۆ هاولاتیەکانیان بپارێزن. لەلایەکیترەوە بەهێزکردنی هاریکاری ناوچەیی دوور لەدەستی هێزی دەرەکی بەسەرنجدان لەپێگەی لاوازیان لەپاڵ هێزی گەورەی ناوچەکە دڵەراوکێی بۆ دروست کردون کە لەوانەیە بکەونە ژێر فشار و هەرەشەی هێزە گەورەکانی ناوچەکەوە. چونکە وڵاتانی ناوچەکە هێشتا ناتوانن بۆماوەی دوورودرێژ ئاسایشی ناوچەکە بپارێزن.

## تێڕوانینی جیاواز بۆ ئاسایشی کەنداو و نەبوونی متمانەی جەماعی:

یەکێك لەگرنگترین هۆیەکانی بەدەست نەهێنانی ڕێگا چارەی گونجاو بۆ قەیرانەکانی ناوچەی کەنداو، نەبوونی یەك پێناسەی گشتی لەبەرژەوندیەکان و وابەستەییان لەبەرامبەر ناوچەکەدا بووە. ئامانجی ئاسایشی کەنداو لەلای وڵاتانی ناوچەکە زۆر جیاوازە. ئەگەر ئاسایش بەئامانجی گشتی بەسەر وڵاتانی حەوزی کەنداودا بسەپێنین بەو ڕاستیە ناخۆشە دەگەین کە زاراوەی (ئاسایشی کەنداو) لەڕووی وتنەوە هاوبەشە، بەڵام لەواتا و گوزارشدا بەتەواوی جیاواز و ناکۆکە، کە هەمیشە وڵاتانی ناوچەی کەنداو لەناو ئەم جیاوازیەدا دەژین. تێڕوانینی وڵاتانی ناوچەکە سەبارەت بە مەسەلە گرنگەکان خواستی ناوچەیی زۆر جیاوازیان هەیە. ئەم جیاوازیە لەواتا و گوزارشتدا تەنیا وڵاتانی ناوچەکە ناگرێتەوە، بەڵکو هەموو وڵاتە بەهێزەکان دەگرێتەوە کە لەئاسایشەدا بەرژەوندیان هەیە.

بەسەرنجدان لەوەی کە بەگەڕانەوە بۆ ئاسایشی ناوچەکانیتر، پیشاندەدات کە ئەندێشەی بنەڕەتی ئاسایشی ناوچەیی هاوشێوەن بەڵام بۆچونە جیاوازەکان لەبارەی تایبەتمەندی ئاسایشی کەنداوی فارسی بۆتەهۆی پلانڕێژی فۆرمی ئاسایشی جیاواز بە شێوەی جیاجیا، کە هەندێکجار دژ بەیەکن و لەکۆتایدا هەنگاوی تاکلایەنەی وڵاتەکانی ناوچەکەی لێکەوتۆتەوە بە ئاراستەی کاردانەوەی بەرگری ڕۆیشتووە، کە ئەم هەنگاوە تاکلایەنانە بۆتەهۆی نەهێشتنی ئارامی وڵاتانی دراوسێ. ئێستا کە ئاسایشی کەنداو لەکاردایە بەپێی تێڕوانینێکی تجریدکراو شیاوی سەرکەوتن نییە، بەڵکو هەنگاوی دەستەجەمعی وڵاتانی ناوچەکە دەتوانێت تەنیا فۆرمی ئاسایشی لۆجیکی بۆ بەدەستهێنانی ئاسایشی واقعی ناوچەکە بێت.

بەبوونی ڕووی هاوبەشی بەهێزکراو بۆ هاریکاری ناوچەیی، لەدەستدانی متمانەی بەرامبەر و هەنگاوی کاریگەر بەناراستەی دروستکردنی کەشی لەبار بۆ متمانەی جەماعی، ناوچەکەی ڕووبەڕووی ناڵوزی زۆرتر کردۆتەوە، کە پێویستە پێش هەرجۆرە هاوکێشەیەکی هاریکاری دەستەجەمعی، هەنگاو بەرەو ئەوەبنێن، هەنگاوەکانی متمانەسازی، لەکەشێکدا کە جیاوازی بیرکردنەوە کۆسپی سەرەکی لەبەردەم هاریکاری و چۆنیەکخوازی دروست کردوە، دەتوانرێت وەك یەکەم هەنگاو بۆ سەرکەوتن بە قۆناغی دواتر بخرێتە بواری کارەوە. وڵاتانی ناوچەکە بۆ بەدەستهێنانی فۆرمێکی بنەڕەتی جێگای متمانەی ناوچەیی نابێت بۆیان، مەگەر لەپەیوەندی دۆستانە و هاریکاری لەبەرامبەر یەکتردا لەگەڵ یەکتردا توندوتۆڵیان بکات.

بێگومان سیاسەتی بەدگومانی و نەبوونی متمانە لەناوچەکە گەیشتۆتە ئاستێك کە هیچ یەکێك لەوڵاتانی ناوچەکە ئامادە نەبوون ئەگەر پرۆژەیەك لەلایەن وڵاتێکی ناوچەکەوە بخرێتە ڕوو ئەوانیتر قبوڵی بکەن و هەموو تواناکانیشیان دەخەنەکار بۆ ئەوەی ئەو پرۆژەیەی خراوەتەڕوو سەرنەگرێت .

تائێستا وڵاتانی ناوچەکە پارەیەکی بێهودەیان خەرجکردووە بۆ دورخستنەوەی ئەو کەشەی لەئەنجامی بێمتمانەی و بەدگومانیەوە ناوچەکەی سەرقاڵ کردووە.

بۆ ناسین و زانیاری لەسەر مانا جیاوازەکانی زاراوەی ئاسایشی کەنداو، تێروانینەکانی هەریەکە لەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، وڵاتانی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو، ئێران و عێراق و ڕۆڵی هەریەکەیان هەڵدەسەنگێنین.

## ئاسایشی کەنداو لەدیدی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە:

دوای تێپەڕبوونی چەندین ساڵ بەسەر جەنگی دووەمی کەنداو و دەرپەڕاندنی عێراق لەکوێت، گۆڕانکاری لەناوچەی کەنداو بەرچاو دەکەوێت. هەرچەندە ئەم گۆڕانکاریە کەمتربوو لەوەی کە لایەنگران و دژەکانی جەنگ پێشبینیان دەکرد. بەپێی هەڵسەنگاندنێکی دەساڵە دەرکەوتووە کە لەجەنگدا پشتگیری لەڕۆڵی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کراوە لەبەرگریکردن لەوڵاتە عەرەبیەکانی کەنداو و دیدگا جیاوازەکانی پەیوەندی و هەروەها لێکدانەوەی ناوچەیشی گۆڕیوە. ئەم گۆڕانکاریانە هیچ یەکێك لەپێشبینیەکان پشتگیری لەوە ناکەن کە ڕۆژئاوا و ئەمەریکا بەناوی پارێزگاری ئاشتی سەرنگونی ڕژێمە محافکارەکانیتر بکات، لەکاتێکدا سەدام حسین هێشتا لەدەسەڵاتدایە هەرچەندە گەمارۆش دراوە. (تا نوسینی ئەم باسە جەنگی ئازادی عێراق و ڕوخانی سەدام حسین دەستیپێنەکردووە ـ وەرگێڕ)

لەدیدی ئەمەریکا و ڕۆژئاواوە جەنگی کوێت، جەنگی بەرگریکردن و دڵنیایی دەستکەوتنی نەوت بووە. سەرچاوەکانی ووزە هێشتا وەك بەرژەوەندی ستراتیجی و ژیانی بۆ جیهانی وڵاتانی پیشەسازی ماوەتەوە و لەماوەی دەساڵی ڕابردوودا (واتە دەساڵی پێش ٢٠٠٢) هیچ شتێکیتر نەیتوانیوە گرنگی

تەواوی نەوتی کەنداو بۆ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ڕۆژئاوا و یابان بخاتە مەترسیەوە. دوای ئەمانی عێراق لە بازاری نەوتی جیهانیدا گرنگی نەوتی ولاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوی لە جاران زیاتر بووە، هەرچەندە ئەمباری گەورە و فراوان لەکۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست و قەوقاز دۆزراوەتەوە، بەلام لەئایندەیەکی نزیکدا نەوتی ئەم ناوچانە ناتوانێت بە بڕی زۆر بێتەناو بازاری جیهانەوە. بۆیە ئەم واقعیەتە ناتوانین نادیدە بگرین کە بوونی یەدەگی دڵنیایی و ئەمباری گەورە نەوت وگازی کەنداو و توانای زیادکردنی بەرهەمی ناوچەکە، ئەو تایبەتمەندیەی هەیە کە لەکاتی هەر ڕووداوێکدا (وەك ئەوەی داگیرکردنی کوێت) بەخێرایی دەتوانن بەرهەم زیاد بکەن و قەیرانەکە چارەسەر بکەن.

ڕویەکیتری ئاسایشی کەنداو لاوازی ولاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوە. لەگەڵ ئەوەی کە پێش داگیرکردنی کوێت ئەم ولاتانە پارەیەکی زۆریان بۆ کڕینی چەکی پێشکەوتوو خەرجکردووە، بەلام هیچ یەك لەم شەش ولاتەی ئەنجومەنی هاریکاری جگە لە سەڵتەنەی عومان هێزی وشکانی ئەوتۆی نییە کە بتوانێت عێراق دوودڵ بکات لەوەی کە هێرشەکەی سەرکەوتوو دەبێت یان نا.

بەدرێژایی جەنگ، سەرکردەکانی ولاتە عەرەبیەکانی کەنداو لەگەڵ دانپیانان بە بێئاگاییان، لەدامەزراندنی هێزێکی سەربازی بەرگری، بەڵێنیاندا کە هەنگاوی پێویست بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەنجام بدەن. بەلام واچاوەڕوان دەکرێت ئەو قسانە لەلایەن باڵی نەیارەوە بوو بێت کە نارازیبووە لەبوونی هێزەکانی ئەمەریکا لەولاتانی ناوچەکە و ئاوی کەنداو، هەرچەندە ولاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو بڕە پارەیەکی زۆریان بۆ کڕینی چەکی پێشکەوتووی ئاسمانی، دەریایی و زەمینی خەرجکردووە، بەلام جگەلە هەنگاوە کەمەکانی کوێت، کۆششی زۆر بۆ دامەزراندنی هێزێکی بەتوانا نەنراوە. هۆکاری سەرەکی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بیرکردنەوەیەی کە دامەزراندنی سوپای بەهێز و جێگیر ئەگەری دروستبوونی کودەتای زۆری لێدەکرێت.

لەدیدی ئەمەریکاوە، بۆ بەرگریکردن لەم ناوچانە هەمیشە گرفت هەیە. میرنشینە بچوکەکانی کەنداو وەك کوێت، بەحرین، قەتەر و ئیمارەتی یەکگرتوو کە خاوەنی قوڵایی ستراتیجی نین هەروەك ئەوەی کە لەکوێت ڕوویدا ئەم ولاتانە دەتوانرێت لەماوەی چەند کاتژمێرێکدا داگیر بکرێن. عەرەبستانی سعودیش کە خاوەنی قوڵایی ستراتیجیە بەلام سەرچاوەی گرنگەکانی نەوتی ئەم ولاتە نزیك بە کەنارەکانی کەنداوە، کە هەمیشە دەکەوێتە بەر هێرشی ئاسمانی و دەریاییەوە. سوپایەکی بەهێز دەتوانێت هێرشی دوژمن دواخات بەلام ڕێگرتن لەداگیرکردنی بیرە نەوتەکان وەك کارێکی ئەستەم سەیردەکرێت.

بەپێی ئەو بەڵگانەی سەرەوە و بەتایبەت بە بەهانەی ئامانجی سیاسی لەپەیوەند بەسوپای ڕێکخراوی ولاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو زیاتر پشتیان بە هێزی ئاسمانی و دەریایی خۆیان

بەستووە، ئامانجیان ئەوەیە کە جەنگ بۆ ئەو لایە ڕاکێشن، بەڵام ئەم وڵاتانە پێش ئەوەی هەر هەنگاوێك بنێن پشت بە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەبەستن.

بوونی هێزە ئەمەریکیەکان لەکەنداو پێش کۆتایی دەیەی (١٩٨٠) زۆر کەم بوو. ئەم وڵاتە لەساڵی (١٩٤٩)دا تەنیا هێزێکی بچوکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی کە بریتی بوو لەچەند کەشتیەك لەبەحرێن جێگیرکرابوو. شۆڕشی ئیسلامی ئێران و هێرشی یەکێتی سۆڤیێتی پێشوو بۆ سەر ئەفغانستان کە هەردووکیان لەساڵی (١٩٧٩) ڕوویاندا، بووە هۆی دروستبوونی فەرماندەیی ناوەندی ئەمەریکا، بەڵام بنکەی ئەم فەرماندەییە لەفلۆریدا بوو. لەشەش وڵاتی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو تەنیا عومان ئامادەیی پیشاندا بەبەستنی ڕێکەوتن بۆ ڕێکخستن و ڕاهێنانی هاوبەش لەگەڵ هێزەکانی ئەمەریکادا. هەرچەندە پەیوەندی و ڕێکخستنی فراوان لەعەرەبستانی سعودی لەڕێگای هاوکاری فراوانی نێوان ئەمەریکا و عەرەبستانی سعودی بووە هۆی دامەزراندنی هێزێکی ئاسمانی شانشینی سعودی، بەڵام بەشێوەی فەرمی هیچ ڕێکەوتنێك لەنێوان ئەم دوو لایەنەدا واژۆنەکرا.

جێگیربوونی بەرفراوانی ئەمەریکیەکان لەماوەی ئۆپەراسیۆنی گەردەلوولی بیاباندا. وەك خاڵی گرنگ بۆ ئامادەبوونی ئەمەریکیەکان دەژمێردرێت. کاتێك جەنگ کۆتاییهات بەشێکی گەورەی هێزە وشکانیەکان ناوچەکەیان جێهێشت، وڵاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو ڕێکەوتننامەی تازەیان لەگەڵ ئەمەریکا واژۆکرد بەمەبەستی دەسکەوتنی پێگەی سەربازی هەنگاویاننا، هەموو ئەو وڵاتانە جگە لەعەرەبستانی سعودی ڕێکەوتنی هاریکاری بەرگریان لەگەڵ ئەمەریکادا واژۆکرد.

لەکاتی جەنگەوە تا ئەمڕۆ، ئەمەریکا بوونی دەریایی هەسپێکراو و بەردەوامی لەکەنداو و لەنزیك ئەم ناوچەیە پاراستووە کە ئەم هێزە دەریاییە فرۆکە جەنگی پێشکەوتووشی تێدایە. شکستی عێراق بەهۆی هێرشی هەمەلایەنەوە بۆ سەر بارەگاکانی لەناو خۆی عێراقدا، لەلایەن ئەم هێزانەوە پیادە دەکران.

هێزی ئاسمانی ئەمەریکا لەبنکەی ئاسمانی ناو عەرەبستانی سعودی و کوێت چاودێری بەردەوامی ناوچەی دژە فڕینی باشووری عێراق دەکات.

هەرچەندە ژمارەی کەسانی دەریایی و زەمینی ئەمەریکا لەناوچەکە بۆ فێرکردن و ڕاهێنانی هێزە ناوخۆییەکان و هەنگاوی لۆجستی لەشوێنی پێویستدا زۆر نییە، بەڵام ئەنجامدانی ڕاهێنانی (تمرینات) هاوبەش لەگەڵ هێزەکانی وڵاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو لەو ئامانجانەیە کە یەکەکانی هێزی دەریایی ئەمەریکا بەشێوەی خولی بەردەوام و دووبارە مانۆڕ لە ناوچەکە ئەنجامی دەدات.

## هەڕەشەی ئاسایشی عێراق لەدیدی ئەمەریکاوە:

هەرچەندە گوزارشتی ئەمەریکا بۆ هەڕەشە لەسەر کەنداو هەمیشە یەکسان نییە لەگەڵ گوزارشتی هەموو وڵاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو. بەڵام بەڕوونی دیارە کە وڵاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو بەتایبەتیش کوێت و عەرەبستانی سعودی بۆ بەرگریکردن لەبەرامبەر هەر هەڕەشە و هێرشێك بەتایبەت ئەگەر لەعێراقەوە بێت هاوکاری نزیکی یەکترن.

هەرەشەی ڕاستەقینەی لەلای عێراقەوە بە ئەندازەی پێویست ئاشکرایە. داگیرکردنی کوێت لەلایەن سەدام حسینەوە کە وەك هەوڵی وڵاتێکی عەرەبی بۆ یەکگرتن لەگەڵ وڵاتێکیتری عەرەبی پیشاندرا، ئەوەندە ناچاوەڕوانکراو بوو کە وڵاتە عەرەبیەکانی ناوچەکە بیریان بۆ کاریتر دەڕژیشت. بەتایبەت مانۆڕی هەڕەشە ئامێزی ساڵی (١٩٩٤)ی هێزەکانی عێراق ئەم گومانەی زیادکرد. هەرچەند سوپای عێراق لەماوەی ئۆپەراسیۆنی گەردەلوولی بیابان گورزی قورسی بەرکەوتبوو و مەعنەویەتی هێزەکانی عێراق بۆ ئۆپەراسیۆنیتر لەباروودۆخێکی ئەویستراودا بوو. سەرەڕای ئەوە بەهۆی نیگەرانی سەرهەڵدانی کودەتاوە زۆر لەئەفسەرانی سوپا پاکسازی کرابوون و هێزی ئاسمانی عێراقیش زۆر لاوز بوو، بەشێك لەفڕۆکەکانی لەکاتی جەنگدا ڕەوانەی ئێران کرابوون و بەشێکیشی بەهۆی نەبوونی پارچەی یەدەگ لەکار کەوتبوون. سەپاندنی ناوچەی دژەفڕین لەباکور و باشووری عێراق لەڕووی پراکتیکیەوە ئەم هێزەی قفڵ کردبوو. لەبەرئەوە ئەمەریکا بەشێوەیەکی بەرچاو هەڕەشەی ئاسایشی عێراقی بۆ سەر وڵاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو کەمکردبووەوە.

لەگەڵ ئەوەی ئەگەری بەکارهێنانی توانای سەربازی لەلایەن عێراقەوە زۆر دوورە، بەڵام لەڕووی کرداریەوە وڵاتانی ناوچەکە و بەتایبەت دراوسێ عەرەبیەکانی ئەم وڵاتە نیگەرانی خۆیان هەیە. ئەم نیگەرانیانە زۆرتر لەو لایەنەوەیە کە لەئاستی نێودەوڵەتی و ناوچەیی پەیوەست بەهەڵگرتنی گەمارۆی ئابووری بۆچوونی جیاواز هەیە، کە فشاری زۆری وڵاتانی دژ بەگەمارۆ دەتوانێت بەهەڵگرتنی گەمارۆ ئەم نیگەرانیانە بۆ هەرەشەی دووبارەی عێراق بۆ ئەم وڵاتانە دروستبکاتەوە.

## هەرەشەی ئاسایشی ئێران لەدیدی ئەمەریکاوە:

لەدیدی ئەمەریکاوە، ئێران دوای کۆتاییهاتنی جەنگ لەگەڵ عێراق بەردەوامە لەسەر بەهێزکردنی هێزە سەربازیەکانی خۆی و چەکی جۆراوجۆری لەوڵاتانی وەك ڕووسیا، کۆریای باکور و چین دەسکەوتوو و ناڕازیە لەبوونی هێزەکانی ئەمەریکا لەکەنداو، هەرچەندە ئێران نینکاری دەکات بەڵام ئەمەریکا لەوباوەڕەدایە ئەم وڵاتە بەشێوەی نهێنی لەگەڕان و دروستکردنی چەکی ئەتۆمیدایە.

ئەمەریکییەکان لەوباوەڕەدان، لەئێستادا ئەگەری هێرشی ئێران بۆ سەر وڵاتانی دراوسێ دوورە. بەهۆی ئەوەی هەروەك عێراق لەگۆشەگیری نێودەوڵەتیدایە و هێزی سەربازی ئێرانیش لەڕووی توانای لۆجستی سەربازییەوە خاوەنی کەلوپەلی کۆنی ئەمەریکا و ئەوروپایە لەم ڕووەوە کێشەی هەیە.

لەسەرەتای دەیەی (١٩٩٠)دا بەکڕینی ژێردەریایی و ژمارەیەك فڕۆك لەوانە (میك٢٩) لەڕووسیا، ئەم هەنگاوە وەك بەشێك لەهەوڵی ئێران بۆ هەڵکشانی تواناکانی و کۆنترۆڵکردنی کەنداو سەیردەکرا، بەڵام دوایی ئەمەریکا سەبارەت بەمە بەدیدێکی تازە سەیریکرد، بەوجۆرە ئەمەریکا هەمیشە سەبارەت بە هەڕەشەی ئێران و کڕینی چەك بەتایبەت تەیاربوون بەچەکی ئەتۆمی و موشەکی کیشوەربڕ مەترسییەکانی بڵاودەکردەوە.

ئەمەریکا لەوباوەڕەدایە ئێران هێزێکی لەکەناری گەرووی هورمز جێگیر کردووە و جارجارێك موشەکی زەمین بەزەمین و زەمین بەئاسمان بە درێژایی گەرووی هورمز و دورگەکان لەوانە دورگەی ئەبو موسا لەحاڵەتی ئامادەباشیدا دادەنێت، کە لەڕاستیدا بەهەڕەشەی بۆسەر ئاسایشی کەنداو دادەنا، بەڵام جێگیرکردنی موشەکی زەمین بەئاسمان لەبەرامبەر داوای ئیماراتی عەرەبی یەکگرتووە سەبارەت سێ دورگەی (تنبی گەورە و تنبی بچوك و ئەبوموسا) وەك چالاکی بەرگری هەڵیدەسەنگێنێت.

لەبەرئەوە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا یەکێك لەبەڵگەکانی بوونی خۆی لەکەنداو بۆ نەهێشتنی هەڕەشەکانی ئێران دەگێڕێتەوە، بوونی ئەمەریکا وای کردووە ئێران لەهەر جۆرە هەنگاوێکی لەوجۆرە ڕابگرێت.

## ئاسایشی کەنداو لەدیدی عێراقەوە:

لەدیدی عێراقەوە ئاسایش لەچوارچێوەی ڕژێمی فەرمانڕەوا کە بۆی دارشتووە پێناسەی دەکات. عێراق هێرش بۆ سەر ئێران و کوێت بەدژ و پێچەوانەی ئاسایشی کەنداو نازانێت و بەڵکو وەك ئاسایشی عێراق و ناوچەکە سەیری دەکات. ئەم وڵاتە لەوباوەڕەدایە کە بەهۆی کەمی کەناراوەکانی لەکەنداو و بوونی کێشەی جیوپۆلەتیکی هیچ ڕێگاچارەیەکی نییە جگە لەکردنەوەی بواری ژیانەوەی عێراق و ئەم هەنگاوەش بەبەشێك لەپاراستنی ئاسایشی کەنداو سەیردەکات. هەرچەندە سەبارەت بە هێرش بۆسەر ئێران بانگەشەی دەسەڵاتدارانی عێراق ئەوەبوو سەرەڕای ئاسایشی عێراق ئاسایشی وڵاتانی عەرەبیش لەبەرچاو گیراوە. لەم بوارەدا سەدام حسین لەوتارێکیدا ووتی عێراق بەردی بناغەی ئاسایش و ئۆقرە و ئارامی ناوچەکە بووە و دەبێت. عێراق پێش هەر وڵاتێکیتر لەناوچەکە بۆ پاراستنی ئاسایش و ئارامی ناوچەکە کاریکردووە. سەدام حسین لەوباوەڕەدایە کە لەجەنگی عێراق ئێراندا، وڵاتانی عەرەبی کەنداو سوودمەندبوون بەبێ ئەوە بەهای گیانی ئەو بپارێزن. سەدام حسین لەوتارێکدا لە(مارسی ١٩٩١) ووتی لەڕووداوی ئابی ساڵی (١٩٩٠) کاتێك عێراق هێرشیکردە سەر کوێت لەبنەڕەتدا هەنگاوبوو بۆ

بەرگریکردن لەدەسکەوت و بەهاکانی خۆی. ئەو لەوتارێکیتردا لە(١٢ ئاب ١٩٩٢) وەختێك بۆ چارەسەری کێشەکانی ناوچەکە وتاری دەدا چارەسەری ئەمەی وەك یەك کێشە نەك دوان، داوایدەکرد چارەسەری کێشەی فەلەستین لەسەرەوەی کارەکان بێت. ئەو لەقسەکانیدا جارێکیتر وەبیر بەرامبەری هێنایەوە کە ئەم مەسەلەیە، وەك کێشەیەکی سەرکی ماوەتەوە و ئەمێنێتەوە و سەرچاوەی سەرەکی ئەم نائارامی و ناجێگیریە لاوازی ئاسایش و ئارامی ناوچەکەیە. سەدام حسین دواتر ڕایگەیاند : ئێمە شوێنی خۆمان وەك کلیلی پاراستنی ئاسایش و ئارامی ناوچەکە درێژە پێدەدەین، کە ماف و بنەمای ئینسانی لەناوچەکە دابیندەکات. بەبێ بوونی عێراقێکی بەهێز و مۆدێرن، نائارامی سەرتاسەری ناوچەکە داگیردەکات و بێسەروبەرەیی بڵاودەبێتەوە. کەسانێك کە لەخەوی غەفڵەتدان و لەبارەی هەڵسەنگاندنی هەڵەیان سەبارەت بە شوێن و ڕۆڵی عێراق باجی گەورە دەدەن.

بە شێوەیەکی گشتی عێراق نارازیە لەجێگیر کردنی هێزەکانی ئەمەریکا لەکەنداو بەبیانووی پاراستنی ئاسایشی وڵاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو و لەبەر ئەوە هەمیشە ڕەخنە ئاراستەی وڵاتانی عەرەبی ناوچەکە دەکات. لەم بارەیەوە سەدام حسین ڕەخنەی توندی لەدەسەڵاتدارانی کوێت گرت و ئاگادریکردنەوە لەپێکەوە بەستنی چارەنوسی تایبەتی خۆیان بە بەرژەوەندی بێگانەوە، ڕوونیدەکاتەوە کە (هەموو ئەو کەسانەی بۆ ئاینده دەڕوانن و ئارەزووی ئارامی و ئاسایش دەکەن، دەبێت بزانن بەکوشتنی دەستەجەمعی منداڵانی عێراق و مردنی ژمارەیەکی زۆری نەوەکانیان بە درێژی تەمەن و کەمی کەرەسەی خۆراك و تەندروستی، بانگکردنی هێزەکانی بێگانە و جێگیرکردنیان لەسەر زەوی کوێت، کە ئەم زەویە بۆتە پێگەیەك بۆ هێرشکردن لەڕابردوودا و ئێستاش بەردەوامە، ڕووبەڕووبوونەوە بەم دوژمنایەتیە لەسەر ئەم ئاستە بەربڵاوە ئاشتی و ئارامی و ئاسایش دروستناکات و هیچ وەختێك بەئەنجامی ئاشتیەك کە لەبیری هەرکەسێکدا هەیە ناگەین.

### ئاسایشی کەنداو لەدیدی ئێرانەوە:

لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران، ناوچەی کەنداو و ئۆقیانوسی هندی، بووە جێگای بڵاوبوونەوەی هێزی دەریایی زلهێزەکان و بەتایبەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا. لەم ماوەیەدا ڕۆڵی سەرەکی ئێران وەك وڵاتێك کە ڕۆڵێکی گرنگی لەپاراستنی ئارامی و ئاسایش لەناوچەکەدا هەیە لەبەرچاو نەگیراوە، بە دروستکردنی هاریکاری هەرێمی وڵاتانی حەوزی کەنداو لەگەڵ وڵاتانی دەرەوەی ناوچەکە و هەوڵدان بۆ سنوردارکردنی هەرچی زیاتری ڕۆڵی ئێران و ساردی پەیوەندیەکانی لەگەڵ وڵاتانی ناوچەکە کاردەکرێت. ئەمە لەکاتێکدایە کە ئێران وەك بە هێزترین وڵاتی کەنداو دەبێت لەچوارچێوەی ئاسایشی ناوچەکە ڕۆڵی سەرەکی ببینێت. هەتا وڵاتانی ناوچەکە و دەرەوەی ناوچەکە چەندینجار سەرنجیان لەڕێژەی دانیشتوان و پێگەی ستراتیجی و توانای ئابووری بەهێزی ئێراندا داوەن و دانیان بەو ڕاستیەدا ناوە.

تێڕوانینی ئێران سەبارەت بە ئاسایشی کەنداو بەشێوەی گشتی، لەدەسەڵاتدارێتی وڵاتانی ناوچەکە لەسەر کەنداو بەبێ دەستتێوەردانی هێزی بێگانە دروست دەبێت. ئێران دەستتێوەردانی ڕۆژئاوا بەسەرەکیترین هەڕەشە بۆ سەر کەنداو دادەنێت. لەدیدی ئێرانەوە، تەنیا شێوازێکی بنەڕەتی و دڵنیایی بەخش کە لەسەر بنەمای لێك تێگەیشتنی هاوبەش و هاوکاری هەموو وڵاتانی ناوچەی کەنداو دامەزرابێت دەتوانێت مسۆگەری دابینکردنی ئاسایش بێت لەناوچەکە و ئەم شێوازی هاریکاریەش لەچوارچێوەی ئابووریەکی هاوپەیوەستدا دەبێت و بە باشترین پاراستنی ئاسایشی هاوبەشی وڵاتانی ناوچەکەی دادەنێت. بەبۆچوونی ئێران هەرجۆرە ڕێکخستن و تەرتیباتێك لەکەنداودا کە یەکێك یان چەند وڵاتێکی ناوچەکە نەگرێتەوە و بخرێنەلاوە، نەك تەنیا ناتەواوە، بەڵکو وڵاتی کەنارخراو خۆی وەك سەرچاوەی نائارمی دەردەکەوێت.

ئاسایشی کەنداو لەدیدی ئێرانەوە بە ڕێزبۆدانانی سەربەخۆیی سنوری وڵاتانی ناوچەکە دیاریدەکرێت و گەورەترین کۆسپی بەردەمی لەناوچەکە هەستی فراوانخوازی هەندێك لەوڵاتانی ناوچەکەیە. ئێران لەگەڵ هیچ یەکێك لەوڵاتە دراوسێکانی داوای زەوی ناکات و هەوڵدەدات هێزی بێگانە دەستنەخەنە کاروباری ناوچەکەوە. هەرچەندە ئەم بۆچوونە لەلایەن ڕۆژئاواوە جێگای قبوڵ نییە.

**ئاسایشی کەنداو لەدیدی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوەوە:**

ڕێکخراوی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو کە لەسەرەتای جەنگی عێراق ئێراندا، بەمەبەستی پاراستنی ئاسایشی وڵاتانی ناوچەکە پێکهێنرا، ناکارایی و بێتوانایی خۆی لەکاتی هێرشی عێراق بۆ سەر کوێت پیشاندا، لەم ڕووەوە بوو کە لەدوای شکستی عێراقەوە، پرۆژەی ئاسایشی بۆ پێکهێنانی یەکێتیەکی سەربازی لەنێوان شەش وڵاتی کەناری باشوری کەنداوی فارسی و میسر و سوریا خرایەڕوو و لەدوای ئەمەش قسە لەسەر پرۆژەیتر کە لەسەر بنەمای هاوبەش و هاوکاری ناڕاستەوخۆی وڵاتانی ئەمەریکا و بەریتانیا و فەرەنسا کرا. لەم قۆناغەدا پێشبڕکێی وڵاتانی ناوبراو بۆ فرۆشتنی چەك بەوڵاتانی کەنداو دەستیپێکرد و لەمبارەیەوە ڕێکەوتنی دوولایەنەی نێوان کوێت و بەریتانیا وفەرەنسا و دواتر لەنێوان قەتەر و بەحرین و بەریتانیا واژۆکرا. ئەم ڕێکەوتنانە لەدیدی ئەم وڵاتانەوە بەهۆی ئەم نیگەرانیانەی خوارەوە واژۆکرا:

١) هەستکردن بەنائارامی و ئاسایش لەدوای هێرشی عێراق بۆ سەر کوێت.
٢) لاوازی پێکهاتەی سیاسی ناوخۆیی و نیگەرانی لەسەرهەڵدانی شۆڕش دژی ڕژێمەکانیان.
٣) هەستکردن بەنیگەرانی لەئێران لەڕووی فراوانبوونی خواستی هێزە ئوسولیەکانەوە.

ڕێژەی نیگەرانیەکانی وڵاتانی کەنداو لەسەر هەڕەشەی ئاسایشیان جیاوازە. زاراوەی ئاسایش لەدیدی کوێتەوە واتا پاراستن و مانەوەی دەسەڵاتە بەهەر ڕێگایەك و پەنابردن بۆ هەرکارێك بێت. کوێت

هەموو تواناکانی دەخاتەکار تا ئاسایشی خۆی لەچوارچێوەیەکی تایبەت کە خۆی پێناسەی کردووە دابینبکات.

لەناو هەموو وڵاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو کوێت لەهەموویان زەرەرمەندترە و زیاتر لەهەموویان بۆ پاراستنی ئاسایشی خۆی پیشت بەڕۆژئاوا دەبەستێت. عێراق بە فەرمی داوای خۆی لەسەر کوێت نەکێشاوەتەوە و ئەو سنورە تازەیەی کە لەلایەن کۆمیسیۆنێکی دیاریکردنی سنوری عێراق ــ کوێت لەلایەن رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکانەوە دیاریکراوە قبوڵنەکردووە. کاتێك ئەم کۆمیسیۆنە ئەنجامی کارەکانی خۆی لە(مایسی ١٩٩٢) پێشکەشکرد هەتا هێزە ئۆپۆزیسیۆنەکانی عێراقیش خۆشحاڵ نەبوون پێی و داوایان لەرێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ دیاریکردنی سنورکرد، دانوسان لەگەڵ حکومەتی خەڵکی عێراق لەبەغدا بکەن. لەو جێگایەی کە زەرەری سروشتی لەناوچەی کەنداو زۆرە، بۆیە کوێت بەهۆی شوێنی جوگرافی و جیوپۆلەتیکی لەباروۆخێکی مەترسیداردایە. ئەو وڵاتە کە کەوتۆتە نێوان عێراق و عەرەبستانی سعودیەوە و رووبەرەکەی (١٧٠٠٠کم٢) کە (١١٣) میلی دەریایی کەناری هەیە، هەر هەرەشەیەك ئەگەر لەلایەن عێراقەوە بکرێتەسەری، کوێت لەناوخۆ بۆ لای عەرەبستانی سعودی و لەدەرەوە بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پاڵپێوەدەنێت. لەبەرئەوە لەرەهەندی فراوانتردا ئاسایش بۆ کوێت واتە گەرانەوەی بوون و درێژەدان بە ژیانی ئەم وڵاتە لەرێی پەیوەستبوون بەپارێزگاری ئەمەریکاوە، ئەم خاڵە وادەکات کە دیدگای ئاسایشی عەرەبستانی سعودی و کوێت بەیەکەوە پەیوەستبن.

لەرەهەندێکی تەسکتردا، ئاسایش لەدیدی کوێتەوە پەنابردنە بۆ هەرکارێك بۆ پاراستن و بەردەوامی ئاسایش وڵات و خانەوادەی ئال صباح. بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئامانجە، لەرێگای دەرامەت و توانای دارایی و پەیوەندی سیاسی بەتایبەت کە لەدەرەوەی ناوچەکە هەیەتی هەوڵدەدات بەرگری لەئاسایش خۆی لەچوارچێوەی ئەو پێناسەیەی کە بۆ ئاسایش کەنداو هەیەتی بکات.

عەرەبستانی سعودیش هەمان دیدی ئاسایشی کوێتی هەیە لەگەڵ ئەو جیاوازیەی کە ئەم وڵاتە هەیەتی لەخاوەنداری ئەمباری گەورەی نەوت و فراوانی رووبەر کە دەگاتە (٢,٢٤٠,٠٠٠کم٢) کەنارێك بەدرێژایی (٣٠٠٠) میلی دەریایی و پێگەی ستراتیجی لەبار، ئەم وڵاتە بەپایە یان ستونە گرنگەکانی بەرژەوەندی ئەمەریکا دەژمێردرێت لەناوچەکەدا. بۆیە ئەم وڵاتە لەگەڵ هەبوونی دەرامەتی باش و پەیوەندی سیاسی تایبەت لەگەڵ وڵاتانی رۆژئاوا لەرووی ئارامی و پاراستنی ئاسایشی خۆیەوە سوودمەندە.

## مەسەلە ناوخۆییەکان و ئەو هەڕەشە ئەمنیانەی لێوەی سەرچاوە دەگرێت:

کێشە ناوخۆییەکانی هەندێك لەوڵاتانی کەنداو نیگەرانی ئاسایشی بۆ ئەوان دروست کردووە. دوای سەرکەوتنی هاوپەیمانان بەسەر عێراقدا، ناکۆکیە ناوخۆییەکان لەعەرەبستانی سعودی پەرەی سەند و سەرەرای پلانەکانیان کە بەشێوەی ئاشکرا هەنگاوی پراکتیکیان بۆ جێبەجێکردنینا. نارەزاییەکان زیاتر پەیوەندی هەبوو بەوابەستەیی عەرەبستانی سعودیەوە لەگەڵ هێزە بێگانەکان بەتایبەت وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ئاماژە بۆ بەرپرسانی سیستەمی بەڕێوەبردنی عەرەبستانی سعودی دەکرێت. لە(تشرینی دووەمی ١٩٩٥) لەریاز تەقینەوە ئەنجامدرا و پاشان بنکەی هێزەکانی ئەمەریکا لەزەهران کەوتە بەرهێرش کە ژمارەیەك کوژراو و برینداری لێکەوتەوە. بەهۆی هەستیاری و نارەزایی زۆر لەبەرامبەر بوونی هێزەکانی ئەمەریکا لەم وڵاتە، هاوکاری نێوان ئەم دوو وڵاتە بەبێ راگەیاندن و گشتاندن ئەنجام دەدرێت. هەتا دوای تەقینەوەکەی زەهران هەوڵدراوە کە هێزەکانی ئەمەریکا کەمتر لەبەرچاوی خەڵکبن و بنکەکانیان بۆ ناوچە دوردەستەکان بگوێزرێنەوە. لەهەمانکاتەدا دەسەڵاتداران لەعەرەبستانی سعودی بۆ کەمکردنەوەی بەرهەڵستکاران و گروپی ئۆپۆزیسیۆن بڵاویان کردەوە کە خەڵکانێ لەدەرەوەی خانەوادەی دەسەڵات لەکاروباری سیاسی و بریاردان دابمەزرێنن و لەم بوارەدا لەنەنجومەنی راوێژکاری خەڵکانی دەرەوەی خانەوادەی دەسەڵاتیان دامەزراند. هەرچەندە نارەزایەتیەکان لەبەر ئەو هۆیانەی پێشەوە بەئاشکرا هەستیپێ دەکرێت، بەڵام ئەمە نیشانەی ئەوە نییە کە لەعەرەبستانی سعودی گۆرانکاری خێرا و شۆرش روودەدات. بەهۆی هەلومەرجی جسمی و نەخۆشی شا فهد، کاروباری وڵات لە(ئاداری ١٩٩٦) سپێردرا بە شازادە عبداللە، گروپە ئیسلامیەکان بەهۆی ئاراستە و سەرنجی زۆرتری ئەو (شاعبداللە) بۆ دابونەریت و سونەتەکان، نارەزایەتی خۆیان کەمکردەوە.

سەرەرای عەرەبستانی سعودی، بۆمبگوزاری و نارەزایەتی زۆر و فراوان لەبەحرێن لەلایەن شیعەکانەوە (کە زۆریەی دانیشتوانی ئەو وڵاتە پێکدەهێنن) سەریهەڵدا کە نیگەرانی لەسەر ئاستی وڵاتانی محافزکار لەناوچەکە دروست کرد. هەرچەندە ئەم نارەزایەتیە لەلایەن حکومەتەوە سەرکوت کرا، بەڵام چونکە بێمافی زۆرینەی خەڵکی و بەتایبەت لەدەسەڵاتی جێبەجێکردن و سیاسدا بەبابەتی سەرەکی نارەزایەتیەکە دەژمێردرێت، بۆیە زەمینەی دروستبوونی گرژی لەئاییندەدا هەر بەرێوەیە.

## گرنگی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەماوەی جەنگی سارد و ڕۆڵی لەدیاریکردنی ستراتیجی جیهانیدا:

لەزۆر کۆنەوە تا ئەمڕۆ، هێزە جیهانیەکان هەوڵیانداوە دەسەڵاتیان بەسەر ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەبێت، چونکە دەسەڵات بەسەر ئەم ناوچەیە وەك ئیمتیازێکی ستراتیجی بۆیان دەژمێردرێت، لەبەرئەوە بەهۆی ململانێی ئەم هێزانەوە لایەنی نفوزی هەر لایەك هەرچی زیاتربێت، ئەم ناوچەیە ماوەی ناجێگیری و نائارامی زیاتری بینیوە. ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەمیشە بازاڕی سەرەکی چەکی سەربازی جیهان بووە و ئەم مەسەلەیە سەرەڕای ئەوەی کاریگەری لەسەر پەیوەندی عەرەب و ئیسرائیل بەجێهێشتووە، لەسەریشیان کاریگەر بووە. لەڕاستیدا ناکۆکی عەرەب و ئیسرائیل فراوانتر بووە لەشەڕێکی هەرێمی و زلهێزەکان هەریەکەیان پارێزگاری لەلایەنێکی بەشەڕهاتوو دەکەن.

لەسایەی جەنگی سارد و بەپارێزگاری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ئیسرائیل توانی بازبدات بەسەر جێبەجێکردنی ڕێکەوتننامەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان کە خواستی کۆمەڵەی گەلانە و لەلایەکیتریشەوە تا ئەو جێگایەی کە مۆسکۆ بە پارێزەری جیهانی عەرەبی دەژمێردرێت، واشنگتۆن نارازیبوو لەهەر جۆرە ڕێکەوتن و لێك تێگەیشتنێك کە ببێتە هۆی زیاد کردنی نفوزی یەکێتی سۆڤێت لەناوچەکەدا. هەرچەندە لەگەڵ کۆتاییهاتنی جەنگی سارد و چونەدەرەوەی یەکێتی سۆڤێت لەگۆڕەپانی سەرەکی ململانێی نێودەوڵەتی بەتایبەت لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، وابەرچاو دەکەوێت کە ئەمەریکا مەبەستیەتی کێشەی عەرەب و ئیسرائیل بەرەو چارەسەر بەرێت.

لەماوەی پەنجا ساڵی ڕابردوودا گرنگی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەئاستی ستراتیجی جیهانیدا جیاواز بووە. یەکێتی سۆڤێت بەمەبەستی نفوزی خۆی هەوڵیداوە بنکە و بارەگای گرنگ لەناوچەکە بەدەست بهێنێت، بەجۆرێك کە بتوانێت بەرژەوەندیەکانی خۆی وەك زلهێزێك مسۆگەر بکات. بۆ ئەمەریکاش بەدەستهێنانی دوو ئامانجی سەرەکی گرنگ بوود. یەکێکیان دابینکردنی نەوتی پێویست بۆ پیشەسازیەکانی ئەمەریکا و ڕۆژئاوا و ڕێگرتن لەزلهێزی بەرامبەر لەدەستکەوتنی ئەم دەرامەتە و دووەمیان بەرگریکردن لەوڵاتی ئیسرائیل وەك نیشتمانی جولەکەکان.

ئەم دوو ئامانجەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەناو خۆیدا دژ بەیەکبوون و هەمیشە بەرپرسانی حکومەت ئەمەریکا ڕووبەڕووی ئەم کێشەیە بوونەتەوە. ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بۆ ئەمەریکا مایەی سەریەشە بووە و هەریەکە لەسەرۆك کۆمارەکانی ئەمەریکا سوودوەرگرتن لەڕەوشی تایبەت هەوڵیانداوە سیاسەتێکی هاوڕێك بگرنەبەر، چونکە ئەمەریکیەکان هەم پێویستیان بەنەوتی عەرەبە و هەم پێویستیان بەیارمەتی جولەکە بەهێزەکانی ناو ئەمەریکایە لەهەڵبژاردندا هەیە. بەهەندنەگرتنی هەر یەکێکیان دەتوانێت کێشەیان لەسەر ئاستی جیهان بۆ دروست بکات. هەرچەندە لادان بەلای ئیسرائیلدا

هەمیشە زۆرتر بووە. لەخوارەوە لێکۆڵینەوەی زیاتر لەسەر گرنگی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەو سیاسەتانەی گیراوەتەبەر بەتایبەت لەلایەن ئەمەریکاوە دەخەینەڕوو:

### گرنگی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەلای زلهێزەکانەوە لەدوای جەنگی دووەمی جیهانیەوە:

ئەمەریکا بۆ بەدەستهێنانی ئامانجە سیاسیەکانی خۆی لەناوچەکە و سوودوەرگرتن لەتواناکان، پەنای بۆ ستراتیجی جیاواز بردووە. هەڵبژاردنی ستراتیجێك یان کۆمەڵە ستراتیجیك پەیوەستە بەبارودۆخ و کەشی ناوچەکەوە. ستراتیجی هەڵبژێردراو بەسەرنجدان لەپێویستی مانەوەی سیاسەتی ئەمەریکا لەناوچەکە لەگەڵ وڵاتانی وابەستە بەوەوە و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ شۆڕشی ئیسلامی و بڵاوبوونەوەی نفوزی یەکێتی سۆڤێت لەناوچەکە، ڕێکخراو و جێبەجێکراوە. گرنگیدان و جەختکردنەوە لەسەر یەکێك یان چەند ستراتیجیکی هەڵبژێردراویش پەیوەستە بەبارودۆخی ناوچەکە و جیهانەوە و کاتێك ستراتیجی سەربازی لەوانیتر بەباشتر دەزانرێت. بەدرێژایی جەنگی سارد نیگەرانیە سەرەکیەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەناوچەکە، وەك هەر شوێنێکیتر جڵەوگرتنی یەکێتی سۆڤێت بووە، لەڕاستیدا ئارەزوو نەبوونی یەکێتی سۆڤێت لەکشانەوەی هێزەکانی لەئێران لەساڵی(١٩٤٦) یەکێك لەبیانوەکانی دەسپێکردنی جەنگی ساردبوو. تاپێش ساڵی (١٩٧١) ناوچەی کەنداو وەك جێگای تێڕوانینی پلاندانەرانی ستراتیجی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەپلەی دووەمدا بوو دوای ئەورووپای ڕۆژهەڵات. بەڵگەی سەرەکی ئەوەیە کە یەکەم: ناوچەکە لەگەڵ ئەوەی دراوسێیە لەگەڵ یەکێتی سۆڤێت بەڵام وانابینرێت هێڵی پێشەوەی ڕووبەڕووبوونەوەی کۆمۆنیست بێت، چونکە نفوزی ئەم ئایدۆلۆجیەتە بەپێچەوانەوەی بەشەکانی ئەورووپا و ڕۆژهەڵاتی ئاسیا لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەرگرتن و قبوڵکردنی لەلایەن خەڵکەوە کەمتربوو. دووەم ئامادەیی بەرفراوانی بەریتانیا لەناوچەکە بوونی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای سنووردارکردبوو، وە پێویستی ئامادەیی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کەمکردبۆوە, بەریتانیا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا خاوەنی ژمارەیەك لەبەرژەوەندی هاوبەش بوون. لەهەموویان گرنگتر ڕووبەڕووبوونەوەی یەکێتی سۆڤێت و بەرگرتن لەڕژێمەکانی ناوچەکە بۆ بەدەستهێنانی سامانی نەتەوەییان (واتە خۆماڵیکردنی نەوت - وەرگێڕ). بەجۆرە و بەشێوەی گشتی تاکاتێك کە ئەم بارودۆخە درێژەی هەبێت جێگای ڕەزامەندی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بووە.

هەوڵی سەرەکی، نفوزی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەعەرەبستانی سعودی بوو. لەسەرەتای دەسپێکردنی جەنگی دووەمی جیهانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەژێر فشاردا بەریتانیای والێکرد بیرە نەوتەکانی کوێت، بەحرین، عێراق و عەرەبستانی سعودی بسپێرێت بەئەمەریکا. بەدرێژایی جەنگ ئەمەریکا سوودی لەپێگەی جەنگی خۆی وەرگرت بۆ دارشتنی ئامادەیی ستراتیجی ماوەدرێژ لەعەرەبستانی سعودیە. پێشڕەوی بەرچاوی تر کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەسنووری بەریتانیا

کردی، دامەزراندنی کەشتیگەلێك بوو لەساڵی (١٩٤٩)دا بەناوی (فەرماندەیی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست). ئەم گروپە کەشتیگەلێکی بچوکبوو لەبەحرین جێگیرکرا، کە دووکەشتی جەنگی و تجهیز و تەیارکردنی فەرماندەیی بوو بۆ ماوەی سی ساڵی ئاینده پلانی بۆ دارێژرابوو کە وەك نمایندەی گرنگی هێزەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەبەرامبەر یەکێتی سۆڤێت سەیردەکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئەمەریکا لەجیاتی سوودوەرگرتن لەچەکی تقلیدی لەبەرامبەر چالاکیەکانی یەکێتی سۆڤێت هەوڵەکانی خۆی لەبواری دیپلۆماسی خستۆتەکار لەوانە ڕێکەوتنی دوولایەنە و دامەزراندنی پەیمانی بەغدا، کە لەهەرەشەی سەربازی ناوکی پارێزران.

نیگەرانی گشتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەبڵاوبوونەوەی مەترسی کۆمۆنیستەوە سەرچاوەدەگرێت. کە تایبەتە بەدوو نیگەرانی لەناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست واتە پارێزگاریکردن لەئیسرائیل و پاراستنی بەرژەوەندیە نەوتیەکان وەك لەپێشەوە ئاماژەی بۆکرا. بەکاربردنی نەوت لەجیهاندا بەشێوەی بەردەوام لەساڵانی پەنجا و شەستەکاندا زیادیکرد لەگەڵ ئەوەی بەرهەمی نەوتی ناوخۆی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاش بەخێرایی زیادیکرد. بەڵام جیهانی ڕۆژئاوا بەشێوەی ڕۆژانە پێویستی بۆ هاوردەی نەوت زیادیکرد، کە بەشی زۆری لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە دەهات، بەڵام لەگەڵ ئەو پچڕاندنەی لەئەنجامی خەباتی وڵاتانی بەرهەمهێنی نەوت بەمەبەستی خۆماڵیکردنی نەوت و بەرزکردنەوەی نرخەکەی، تاپێش قەیرانی نەوتی (١٩٧٣-١٩٧٤). نیگەرانیەکانی ڕۆژئاوا و ئەمەریکا ئەوەندە ڕوو لەمسۆگەرکردنی نەوت نەبوو زیاتر ڕووی لەهاتنەناوەوە و دەستێوەردانی یەکێتی سۆڤێت بوو بۆناو وڵاتانی ناوچەکە.

لەکۆتایی ساڵانی شەستدا بەهۆی زەرەر و زیانە مادی و مرۆییەکانی جەنگی ڤێتنامەوە کە بووە هۆی گۆڕانێکی لەناوکاو لەسیاسەتی دەستێوەردانی ئەمەریکا، لەئەنجامدا کاتێك بەریتانیا لەساڵی (١٩٦٨) کشانەوەی هێزەکانی لەڕۆژهەڵات سوێس ڕاگەیاند لەڕووی سیاسی و داراییەوە بۆ ئەمەریکا نەگونجاو بوو کە بتوانێت جێگای ڕاستەوخۆی ئەو بگرێتەوە.

بۆ ڕێگرتن لەڕووشاندنی ئەو ئابڕووچوونەی ئەمەریکا کە توشی پاشەکشێ و گۆشەگیری کردبوو، لەساڵی (١٩٦٩) نیکسون تیۆرێکی نوێی بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ڕاگەیاند کە پشت بەم سێ تەوەری خوارەوە دەبەستێت:

یەکەم- وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەموو پەیماننامەکانی پەیوەند بەبەڵێنەکانی خۆی چاودیری بکات.

دووەم- لەکاتێکدا کە هێزی ئەتۆمی، ئازادی حکومەتە هاوپەیمانەکانمان یان ئەو حکومەتانەی کەمانەوەیان بۆ ئاسایشی ئەمەریکا زۆر پێویست و ستراتیجیە، دەکەونە بەر هەڕەشە، ئێمە وەك سەنگەرێکە پۆڵایین لەبەرامبەریان هەنگاو دەنێین.

سێیەم- لەکاتێکدا ئەگەر هێرش بکرێتە سەرنەمان بەهەر شێوەیەك، ئێمە بەپێی ئەو پەیانەی بڕیارلێدراو یارمەتی ئابووری و چەکیان پێشکەش دەکەین، بەڵام ئێمە لەنەتەوەیەك کە ڕاستەوخۆ لەبەردەم هەڕەشەدان دەمانەوێت سەربەخۆیی بەدەستبێنن هێزی مرۆیی بۆ بەرگریکردن لەخۆی بگرێتەئەستۆ.

لەدوای ڕێکەوتنی بەریتانیا بۆ کشانەوەی و بڵاوبوونەوەی ئۆپەراسیۆنی کەشتیگەلی دەریایی سۆڤێتی لەئۆقیانوسی هندی و کەنداوی فارسی وەك مۆدێلێك بۆ جێبەجێکردنی تیۆری نیکسون دەرکەوت، بۆ جێبەجێکردنی ئەم تیۆرە ئێران و عەرەبستانی سعودی وەك دوو پایەی سەرەکی لەبەرچاوگیران. نیکسون سیاسەتی خۆی لەکەنداو، لەژێرناوی (سیاسەتی دوو ستون Tow Pillars Policy) خستەبواری کارەوە.

جەنگی عەرەب ئیسرائیل لەساڵی (١٩٧٣) دۆخێکی بۆ دووبارە تێڕوانینەوەی لەستراتیجی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هێنایەکایەوە. دەوڵەتە عەرەبیە نەوت بەرهەمهێنەکان وەك نارەزایی داگیرکاری ئیسرائیل، بەرهەمی نەوتیان کەمکردەوە و نرخەکەشیان بەرزکردەوە لەدژی ئەو بەرگریە ڕەهایەی هۆڵندا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەئیسرائیل گەمارۆیەکی تەواویان لەسەردانان. نارێکوپێکی ئابووری کە لەئەنجامی قەیرانی نەوتەوە دروست بوو هەڕەشەبوو بۆ سەر ئاسایشی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ڕۆژئاوا دوور لەچەمکی سۆڤێتی و سەربازی و هەروەها ناکارایی سیاسەتی ستراتیجی ڕۆژئاوای پیشاندا لەبەرامبەر ئەم هەڕەشانەدا.

لەئەنجامدا دارێژەرانی سیاسەتی ئەمەریکا بەناچاری پەیوەندی ڕاستەوخۆی لەنێوان مسۆگەرکردنی نەوتی کەنداو و چارەسەری کێشەی عەرەب و ئیسرائیلیان خستەبەرباس و لێکۆڵینەوە. هەرچەندە نەبوونی هاوئاهەنگی لەناو عەرەبەکاندا بووە هۆی ئەوەی ئەم کارە زۆر بەجدی وەرنەگیرێت، بەڵام واقعی بوونی لەلایەن حکومەتی کارتر و ریگانەوە پشتگیری لێکرا. لەدوای ئەمەوە هەنگاوەکانی عەرەبستانی سعودی بۆ سوودوەرگرتن لەسیاسەتی نەوت بەمەبەستی فشاری سیاسی لایەنگری ڕژێمی شای ئێران لەبەرزکردنەوەی نرخی نەوت بەئاشکرا ناکارایی تیۆری نیکسونی پیشاندا، چونکە هەردوو پایەی سەرەکی ئەم تیۆرە خۆیان دەیانتوانی ئاسایش ئەمەریکا بخەنە بەر هەڕەشە. سوودوەرگرتن لەگەمارۆی نەوت بەمەبەستی سیاسی زەنگێکی مەترسیداری بۆ ئەمەریکا لێدا، چونکە جیهانی پیشەسازی لەگەمارۆیەکی جدیتردا بەجێهێشت، زۆر نزیکە مەترسی دەستێوەردانی سەربازی ڕوویدات. لەگەڵ ئەوەی (شلزنیگر) وەزیری بەرگری ئەمەریکا ڕایگەیاند جۆرە دەستێوەردانێکی سەربازی لەوانەیە ڕوویدات، بەڵام زانیاریە هەواڵگری و لێکۆڵینەوەکانی کۆنگرێسی ئەمەریکا گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە وڵاتە یەکگرتووەکانی

ئەمەریکا توانای سەربازی بۆ کونترۆلکردن و بەڕێوەبردنی کاریگەری لەناوچە نەوتییەکاندا نییە، چونکە زیانەکانی لەئەنجامی نۆبەراسیۆن دژی ولاّتانی بەرهەمهێنی نەوت وەك شێوەی بەرگریکردن، پەرێشانی زیاتر بۆ پاراستنی ئەمباری نەوت بەبەراورد بەگەمارۆی نەوت لەلایەن عەرەبەکانەوە دروست دەکات. لەدوای ئەمجۆرە دەستێوەردانە پرهەروهۆریایە ناسەواری درێژخایانی بەدوادا هات، لەراستیدا هەتا ناماژەکان بۆ ئەوەیە کە ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەوانەبوو پەنا بۆ ئەم کارە بەرێت، پەیوەندیەکانی ئەمەریکا و ناوچەکەی بردە دواوە.

لەجیاتی کەمکردنەوەی ئەو مەترسیانەی لەقەیرانی نەوتەوە دروست دەبێت، لەرێگای پێدانی دادپەروەرانەی نرخی نەوت و بەجدیترگرتنی کێشەی عەرەب و ئیسرائیل، ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەموو هەوڵەکانی خستەکار بۆ رێگرتن لەنفوزی یەکێتی سۆڤێت و پەنابردن بۆ تیۆری نیکسون درێژەی پەیداکرد. قەیران لەناوچەی هەستیار پێویستی بەدروستکردنی هێزی دەستێوەردان (مداخلە) وەك تەنیا رێگا بۆ پارێزگاریکردن لەبەرژەوەندیەکانی ئەمەریکا و لەگەڵ ئەوەی هەموو شك و گومانەکان لەم بوارەدا خرایەکار، پەرەپێدانی بارودۆخی سەربازی بۆ دەستێوەردانی خێرا لەهەلومەرجی قەیراندا لەکەنداوی فارسی لە دەستوری کاردا جێگیرکرا.

لەهەلومەرجی گشتی ئاشتی نیوان زلهێزەکان، خولیای کەم بۆ دروستکردنی گۆڕانی گەورەی سەربازی دروستبوو. بەلاّم رووداوی ساڵی (۱۹۷۹) گۆڕانی بنەڕەتی لەسیاسەتی حکومەتی ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دروستکرد. سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران و پاشان هێرشی یەکێتی سۆڤێت بۆ سەر ئەفغانستان بووەهۆی ئەوەی کارتر سەرۆك کۆماری ئەمەریکا بەتیۆرێکی فەرمی، بڕیاری ولاّتی خۆی لەپەیوەندی بەپاراستنی بەرژەوەندی ولاّتەکەی لەکەنداو ئاشکرابکات. کارتر رایگەیاند:

(هەر هەوڵێك لەلایەن هێزێکی دەرەکی بۆ کۆنترۆلکردنی کەنداو، هەروەك هەرەشە بۆ سەر بەرژەوەندیە ستراتیجیەکانی ئەمەریکا سەیر دەکرێت و بەهەر رێگایەك بێت رووبەرووی دەبینەوە لەوانەش بەکارهێنانی هێزی سەربازی). راگەیاندنی کارتر لە(ئازاری ۱۹۷۸) لەکاتی پێکهێنانی (هێزی کاردانەوەی خێرا) بڕیاری لێدرا تاولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بسازێنێت بۆ چارەسەری قەیرانەکان و پیشاندانی کاردانەوەی خیرای سەربازی.

## پەیدابوونی هێزی کاردانەوەی خێرا:

ریشەکانی بلاّوبوونەوەی خێرای تواناکانی سەربازی لەهەلومەرجی دوایدا دەتوانین لەتێڕوانینی نوێی ساڵی (۱۹۷۷) لەپەیوەندی بەهاوسەنگی ستراتیجی یەکێتی سۆڤێت و ئەمەریکاوە ببینین، کە زەمینەی یاداشتی بۆ سەرلەنوێ تێڕوانینی سەرۆکایەتی کۆمار (PRM-۱۰) فەراهەم کرد. ئەم یاداشتە دواتر بەشێوەی دەستوریکاری سەرۆکایەتی کۆمار (PD-۱۸) وەك سیاسەتی فەرمی پشتگیری لێکرا.

ئەم دەستوریکارەی سەرۆکایەتیە فەرمان دەدات کە یەکەی بچوکی پیادەی سەربازی پێکبهێنرێت لەهێزی ڕاهێنراو (تدریبکراو) بە جوولەی ستراتیجی سەربەخۆ لەبارەگاکانی ئۆقیانوسەکان و بەبێ سنوردارکردنی ویستی لۆجستی و کەشتیگەلی دەریایی و هێزی تاکتیکی کە لەرۆژهەلاتی ناوەڕاست و کەنداوی فارسی و کۆریا و یان هەر شوێنێکیتر بەکاربهێنرێت پێکبهێنرێت.

لەسەرەتای (ئازاری ۱۹۷۸) کارتر ڕایگەیاند ( وەزارەتی بەرگری لەژێر فەرمانـدەیی منـدا لەحالەتی پێشکەوتندایە و وەك هێزی کاردانەوەی خێرای ئاسمانی و زەمینی و دەریایی بۆ پارێزگاریکردن لەبەرژەوەندیەکانی ئێمە لەسەرتاسەری جیهاندا دەمێنێتەوە). چوار مانگ دواتر بلاوکراوەکان بەرژەوەندی گوزارشتی بەشێکی دەستوریکاری نهێنی سەرۆکایەتی کۆماری ئاشکراکرد، کە ئەم هێزی کاردانەوەی خێرایە پێکهاتووە لە(۱۰۰,۰۰۰) سەرباز کە خاوەنی دوو گروپی گواستنەوە و گوێزانەوەی ئاسمانی و تیمی زەمینی/دەریایی لەژێر پارێزگاری دوو تا چوار کەشتی فڕۆکە هەلگر و زیاتر لەسێ گروپی هێزی ئاسمانی کە توانای (۲۰۰) فڕۆکەی سەربازیان هەیە.

هێزی هاوبەشی کاردانەوەی خێرا سەرئەنجام لە(۱ی ئازاری ۱۹۸۰) بەرژەوەندی بەرپرسیارێتی تەواو بۆ پلانـدانان و پەروەردەی هاوبەش و ڕاهێنـان و خۆئامـادەکردن بـۆ بلاوبونـەوە لەبـەرەکان و بەکارهێنانی هێزی تایبەت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەگەری هەر مەترسیەك بۆ سەر بەرژەوەندی ژیانی ئەمەریکا، کە بەفەرمی کاری خۆی ئەنجام بدات، هەرچەندە کارکردنی جیهانی هێزی کاردانەوەی خێرای دواتر سنوردارکرا لەرۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، بەلام بەرپرسیارێتی ئۆپەراسیۆنی سەربازی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەم ناوچەیە لەئەستۆی فەرماندەیی ئەوروپا و فەرماندەیی باسفیکدا مایەوە.

پشتیوانی لۆجستی وەك بەشێك لەچەمکی هێزی کاردانەوەی خێرابوو، کە دەزگای سەرۆکایەتی کارتر بە مەبەستی دانوسان و لایەنی ڕێکەوتن لەگەل ولاتانی باشووری ڕۆژئاوای ئاسیا بۆ سوودوەرگرتن لەبنکە و بارەگاکانی لەناوچەکەدا داوایان لێکردن. دانوسانەکان بە ئەندازەی فراوان بەهۆی ئارەزوونەبوونی ولاتانی ناوچەکە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئاشکرا خۆیان لەچەمکی هێزی کاردانەوەی خێرا بێئاگاکرد و تەنیا سێ ڕێکەوتننامە لەگەل عومان، کینیا و سۆمال بۆ بەکارهێنانی بنکە و بارەگاکانیان لەکاتی پێویستدا واژۆکرا. بەمجۆرە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بڕی (۱,٤) ملیارد دۆلاری لەماوەی سالانی (۱۹۸۰) بۆ باشکردنی دامەزراوەکانی حەوزی ولاتانی ئاسیای باشوری ڕۆژئاوا و ڕێگاکانی بەیەکەوە بەستنیان خەرجکرد و پرۆژە دامەزراوەکانی لەژێر چاودێری ئەمەریکا و عەرەبستانی سعودی کە بەخەرجی پارەی عەرەبستانی سعودی ئەنجامدرا و بەسوودی ئەمەریکا بوو.

لـەمانگی (ئـازاری ١٩٨٠) بنکـەی فەرمانـدەیی هێـزی کاردانـەوەی خـێرا لـەژێر فەرمانـدەیی ئامادەباشی ئەمـەریکا دامـەزرا و لـە(کانونی دووەمـی ١٩٨٣) هێـزی کاردانـەوەی خـێرا لەفەرمانـدەیی ئامادەباشی جیاکرایەوە و گۆڕا بۆ فەرماندەیی ناوەندی ئەمەریکا.

## ئۆپەراسیۆنی سەربازی فەرماندەیی ناوەندی:

لـە(کـانونی یەکـەمی ١٩٨٦) ئەفـسەری بـاڵای فەرمانـدەیی ناوەنـدی سـەبارەت بـە مێـژووی هەنگاوەکانی فەرماندەیی ناوەندی لەبەرامبەر قەیرانەکان ئاماژەی بۆ پێنج بابەت کردوە:

١) ناردنی ستراتیجی ئاواکس بۆ میسر لەسـاڵی (١٩٨٣) بـۆ ڕێگـرتن لـەکودەتا دژی سـۆدان کـە لەلایەن لیبیاوە پشتیوانی لێدەکرا.

٢)کاردانـەوەی ئـاواکس بـۆ وەڵامدانـەوەی بۆردومانـەکانی وێـستگەی ڕادیـۆیی سـۆدان لـەمانگی (ئازاری ١٩٨٤).

٣) هەڵگرتنەوەی مین لەدەریای سوردا لەساڵی (١٩٨٤).

٤) گەڕانی (سـەرنەکەوتوو) بەشـوێن ژێردەریـایی ئیـسرائیلی داکـار کـە لەسـاڵی (١٩٨٦)ەوە تـا ئەمڕۆ نادیارە.

٥) پارێزگاریکردن لەکەشتیە بازرگانەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەناوی کەنداودا.

هەر چەندە لەعەرەبـستانی سـعودیش لـە(١٩٨٠) ئـاواکس هـەبوو، بـەڵام بـەهۆی کـەمیی هێـزی ڕاهێنـراوەوە و پـشتگیرینەکردنی کۆنگرێـسی ئەمـەریکا سـودیان لێوەرنـەگیرا، بـەڵام لـەژێر چـاودێری فەرماندەیی ناوەندیدا بوون. هەروەها کوێت و عەرەبستانی سعودی سەبارەت بە ڕاهێنانی هاوبەشی هێـزی زەمینی گفتوگۆیان ئەنجامدا.

هەروەها هەموو هێزە چەکدارەکان، دەسەڵاتی فەرمانـدەیی ناوەنـدی لەڕووبەڕووبونـەوەی مەسـەلە ستراتیجیەکان بەشێوەی ئۆرە لەمانۆڕی سـەربازیدا دەخرێنـە ئەزمونـەوە. ئـەم مانۆڕانـە لەنەخشەکێـشی و مەیدانـسازی کۆمپیوتەریـەوە دەسـتپێدەکات و بـە ئۆپەراسـیۆنێك کـە هـەزاران سـەرباز لـەخۆدەگرێت کۆتاییـدێت. گـەورەترینی ئـەو چـالاکیانە مـانۆڕی ئەسـتێرەی درەوشـاوەیە. یەکـەمین مـانۆڕ لەمیـسر لـە(تـشرینی دووەم ١٩٨٠) جێبـەجێکرا کـە (١٤٠٠) سـەرباز بەشـداری تێـداکرد. مـانۆڕی ئەسـتێرەی درەوشاوە لە(١٩٨٧)، (٢٧٧٠٠) سەربازی ئەمەریکای و (١٥٣٧٥) سەرباز لە وڵاتی میـوان بەشـداربوون و بریتیبوو لە مانۆڕی هێزی چەکداری زەمینی دوو وڵات.

یەکەمین کاری فەرماندەیی ناوەندی پارێزگاریکردن بوو لەکەشتیەکی نەوتبـەری کـوێتی کـە ئـاڵای ئەمەریکای هەڵکردبوو. لەدوای ئەوەوە کریـست ئەفـسەری بـاڵای فەرمانـدەیی ناوەنـدی، لەگوزارشـتێکی خۆیدا لەساڵی (١٩٨٨) ڕایگەیاند کە:

(سالّی ١٩٨٧ سالّی کاملّبوونی فەرماندەیی ناوەندیە، ئێمە هێزەکانی خۆمان بلاّوکردۆتەوە. ئێمە مانۆڕ ئەنجام دەدەین. ئێمە کارمانکرد، ئێمە جەنگاین، لەماوەیەکی کورتی (١٢) مانگیدا تیۆرێکمان گۆڕی بۆ ڕاستی، فەرماندەیی ناوەندی بە شێوەی پێشەنگی هێزە چەکدارەکانی ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەرکەوت و لەناسیای باشووری رۆژئاوا لەژێر یەك فەرماندەییدا بوو).

## ستراتیجی ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەجەنگی عێراق ئێراندا:

ئەمەریکا هاوکات لەگەلّ گەشەکردنی فەرمانـدەیی ناوەندی هەر لەسەرەتاوە هەستیکرد بۆ پارێزگاری لەبەرژەوەندیەکانی لەناوچەکە دەبێت پەیوەندی نزیکتر لەگەلّ ولاّتانی دۆست بەپێی هاریکاری بەرفراوانی سەربازی جێگیر بکات (لەوانە ڕاهێنـان، دروستکردنی دامەزراوەکان، فرۆشتنی چەك و ...هتد). دوای هێرشی یەکێتی سۆڤێت بۆ سەر ئەفغانستان لەگەلّ گومـان و نابـاوەڕی ڕەهـا لای حکومەتەکانی ناوچەکە، هەموو جەختی ئەمەریکا لەسەر مەترسی یەکێتی سۆڤێت بوو لەناوچەکەدا، بەلاّم ناثارامیە ناوخۆییەکانی ولاّتە نەوت بەرهەمهێنەکان و نـاکۆکی ناوچەیی بەتایبەت جەنگی عێراق ئێران بەپێی ئەو لێکۆلّینەوانەی کراوە، ئەگەری وەستاندنی ناردنەدەرەوەی نەوتی زۆر زیادیکردووە.

نیگەرانی ئەمەریکا لەم بارەیەوە کە یەکێتی سۆڤێت مەبەستی بوو لەهەلومەرجی ئەوکاتەی جەنگدا، سوودوەرگرێت بۆ فراوانکردنی نفوزی خۆی لەچاوپێکەوتنێکدا کە لەئەیلولی (١٩٨٠) لەنێوان وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا و گرومیکوی وەزیری دەرەوەی یەکێتی سۆڤێت بەسترا، ئەم بڕیارە کە هەردوو ولاّت لەبەرامبەر جەنگی عێراق ئێران بێلایەن بن ئاارامیەکی پەیداکرد. لەڕاگەیاندنی هاوبەشدا ئەم ڕاستیە ڕەنگیدایەوە کە نە یەکێتی سۆڤێت و نە ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا مافی ئەوەیان نییە یارمەتی پێشکەش بەهیچ لایەنێکی شەرکەر بکەن، لەڕاستیشدا ئارەزوودەکەن لەم هەنگاوە خۆیان بپارێزن.

ڕوودانی جەنگ بەو جۆرە لەوانەبوو ببێتەهۆی تێکدان لەدابینکردنی نەوت و بیانگێڕێتەوە بۆ فشارە نابووریەکانی سالاّنی (١٩٧٠) و نیگەرانی جدی بۆ ڕۆژئاوا دروستکات. لەم ڕووەوە لەماوەی سێ هەفتە دوای سەرهەلّدانی جەنگ نزیکەی (٦٠) کەشتی جەنگی ڕۆژئـاوا کـە گروپی کەشتیگەلی ئاسمانی ئەمەریکا تێدابوو نێردران بۆ ناوچەکە. لەڕاستیدا لەگەلّ ئەوەی بەندەری نەوتی عێراق لەفاو و گەمارۆدانی کەشتی دەریایی بۆ قەدەغەکردن و نەگەیشتنی عێراق بە ئاوەکانی کەنداو لەلایەن ئێرانەوە، دابینکردنی نەوتی بەشێوەی گشتی خستەژێر کاریگەریەوە و زۆربەی کەشتیە هاتووەکان گەڕانەوە.

نیگەرانی جدی کە لەسالّی (١٩٨٢) دووبارە دەرکەوتەوە کاتێك بوو کە ئێران دوای دەرپەڕاندنی عێراق لەخاکەی خۆی و پێشڕەویکردنی بۆ نـاو خـاکی عێراق دەستیپێکرد. ئەم نیگەرانیە کە ئێران دەتوانێت عێراق بشکێنێت، ئەمە یەکەم هەنگاوبوو بۆ ئێران کە بتوانێت شۆڕشی ئیسلامی بنێرێتەدەرەوە و هەردوو زلهێزەکەی هاندا کە یارمەتیەکانیان بۆ عێراق زیاد بکەن.

لەگەڵ نیگەرانیەکانی ئەمەریکا بۆ کەمکردنەوەی نفوزی یەکێتی سۆڤێت لەکەنداو و ئاسایشی بیرە نەوتەکان، ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەولّیدەدا دەوڵەتەکانی کەنداو بەپاراستنی دیپلۆماسی و دابنکردنی چەك دڵنیا بکاتەوە. باشترین یارمەتیەك کە لەماوەی هەفتەی یەکەمی دوای هەلّگیرسانی جەنگ ئەنجامدرا وەڵامدانەوە بوو لەسەر داوایەکی عەرەبستانی سعودی بۆ پاریزگاریکردنی سەربازە ئەمەریکیەکان. چوار فروندی ئاواکس هاوڕا بە ڕاداری زەمینی و هۆیەکانی پەیوەندیکرن و (٤٠٠) کەسی ئەمەریکی بۆ بەڕێوەبردنی ڕاستەوخۆ رەوانەکران. ئەم بڕیارە خێرایە سەبارەت بەپێشنیازی فرۆشتنی (٥) فروەندی ئاواکس بە عەرەبستانی سعودی بە تێپەربوونی رێگای پێچوپەنای کۆنگرێسدا ڕوبەڕووبووەوە و سەرئەنجام بەشێوەیەکی لێبڕاو بڕیاری لەسەردرا.

هاوکاری ئاواکس لەو نیگەرانیەوە سەرچاوەیگرت، کە ئەگەر دەوڵەتە بچوکەکانی کەنداو تووشی جەنگ بن، لەوانەبوو دابنکردنی نەوت دوچاری تێکچوون ببێتەوە. بەڵام ئەم مەسەلەیە بەگشتی لەبەرچاو نەگیرا و یارمەتی کوێت و عەرەبستانی سعودی بۆ عێراق بێلایەنی ئەوان لکەدار دەکات. لەگەڵ ئەوەی یەکێك لەمەرجەکانی پارێزگاری ئاواکس ئەوەبوو کە دەوڵەتە عەرەبیەکانی کەنداو نابێت رێگا بدەن عێراق سوود لەبنکە ئاسمانیەکانی ئەوان وەربگرێت. لایەنی کەم هەندێك لەوزانیاریە بەنرخانەی لەلایەن ئاواکسەوە کۆکرابووەوە بەتێپەڕین بەسەر خاکی عێراقدا و بەرەزامەندی ئەمەریکا دروست بووە، ئەم مەسەلەیە لەمانگی مایسی١٩٨٤ لەلایەن سەدام حسینەوە پشتڕاست کرایەوە.

### جەنگی کەشتیە نەوتبەرەکان و ستراتیجی ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا:

مەترسی بۆ هاتووچۆی کەشتیەکان لەکەنداو دووبارە لەکۆتایی ساڵی (١٩٨٣) بووە جێگای سەرنجی نێودەوڵەتی، بەبیانووی ئەوەی کە ئێران هەڕەشەیکرد ئەگەر عێراق فڕۆکە نوێیە فەرەنسیەکان بەناوی (سوپر ئاتندارد Super Etendard) بەکاربهێنێت بۆ لێدانی کەشتی و دامەزراوە نەوتیەکانی ئێران، ئەوا ڕێدەگرێت لەناردنەدەرەوەی نەوت لەڕێگای کەنداو. ئەم هەڕەشەیە لەلایەن ڕۆژئاواوە زۆر بەجدی وەرگیرا چونکە ئێران تەواو وابەستەبوو بە ناردنەدەرەوەی نەوت لەڕێگای گەرووی هورمز و ناوچەکەوە کە ئەگەر ئەو دەرگایەی داخست خۆشی ناتوانێت سوودی لێوەرگرێت.

هەڕەشەکان، باسی وخواستی ئالۆزی بەدوای خۆیداهێنا، سەبارەت بە مینرێژکردنی گەرووی هورمز یان داخستنی لەڕێگا نقومکردنی کەشتیەوە.

پاش قۆناغێك لەپاشەکشێ لەبەرەکانی جەنگی عێراق ئێران، لەساڵی (١٩٨٤) ئێران سەرکەوتنی یەکبەدوایەکی بەدەستهێنا و عێراق لەحاڵەتی هەڵچونی تەواو دابوو و چاوەڕوانی هەلێکبوو بۆ گۆڕانی بارودۆخەکە.

عێراق لەژێر باری قورسی جەنگی زەمینی دوو ئامانجی لەدەسپێکردنی قۆناغی یەکەمی جەنگی نەتبەرەکان هەبوو، بۆ زەرەردان لەئابووری ئێران و ئومیدەواربوو کە پەیوەندی نێودەوڵەتی بۆ کۆتاییهێنان بەجەنگ رایکێشێت. بۆیە عێراق لەجیاتی ئەوەی بترسێت هانیدەدا بۆ ئامانجگرتن لەئەوتبەرەکان لەکەنداو و سەرئەنجام لە(شباتی ١٩٨٤) دەستیپێکرد.

ئێران هەر لەسەرەتای جەنگەوە، توانای گەیشتنی عێراقی بە کەنداو پچڕاند، بەڵام عێراق توانای نەبوو لەبارەی ناردنەدەرەوەی ئەوت هەمانکار بکات. دوای تێپەڕبوونی دوو مانگ پانزە ئەوتبەری ئێران کەوتنەبەر هێرشی عێراق، ئێران دەستی بەتۆڵەکردنەوە کرد لەکەشتیەکانی عەرەبستانی سعودی و کوێت، لەسەر ئەو بنەمایەی کە یارمەتی ئەوان بۆ عێراق ئیشانەی ئەمانی بێلایەنیانە.

لەگەڵ ئەوەی دەستپێشکەری عێراق بۆ هێرشکردنە سەر ئەوتبەرەکان، پرۆتستۆی نێودەوڵەتی لێکەوتەوە لەئەنجامی ئەو هەڕەشانەی ئێران، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا رایگەیاند کە بڕیاریداوە گەروی هورمز بەکراوەیی بهێڵێتەوە و بۆ جەختکردنەوە لەپەیامەکەی، کەشتیگەلی دەریایی خۆی دووبارە رەوانەی ئۆقیانوسی هندی کردەوە. لەهەمانکاتدا کۆشکی سپی رایگەیاندا بۆ پاریزگاریکردن لەناردنەدەرەوەی ئەوت، هێزی چەکدار هەتا ئەگەر پێویست بەهێزی زەمینیش بکات دەنێرێت بۆ ناوچەکە. لە(کانونی دووەمی ١٩٨٤) کەشتیە جەنگیەکانی ئەمەریکا لەکەنداو لەدوای گوزارشتی هێرشی خۆکوژی لەلایەن ئێرانیەکانەوە کەوتنە حاڵەتی ئامادەباشی تەواوەوە. سنوری ئاسایشی بە رووبەری (٥) میل لەدەوری کەشتیە ئەمەریکیەکان راگەیەنرا. پلانی کتوپڕی بۆ پوچەڵکردنەوەی مین و دەستەی چەکدار بۆ پاریزگاری کەشتیەکان رەوانەی بەندەرە بێلایەنەکانکرا، کە بەریتانیا رەزامەندی دەربڕی بۆ بەشداریکردن لەم رێکخستنەدا.

وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەم هەلەی قۆستەوە بۆ فشار خستنەسەر دەوڵەتە عەرەبیەکانی کەنداو و هاوکاری سەربازی زۆرتر لەگەڵیان، بەڵام رووبەڕووی بەرگری ئەوان بووەوە. لەکۆبوونەوەیەکی وڵاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو، وەزیری بەرگری کوێت، لەگەڵ ناخۆشحاڵی بۆ هێرشکردنە سەر ئەوتبەرەکان جەختیکردەوە ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو لەبەرامبەر هەر دەستتێوەردانێکی دەرەکی بەرگری دەکات لەهەر ئاستێکدا بێت، لەوەڵام بۆ تۆڵەکردنەوە لەئێران، ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو کۆبوونەوەیەکی نائاسایی سەبارەت بەوهەلومەرجە ئەرخانکرد. لەوکۆبوونەوەیەدا هەندێك نارەزایەتیان لەدەستتێوەردانی راستەوخۆی ئەمەریکا پیشاندا و لەجیاتی ئەوە داوای چارەسەریان لەرێگای ئەنجومەنی ئاسایشی سەر بە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان کرد. هەڵبەت پڕوپاگەندە هەبوو وە پێشنیاز کرابوو بۆ یارمەتی لەژێر چەتری ئاسمانیدا.

هەروەها پرۆژە بۆ باشکردن بەناراستەی پارێزگاری کردن لەنەتبەرەکان پەیوەست بەولاتە عەرەبیەکانی کەنداو لەرێگای دیاریکردنی رێگای هاتوچۆیان تا کەنارەکان و لەرێگای چەتر ئاسمانیەوە ئامادە و رێکخرا. لەگەڵ ئەوەی عەرەبەکان حەزیان نەدەکرد بەئاشکرا پەنا بۆ یارمەتی ئەمەریکا و لەژێر چەتری ئاسمانی و بەپێی نۆیەراسیۆنی ئەمەریکا و کۆنترۆڵی ئاواکس ئەنجام بدرێت. ئەنجامی راستەوخۆی پارێزگاری ئەمەریکا بۆ چەتری ئاسمانی خستنەخوارەوەی (F-٤) فانتۆمی ئێرانی لەلایەن (F-١٥) عەرەبستانی سعودی لە(٥حزیرانی ١٩٨٤) بوو، راستەخۆ لەدوای ئەم رووداوە حکومەتی ریگان بەسوودوەرگرتن لەمافی سەرۆکایەتی کۆمار رەزامەندی دەربڕی لەپێدانی موشەکی ستینگر، (٤٠٠) موشەکی ستینگر و (٢٠٠) موشەکنەنداز بەپەلە رەوانەکرا، هەرچەندە ئەمە خواستی کوێتیش بوو بەلام بۆ کوێت رەزامەندی لەسەر نەدرا.

سەرەرای پەیوەندی توندوتۆڵی لەگەڵ عەرەبستانی سعودی، ئەمەریکا پرۆژەی سەربەخۆی بۆ پارێزگاری لەکەشتوانی خستەروو، لەسەر بنەمای گوزارشتی ئازادی کارە، گەشتی رێکخراوی ئاسمانی لەبنکەکانی کەشتیە فرۆکە هەڵگرەکانی جێگیر لەباکوری دەریای عەرەبی یان لەبنکە ئاسمانیەکانی کەنداوی فارسی و پارێزەرە چەکدارەکانی کەشتیەکان، یان لێدانی بروسکەئاسا لەفرۆکەخانەکانی ئێران دەگرێتەوە. گەشتی ئاسمانی بەهۆی دوری ماوەکەی رووبەرووی کێشەی دەکاتەوە و هەروەها ئارەزوو نەبوونی حکومەتەکانی کەنداو بۆ یارمەتیدانی لەمکارەدا، ئەم هەوڵەی بێنەئەنجام کردووە.

کەشتی پارێزەکانی کەشتیگەلی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەنەگونجاو و زەرەرخوارد دادەنرێن. پارێزگاریکردن لەنەوتبەرەکان لەکاتی بارکردندا کێشەی هەبووە و پێویستی بەتۆڕی گەورەی ئامادەکرن هەیە لەکەنداودا. لێدانی فڕۆکەخانەکانی ئێران مەترسی کەوتنەخوارەوەی فرۆکەی ئەمەریکای لێدەکەوێتەوە تەنیا دەتوانێت ئەو هەرەشانەی لەئێرانەوە دەکرێت سنورداربکات. لەلێکۆڵینەوەیەکی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمەریکا سەبارەت بەرووداوەکانی (١٩٨٧ -١٩٨٨) ئەم خاڵانەی خوارەوەی دەرخستووە:

١- هەرجۆرە هەنگاوێکی ئەمنی کەهێزی نێودەوڵەتی بگرێتەوە پێویستە بەهاوپەیمانی ئەمەریکا بێت.

٢- دەوڵەتەکانی کەنداو دەبێت داوای پاراستن لەئەمەریکا بکەن.

٣- دەوڵەتەکانی کەنداو بۆ پاراستنیان لەرێگای فرۆکەوە دەبێت ئامادەکاری لەکاتی هەستیار و ئاسانکاری زەمینەی پێویست بخەنە بەردەستی ئەمەریکا.

لەگەڵ لێدانی زەنگی مەترسیداری جیهانی لەماوەی چەند مانگی یەکەمی جەنگی نەوتبەرەکان یەکسەر هەموویان تێگەیشتن کە مەترسی جدی دابینکردنی نەوت بەشێوەیەکی بەرچاو رووبەرووی جیهان

دەبێتەوە. قۆناغی یەکەمی جەنگی نەوتبەرەکان کاریگەری ئەوتۆی نەبوو، چونکە هەرچەندە کاریگەری لەسەر ئابووری ئێران هەبوو، بەلاّم عێراق چ لەزەمینەی کەمکردنەوەی ناردنەدەرەوەی نەوتی ئێران و چ لەزەمینەی لەگەیشتن بە ئامانجەکەی بۆ بەنێودەوڵەتی کردنی جەنگ بێتوانابوو.

قۆناغی دووەمی جەنگی نەوتبەرەکان لەساڵی (١٩٨٦) دەستپێکرد واتە ئەو کاتەی کە عێراق دووبارە کەوتە ژێر فشاری زۆری جەنگی زەمینی بەدوای داگیرکردنی نیمچەدوورگەی فاو لەلایەن ئێرانەوە. بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشی چاوەڕوانکراوی ئێران بۆ سەر بەسرە لەسەرەتای ساڵی (١٩٨٧) عێراق بەشێوەیەکی بەرچاو هێرشەکانی بۆ سەر بنکە ئابوورییەکانی ئێران لەوانەش نەوتبەرەکان زیادکرد. ئێران بەهێرشی موشەکی بۆ سەر عێراق وەڵامیدایەوە بەفشارهێنان بۆ گۆڕانکاری لەنۆپێك و بەزیادکردنی هەرەشەی تازەتر بۆ سەر وڵاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو بەهۆی پارێزگاری کردنیان لەعێراق بۆ سەر کەشتیە نەوتبەرەکانیان.

هەروەك چۆن جارییەکەم لەجەنگی نەوتبەرەکان دەسپێشخەری لەلایەن عێراقەوە بوو، ڕەخنەکانی ئێران لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی جارێکیتر دوبارە بووەوە. جیاوازی سەرەکی ئەم دوو قۆناغە ئەوەبوو کە ئێران لەرێگای داگیرکردنی نیمچەدوورگەی فاوەوە بالآدەستی خۆی لەجەنگی زەمینی پیشاندا. لەئەنجامدا عێراق بەشێوەی بەرچاو فشاری زیاتری لەکەنداو بەکاردەهێنا.

### پەرەسەندنی دوژمنایەتی نێوان ئێران و ئەمەریکا:

پەرەسەندنی دوژمنایەتی نێوان ئێران و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەئەنجامی سیاسەتی پێشبینیکراوی پارێزگاری لەکەشتیەکان بوو. ئێران لەئەنجامی هێرشەکانی عێراق بۆ سەر نەوتبەرەکان توانا نەوتیەکانی لەکەنداو دابەزی و کاریگەری زیانی ئابووری و دەرونی هەنگاوەکانی جەنگی لەسەر ئێران زیادیکرد. ئێران هەوڵیدا بڕیارە دانراوەکانی ئەمەریکا بۆ ڕزگاربوون لەم بارودۆخە بشکێنێت. بۆ نموونە دەتوانین ئاماژە بۆ مین ڕێژی لەناوچەکانی کەنداوی فارسی و هێرش بۆ سەر شاری کوێت کە پارێزگاریکردن لەم شارە لەئەستۆی کوێتدا بوو، هێرش بۆ سەر هەندێك کەشتی بازرگانی کوێت و عەرەبستانی سعودی کە لەلایەن کەشتیگەلی ئەمەریکا و یەکێتی سۆڤیێت پارێزگاریان لێدەکرا بکەین. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ تەمێکردنی ئێران کاردانەوەی لەبەرامبەردا پیشاندا، بەجۆرێك بارودۆخ هاتبووەپێشێ کە ئەگەری لەدەست دەرچونی کاروبار و کۆنترۆڵ نەکردنی زۆر نزیکبوو.

گرنگترین ڕووداوێك کە ڕوویدا شەری کەشتیگەلی دەریایی بوو لە(نیسانی ١٩٨٨)دا، کەشتیگەلی ئەمەریکا بەشێکی زۆری کەشتیگەلی ئێرانی لەناوبرد و لەلایەن کەشتی جەنگی (فینسیس Vincenns)ەوە فڕۆکەیەکی ئەفەربەری ئێران خرایە خوارەوە. هەرچەند ئەمەریکیەکان ڕایانگەیاند لەلێکۆڵینەوەکاندا دەرکەوتووە کە بەهەڵە ئەم کارە کراوە و فڕۆکە ئەفەرەبەرەکەیان بە فڕۆکەی جەنگی

زانییوە. بەڵام جێگای سەرسامبوونە کە هەڵەیەکی وا لەهەلومەرجی گرژی و تاڵۆزی ناوچەکەدا لەلایەن پارێزەرە نەوتبەرەکانەوە ڕوویدات.

ئەمانە و هەموو پێکدادانەکانیتری نێوان وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ئێران بووەهۆی تێکچوونی لەرادەبەدەری بارودۆخەکە لەکەنداودا، ئەمش بووەهۆی ئەوەی مەترسی لەناکاو بۆ ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی دروست بکات. بۆ نموونە ئێران لەبەرامبەر هێرشی مانگی نیسانی ئەمەریکا، هێرشی کردە سەر سەکۆی نەوتی ئیمارەتی عەرەبی کە لەژێر چاودێری ئەمەریکا و نەوتبەری بەریتانیادا بوو.

لەو هەلومەرجەی سەرەوەدا ئێران لەبارودۆخێکی زۆر دژواردا بوو. لەئەنجامی گۆشەگیرکردنی نێودەوڵەتی، فشاری کەم لەسەر وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ سنووردارکردنی چالاکیەکانی، هەتا لەهەلومەرجی دەرکردنی بڕیاری (٥٩٨)دا فشاری زۆر خرایە سەر ئێران. عێراق دەیتوانی کۆنترۆڵی تەواوی خۆی لەجەنگی نەوتبەرەکان بەدەست بێنێت، چونکە ئێران لەوەزیاتر توانای ڕێگرتنی لەهێرشی عێراق یان هاوپەیمانەکانی نەبوو، وە پارێزگاریکردنی نێودەوڵەتی گیانی تازەی بەخشی بە چالاکیەکانی عێراق لەجەنگی زەمینیدا و ئێرانی توشی پاشەکشی یەکبەدوایەك کرد.

ئێران لەساڵی (١٩٨٧) بەدواوە خەریك بوو ڕێکەتنی سەبارەت بەدانوسان لەسەر بڕیاری (٥٩٨). لەدوای لاوازبوونی معنەویەتی ئێران و هەروەها تێکشکاندنی لەمەیدانی جەنگ و کەوتنەخوارەوەی فڕۆکەی مەدەنی لەتموزی ساڵی (١٩٨٨) بڕیاری (٥٩٨)ی قبوڵ کرد.

**داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراقەوە:**

جەنگی عێراق ئێران کە لەڕۆژی (١٨ تەموزی ١٩٨٨) کۆتایی پێهات*، لەوکاتەدا هیچ کەس نەیدەتوانی پێشبینی بکات کە ئەم مێژووە سەرەتای سەرهەڵدانی قەیرانێکی تازەیە لەکەنداودا، لەجەنگی عێراق ئێراندا، بەغدا توانی شوێنپێی خۆی لەکەنداو بەدەستبێنێت یان بەهۆی گەمارۆدانی لەناو وشکانیدا، فراوانی بەدەستبێنێت و بەناماڤجە ناشکراکەی خۆی بگات. ڕاستەوخۆ لەدوای کۆتاییهاتنی جەنگ لەگەڵ ئێراندا ڕووبەڕووی تەنگژەی دارایی بووەوە، بەهۆی کێشەی دارایی و فاکتەری ترەوە (کە لەدرێژەی باسەکەدا ڕوونیدەکەینەوە)، عێراق بۆ گەیشتن بە ئامانج و چارەسەری هەموو کێشەکانی بیری لەداگیرکردنی کوێت دەکردەوە.

لەبەرئەوە هێزە چەکدارەکانی عێراق لە(ڕۆژی پێنج شەممەی ٢ ئابی ١٩٩٠) سنوری کوێتیان بەزاند و ئەم وڵاتەیان لەماوەی چەند کاتژمێرێکدا داگیرکرد. حکومەتی عێراق دوای داگیرکردنی کوێت

---

*) جەنگی عێراق ئێران لە (١٩٨٨/٨/٨) کۆتاییهات. نەك لەو بەروارەی سەرەوەدا ، بەڵام پێموایە نوسەر بۆیە ئەو ڕۆژەی نوسیوە چونکە لەو ڕۆژەدا ئێران ڕازامەندی لەسەر بڕیاری (٥٩٨) دا کە سەرەتابوو بۆوەستانی جەنگی عێراق ئێران . وەرگێڕ.

حکومەتێکی بەناوی حکومەتی ئازاد لەم وڵاتەدا پێکهێنا، بەڵام دوای چەند ڕۆژێك ئەو حکومەتەی هەڵوەشاندەوە و لە(٨ ئابی ١٩٩٠) کوێتی بەفەری لکاند بە عێراقەوە وەك پارێزگای نۆزدەیەم ڕایگەیاند.

هێرشی قورس و بروسکە ئاسای هێزەکانی سوپای عێراق بۆ سەر خاکی کوێت لەدووی ئابدا یەك ڕۆژ دوای ئەوە بوو کە دانیشتنی هاوبەشی دەستەی نوێنەرایەتی عێراق و کوێت لەجەددە سەبارەت بە تۆمەتبارکردنی کوێت لەلایەن عێراقەوە بێئەنجام کۆتایی هاتبوو. عێراقییەکان کوێتیان بەوە تۆمەتبار دەکرد کە نەوت بەهەرزان دەنێرێتە دەرەوە و بیری ناپاسایی لەحەوزی ڕمێلە لێداوە بۆ دزینی نەوتی عێراق.

سەدام حسین لەداواکارییەکانی بۆ چارەسەری کێشەکانی نێوان هەردوو وڵات پەنای بۆ سێ شت برد:

١- چارەسەرکردنی ناکۆکیە سنورییەکان لەگەڵ کوێت بەتایبەت لەدەوروبەری حەوزی بیرە نەوتی ڕمیلە کە بۆتە جێگای ناکۆکی هەردوولا.

٢- ڕێگەدان بەبەکارهێنان یان بەکرێدانی هەردوو دورگەی (وەربە و بۆبیان) لەلایەن عێراقەوە وەك ڕێگای کراوە بۆ ئاوئاوی کەنداو.

٣- چارەسەری کێشە ئاشکرا و کەڵەکەبووەکانی سەر عێراق کە بەهۆی جەنگی لەگەڵ ئێران سەریهەڵدا بوو. بەواتا چاوپۆشین لەگێڕانەوەی قەرزەکان و پێدانی (١٠) ملیارد دۆلاریتریش وەك یارمەتی بۆ ئابووری عێراق.

بە بڕوای چاودێران، عێراقیەکان لەهێرشیان بۆ سەر کوێت چەند ئامانجێکی سەرەکیان هەبوو. لەوانە چارەسەری کێشەی سنوری دێرین لەگەڵ کوێت لەڕێگای زۆرداریەوە، بەرزکردنەوەی نرخی نەوت، کارکردن بۆ دەسەڵاتداری بەسەر جیهانی عەرەبیدا، ڕزگاربوون لەوقەرزە زۆری کوێت (کە لەلایەن دەسەڵاتدارانی کوێتەوە پێشکەش بەرژێمی بەعسی کرابوو). بەڵام زۆر لەلێکۆڵەرەوانی سیاسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەوباوەڕەدان کە عێراق دوای (٨) ساڵ جەنگ و زەرەرو زیانی زۆری ئابووری بەهیچ جۆرێك نیدەتوانی لەڕێگای ئەو کەمەنەوتەی دەینێرێتەدەرەوە لەوبارودۆخە سەختە ڕزگاری بێت و ئابوورییە شێواوەکەی ڕێکبخاتەوە. پسپۆرێکی ئەمەریکا شارەزا لەبواری ئابووری ووتبووی عێراق لەڕێگای ناردنەدەرەوەی نەوت دوای هەشت ساڵ جەنگ هەتا ناتوانێت بەشی پێویستیەکانی خۆی بکات. بە بۆچوونی بەرپرسانی بەعسی عێراق، داگیرکردنی کوێت و زەوتکردنی نەوتی ئەو وڵاتە لەژێر پەردەی عێراقی بوونی ئەو وڵاتە چارەسەری سەرەکی ئەم کێشەیە.

لەبەرئەوە سەدام حسین لەماوی چەند کاتژمێرێکدا خەونەکەی هێنایە دی و دەستیگرت بەسەر نزیکەی (٢٠٪) یەدەگی نەوتی جیهاندا و لەساڵێکدا دەیتوانی (١٢) ملیارد دۆلار بۆ خەزێنەکەی زیاد بکات. وە لەوماوەکورتەدا توانی (٢٠٠کم) لەکەنارەکانی کەنداو بەدەست بهێنێت.

بەرواڵەت سیاسەتی عێراق لەکوێت ئەوندە بۆ دەسەڵاتدارانی عێراق گرنگ بوو کە ئەوان لەناکاو لەهەموو خواستەکانیان کە (٨) ساڵ لەپێناویدا جەنگین لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێراندا، سەدان هەزار سەربازیان لەدەستداو زیانی دارایی و ئابووری گەورەیان پێکەوت چاوداخەن و هەوڵبدەن هەموو ناکۆکیەکانیان لەگەڵ ئێران کۆتایی پێبهێنن، بەجۆرە رژێمێك کە بەوەرگرتنی گەورەترین یارمەتی دارایی و چەك و ڕاگەیاندن لەئەمەریکا و ئەوروپای رۆژئاوا (لەوانە فرۆکەی جەنگی دوورەفڕ و سەدەها موشەکی فەرەنسی و کارگەی دروستکردنی چەکی کیمیایی بگرە تادەگات بە کارخانەی پیتاندنی یۆرانیۆم و تەکنەلۆجیای ئامادەکردن و ئاراستەکردنی هێزی بزوێنەری موشەکەکانی ئەورویی و رووسی) کەوتبووە گیان شۆڕشی ئیسلامی ئێران بەهەمان شێوە و دڵفراوانیەوە کەوتە جەنگەوە لەگەڵ ئەربابانی پێشووی خۆی. هەروەها وڵاتانی عەرەبی کەنداو بەتایبەت خانەوادەی ئال صباح کە لەماوەی چەند کاتژمێرێکدا رووخابوون گەورەترین یارمەتیدەری رژێمی عێراق بوون لەماوەی جەنگی عێراق ئێراندا پارێزگاریان لەسنوربەزاندنەکانی عێراق دەکرد. ئەمجارە کەوتە گیانی ئەوان و فراوانخوازی و سنوربەزێنی لەناوچەکەدا.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەو فاکتەرە جۆراوجۆرانە بکەین کە کاریگەریان لەسەر سیاسەتی دەرەکی عێراق سەبارەت بە داگیرکردنی کوێت هەیە. هەرچەندە پلەی کاریگەری هەموو فاکتەرەکان لەسەر سیاسەتی دەرەکی حکومەت عێراق پەیوەست بەداگیرکردنی کوێتەوە وەك یەك نەبووە، بەڵکو هەندێك فاکتەر رۆڵی سەرەکی بینیوە و هەندێکیتریان رۆڵی کەمتری بینیوە و پلەی کاریگەریەکەیان دەگۆڕێت.

هەرچۆنێك بێت گرنگترین فاکتەرێك کە کاریگەری لەسەر دارشتن و جێبەجێکردنی سیاسەتی دەرەکی عێراق لەبواری داگیرکردنی کوێت هەبووە بریتیەلە: شوێنی جوگرافی، سەرچاوەی سروشتی، رۆڵی رابەری، توانای سەربازی، گرفتی دارایی و سیستەمی نێودەوڵەتی.

عێراق بۆ گەیشتن بە دەریا لەڕووی شوێنی جوگرافیەوە باروودۆخێکی گونجاوی نییە. خاوەنی سێ بەندەرە بە ناوەکانی (بەسرە، ئوم قەسر و فاو) لەسەر کەنداو، کە ئەم سێ بەندەرە هەرسێکیان لەڕووی بەکارهێنانەوە لەلایەن عێراقەوە سنووردار، لەکاتی سوود لێوەرگرتنیاندا عێراق توشی گرفت دەکات، هەروەها عێراق بەهۆی کەمی ڕووبەری کەنارەکانیەوە پێگەیەکی باشی نییە بۆ دامەزراندنی بەندەری تازە، درێژی کەنارەکانی ئەم وڵاتە لەسەر کەنداوی فارسی نزیکەی (٥٥کم) دەبێت. لەناو (٨) وڵاتی سەر کەنداو کەمترین سنوری ناوی هەیە.

لەبەرئەوە بەداگیرکردنی کوێت یان لایەنی کەم داگیرکردنی دورگەی (وەربە و بۆبیان) وەك ناوچەکی گرنگی ستراتیجی، درێژی کەنارەکانی عێراق زیاددەکات و لەمکاتەدا عێراق دەتوانێت ببێتە خاوەنی بەندەری هەمەجۆر لەئاوی قوڵدا لەناو کەنداودا. باڵادەستی بەسەر دورگەکانی ناوبراو یان هەموو خاکی

کوێتدا ئەو توانایە بەعێراق دەبەخشێت کە هێزی دەریایی بەتوانا لەکەنداودا دابمەزرێنێت و ڕۆڵی گرنگتر لەناوچەکەدا ببینێت.

هەڵبەت لەساڵی (١٩٨٤) دوای ئەوەی کە هێزەکانی ئێران چونەناو خاکی عێراقەوە، فشاری حکومەت عێراق لەسەر کوێت بۆ پێدانی ئەو دوو دورگەیە و مۆڵەتدانی جێگیرکردنی هێزی سەربازی ئەم وڵاتە لەسەر دورگەی بۆبیان زیادیکرد، کە کوێت ناچاربوو لەوبارودۆخەدا ڕازیبێت بەجێگیرکردنی هێزی عێراق لەسەر دورگەی بۆبیان و هێزەکانی عێراق لەسەر ئەم دورگەیەوە هێرشیان کردەسەر هێزەکانی ئێران لەنیمچەدورگەی فاو.

سەرەرای ئەو بابەتانەی سەرەوە سنورە جوگرافیەکانی عێراق و کوێت لەدیاریکردنی سیاسەتی دەرەکی عێراقدا ڕۆڵی گرنگ دەبینن، ئەم سنورانە بەشێوەی بەردەوام هۆکاری دروستبوونی گرژی و ئالۆزیە لەپەیوەندیەکانی نێوان ئەم دوو وڵاتەدا، سنورەکانی نێوان عێراق و کوێت پێش ئەوەی زادەی بەرهەمی واقعی ناوخۆی ئەو دوو وڵاتە بێت، ڕەنگدانەوەی بەرژەوەندی دەوڵەتی بەریتانیا بووە، بەجۆرێك لە دیاریکردنی سنوری نێوان ئەم دوو وڵاتە، تایبەتمەندی جوگرافی و سروشتی و فەرهەنگی لەبەرچاو نەگیراوە، عێراق چەندینجار هەوڵیداوە بەپەنابردن بۆ زەبروزەنگ ئەم سنورە دەسکردە لەناوبەرێت، لەم بوارەدا دەتوانین ئاماژە بۆ سنوربەزاندنەکانی عێراق بۆ سەر کوێت لە(ئازاری ١٩٧٣، ئەیلول ١٩٧٦ و سەرەتای ساڵی ١٩٧٧) بکەین. داگیرکردنی کوێت لە(٢ی ئابی ١٩٩٠) لەم بوارەوە سەرچاوەیگرت. تاریق عزیز وەزیری دەرەوەی عێراق لەڕونکردنەوەیەکدا سەبارەت بەداگیرکردنی کوێت لە(٢ ئاب ١٩٩٠) دەریخست کە: (عێراق مافی ئەوەی هەیە هێرش بکاتە سەر کوێت، چونکە کوێت تاساڵی ١٩١٣ بەشێك بووە لەعێراق و ئەمە ئینگلیزەکان بوون کە ئەم خاکەیان لەعێراق دابڕی و ڕژێمێکی ساختەی بەدەستی شێخە لێکەوتەکان لێرە دامەزراند).

گرنگترین فاکتەرێك کە کاریگەری تارادەیەك جێگیری لەسیاسەتی دەرەوەی عێراق سەبارەت بەکوێت هەیە، بوونی دەرامەتی سروشتیە، یەکەم ناردنەدەرەوەی نەوت و دووەم بوونی یەدەگیی گەورە و دەوڵەمەندی نەوت لەکوێتدا.

سەبارەت بەناردنەدەرەوەی نەوت ڕابەرانی عێراق وارادەگەیەنن کە ڕێگایەکی دڵنیایان نییە بۆ ناردنەدەرەوەی نەوتی خۆیان. لەبەر ئەوە کوێتیان خستۆتە ژێر فشاری خۆیانەوە کە بەشێك لەخاکی خۆی بخاتە خزمەتیان بۆ دامەزراندنی ترمینالێك یان بەندەرێکی نەوتی، کە لەدانوسانەکانی (جدە)دا لە(تەموزی ١٩٩٠) جارێکیتر ئەم داوایەیان دووبارەکردەوە، بەڵام چونکە کوێت دژی ئەم داوایە بوو بۆیە کاریانکرد بۆ داگیرکردنی هەموو خاکی کوێت و لکاندنی بەعێراقەوە.

بوونی یەدەگێکی زۆری نەوت لەکوێت و زۆری بەرهەمی نەوت و دەرامەتی کوێت، ئەمانە وایان لەسەرکردەکانی عێراق کرد چاوبڕنە ئەم وڵاتە. {داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراقەوە بەناکۆکی هەردوو وڵات لەسەر مەسەلەی نەوت دروستبوو؛ عێراق لەتەموزی ١٩٩٠ ڕایگەیاند کە حەوزی نەوتی ڕمیلە کەتۆتە ناو خاکی کوێتەوە و لەبنەڕەتدا سەر بەعێراقە و کوێتی تاوانبارکرد بەدزینی نەوتی ئەم ناوچەیە و داوای (٢,٤) ملیارد دۆلار وەك پێبژاردن کرد. هەروەها عێراق کوێتی تاوانبارکرد لەڕێگای زیادکردنی بەرهەمی نەوتەوە نرخی نەوتی دابەزاندووە لەبازاڕدا نزیکەی (١٤) ملیارد دۆلار زەرەری لەم وڵاتەداوە. ئەم بڕە پارەیە یەکسان بوو بەوپارەیەی کە کوێت لەجەنگی عێراق ئێران پێشکەشی عێراقی کردبوو. عێراق دەیویست لەم ڕێگایەوە کوێت ناچار بکات چاو لەوقەرزەی بەعێراقی دابوو بپۆشێت و بڕە نەوتی ڕمیلەش ببەخشێت بەعێراق.

بەشێوەی گشتی کوێت خاوەنی (١٠٪) ی یەدەگی دڵنیایی نەوتی جیهانە. لەبەرئەوە بە داگیرکردنی، عێراق دەبێتە خاوەنی (٢٠٪) یەدەگی جیهان. بەرهەمی نەوتی کوێت لەساڵی (١٩٨٩) زیاتربوو لە(١,٦)ملیۆن بەرمیل لەڕۆژێکدا، لەگەڵ بەرهەمی نەوتی عێراقدا دەگاتە (٤,٥) ملیۆن بەرمیل لەڕۆژێکدا، ئەمە وادەکات دەرامەتی عێراق بە شێوەیەکی بەرچاو زیادبکات و وا لەعێراق دەکات لەکاروباری نێودەوڵەتیدا ڕۆڵی گرنگ بگێڕێت}.

سەبارەت بەرابەریش، یەکێك لەئارەزووە کۆنەکانی سەدام حسین سەرکردایەتیکردنی جیهانی عەرەبی بوو، سەدام حسین وایهەست دەکرد کە عێراق تەنیا وڵاتە کە خاوەنی هێزی سەربازیە بتوانێت ئیسرائیل بگرێت و ببێتە باڵادەستی سیاسی و سەربازی لەناوچەکەدا، ئەگەر عێراق لەداگیرکردنی کوێتدا سەرکەوتووبێت دەبێتە سەرکردەیەکی بێبەرامبەر لەجیهانی عەرەبیدا.

فاکتەرێکیتر کە ڕۆڵی گرنگی بینیوە لەداڕشتن و جێبەجێکردنی سیاسەتی دەرەکی عێراقدا، توانای سەربازی عێراق بووە، عێراق لەجەنگ دژی ئێران بەیارمەتی وڵاتانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات و ڕژێمە دەوڵەمەندەکانی باشوری کەنداو گۆڕا بۆ هێزێکی سەرەکی لەناوچەکەدا، جبخانەی خۆی بەشێوەیەکی بێوێنە پەرەپێدا و هێزێکی سەربازی گەورەی دامەزراند بەجۆرێك کە {عێراق لەساڵانی (١٩٨٣-١٩٨٥) بەبەهای زیاتر لە(٨٤) ملیارد دۆلار چەك و کەلوپەلی سەربازی کڕیبوو کە (٤٢) ملیاردی لەیەکێتی سۆڤێت و (١٦,٥) ملیارد لەفەرەنسا کڕی بوو}، {عێراق لەساڵی (١٩٨٤) چوارده ملیارد دۆلاری بۆ کڕینی چەك تەرخان کردبوو کە دەکاتە نیوەی داهاتی نەتەوەیی ئەو وڵاتە و لەماوەی چەند ساڵی داهاتوودا بووە گەورەترین هاوردەی چەك لەجیهاندا لەوماوەیەدا نزیکەی لە(١٠٪) فرۆشی چەکی جیهانی بۆخۆی بردبوو}، {بۆیە لەکۆتایی جەنگدا خاوەنی یەك ملیۆن سەرباز و زیاتر لە(٥٠٠) فڕۆکەی جەنگی، (٥٥٠٠) تانك، (٣٥٠٠) تۆپ، (١٦٠) هلیکۆپتەر و سەدەها موشەکی مامناوەند و کورتەودا بوو،

سەرەڕای ئەوە سەدام بەیارمەتی دەرەکی جبەخانەی گەورەی چەکی کۆکوژی کیمیایی و موشەکی بالستی دروستکرد، بەپێی گوزارشتێکی کەناڵە ڕاگەیاندنەکانی ڕۆژئاوا، چەکی بایۆلۆجی ئەم وڵاتە بەئەندازەی چەکی ئەتۆمی پێشکەوتوو بووە، لەڕووی چۆنایەتیەوە ئەم سوپایە لەماوەی (٨) ساڵی جەنگی لەگەڵ ئێران تاقیکردنەوەی زۆر فێربووە و ئەزموونی کردووە، بەدەستهێنانی توانای سەربازی لەوناستەدا وای لەسەرکردەکانی عێراق کرد کە بڕوابێنن بەوەی کە دەتوانن کوێت داگیر بکەن، هەلومەرجی خۆیان چ لەڕووی سەربازی و چ لەڕووی ئابووری لەناوچەی کەنداو بەسەر ئەوانیتردا بسەپێنن}.

فاکتەری گرنگ و ئەساسیتر لەگرتنەبەر و ئاراستەکردنی سیاسەتی دەرکی عێراق و داگیرکردنی کوێتدا کە کاریگەری هەبوو، بارودۆخی ئابووری عێراق بوو لەدوای کۆتایی هاتنی جەنگ، بە پێچەوانەی ئێرانەوە کە لەهەموو جۆرە یارمەتیەکی دەرەکی بێبەش بوو، داواکاریەکانی عێراق لەلایەن دۆستان و هاوپەیمانەکانیەوە دابیندەکرا، بووە هۆی ئەوەی کە لەدوای کۆتاییهاتنی جەنگی عێراق ئێران {بارودۆخی دارایی عێراق کارەساتبار بوو، چونکە لەسەرەتای جەنگ لەگەڵ ئێران، عێراق خاوەنی (٣٠) ملیارد دۆلار پاشەکەوت بوو، بەلام دوای (٨) ساڵ بە (١٠٠) ملیارد دۆلار قەرزەوە لەجەنگ هاتەدەرەوە} بۆیە پێویستی زۆری بەپارەبوو. سەرکردەکانی عێراق بۆ دابنکردنی پێویستیەکانیان پەنایان بۆ دوو ڕێگاچارە دەبرد. یەکەم ئەوەی کە وڵاتە عەرەبیە نەوتیەکانی کەنداو ناچارکەن کە چاو لەبەشێکی زۆری ئەو قەرزانەی پەیوەستە بەجەنگی عێراق ئێرانەوە بپۆشن، دووەم ئەوەی کە ئۆپێك ڕازیبکەن کە نرخی هەر بەرمیلە نەوتێك بۆ (٢٢) دۆلار بەرزبکاتەوە تا عێراق بتوانێت سەرمایەی پێویست بۆ بنیاتنانەوەی وڵات و قەرەبووی ئەو گورزە ئابووریە بکاتەوە کە بەهۆی جەنگەوە بەری کەوتبوو.

قایلنەبوونی عەرەبستانی سعودی و کوێت و ئیماراتی عەرەبی کە سێ دۆست و هاوپەیمانی عێراق بوون لەکاتی جەنگدا، بە پێشنیازەکەی عێراق، تووڕەیی ئەم وڵاتەی زیادکرد، بۆیە هەرسێ وڵاتی ناوبراو کە خاوەنی دانیشتوانی کەم و دەرامەتی زۆری نەوتن بە وڵاتی دەوڵەمەندی کەنداو دەژمێردرێن و لەژێر فشاری سیاسیدا ئامادەی هاوکاری و پێشنیارەکانی عێراق نەبوون. لێرەوە هەستدەکرێت کە بۆچی سەدام حسێن لەوتارێکیدا بە بۆنەی (٢٢) ساڵ ڕۆژی هاتنە سەر حکمی حیزبی بەعس لەعێراق هێرشی کردە سەریان و ووتی (لەکاتێکدا عێراق بە هەموو توانایەوە بەرگری لەوسێ وڵاتە کردووە و یەکێك لەهۆیەکانی جەنگ لەگەڵ ئێران بۆ بەرگریکردن بووە لەوان، بەلام ئەم وڵاتانە لەجیاتی سوپاس لەپشتەوە خەنجەر لەعێراق دەدەن) بەبۆچوونی سەرکردەکانی عێراق ئەماعی ئیستعماری ئەمەریکا لەوەدایە کە دەست بگرێت بەسەر نەوتی هەرزانی کەنداو و عێراق بەلاوازی بهێڵێتەوە، بەمجۆرە هێرشی عێراق بۆ سەر کوێت لەدیدی سەرکردەکانی عێراقەوە بە تەواوی هەستی پێدەکرا و دەیتوانی کێشە داراییەکانی عێراق چارەسەر بکات.

فاکتەرێکیتر کە هەم کاریگەری لەسەر سیاسەتی دەرەکی عێراق هەبوو، سیستەمی نێودەوڵەتی بوو. لەراستیدا پاریزگاریکردن لەلایەن زلهێزەکانەوە لەسیستەمی دوو جەمسەریدا لەسەدام حسین لەکاتی هێرشکردنی بۆ سەر ئێران، ئەو بۆچوونەی لەلای ئەو دروستکرد کە داگیرکردنی کوێت کێشەیەکی ئەوتۆی بۆ دروستناکات. لەکاتێکدا سیستەمی نێودەوڵەتی لەسەرەتای دەیەی هەشتاکان، کە عێراق هێرشیکردە سەر ئێران تەواو جیاواز بوو لەسیستەمی نێودەوڵەتی سەرەتای نەوەتەکان، چونکە سیستەمی نێودەوڵەتی لەم سەردەمەدا لەشێوەی دوو جەمسەریەوە بۆ چەند جەمسەری گۆرابوو. لەسیستەمی نێودەوڵەتی فعلیدا (سیاسەتی رووبەرووبوونەوە) گۆرابوو بۆ (سیاسەتی هاوکاری و لێکترتێگەیشتن). لەبەرئەوە هێزی مانۆرەکانی عێراق سنوردار بووبوو. بۆ نموونە یەکێتی سۆڤێت کە یەکێك بوو لەهاوپەیانە کلاسیکەکانی عێراق دابینکەری سەرەکی چەك و پێویستی سەربازی عێراق بوو، لەسەرەتای داگیرکردنی کوێت سیاسەتی خۆی بەوجۆرە دانا کە گۆرانکاریەکانی قەیران هەر چۆنێك بێت، بۆ هاوکاریە تازەکانی ئەم وڵاتە لەگەڵ رۆژئاوا مەترسی دروست ناکات. بەگوزارشتێکیتر سیاسەتی لێکنزیك بوونەوەی لەگەڵ رۆژئاوای لاپەسەندتر بوو وەك لەپەیوەندیەکانی لەگەڵ عێراقدا. فەرەنساش کە یەکێکیتربوو لەپاریزەرانی عێراق لەجەنگ دژی ئێراندا و بە دووەمین دابینکەری کەلوپەلی جەنگی بۆ ئەو وڵاتە دەژمێردرێت، سیاسەتی خۆی هاوئاهەنگ کرد لەگەڵ ئەمەریکا لەبەرامبەر داگیرکردنی کوێتدا. بەشێوەیەکی گشتی هەموو زلهێزەکان داگیرکردنی کوێتیان لەلایەن عێراقەوە و لکانی بەخۆیەوە پرۆتستۆ کرد و داوای کشانەوەی هێزەکانی عێراقیان کرد لەناوخاکی کوێت و گێرانەوەی ئازادی سەربەخۆییان بۆ ئەو وڵاتە دەکرد، تا ئەوکاتە هیچ رێکەوتنێکی لەسیستەمی نێودەوڵەتیدا بوونی نەبوو.

## هەوڵە سیاسیەکانی ئەمەریکا دژی عێراق:

ماوەی نێوان جەنگی یەکەمی کەنداو (جەنگی عێراق ئێران) و سەرەتای جەنگی دووەمی کەنداوی (هێرشی عێراق بۆ سەر کوێت) و دەستپێکردنی گەردەلوولی بیابان، لەلایەن ئەمەریکاوە دەتوانین بەقۆناغی هەوڵی سیاسی ئەمەریکا لەناوچەکە دژ بەعێراق بژمێرین، قۆناغێك هاتەپێش کە بەدگومانی هەردوو لا ئەمەریکا و عێراق گەیشتە لووتکە.

رووداوێکی گرنگ کە لەم قۆناغە ئالۆز و نادیارەدا روویدا ئەوەبوو کە رێك دوو کاتژمێر پێش چاوپێکەوتنی سەعدون حمادی جێگری سەرۆك وەزیرانی عێراق لەگەڵ جورج شولتز وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا لە(٨ی ئەیلول ١٩٨٨) وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا بە فەرمی لەقسەکانیدا عێراقی تاوانبارکرد بەبەکارهێنانی چەکی کیمیایی دژی کوردەکانی وڵاتەکەی خۆی، لەمانگی ئابی هەمان ساڵدا و ئەمکارە بووە جێگای رەخنە. ئەم قسەیە کاتێك کرا کە هاوکاتبوو لەگەڵ ئەو قسە و باسانەی کە عێراق لەکۆتایی

جەنگ لەگەڵ ئێراندا، لەھەڵەبجەش چەکی کیمیایی بەکارھێناوە. ھەڵبژاردنی ئەوکاتە بۆ ھێنانەوەی ئەو تاوانە بەلای عێراقەوە زۆر سەیروسەمەرە بوو.

( بۆ ئەم ھەنگاوەی ئەمەریکا دەتوانین دوو بەڵگە بخەینە روو: یەکەم جورج شولتزیش وەك ھینری کیسنجر بەئاشکرا و نهێنی ھەوڵ و خۆشەویستی بۆ ئیسرائیل ھەبوو. دووەم ئەوەی کە زۆر لەوڵاتانی ناوچەکە بەتایبەت ئیسرائیلی دۆست و ھاوپەیمانی ئەمەریکا، نیگەران بوو لەھێزی سەربازی عێراق کە خاوەنی یەك ملیۆن سەرباز و چەکی کیمیایی و موشەکی دورمەودابوو کە بەبۆچوونی ئەوان ئاسایشی ناوچەکە لەمەترسیدایە.

لەرووی ستراتیجیەوە گرنگترین ئەنجامێك کە سەلمێنرابوو ئەوەبوو کە ئیسرائیل خۆی بۆ رێگرتن لەھێرشێکی لەناکاوی عێراق ئامادەکردبوو. لەم رووەوە سالینجر ئەم بابەتەی بەباشی شیکردۆتەوە (عێراق لەکاتی جەنگ لەگەڵ ئێراندا دڵنیابوو لەوەی کە لەپارێزگاری و یارمەتی فراوانی ئابووری/سەربازی رۆژئاوا سوودمەند دەبێت و ئەمەریکاش لەوباوەڕەدابوو کە عێراقێکی بەھێز فاکتەری جێگیری و ئارامیە لەناوچەکەدا) ھەڵەی ئەم بۆچون و لێکدانەوەیە دوایی دەرکەوت و ئیسرائیل تێگەیشت کە دوژمنی دێرینی کە عێراقە پەیوەندی دۆستانەی لەگەڵ ھاوپەیمانە رۆژئاواییەکانی بەتایبەت ئەمەریکا بەستووە و لەھەموو جۆرە پشتیوانیەکی دارایی/سەربازی ئەوان سوودمەندە. بۆیە لەوانمیە ئیسرائیل ھۆشیاری دابێت بەئەمەریکا کە عێراقێکی خاوەن چەك نەك فاکتەری جێگیری و ئارانی نییە، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئارامی و ئاسایشی ناوچەکە دەخاتە مەترسیەوە. ئەوەبوو ئەمەریکا رازیبوو کە سەنگەری خۆی بگۆڕێت و عێراق بکاتە ئامانج.

کەمتر لە(٢٤) کاتژمێر دوای وتارەکەی جۆرج بوش لەھێرش بۆ سەر عێراق، ئەنجوومەنی پیرانی ئەمەریکا رێوشوێنی توندی دژ بەعێراق گرتەبەر. ھەڵبەت پێشنیارە دەرکراوەکەی ئەنجوومەنی پیرانی ئەمەریکا لەلایەنگیری دوژمنانەی ئەنجوومەنەوە بۆ عێراق سەرچاوەی گرت، ھەرگیز بەشێوەی یاسا دەرنەچوو تەنیا بەساردی پەیوەندیەکانی ھەردوو وڵات ئەنجامدرا.

لە(١١ ئەیلولی) ھەمان ساڵدا، (١٥٠ھەزار) کەسی عێراق لەبەردەم باڵوێزی ئەمەریکادا خۆپیشاندانیان کرد لەدوای ئەمە حکومەت عێراق دیپلۆماسێکی ئەمەریکا وەك کەسێکی نەخوازراو لەعێراق دەرکرد. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاش لەبەرامبەر ئەمەدا، دیپلۆماسێکی عێراقی لەئەمەریکا دەرکرد. پەیوەندی و دۆستایەتی نێوان ئەم دوو وڵاتە ووردەوردە ساردی تێکەوت و گومان دروستبوو، ھەرچەندە جۆرج بوش بەریگرت لەتوندڕەوی سیناتۆرەکانی ئەمەریکا سەبارەت بەحکومەت سەدام حسین و ئەم بارەی راستکردەوە.

لەوکاتە بەدواوە وردەوردە لەکۆڕ و کۆبوونەوە فەرمی و نافەرمیەکانی بەغدایە ئەو پڕوپاگەندانە بڵاوبۆوە کە هەوڵێکی جیهانی بە سەرکردایەتی ئەمەریکا و هاودەستی ئیسرائیل هەیە بۆ سەرنگونکردنی ڕژێمی بەغدا، ئەمەش بووەهۆی سەرهەڵدانی دژایەتی ڕۆژئاوا لەعێراقدا. بەبۆچوونی سەدام حسین ڕووداوەکانی دوایی سەلمێنەری ئەو ڕاستیەبوون. لەونیشانانەی کە سەدام بۆ سەرنگونکردنی خۆی دەیبینی، ڕاگەیاندنەکانی پەیوەست بەمافەکانی مرۆڤ بوو کە بەبەردەوامی دژی عێراق بڵاودەکرایەوە.

حکومەت ئەمەریکا لەخراپی پەیوەندیەکانی هەردوو وڵات ئاگاداربوو (جۆن کلی) یاریدەدەری وەزارەتی دەرەوەی بەسەرۆکایەتی دەستەیەك لە(١٢/٢/١٩٩٠) ڕەوانەی بەغداکرد، تایەیوەندی بەرپرسانی ئەمەریکا بەرەو باشبوون بەرێت و (جۆن کلی) عێراقی وەك فاکتەری چاکسازی لەناوچەکە وەسفکرد. بەڵام هێشتا چەند ڕۆژێك بەسەر ئەم دانیشتنەدا تێنەپەڕیبوو کە ڕادیۆی دەنگی ئەمەریکا لەبەشێك لەبەرنامەکانی خۆیدا بەزمانی عەرەبی وەك ( بیروبۆچوونی حکومەت ئەمەریکا) بڵاویکردەوە، حکومەتی عێراقی وەك تاوانکارترین ڕژێمی دونیا وەسفکرد و داوای لەخەڵکی عێراق کرد دژی ڕژێمی خوێنڕێژی بەغدا ڕاپەڕن. شێوەو ناوەڕۆکی ئەم بەرنامەیە بەجۆرێك توندوتیژبوو کە باڵوێزی ئەمەریکا لەبەغدا ناچاربوو داوا لەبەرپرسانی سەروی خۆی بکات بە فەرمی داوای لێبووردن لەحکومەت عێراق بکەن. بەوتەی هاوسەری باڵوێزی ئەمەریکا لەعێراق کە دوای ئاشکرابوو، سەدام حسین دوای ئەو ڕووداوە هیچ دودڵیەکی نەما کە ئەمەریکا لەهەوڵی لابردنی ڕژێمەکەیدایە، بەجۆرە کەشوهەوای سیاسی لەعێراق لەکۆتایی (شباتی ١٩٩٠) بە تەواوی گۆڕا و بڵاوکراوەکانی عێراق هەمیشە ئاگاداری دەدا کە ئیستعمارگەرایانی ڕۆژئاوا و لەسەروشیانەوە ئەمەریکا لەهەوڵی گۆڕینی ڕژێمی عێراق و زەرەر گەیاندن بەم وڵاتە دایە.

پەیامی ناڕوونی پەیوەندیەکانی ئەمەریکا و عێراق لەدەرکردنی دیپلۆماتەکانی عێراق و ئەمەریکا بوو لەلایەن یەکترەوە، بووەهۆی ئەوەی کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەم بەمەبەستی لابردنی ئەو نائارامیانەی سەریهەڵداوە و هەم بۆ لێکۆڵینەوەی زیاتر دەستەیەکی لە(نیسانی١٩٩٠) کە لەپێنج سیناتۆر پێکهاتبوو بەسەرۆکایەتی (بوب دول) ڕەوانەی بەغدا کرد. سەدام حسین لەسکاڵا و شکاتەکانی خۆی بەردەوام بوو دژی ئەمەریکا و بەریتانیا بۆ پارێزگاریکردن لەئیسرائیل کە مەبەستیانە ڕژێمەکەی بروخێنن، حکومەتی ئەمەریکا لەوەڵامدا بۆ دەخستنی نیەت پاکی خۆی، خودی سەرۆك کۆمار ئامادەی سەفەرە یان لەڕێگای تەلەفون بیسەلمێنێت کە ئەمەریکا دەیەوێت پارێزگاری لەمانەوەی پەیوەندیەکانە لەگەڵ عێراقدا بکات.

نیشانەکان لەلایەن واشنگتۆنەوە دژ و پێچەوانە دەردەکەوت و سەدام حسین نەیدەزانی پشت بەووتەکانی (دول و کلی) ببەستێت یان بڕوا بە هەنگاوە دوژمنکارانەکانی ئەمەریکا بکات. ﴿لە

(٢٧تەموزی) هەمان ساڵدا کاتێك واشنگتۆن سنورداری بانکی و بازرگانی تازەی سەبارەت بەعێراق لەبەرچاوگرت، ئەنجومەنی پیرانی ئەمەریکا بە (٨٠) دەنگ و ئەنجومەنی نوێنەران بە (٢٣٤) دەنگ پرۆژەی پێشنیاز کراوی گەمارۆی ئابووری سەر عێراقیان پەسەند کرد). بەجۆرە بەسەرنجدان لەکەشوهەوای سیاسی ناڕۆشن کە دەستی کێشابوو بەسەر پەیوەندیەکانی هەردوو وڵاتدا. هەردوو وڵات بۆ ڕووبەڕووبونەوە و جەنگی واقعی ئامادە و لەکاردا بوون.

بەم شێوەیە لە(٢٥تموزی١٩٩٠) لەدیداری (ئاپریل گلاسپی) باڵوێزی ئەمەریکا لەگەڵ سەدام حسین، ئەو دەریخست کە هەوڵەکانی سەدام لەبواری بنیاتنانەوەدا ستایش دەکات و پێویستیەکانی ئەو بەپارە هەست پێدەکات. باڵوێزی ئەمەریکا لەناو ئەوەی کە ڕایدەگەیاند ئەمەریکا نایەوێت نرخی نەوت زۆر بەرزبێتەوە لەگەڵ سەدام هاوخەمە. دەیگوت زۆر لە ئەمەریکیەکانی ناوچە نەوتیەکانی حەزدەکەن نرخی نەوت بۆ زیاتر لە(٢٥) دۆلار بەرزبێتەوە. وەپاشان دەریخست سەبارەت بە ناکۆکیەکانی عەرەبەکان، وەك گفتوگۆی سنوری نێوە لەگەڵ کوێت مەسەلەیەکە ئێمە وەك ئەمەریکا هیچ تێبینیەکمان لەسەری نییە.

هەروەها دەربڕینەکانی (مارگریت تاتوایلر) وتەبێژی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا لەوەڵامی پرسیارێك پەیوەست بەجێگیرکردنی دوو لیوا لەهێزی زرێپۆشی عێراق لەسەر سنوری کوێت وتی: ئەمەریکا لەگەڵ کوێت پەیمانی بەرگری نییە، ئێمە هیچ پەیمانێکی بەرگری و ئاسایشیمان لەگەڵ ئەوان نییە. لەڕاستیدا ئەمجۆرە قسانە لەکەسانی پایەبڵندی ئەمەریکاوە نیشانەی هەڵکردنی گڵۆپی سەوزەبوو بۆ عێراق بۆ داگیرکردنی کوێت، کە بووەهۆی ئەوەی سەدام حسین لەئارەزوو بەرژەوەندی ئەمەریکا لەناوچەکە لێکدانەوەی هەڵەی بۆ بکات.

سەرەڕای ئەو بابەتانەی سەرەوە هەندێك بابەتی تیرۆرستی، پرۆژەدانانی جاسوسی و لەسێدارەدانی (بهزاد بازوفت)، ڕۆژنامەنوسی گۆڤاری ئۆبزیرڤەر کە بەدوای لێکۆڵینەوە لەتەقینەوەك لەناوچەیەکی سەربازی بەغداوە بوو، هەروەها ڕاگرتنی چل ئەمباری ئەلکتریکی لەفرۆکەخانەی لەندەن کە ئامادەکرابوو بۆ گواستنەوە بەرەو بەغدا کە بۆ هەڵدانی چەکی ئەتۆمی بەکاردەهێنرا و ترس لەهێرشی ئیسرائیل بۆ سەر دامەزراوە سەربازی و ستراتیجیەکانی عێراق، هەموو ئەمانە ڕێگای خۆشکرد بۆ زیادبوونی بەدگومانی و دڵەڕاوکێ و ترسی لەلای سەدام حسین، بەم شێوەیە ئەو پێویستی بە قەیرانێکیتر بوو بۆ بالأبوونی خۆی و ڕژێمەکەی کە لەهێرشکردن بۆ سەر کوێت ڕەنگیدایەوە.

**جەنگی دووەمی کەنداو ( جەنگی نەوت ):**

هێرشی عێراق بۆ سەر کوێت لە(١٩٩٠/٨/٢) و پاشان لکاندنی ئەم وڵاتە بەخاکی عێراقەوە بە شێوەیەکی گشتی کاریگەری قوڵی لەسەر باروودۆخی ستراتیجی ئۆقیانوسی هندی و بەتایبەت کەنداوی فارسی بەجێهێشت. ئەم هەنگاوە دوژمنکارانەیە زۆر لەخەڵکانی دنیا و بەتایبەت سەرکردەکانی وڵاتان و چاودێرانی سیاسی سەرسام کرد و بۆ زۆر لەتوێژەر و چاودێری سیاسی و سەربازی چاوەڕوان نەکراو بوو.

ئەم هێرشە کە بووەهۆی ڕووخانی ڕژێمی ئال صباح و داگیرکردنی سەربازی ئەم وڵاتە، شەپۆلێك لەپرۆتستۆ کردنی جیهانی بەدواوەبوو. ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو، کۆمکاری عەرەبی، ڕێکخراوەی کۆنفرانسی ئیسلامی و هەروەها ئەنجومەنی ئاسایشی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان لەناو ئەو ڕێکخراوە هەرێمی و جیهانیانەبوون کە هێرشی عێراق بۆ سەر کوێتیان پرۆتستۆکرد.

ئەم هەنگاوەی عێراق ڕووبەڕووی پەرچەکرداری توندی چاوەڕوانەکراوی ئەمەریکا بووەوە و ئەم وڵاتە تیۆرەکانی خۆی قۆناغ بەقۆناغ توندتر دەکرد. ﴿جۆرج بوش لە(١٩٩٠/٨/٨) بەفەرمی ڕایگەیاند کە هێزە سەربازیەکانی ئەمەریکا بەمەبەستی بەرگریکردن لەعەرەبستانی سعودی بۆ ناوچەکە ڕەوانە دەکرێت. ئەو بۆچون و خواستەکانی ئەمەریکای بەمجۆرە خستەڕوو: یەکەم، چونەدەرەوەی بێقەیدوشەرتی هێزەکانی عێراق لەکوێت. دووەم، گەڕانەوەی حکومەتی ڕەوای (شرعی) کوێت. سێیەم، پابەندبوونی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەروەك لەڕابردوودا لەسەردەمی سەرۆکایەتی ڕۆزفڵت تا ڕیگان بەپارێزگاریکردن لەئارامی و ئاسایش لەناوچەی کەنداودا. چوارەم، سەدام حسین خۆی پەیمانبدات بەپاراستنی گیان و ژیانی هاوڵاتیانی ئەمەریکای نیشتەجێی ناوچەکە.

جیمس بیکری وەزیری دەرەوەی ئەوکاتەی ئەمەریکا لەلای خۆیەوە لەئەنجومەنی نوێنەران بەسەرنجدان لەسیاسەتی هێرشبەری حکومەتی بوش وتی: وابەستەیی جیهان بەسەرچاوەی وزەی کەنداو و پێویستی پاراستنی بەدەستهێنانی ئەم سەرچاوەیە واقعیەتێکی ژیانیە (حیاتیە) کە سەدام حسین دەیتوانی بەبڕینی ئەمە سیستەمی ئابووری جیهان ڕووبەڕووی مەترسی بکاتەوە﴾.

لەبەرئەوە ئەمەریکا هەلی کەوتەدەست بۆ جێگیرکردنی هێزەکانی لەناوچەکە بەخەرجی حکومەتی کوێت و وڵاتانیتری عەرەبی بەمەبەستی بەرگرتن لەهێزەکانی عێراق بۆ هاتنەناوەوەی بۆ ناوخاکی عەرەبستانی سعودی بەخێرای هەنگاوینا بۆ ناردنی هێزەکانی خۆی و هاوپەیمانەکانی بۆ ناوچەکە.

هەرچۆنێك بێت داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراقەوە جارێکیتر هەلی خستەبەردەستی ئەمەریکا تا بەشێوەیەکی بەرفراوان و پرچەك کە لەمێژووی ڕابردوی کەنداودا وێنەی نەبووە، دەستبخاتە ناوکاروباری ناوچەکەوە.

## کاردانەوەی ئەمەریکا لەبەرامبەر دەستدرێژی عێراق بۆ سەر کوێت:

قەیرانی کەنداو کە بەدەستدرێژی هێزەکانی سوپای عێراق بۆ سەر خاکی کوێت و داگیرکردنی ئەم ئەمیرنشینە بچوکە دەستی پێکرد، بووە هۆی کاردانەوەی جدی ئەمەریکا لەبەرامبەر ئەم هێرشە سەربازیەدا. تیۆرزانانی عێراق لەو باوەڕەدا بوون کە لەدیدی پایەدارانی ڕۆژئاواوە تەنیا نەوتی کوێتیان بەلاوە بەنرخە نەك خانەوادەی ئال صباح. لەبەرئەوە بەبۆچوونی بەغدا، ئەوروپا و ئەمەریکا دوای داگیرکردنی کوێت لەلایەن سوپای بەعسەوە دەتوانن بەبێ کێشە نەوتی خۆیان لەناوچەکە بەدەستبهێنن، بەڵام هەڵەی لێکدانەوەی عێراقیەکان لەوەدابوو کە ئەگەر نەوتی ناوچەکە بۆ ئەمەریکا و ئەوروپا گرنگە، ئەم نەوتە بەبێ متمانەکردن بەرژێمە عەرەبیە خاوەن نەوتەکان ناگاتە دەستی ئەوروپا و ئەمەریک.

جگە لەوگریمانەیەی کە شێوەی دەرەوەی کێشەکەیە، پاڵنەری بەهێزتریش هەیە، کە ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی دەیانویست لەبەرامبەر داگیرکردنی کوێت هەوڵبدرێت بۆ سڕینەوەی تواناکانی سوپای عێراق، ئەو سوپایەی دەیتوانی هەرەشەی جدی بێت بۆ سەر ئیسرائیل و وڵاتانی ناوچەکە. دوو ساڵ پێش قەیرانی کەنداو بەرپرسانی پایە بەرزی ئەمەریکا لەدانیشتنێکی تایبەت لەئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمەریکادا جەختیانکردەوە لەسەر پێویستی کەمکردنەوەی توانای هێزی ئەو دەوڵەتانە لەناوچە جیاوازەکانی جیهاندا کە بەهەڕەشە بۆ سەر بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکا دەژمێردرێت.

﴿دیك چینی وەزیری بەرگری ئەمەریکا لەمانگی (شباتی ۱۹۹۰) واتە پێنج مانگ پێش داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراقەوە بەڵگەیەکی نهێنی واژۆکرد کەتێدا بڕیاری بەرگری بۆ قۆناغی (۱۹۹۲ـ۱۹۹۷) دیاریکرد بوو. لەم بەڵگەنامەیەدا داوا لەهێزە چەکدارەکانی ئەمەریکا دەکات کەمتر جەخت لەمەترسی یەکێتی سۆڤێت بکەنەوە و خۆیان بۆ ئەگەری جەنگەکانی هێزە ناوچەییەکانی جیهانی سێیەم ئامادەبکەن﴾.

لەبەرئەوە بەباشی ئاشکرابوو کە ئەمەریکا لەتوانا و پەرەسەندنی جبەخانەی عێراق نیگەرانە. ئەم پەرەسەندنە سەربازیە لەپاڵ ئەو هەڕەشانەی کە سەدام حسین سەرۆك کۆماری عێراق لەئیسرائیلی دەکرد، بەبۆچوونی پسپۆڕان و سیاسەتمەدارانی ئەمەریکا بەمەترسیەکی گەورە و جدی وەردەگیرێت. مەترسیەکە کە ئەمڕۆ یان سبەی دەبێت لەناوببرێت تا لەلایەك پێگەی سەرەکی خۆیان لەناوچەکە کە ئیسرائیلە لەناسایشدابێت و لەلایەکیترەوە بەردەوامی نەوتی کەنداو سەرچاوەی وزە و سوتەمەنی پیشەسازیەکانی ئەمەریکا، ئەوروپا ویابان دابینەدکات دوچاری مەترسی نەبێتەوە.

سەبارەت بەم ئامانجە بوو کە ﴿فەرماندەی فەرماندەیی گشتی هێزە چەکدارەکانی ئەمەریکا پلانی سەرەکی بۆ لابردنی پێویستیەکانی نەوتی بەشێوەی دەستێوەردانی سەربازی لەناوچەی کەنداو کە لەپێشدا ئامادەیکردبوو خستبوویە بواری جێبەجێکردنەوە. لەساڵی (۱۹۸۷ـ۱۹۸۸) ئەمباری ناوەندی زۆر گەورە

بۆ گلدانەوەی نەوت لەلایەن ئەمەریکاوە لەبەحرین دامەزرا و بەمشێوەیە باروودۆخی ئەمبارەکانی هێزە سەربازیەکانی ئەمەریکا لەناوچەکە گەیشتە (٢,٤) ملیۆن بەرمیل نەوت لەگەڵ (١,٥) ملیۆن بەرمیل سوتەمەنی فڕۆکە کە بۆ ئێرە گوێزرابۆوە زیادی کرد. ماوەیەکی کەم دوای ئەوە کۆنگرێسی ئەمەریکا دەنگیدا لەسەر پرۆژەی دابینکردنی بودجەیەکی گەورە بۆ نەوتی خاو و نەوت و ڕۆن کە بەوپێیە توانای زەخیرەسازی نەوت لەئەمبارەکانی بەحرین بۆ (١٠) ملیۆن بەرمیل نەوت زیادیکرد. ئەم داهێنانەی فەرماندەی فەرماندەیی گشتی هێزە چەکدارەکانی ئەمەریکا، دوای ساڵی (١٩٨٧) لەوڵاتانیتری عەرەبی کەنداو بەردەوامی هەبوو، بەجۆرێك کە ڕێژەی خەزنکردنی نەوتی ئەمەریکا بەقەبارەیەکی بەرچاو زیادیکرد. فەرماندەی ناوەندی فەرماندەییش لەبواری چاکسازی و بیناکردنی لولەی نەوتی و لابردنی گیروگرفتەکانی بەردەم دابەشکردنی نەوت هەنگاوی کارای ناوە.

بەمجۆرە بەتەواوی ئاشکرایە کە فەرماندەی فەرماندەیی گشتی هێزە چەکدارەکانی ئەمەریکا لەهەمان شوێنی ڕوبەڕووبوونەوە لەگەڵ هەرجۆرە هەڕەشەیەك لەم ناوچەیە بەناماڵجی سەرەکی و بنەڕەتی دەژمێردرێت و ئامادەی هێزی خێرای خۆی و ناردنی سێ هەزار جەنگاوەر بۆ ناوچەکەیە، لەبەرئەوە یەکسەر دوای داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراقەوە، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەسەر بنەمای نەخشەیەك کە پێشتر ئامادەی کردبوو کاردانەوەی پیشاندا و ئاشکرابوو ئەمەریکا پێشتەوەی پەنا بۆ هێزێکی سەربازی فرەنەتەوەیی بەرێت، پشتی بەتوانای سەربازی ـ هونەری خۆی بەتایبەت لەبواری زەخیرەسازی نەوتی ـ ووزە لەناوچەکە و کارایی سیستەمی دابەشکردنی خێرای سوتەمەنی لەوڵاتانی کەناری کەنداو بە تایبەت عەرەبستانی سعودی بەستووە. بەدرێژایی ماوەی جەنگی کەنداویش ئەم ئامادەکاریە پەیوەستبوە بەفەرمانـدەی فەرمانـدەیی گشتی هێزە چەکدارەکانی ئەمەریکاوە و خێرای لەبواری ئامادەکاری پەیداکردنی کەرەسەی سوتەمەنی و زەخیرەسازی بەردەوام بووە، بەجۆرێك کە بەدرێژایی جەنگ قابلیەتی بە (٩٠٠) هەزار بەرمیل لەڕۆژێکدا خەملێنراوە کە وەڵامدەرەوەی هەموو پێویستیەکانی سوتەمەنی ئامێرە جەنگیەکانی ئەمەریکا بووە لەناوچەکەدا بەگشتی بۆ بواری هەوایی و زەمینی﴾.

لەدوای داگیرکاریەکەی کوێت لەلایەن عێراقەوە، ئەنجومەنی ئاسایشی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان توندترین کاردانەوەی لەبەرامبەر ئەم داگیرکاریەی عێراق پیشاندا، بەجۆرێك کە ئەم کارە لەمێژووی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان بێوێنە بووە. ئەنجومەنی ئاسایش چەند کاتژمێرێك دوای داگیرکردنی کوێت دانیشتنێکی ئەنجامدا و بەدەرکردنی بڕیارنامەی ژمارە (٦٦٠) دوژمنکاریەکەی عێراقی پرۆتستۆکرد و داوای کشانەوەی بێقەیدوشەرتی هێزەکانی عێراقی لەخاکی کوێت کرد. هەروەها ئەنجومەنی ئاسایش بەدەنگدان لەسەر بڕیاری ژمارە (٦٦١) عێراقی خستە ژێر گەمارۆی ئابووری و

چەکەوە. بەپێی ئەم دوو بڕیارنامەیە و بڕیارنامەکانی دوایی ڕێگا دەدات کە لەڕێگای بەکارهێنانی هێزەوە بتوانرێت هێزەکانی عێراق لەکوێت دەربکرێت. لەبەرئەوە لەدوای چەند مانگێك لە داگیرکردنی کوێت (۱۲) بڕیارنامە لەدژی عێراق دەرچوو، کە دواهەمینیان پێش هەڵگیرسانی جەنگ دەرچوو کە بریتیبوو لەبڕیاری (٦٧٨) ی ئەنجومەنی ئاسایش بوو لە(۱۹/۱۱/۱۹۹۰) کە دوا ماوەی بۆ عێراق دانا لە(۱۵/۱/۱۹۹۱) خاکی کوێت بەجێبهێڵێت و بڕیاری (٦٦٠) جیبەجێبکات. لەدوای ئەم بڕیارە دەیان کەشتی جەنگی و فڕکەهەڵگری ئەمەریکا، بەریتانیا، فەرەنسی و ولاتانیتری ئەوروپی بە مەبەستی فشار خستنەسەر عێراق هاتنە ناو ناوی کەنداوەوە.

خاڵی جێگای سەرنج لێرەدا ئەوەیەك کە یەکێتی سۆڤیێت بەبەڵێ دەنگی بۆ بڕیارەکەدا (لەبری وەگرتنی ٤ ملیارد دۆلار لەعەرەبستانی سعودی و بەڵێنی پێدانی ۳ ملیارد دۆلاریتر لەلایەن ولاتانی عەرەبی کەنداوەوە).

یەکەمین کاردانەوەی ئەمەریکا لەبەرامبەر داگیرکاریە سەربازیەکەی عێراق داوای پێکهێنانی دانیشتنێکی خێرای ئەنجومەنی ئاسایشی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان کرد بۆ بەرگرتن لەم دوژمنکاریە. هەڵبەت ئەم هەنگاوەی ئەمەریکا بەهیچ جۆرێك نەیدەتوانی بەربەستبێت لەبەردەم ئەو داگیرکاریەدا. دووەمین هەنگاوی ئەمەریکا بلۆککردنی پارە و داراییەکانی عێراق و کوێت بوو لەئەمەریکا، کە بەڵگەنامەکانی تایبەت بەوکارە شەو لەلایەن ڕاوێژکارانی یاسایی کۆشکی سپی و وەزارەتی دەرەوە و وەزارەتی داراییەوە ئامادەکرا و کاتژمێر پێنج کە هێشتا ڕۆژێك بەسەر دوژمنکاریەکەدا تێنەپەریبوو جۆرج بووش واژۆی لەسەرکرد. هەنگاوی لەمجۆرە لەولاتانی ئەوروپا و یابانیش نرا تا ڕێبگرێت لەوەی ئەو حکومەتە دەسکردەی کەعێراق لەکوێت دایمەزراندوە سوود لەوپارە زۆرەی کوێت وەربگرێت کە بەسەد ملیارد دۆلار دادەنرا.

لەڕۆژی یەکەمی داگیرکاریەکەدا بوش لەوتارێکدا ڕایگەیاند کە (ڕێگام بدەن کە بڵێم ئەمەریکا ئەم داگیرکردنە بەتوندی پرۆتستۆ دەکات و داوای کشانەوەی بێقەیدوشەرتی عێراق دەکات. لەدنیای ئەمرۆدا نیتر جێگای ئەمجۆرە کارە توندوتیژی و دڕندانەیە نەماوە).

تەنیا بە تێپەربوونی پێنج ڕۆژ بەسەر داگیرکردنی کوێتدا، بوش لەوتارێکیدا بۆ خەڵکی ئەمەریکا لەپێناوی ئاراستەکردنی ستراتیجی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا چوار بنەمای دیاریکرد:

۱- کشانەوەی بێقەیدوشەرتی عێراق لەکوێت.

۲- گەڕانەوەی حکومەتی ڕەوای (شرعی) کوێت.

۳- پابەندبوون بەئاسایش و ئارامی لەکەنداو بەتایبەت لەبواری هاتوچۆی نەوتدا.

٤- پاراستنی لایەنگرانی ئەمەریکا لەناوچەکە.

هەفتەیەك دوای ئەمە سەرۆك كۆماری ئەمەریكا ئەم چوار بنەمایەی وەك (ئامانجەكانمان) ناساند و دەربارەی گێڕانەوەی بارودۆخەكە و بەكارهێنانی هێز ودەسەڵاتی پێویست بۆ بەدەستهێنانی ئەم ئامانجانە ڕوونكردنەوەیدا. ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا بڕیاریدا بەناردنی هێزی سەربازی بۆ عەرەبستانی سعودی تارێبگرێت لەعێراق كە هێرش نەكاتە سەر ئەم وڵاتە یان ئامانجێكیتر كە لەدوای كوێت هەیبێت. ئەمكارە عێراقی گۆشەگیركرد و هەوڵیدا لەڕێگای گەمارۆی ئابووری لەسەر هاوردە و ناردەنی عێراق ناچار بەپاشەكشێی بكات.

بوش لەئاراستەكردنی هەنگاوەكانی خۆی چەند بەیاننامەیەكی دەركرد و لەناویدا ئاماژەی كرد بەوەی كە بەرژەوەندیەكانی ئەمەریكا كەوتۆتە بەرمەترسی: لەناویاندا نەوت هاندەرێكی گرنگ بوو.

﴿بەرژەوەندی ستراتیجی ئەمەریكا لەبێبایەخكردنی ستراتیجی سەدام بۆ بەكارهێنانی سیاسەتی هێز، پێویستی دەكرد كە ئەمەریكا هەنگاوی زیاتر بۆ گێرانەوەی بارودۆخەكە بنێت. هەروەها دەبێت بێپێدانی ئیمتیازاتی زەمنی لەسەر مەسەلەی ئاسایش كەنداو و بە مناسەباتی ئیسرائیل و فەلەستین، عێراق ناچار بكات كوێت بەجێبهێڵێت. لەسەرەتای مانگی ئابدا هەتا سیاسەتمەداران لەواشنگتۆن دوودڵ بوون كە لەڕێگای دیپلۆماسیەتی فشارەوە لەپاڵ گەمارۆی ئابووری بتوانرێت عێراق ناچاربكرێت كوێت بەجێبهێڵێت. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لەسیاسەت دارێژەران دودڵیان پیشاندا كە ستراتیجی چڕكردنەوە بۆ گێرانەوەی بارودۆخەكە بۆ پێشوو بەتەنیا بتوانێت بەئامانجی سێیەمی بوش واتە ئاسایش ناوچەكە بگرێتەوە. ئەگەر عێراق بكشایەتەوە و هێزە سەربازیەكەی وەك خۆی بمایایەتەوە، كەواتە هەر دەیتوانی هەڕەشەبێت بۆ سەر هەموو دەوڵەتەكانی كەنداو، ئەگەر بزانین پەیوەندی سەدام حسین لەگەڵ تەكنەلۆجیای ئەتۆمی و كیمیایی و موشەكی لەئەنجامی ئەم پاشەكشێیە هەڕەشە دەبێت بۆ سەر ئاسایشی ئیسرائیل﴾.

حكومەت ئەمەریكا بۆ تێكشكاندنی سەدام سەرەڕای پروپاگەندەكان هاوڕا لەگەڵ جێگیركردنی هێزەكانی لەخاكی عەرەبستانی سعودی، پەنایبردەبەر گەمارۆدانی عێراق، چونكە عێراق نەیدەتوانی نەوت بنێرێتەدەرەوە و كاڵاش بۆ ناوخۆی وڵات هاوردەبكات.

بەهەمان مەبەست بۆ كاریگەری گەمارۆی ئابووری ڕێكخراوی نەتەوە یەكگرتوەكان، ڕێكەوتنی نێودەوڵەتی بۆ ئەم بڕیارانەی ڕێكخراوی نەتەوە یەكگرتوەكان زۆر گرنگ بوو. ئەم كارە بەمانای ئەوەبوو كە توركیا و عەرەبستانی سعودی كە لولەی نەوتی عێراق بە ناویاندا دەڕوات داخەن و سوریاش بۆریەنەوتەكانی بەداخراوی بهێڵێتەوە. توركیا لە(٧ ئاب) بەمكارە ڕازیبوو چونكە دڵنیابوو هێزی سەربازی توركیا دەتوانێت ڕێگربێت لەتۆڵەكردنەوەی سەربازی عێراقی.

بوش بۆ جێگیركردنی هێزەكانی ئەمەریكا لەعەرەبستانی سعودی و ڕووبەڕووبونەوەی هەر جوڵەیەكی عێراقی ناچاربوو ڕەزامەندی عەرەبستانی سعودی بۆ ناردنی هێزی ئەمەریكا بۆ ئەم وڵاتە

وەگرێت. لەبەرئـەوە لـە(١٩٩٠/٨/٥) وەزیـری بـەرگری خـۆی بـەرەو عەرەبـستانی سـعودی ڕەوانـەکرد. بەسـەرنجدان لـەمانۆرە سـەربازیەکانی عێـراق لەسـەر سـنوری عەرەبـستانی سـعودی و نادیـاری لەنیـەتی کارەکانی، سعودیەکانی بەجۆرێك ترساند کە دوای وتووێژێکی دوورودرێژ سـەرکەوت بەسەر دوودڵیەکەیـدا و ڕۆژی حەوتی ئاب مەلیك فهد بەمـەرجەکانی ئەمەریکا بەناردنی هێزەکانی بۆ عەرەبـستانی سـعودی ڕازی بوو لەگەڵ گرتنەئەستۆی هەموو خەرجیەکانی ئەم هێزە لەلایەن عەرەبـستانی سعودیەوە و یەکـەمین هـەواڵ دەربارەی ئەم باسە کە دوایی بە(ئۆپەراسیۆنی قەڵغانی بیابان) ناویدەرکرد لەهەمان ڕۆژدا بڵاوبۆوە و ڕۆژی (٨ی ئاب) جۆرج بوش بەفەرمی ئەم ئۆپەراسیۆنەی ڕاگەیاندو جەختی کردەوە کـە ئـەم هێـزە لەسـەر داوای عەرەبستانی سعودی بۆ پاراستنی ئەم وڵاتە لەهێرش و دەستدرێژیەکانی عێراق دەنێردرێت و ئامانجی تەنیا بەرگریکردن دەبێت، بوش هەروەها بۆ یەکەم جـار بەشـێوەیەکی قـەتعی وتـی کـە کۆمـەڵگای نێودەوڵـەتی داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراقەوە قبوڵ ناکەن و عێراق دەبێت بـەبێ مـەرج هێزەکـانی خـۆی لـەم وڵاتـە بەرێتە دەرەوە.

﴿لەڕۆژی ٢٥ ئابدا بڕیاری ژمارە (٦٦٥) ئەنجومـەنی ئاسایـشی ڕێکخـراوی نەتـەوە یـەکگرتوەکان دەرچوو کە بەپێی ئەم بڕیارە بـۆ ئـازاد کردنـی کوێـت پەنابرێتـە بـەر بـەکارهێنانی هێـز. لـەدوای ئەمـەوە ئەمـەریکا بـەبێ ئـەوەی کارفـەرمانی (مـنموریـەت) لەلایـەن ئەنجومـەنی ئاسایـشەوە پێبـدرێت هەڵـسا بەرێکخستن و سازدانی هێزی نێودەوڵەتی بۆ دەرپەڕاندنی عێراق لەکوێت.

تا ئەو مێژووە ژمارەی سەربازانی ئەمەریکا لەعەرەبستانی سعودی لە(٧٠)هەزار سەرباز تێپـەڕی و بەردەوامبوو لەڕەوانەکردنی سەربازی زیاتر. ئامانجی یەکـەمی ئەمەریکیـەکان جـێگیر کردنـی (٢٠٠ تـا ٢٥٠) هەزار سـەرباز بـوو لەکەنـداو و لـەم بـوارەدا هەوڵـە دیـپلۆماسـی و گـەمارۆی ئـابووری و گـەمارۆی دەریایی عێراق بۆ ناچارکردنی سـەدام حـسێن بـۆ کـشانەوە لـەکوێت پـێش پـەنابردن بـۆ لێـدانی سـەربازی بەردەوام بوو.

لەناوەڕاستی تشرینی یەکەم ئەمەریکا بەگوڕوتینێکی زۆرترەوە بەرەو کەنداو هات، تازەمینەی بـۆ ڕێگاچارەی سەربازی هێزی هێرشبەر بڕەخسێنێت. بـەجۆرە ژمـارەی سـەربازانی ئەمـەریکا لەعەرەبستانی سعودی گەیشتە (٢٥٠) هەزار کەس بەڵام جنراڵ شوارسکۆف فەرمانـدەی هێزەکـانی ئەمـەریکا لەکەنـداو ئەم هێزەی بە کەم دەزانی بۆ دەسپێکردنی ئۆپەراسیۆنی جـەنگ دژ بـەعێراق، چـونکە زانیـاری گەیـشتبوو بەناوەندی فەرماندەیی ئەمەریکا لە \ناوچەکە کە عێراق (٤٥٠) هەزار سـەربازی لەکوێت جێگیرکردبوو﴾.

بەبەرزبوونەوەی نرخی نـەوت لەسـەرەتای تـشرینی یەکـەمی ١٩٩٠، (٤٠) دۆلار بـۆ بـەرمیلێك، سەرۆك کۆمـاری ئەمـەریکا ناچـاربوو لەژێرکاریگـەری ئەمـەدا بـیر لـەئابووری نێودەوڵـەتی بکاتـەوە. بـۆ

سیاسەتمەداران و خاون بەرژەوەندی ناوخۆیی و نیگەرانی نەوتی ئەمەریکا و ڕژێمەکانی کەنداو پێویست بوو پەنا بۆ هێزی زۆرەملێ لەناوچەکە بەرن.

بەهۆی کەمی کاریگەری گەمارۆی ئابووری ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لەسەر عێراق بۆ ناچارکردنی ئەو وڵاتە بەکشانەوە لەخاکی کوێت، سەرۆك کۆماری ئەمەریکا بڕیاریدا بەئامادەکردنی زەمینەیەك بۆ هەڵبژاردنی ڕێگاچارەی سەربازی.

﴿بەیاننامەی (٨/١١/١٩٩٠) بوش لەفەراهەمکردنی زەمینەی هەڵبژاردنی ڕێگاچارەی هێرشی سەربازی، کاردانەوەی خێرای کۆمەڵگای نێودەوڵەتی و کۆنگرێسی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای لێکەوتەوە. حکومەت ئەمەریکا سەرەتا بە چالاکی لەڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و دانوسان لەگەڵ یەکێتی سۆڤێت بۆ دەنگدان لەسەر بڕیاری (٦٧٨) بەنێودەوڵەتیکردنی مەسەلەکە گرنگیدا. ئەم بڕیارە لە(٢٩/١١/١٩٩٠) دەنگی لەسەردرا و داوای لەعێراق کرد تا (١٥/١/١٩٩١) بڕیاری (٦٦٠) ی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و بڕیارەکانی دواتریش جێبەجێ بکات، لەهەمانکاتدا ڕێگادرا بەژمارەیەك لەوڵاتان ئانەو بەرواره بەڵام نەك بەزۆر، بۆ جێبەجێکردنی بڕیاری (٦٦٠) ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان سوود لەهەموو هۆکارێك وەربگرن بۆ لێدانی عێراق لەکاتی پێویستدا﴾.

بەدرێژایی ئەو ماوە دیاریکراوە، وەزیرانی دەرەوەی عێراق و ئەمەریکا لەجنێف دانیشتنیان هەبوو، کە هیچ سازشێکی نەکرد، ئەمە یارمەتی حکومەت بوشیدا بۆ سەرکەوتن بەسەر عێراقدا پەنابەرێتە بەر کاری سەربازی.

لەمانگی تشرینی دووەم هاوکات لەگەڵ ناردنی هێزی زیاتر لەلایەن ئەمەریکاوە بۆ ناوچەکە، وڵاتانیتریش ئامادەی بەشداریکردن بوون لەهێزی فرەنەتەوە بۆ دەرپەڕاندنی عێراق لەکوێت و ژمارەی سەربازیان لەناوچەکە زیاد کرد.

﴿لەمێژووی بڕیارەکەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان واتە (٢٩ تشرینی دووەم)، بیست و حەوت وڵات، لەوانە دوازدەیان وڵاتی عەرەبی بوون ئامادەیی خۆیان بۆ هاریکاری ئەمەریکا لەئۆپەراسیۆنی سەربازی دژی عێراق پیشاندا. لەو مێژووەدا ژمارەی سەربازانی ئەمەریکا لەکەنداو لە(٣٧٠) هەزار سەربازی تێپەڕی کردبوو. ژمارەی تانکە ئەمەریکیەکان لەناوچەکە (٤٩٠٠) دانە و ژمارەی فڕۆکە جەنگیەکان و بۆمبهاوێژەکان لەبنکەکانی عەرەبستانی سعودی گەیشتە (١١٠٠) دانە، واتە دووئەوەندی هەموو فڕۆکەکانی عێراق. جگە لەهێزی ئەمەریکا، (٤٠) هەزار سەربازی عەرەبستانی سعودی و (١٣٠) فڕۆکە و (٢٠٠) تانکی لەبەردەستدا بوو. میسر (٣٥) هەزار سەرباز و (٦٠٠) تانك و (٢٠) فڕۆکە، بەریتانیا (٢٥) هەزار سەرباز و (١٦٨) تانك و (٥٥) فڕۆکە، سوریا (٢٠) هەزار سەرباز و (٣٠٠) تانك و فەرەنسا (١٢) هەزار سەرباز و (٢٠٠) تانك و (٧٥) فڕۆکە بەشداریان کرد﴾ و ﴿کوێتی ئازاد بە (٧)

هـەزار سـەرباز و (٦٠) تانـك و (٢٠) فڕۆكـە و بـاقی وڵاتـانی ئەنـدامی ئەنجومـەنی هاریكـاری كەنـداو هەموویان بە (٨) هەزار سەرباز و (٢٤) تانك و (٨٠) فڕۆكە بەشداری ئۆپەراسیۆنەكەیان كرد﴾.

﴿تێكرای ژمـارەی سـەربازانی ئەمـەریكا و هاوپەیمانـەكانی لەكەنـداو لـە (٦٠٠) هـەزار سـەرباز تێپـەڕیكرد كـە زیـاتر بـوو لـەژمارەی هێزەكـانی عێـراق لـەكوێت، ژمـارەی فڕۆكـە جەنگیـەكان و بۆمبهاوێژەكانی ئەمەریكا و هاوپەیمانـەكانی لەناوچەكە زیـاتر لـە(٢٠٠٠) دانـەبوو، واتـە نزیكـەی چوار ئەوەندەی فڕۆكەكانی عێراق دەبوو. نزیكەی سـەد كەشتی جەنگـە كـە شەشـیان كەشـتی فڕۆكـە هـەڵگربوو لەناوەكانی كەنداوی فارسی و دەریای عومان جێگیركرابوون، كە عێراق لەبەرامبەر ئەمەدا خـاوەنی هێـزی دەریـایی نـەبوو. سـەرەڕای ئـەوە سـەكۆی هەڵـدانی موشـەكی (كـرۆز و تۆمـاهۆكی) ئەمـەریكی لەبنكـە سـەربازیەكان جێگیر كرابوو كە لـەكاتی هێرشـدا دەیتـوانی ئامانجـە دیاریكراوەكـان لـەناو عێـراق بەباشـی بپێكێت. سەرەڕای ئەوە ئەمەریكیـەكان ژمارەیـەكی زۆر لەموشـكی دژە موشـەك (پـاتریۆت) لەوناوچـانە جێگیركردبـوو كـە ئەگـەری هەڵـدانی موشـەكی عێراقـی لێـدەكرا بـۆی كـە تـوانی ڕێـژەی (٨٠٪) ی موشەكەكانی عێراق پێش گەیشتن بە ئامانجەكانی لەئاسمان بتەقێنێتەوە﴾.

لە(١٩٩١/١/١٢) ئەنجومەنی پیرانی ئەمەریكا بەزۆرینەیەكی كەم مۆڵەتی بەسەرۆك كۆمـاردا تـا لەگەڵ عێراق بكەوێتە جەنگەوە و دوای چوار ڕۆژ هێرشی هاوپەیمانان بۆ سەر عێراق دەستپێكرد.

ئەخشـەی جەنگی ئەمەریكا لەكەنداو لەسەرەتادا بۆردومانی چڕوپڕ و بەردەوامی ئامانجە سـەربازی و پیشـەسازی و ڕێگاكان و هۆیەكانی پەیوەندیكردنی عێراق بوو بەدرێژایی چوار تاشەش هەفتـەی یەكـەمی جەنگ.

﴿ئۆپەراسـیۆنی ئاسمـانی دژی عێـراق لەكاتـژمێری (٢:٣٠) ی بـەیانی ڕۆژی (١٧كـانونی دووەم) دەستپێكرد بۆ ماوەی (٤٠) ڕۆژ و تا (٧ی شبات) بەردەوام بوو. لەماوەی ئەم چل ڕۆژەدا زیـاتر لـە(٨٠) هەزار چالاكی ئاسمانی ئەنجامدرا كە ڕۆژانە دوو تا سێ هەزار چالاكی ئاسمانی یـان كارفـەرمانی جـەنگی و هێرشی موشەكی ئەنجامدەدرا بۆ لێدانی شارەكان و دامـەزراوە پیشـەسازی و سـەربازیەكان و دامودەزگـای كارەبـا و بنكـە تەلـەفونات و گەیانـدن و جـادە و پردەكـانی عێـراق. هێـزە ئاسمانیـەكانی عێـراق یـەكێك لەئامانجەكانی هاوپەیمانان بوو لەیەكـەمین ڕۆژەكـانی ئۆپەراسـیۆنەكان هـەموو فڕۆكەخانـەكانی عێـراق بـۆ ڕێگرتن لەفڕینی فڕۆكەی عێراقی وێران كران. زیاتر لـە(٢٠٠) فڕۆكـەی عێـراق لەسـەر زەوی یـان لـەكاتی هەستانیدا تێكشكێنران و (١٤٧) فڕۆكەی سەربازی و مـەدەنی بـە مەبەسـتی ڕزگاربوونیـان بەسـەلامەتی بەبڕیاری سەدام حسین ڕوویانكردە ئێران﴾.

سەرئەنجام دوای پێنج هەفتە لەبۆردومانی چڕوپڕ، بوش فەرمانی هێرشی زەمینی بـۆ سـەر عێـراق دەركرد، لەم ماوەیەدا سەدام حسین بۆ تۆڵەكردنەوە لەو گورزە جەرگبڕەی بەر عێـراق كـەوتبوو، دەسـتیكرد

بەهێرشی موشەکی بۆ سەر شارەکانی عەرەبستانی سعودی و ئیسرائیل، بەڵام بەهۆی جێگیرکردنی موشەکی دژە موشەك (پاتریۆت)ی ئەمەریکی لەم دوو وڵاتە، زۆربەی هێرشە موشەکیەکانی عێراق پوچەڵکرانەوە. لێرەدا ئامانجی عێراق لەهێرشی موشەکی بۆ سەر ئیسرائیل زیاتر بۆ ڕاکێشانی هەست و سۆزی وڵاتانی مسلمانی جیهان بوو بۆ پارێزگاریکردن لەعێراق و درز خستنەناو بەرەی هاوپەیمانانەوە. بەبێدەنگ بوونی ئیسرائیل و وەڵامنەدانەوەی سەربازی ـ کە ئەمەریکا داوای لێکرد بوو ـ ئامانجەکەی سەدام حسین بوو بەبلقی سەرئاو.

لەبەرەبەیانی ڕۆژی (٢٤ شبات ١٩٩١) هێزی زەمینی ئەمەریکا لەناوچەی کەنداو کە لەنیو ملیۆن سەرباز تێدەپەری بەیارمەتی هێزی زەمینی بەریتانیا وفەرەنسا و عەرەبستانی سعودی و وڵاتانیتری بەشدار هێرشێکی گەورەیان بۆ ناوخاکی کوێت دەستپێکرد بەمەبەستی دەربەراندنی هێزە سەربازیەکانی عێراق لەوناوچەیە بۆ ماوەی چوار ڕۆژ درێژەی کێشا.

باری دەرونی تێکشکاوی عێراق لەبەرەکانی پێشەوەی شەڕ، بەهۆی دابڕانیان و پچرانی پەیوەندیان لەگەڵ ناوەوەی عێراق و برسێتی و تونیەتی بەهەزار هەزار خۆیان دەدابەدەست هێزی هاوپەیمانانەوە. سەدام حسین فەرمانی کشانەوەی هێزەکانی لەناو کوێت دەرکرد، بەڵام پێش دەرچوونی لەکوێت بڕیاری ناگربەردانی لەبیرە نەوتەکانی کوێتی دەرکرد، کە زۆرترین بیرەکانی ئەم وڵاتەی سوتاند و بڕێکی زۆر لەنەوتی ئەم وڵاتەی ڕژاندە ناوئاوی کەنداوەوە و بووەهۆی گەورەترین کارەساتی ژینگەی لەناوچەکە و جیهاندا.

لەکۆتایی سێیەمین ڕۆژی جەنگی زەمنی نزیکەی هەموو خاکی کوێت و بەشێکی گەورەی باشوری عێراق کەوتە ژێر دەستی هاوپەیمانەکانەوە لەهێزەکانی عێراق دەیان هەزار کوژراو و زیاتر شەست هەزار سەربازیان لێ بەدیلگیرا.

ئەم جەنگە خوێناوی و نابەرابەریە، هەواڵنێرانی ڕۆژئاوا بەگەورەترین جەنگی کلاسیکی زەمینی لەساڵانی دوای جەنگی دووەمی جیهانی ناوی دەبەن، سەرئەنجام لەڕۆژی چوارشەمە (١٩٩١/٢/٢٧) بەرازیبوونی هەموو مەرجەکانی ئەمەریکا و هەموو بڕیارەکانی ئەنجومەنی ئاسایش (لەناویاندا کشانەوەی بێمەرج لەکوێت و بژاردن و قەرەبووکردنەوەی زەرەرەکانی جەنگ و مانەوەی سزای ئابوری لەسەر عێراق) شەڕ کۆتایی هات و عێراق خۆیدابەدەستەوە. بوش عەسری ڕۆژی (چوارشەمەی ٢٧ ی شبات) بڕیاریدا کە جەنگ لەنیوەشەوەی چوارشەمە بەکاتی واشنگتۆن بەرامبەر (٨ ی بەیانی پێنج شەمە بەکاتی بەغدا) بوەستێت. بەجۆرە جەنگی زەمینی تەنیا سەد کاتژمێری خایاند.

هێزەکانی ئەمەریکا لەکەناری باشوری فورات بەدوری (٢٥٠کم) لەشاری بەغدا وەستان و جنراڵ شوارسکۆف لەچاوپێکەوتنێکدا لەدوای کۆتایی جەنگ ووتی ئەگەر بوش بڕیاری وەستانی ئۆپەراسیۆنی سەربازی دەرنەکردایە هێزەکانی ئەمەریکا دورۆژیتر دەگەیشتنە بەغدا.

جێگای باسە کە لەم جەنگەدا بنکەی دیگوگارسیا لەئۆقیانوسی هند بۆ ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆن و کارناسانی ئەمەریکا ڕۆڵی گەورەی بینی.

﴿زیانە مادیەکانی ئەم جەنگە تائێستا ناتوانین بیخەملێنین، بەڵام وەك تێبینی دەکرێت زیاتر لە(٦٠) ملیۆن کیلۆگرام بۆمب و مادەی تەقینەوە بەسەر عێراقدا لەماوەی چل ڕۆژی جەنگ و وێرانبوونی بەشی زۆری بنکە پیشەسازی و سەربازی و پاڵاوگەکان و فڕۆکەخانەکان و پردەکانی ئەم وڵاتە و زیانەکانی لەم جەنگەدا بە سەدەها ملیارد دۆلار دادەنرێت. ( هەندێك لەپسپۆران ڕێژەی زیانەکان بە ٢٠٠ ملیارد دۆلار دەخەملێنن).

ژمارەی هێزەکانی ئەمەریکا لەقۆناغەکانی کۆتایی جەنگی کەنداو گەیشتە (٥٣٩) هەزار کەس، کە بە گەورەترین لەشکرکێشی ئەمەریکا دەژمێرێت لەدوای جەنگی ڤێتنامەوە.

هەموو تێچونی جەنگ لەسەر ئەمەریکا و هاوپەیمانەکان، بەپێی هەڵسەنگاندنێکی وەزارەتی بەرگری ئەمەریکا کە لەژمارەیەکی گۆڤاری تایم کە (١١ی مارس ١٩٩١) بڵاوکراوەتەوە بە (٤٧,٥) ملیارد دۆلار خەملێنراوە. گۆڤاری تایم لەهەمان ژمارەدا نوسیویەتی، شەش وڵات ئەڵمانیا، یابان، عەرەبستانی سعودی، کوێت، ئیمارەتی عەرەبی و کۆریای باشوور ڕازی بوون بە پێدانی (٥٣,٥) ملیارد دۆلار خەرجی جەنگ وەك پێشینەی سەرەتایی خەرجیەکانی ئەم جەنگە﴾.

جەنگی کەنداو کە بەلۆجیکی هەردوو لایەنی بەشەرهاتوو پاڵنەری ئابووری و سیاسی هەبووە و بە(جەنگی نەوت) دەناسرێت.

بڕیاری ئاگربەستی ئەمەریکا لە(٢٧شبات)دا گفتوگۆی زۆری هێنایە ئاراوە. بەڵام لەوکاتەدا ڕاگەیەندرا کە پێشتر لەنامانجە ڕاگەیەنراوەکەی بوش لە(تابی ١٩٩٠) کاتی ئاگربەستی کرداریە (عملی). کوێت ئازاد بووە و هاوسەنگی عێراق بۆ جێبەجێکردنی چالاکی هێرش بردن لەدوایدا بەشێوەیەکی خراپ کەمیکردووە. گورزێك کە بەرتوانای جەنگی و سەربازی عێراق کەوتووە بەو شێوەیە نەبوو کە پێشبینی دەکرا، بەجۆرە گورزێکی قورس بوو. ڕاستە لەجەنگی زەمینیدا زیانەکانی ئەمەریکا کەمتر بوو لەوەی کە چاوەڕوان دەکرا، نرخی بەردەوامی جەنگ بەنومێدی ڕوخانی سەدام حسین ئارۆشن بوو.

جگەلە ئەمەریکا کەس مۆڵەتی ئۆپەراسیۆنی سەربازی لەناو عێراق نەبوو، لەکاتی بەردەوامی جەنگ دەخرایە ژێر پرسیارەوە. ئەگەر واشنگتۆن ڕوخانی ڕژێمی سەدامی لەناو ئامانجە سەرەکی و

دیارەکانی جەنگی دابنایە ئەگەر هەبوو هاوکاری یەکێتی سۆڤیێت و عەرەبەکان و هەتا فەرەنساشی لەدەست بدایا.

لەبەڵگە و هۆکاریتر کە وایکرد جۆرج بوش سەرۆك کۆماری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا والێبکات لەکاتی ئۆپەراسیۆن جەنگی کەنداو خۆی بپارێزێت لەپێشرەوەی بەرەو بەغدا و ئەم بڕیارەش بووە هۆی مانەوەی سەدام حسین، نەبوونی ئەلتەرناتیفێکی گونجاو بوو لەجێگای دیکتاتۆری بەغدا، کە بووەهۆی ڕزگاربوونی گیانی سەدام حسین، چونکە بەتەواوی ئاشکرابوو کە سەرنگونی ڕژێمی بەعسی عێراق کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر دەرکەوتنی حکومەتی خودمختاری کوردەکانی عێراق لەباکوور و شیعەکان لەباشووری ئەم وڵاتە دەبێت. ڕوودانی ئەم گۆڕانکاریە و دوو ئەنجامی لەڕادەبەدەر گرنگ لەسەر ئاستی ناوچەکە دەگرێتەخۆ کە هاوسەنگی هێزەکان دەگۆڕێت و لەئەنجامدا دەبێتەهۆی ئەوەی بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکان لەناوچەکە بخاتە مەترسیەوە.

یەکەمین ئەنجامی ئەمە دابەشبوونی عێراق و بەهێزبوونی ئێران بوو، کە وەك تەنیا هێزی باڵادەست نکۆڵی لێنەکراو لەناوچەکە دەمێنێتەوە. دووەم دروستبوون و جێگیربوونی حکومەتێکی ئیسلامی و نەیاری ئەمەریکا لەسەر زەوی عێراق کە دەیتوانی بەتەواوی کارگەری ئایدیۆلۆجی لەسەر میرنشینە نەوتیی و دەوڵەمەندکانی کەناری باشوری کەنداو هەبێت.

(سەرەڕای ئەو بابەتانەی سەرەوە، مانەوەی سەدام لەسەر دەسەڵات ئەگەری زۆرترە لەڕووی داماڵینی چەکی عێراق سەپاندنی بڕیاری چەك داماڵین، بەتایبەت سەبارەت بەچەکە کۆکوژەکان کە لەکاتی جێگیربوونی حکومەتێکی بەدەسەڵات لەم وڵاتە ئەنجامدانی ئەم کارە ئاسان نەدەبوو).

ئامانجی دورتری ئەمەریکا لەلانەبردنی سەدام و مانەوەی توانا ترسێنەرەکەی لەبەرامبەر وڵاتانی عەرەبی کەنداوبوو، تا بەو ڕێگایە هەم چەك و جبەخانەکانی خۆی بەو وڵاتانە بفرۆشێت و هەم مانەوە جێگیرکردنی هێزەکانی لەناوچەکە مسۆگەر بکات.

(هەڵە نییە گەر بڵێین نەخشەی باڵادەستی بەسەر کەنداودا دەگەڕێتەوە بۆ فکری هینری کیسنجر، ئەم پلانە لەژێر چاودێری ئەو لەساڵی (١٩٧٥) ئامادەکراوە و دواتر لەژێر ناونیشانی (زاڵبوون بەسەر نەوتدا) لەهارپێرس مەگەزین (Harpers Magazine) بڵاوکرایەوە.

## ئەنجامە ستراتیجیەکانی هێرشی ئەمەریکا و هاوپەیمانان بۆ سەر عێراق :

پێش دوژمنکاری عێراق بۆ سەر کوێت ❊ رۆبەرت ئاینمن لەوتارێکدا لەژێر ناونیشانی (تەکنەلۆجیا و توانای چاودێری: سنورە نوێیەکانی سیاسەت) لەژمارەی (بەهاری ۱۹۹۰) ئۆرگانی ئەنجومەنی پەیوەندیەکانی دەرەوەی ئەمەریکا، هۆشداری دەدات کە (لەکاتی بەشدارینەکردنی حکومەت لەهاندانی پیشەسازی ئەمەریکا بە گرنگیدانی زیاتر لەبواری لێکۆڵینەوە و پەرەپێدان، سەرمایەگوزاری ماوەدرێژ و زیادکردنی کارایی سیستەمی پەروەردەیی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ئەم وڵاتە لەململانێ لەگەڵ هاوپەیمانە سیاسیەکانی سەردەمی جەنگی سارد دوادەکەوێت ئەگەر ئەم ململانێیە لەگەڵ یەکێتی سۆڤێت کورتیهێنابێت، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەکەوێتە بەردەم هەڵبژاردنی (ایختیارات) دژوارەوە).

لەبەرئەوە لەکاتێکدا ناردەنی بەرهەمە ناسەربازیەکانی ئەمەریکا بەهەمان خێرایی یابان و ئەوروپا و وڵاتانی تازە پیشەسازی گەشە نەکات، لەکاتێکدا بارودۆخی تازەی نێودەوڵەتی پێویستی بۆ بەرهەمهێنانی کەلوپەلی جەنگی کەمبۆتەوە، لەکاتێکدا ئەوروپا لەئایندەدا بازارێکی گەورەی خستۆتە خزمەتی پیشەسازیەکانی خۆیەوە و لەتەکنەلۆجیای پێشکەوتوو و بەرهەمە پیشەسازیەکانیتر لەو کیشوەرەدا، ئەم کارە ئاسۆی گەشەی ناردەنی بەرهەمە ناسەربازیەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا تاریکتر دەکات. سەرئەنجام لەکاتێکدا کە گەشەی توانای دارایی و پیشەسازی ژاپۆن لەبەردەوامیدایە، لەم بارودۆخەدا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەبێت داواکاری دەرەکی لەسەر بەروبوومە ئابووریەکانی خۆی زیاد بکات و داواکاری ناوخۆ لەسەر بەروبوومی هاوردەنی دەرکی کەمبکاتەوە تا لاسەنگی بودجەی خۆی هاوسەنگ و بەرزبکاتەوە، بتوانێت سەرمایەگوزاری زیادبکاتەوە و توانای ڕکەبەرایەتی هەبێت، بەگوزارشتێکیتر چۆن دەتوانێت ئەم ئەنجامە بەدەست بهێنێت:

کۆتایی جەنگی سارد، ئابووری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەخاڵی هێز و پێشکەوتنەوە بەبەراورد بەئابووری وڵاتانی ئەوروپا و یابان دادەبەزێت و وابەستەیی ئەوروپا و یابان بەهێزی سەربازی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە کەمدەکاتەوە و لەئەنجامدا هەل بۆ ئەم وڵاتانە زیاددەکات کە ئەو دەرامەتە زیادەیەی لەبواری سەربازی خەرجیان کردووە بۆ باشکردنی تەکنەلۆجیا وتوانای ململانێی ئابووری بەکاربهێنن و لەپێشبڕکێی بۆ دەسکەوتنی تەکنەلۆجیای باڵاتر، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ناچارە دەرامەتی زیاتر لەپیشەسازی بەتایبەت تەکنەلۆجیای پێشکەوتوو خەرج بکات و هەروەها ژینگەی نارامی نێودەوڵەتی و خواست لەسەر بەروبووم و خزمەتگوزراری سەربازی کەمدەکاتەوە و لەسەر بەروبوومی ناسەربازی زیاد دەکات، بەڵام گۆڕانکاری ئابووری ئەمەریکا لەدەیەی ڕابردوودا لەبواری ناسەربازیدا لەبەرامبەر ئەوروپا و یابان پێگەیەکی لاوازی هەبووە.

لەئەنجامی هەموو ئەوەی کەوترا دەردەکەوێت کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ ڕزگارکردنی ئابووری خۆی و پارێزگاریکردنی ڕۆڵی سەرکردایەتی جیهان لەدنیای دوای جەنگی سارد، یەکەم دەبێت کۆنترۆڵی ئەو کاڵایانە بەدەستەوە بگرێت کە کاریگەری لەسەر خواستی نێودەوڵەتی و خواستی نێوخۆی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەیە، ئەو کاڵایەش نەوتە. دووەم ئەمەریکا لایەنگری ئاڵارامی کەشوهەوای نێودەوڵەتی و دروستکردنی قەیرانە، شێوازی گەشەی ئابووری هێواشە بۆیە لەڕێگای میکانیزمی ئابووریەوە ناتوانێت بەردەوامبێت، بەجەنگ و دەرکردنی بازاری هەرێمی لەرکەبەرایەتی دروستکردنی بەرزیونزمی لەنرخی وزە و لەپێناوی دروستکردنی خواست بۆ بەرهەم و خزمەتگوزاریەکانی هەوڵدەدات بەو ئامانجە بگات تا کۆمپانیا و دامەزراوەکانی بنێرێتە بازارەکانی جیهانەوە و دەستی بەسەردا بگرێت﴾.

بەهەڵگیرساندنی جەنگی کەنداو تا ئاستێکی زۆر بە ئامانجەکانی خۆی لە ناوچەکە گەیشت، بەهەڵگیرساندنی ئەم جەنگە ئەمەریکا بەئامانجی زۆر لەپەیوەند بەبەرژەوەندیەکانی خۆی گەیشت کە لەخوارەوە ئاماژە بۆ هەندێکیان دەکەین.

لەناو ئامانجەکانی ئەمەریکا وەك ستراتیجێك لەسیاسەتی دەرەوەی خۆیدا، کۆنترۆڵی وردەوردەی ناوەندی ژیانی ئابووری جیهانی کرد، کە بەباڵادەستی و کۆنترۆڵی دەرامەتی دابنکردنی وزەی وڵاتانی پێشکەوتووی جیهان دەتوانێت کاربکات، باشترین ڕێگاچارە بۆ جێبەجێکردنی ئەم سیاسەتە کۆنترۆڵی ناوچەی دەوڵەمەند بەنەوتی کەنداوە، کە لەڕێگای دوژمنکاری عێراق بە کوێت و جەنگی کەنداو ئەمەریکا بەئامانجە و خواستەکانی گەیشت.

بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا فاکتەری سەرەکی لەقەیرانی کەنداو پاراستنی بێوێنە و یەکێتیەکی سەربازی نافەرمی لەگەڵ زۆربەی حکومەتە عەرەبیەکاندابوو، لەسەرەتای قۆناغی قەیرانەکە، ئەمەریکا سەرکەوتوو بوو تا نیگەرانی عەرەبەکان سەبارەت بەئیسرائیل جیابکاتەوە لەبڕیاری کۆکردنەوەیان لەبەرامبەر عێراقدا، ئەمەریکا بۆ بەدیهێنانی سیاسەتی خۆی لەکەنداو هەتا ئامادەبوو زەرەری وڵاتە بەرژەوندیخوازەکان لەقەیرانی ئەو ناوچەیە بژمێرێت. (بەخشینی (٧) ملیارد دۆلار بە میسر و (٧,٣) ملیارد دۆلار بەترکیا لەئەیلولی (١٩٩٠) و هەروەها پێدانی یارمەتی تایبەت بە ئەردەن و میسر و تورکیا لەم چوارچێوەیەدا بوو).

بۆ یەکەمینجار دوای جەنگی دووەمی جیهانی ئەمەریکا لەقەیرانێکی گەورەی نێودەوڵەتی وەك زلهێزێکی جیهانی هاتەمەیدانەوە و حکومەتی سۆڤێت جگە لەشوێنکەتنی هیچی نەکرد و وڵاتە گەورە پیشەسازیەکانی ئەوروپا و یابان لەبەرامبەر سیاسەتێك کە ئەمەریکا دایڕشتبوو جێبەجێیان دەکرد نارەزایەتیان دەرنەبڕی، بەڵکو بەبەشداری ڕاستەوخۆ لەجەنگی کەنداو و بەپێدانی بەشێکی گرنگی

تێچوونی جەنگ توانیان سوود لەدەرامەتەکان و بازاڕی ئەم ناوچەیە وەربگرن. (ئەڵمانیا ڕازیبوو بەپێدانی زیاتر لە(٦,٥) ملیارد دۆلار خەرجی جەنگ و ڕێژەی بەشداری یابان زیاتر لە(١٠) ملیارد دۆلار واتە نزیکەی پێنجیەکی هەموو خەرجی جەنگەکە).

لەڕاستیدا ئەمەریکا بەم سیاسەتە و پێدانی خەرجی جەنگ لەم وڵاتانە تەنیا خەرجیەکە قبوڵ نەکرا، بەڵکو بەبەکارهێنانی چەکە ئەمبارکراوەکانی جارێکیتر کارگەکانی چەك دروستکردنی خستەوەکار و لەڕووی داراییەوە سەرمایەی نوستوو لەئەمبارەکانی ئەم وڵاتەدا بەشێوەیەکی چالاك لەبازاڕی ئەو وڵاتە کەوتەوەگەڕ.

هەروەها کوێت، کە خەرجی نۆژەنکردنەوەی بە نزیکەی (١٠٠) ملیارد دۆلار دەخەملێنرێت بازاڕێکی پڕدەرامەتە بۆ کاڵای ئەمەریکی کردەوە. هەڵبەت وڵاتانیترش کە بەشداریان کرد لە جەنگی کەنداودا، بە تایبەت بەریتانیا و ئەڵمانیا و یابان لەم کارە سودمەند بوون. عێراق ویرانکرا هەم بۆ نوژەنکردنەوەی خۆی ناچاربوو پەنابۆ وڵاتانی پیشەسازی ڕۆژئاوا و یابان بەرێت و بەشێکی گرنگی دەرامەتی نەوتی خۆی بخاتە گیرفانی کۆمپانیاکانی ڕۆژئاواوە.

﴿ لەهەمانکاتدا لەکاتی قەیرانی (١٩٩٠-١٩٩١)ی کوێت، هاوسەنگی هێز لەکەنداو تێکچوو و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەئامادەیی سەربازی بەهێزەوە، دەستلەناو دەستی وڵاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو، بەشێوەی دەسەڵاتی باڵاتر لەناوچەکە دەرکەوت. ئێران لەپایەی دووەمدا بوو و عێراقیش بەشێوەی گشتی لەکارکەوتبوو. نۆپەراسیۆنی سەربازی لەلایەن وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەکاتی قەیرانی کوێتدا، هەم لەدیدی فراوانی و هەم لەدیدی خێرایی گواستنەوەی سەرباز و نامێری جەنگی بێوێنەبوو، ئەم گۆڕانکاریە ستراتیجیە، ئامادەیی بەردەوامی سەربازی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەکەنداو سەلماند، ئەم بەردەوامی ئامادەیی سەربازیە، بووەهۆی گۆڕانکاری بنەما ستراتیجیەکانی لەناوچەکەدا، نەك تەنیا گەورەترین هێزە سەربازیەکانی کەنداو (ئێران و عێراق بە جەنگی کەنداو قەیرانی کوێتەوە) گورزیاخواربوو، کە توانای دارایی لەکەنداو وەرگرت و دەوڵەمەندانی ناوچەکە (عەرەبستانی سعودی و کوێت و ئیمارات) بۆ یەکەمینجار چونە ریزی وڵاتە قەرزارەکانەوە﴾.

سەرەڕای ئەوانەی پێشەوە ئەمەریکا لەکۆتایی ئەم جەنگدا بەئامانجی سەرەکی و ستراتیجیتر گەیشت لەناوچەی کەنداو کە لەخوارەوە ئاماژە بۆ هەندێکیان دەکەین:

**(١) ئامادەیی کارا و ڕاستەوخۆی سەربازی لەناوچەکە:**

داگیرکردنی کوێت لە(١٩٩٠/٨/٢)، هەلێکی باشی بۆ جێبەجێکردنی ستراتیجیەتی ئەمەریکا ڕەخساند، بە ئامادەبوون و جێگیربوونی لەناوچەی کەنداو تابتوانێت کێشە ستراتیجیەکانی دوای قۆناغی جەنگی سارد چارەسەربکات.

ڕۆڵێك کەئەمەریکا وەك پارێزەری عەرەبستانی سعودی و بەرگریکەر لەکوێت لەبەرامبەر مەترسی هێرشی عێراق لەجەنگی کەنداو بینی و ئامادەبوونی زیاتر لەنیو ملیۆن سەربازی ئەمەریکی لەسەرخاکی عەرەبستانی سعودی لەکاتی جەنگدا، نفوزی ئەمەریکای لەم وڵاتە و وڵاتانیتری ناوچەکە زیادکرد. یەکێك لەهۆیەکانی مانەوەی ڕژێمی سەدام حسین دوای کۆتایی هاتنی جەنگ، ئەم بیانووەبوو بۆ درێژەدان بەمانەوەی هێزە سەربازیەکانی لەناوچەکەدا. لەبەرئەوە بوونی سەربازی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەم ڕووەوە پێویست بوو بەبیانووی ئەوەی کە وڵاتانی کەناری باشووری کەنداو توانای بەرگریکردن لەخۆیان نییە لەبەرامبەر هێزە گەورەکانی ناوچەی کەنداو کە پاشکۆی سیاسەتی دەرەکی ئەمەریکا نین.

هەر لەم تێڕوانینەوەیە کە (جنراڵ کۆڵن پاوەڵ فەرماندەی فەرماندەیی هاوبەشی ئەمەریکا و جیمس بیکر وەزیری کاروباری دەرەوە ئەو ڕاگەیاندنەیاندا کە هێزە سەربازیەکانی ئەمەریکا تادوای چارەسەری قەیرانی کەنداو لەناوچەکە دەمێننەوە).

دوای جەنگ ئەمەریکیەکان بەدانوسان لەگەڵ وڵاتانی باشوری کەنداو بۆ بەستنی ڕێکەوتنی بەرگری و جێگیرکردنی بنکەی سەربازی هەمیشەیی لەم ناوچەیە خەریك بوون. تا بتوانن لەڕێگای دامەزراندنی بنکەی دەریایی و ئاسمانی لەوڵاتانیتری کەناری باشوری کەنداو ئامادەیی هەمیشەیی خۆیان لەم ناوچەیە بەدەست بهێنن.

لەبەرئەوە ((هێشتا دەنگدانەوەی جەنگی دووەمی کەنداو لەڕووی دەستێوەردانی سەربازی و ئاسایشی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەکەنداوی فارسی و دەریای عەرەبی بەرچاو دەکەوێت. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا سەرکەوتووبوو تادوای کۆتایی جەنگی دووەمی کەنداو ڕێکەوتنی ئاسایشی بەرفراوان و گرنگ واژۆبکات و هێزەکانی خۆی لەناوچەکە جێگیر بکات، کە ژمارەیان دەگاتە (٢٥) هەزار سەرباز. ئەم ژمارەیە نزیکەی دوازدە ئەوەندەی هێزەکانی ئەمەریکایە لەناوچەکە پێش ساڵی (١٩٩٠). سەرەڕای بڵاوبوونەوەی هێزە سەربازیەکانی ئەمەریکا لەناوچەکە، بەرنامەڕێژی پێویست بۆ ڕاهێنان، ڕێکخستن، پەرەپێدانی هێزە سەربازیەکانی وڵاتانی عەرەبی ناوچەکە لەڕووی چەندی و چۆنیەوە لەلایەن ڕاوێژکارانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە لەوڵاتانی ناوچەکە ئەنجامدرا، لەم بوارەدا قەبارەی و ژمارەی هێزە سەربازیەکانی وڵاتانی ناوچەکە لەسەر ئاستی ناوچەکە زیادیکرد)).

بەپێی گوزارشتێکی بنکەی لێکۆڵینەوەی ستراتیجی لەلەندەن بەناوی (هاوسەنگی سەربازی) دەڵێت ئەو (٢٥) هەزار کەسەی سەر بەهێزی سەربازی ئەمەریکا لەناوچەکەن بەجۆرە دابەشبوون لەکوێت (١٢٠٠)کەس سەربەهێزی پیادە، (١٠٠٠)کەس هێزی دەریایی و (٢٥) کەس هێزی ئاسمانی، لەعەرەبستانی سعودی (١٤٠٠)کەس هێزی پیادە و (١٨٢٠) کەس هێزی ئاسمانی و لە قەتەر (١٣) کەس هێزی پیادە و (٢)کەس هێزی ئاسمانی و ئەوانیتریان لەسەر کەشتیە جەنگیەکانی ناوچەکە جێگیرکراون.

لەکۆتایدا ڕەهەندی جیوپۆلەتیکی مانەوە لەناوچەکە زۆر لەوەفراوانترە تەنیا لەناوچەی کەنداوبێت، بەو واتایەی کە ئەمەریکا بەدەستکەوتنی هەلێك بۆئەوەی دانوسـانەکانی عـەرەب و ئیـسرائیل بخاتـە ژێـر چاودیری خۆیەوە.

**(٢) کۆنترۆڵی دەرامەتی نەوتی وڵاتانی کەنداو:**

ئەگەر بزانین کە کەنداو نیـوەی سـوتەمەنی بـەکارهێنراوی ئـەوروپای ڕۆژئـاوا و زیـاتر لـە(٧٠٪) سوتەمەنی یابان دابینددکات و نزیکەی (٦٥٪) یەدەگی نەوتی جیهان کەوتۆتە (٧) وڵاتی کەنداوەوە، کـە بەشی زۆری ناردەنی نەوتی ئەوان بەکەنداوی فارسیدا تێدەپەڕێت، کەنداو تەنیا ناوچـەیە کـە لـەڕووی زۆری توانای بەرهـەم و لـەڕووی پێویـستیەوە وەك دواهـەمین سـەرچـاوەی ووزە دەردەکـەوێت لـەم ڕووەوە گرنگـی سـتراتیجی خـۆی هەیـە، لەبەرئـەوە بـەردەوامی مانـەوەی هێزەکـانی ئەمـەریکا لەکەنـداو بەبۆچـوونی سەرمایەداری ئەمەریکا دەتوانێت بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ ئامانجە باڵاکانی ئابووری ئەم وڵاتـە لەپەیوەنـدی لەگەڵ ئەوروپا و یابان دابینبکات، لەبەرئەوە هەوڵـدان بـۆ کـۆنترۆڵ کردنـی سـەرچـاوەی دابینکردنـی وزەی جەمسەرە پیشەسازیەکانی وەك یابان و یەکێتی ئەوروپا کە بەرکەبـەری سـەرکی ئەمـەریکا دەژمێـردرین، لەئامانجە دورمەوداکانی ئەمەریکایە بۆ داگیرکردنی بنکەی نەوتی کەنداو.

واتە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەیـەوێت (بەلۆعـەی نـەوت)ی لەبەردەسـتدابێت تـا هێـزی دروسـتکردنی جوڵـە لـەئابووری جیهـان و توانـای کـۆنترۆڵی ڕەوشـی گەشـەی بەربـەرەکانی ئـابووری خـۆی بەدەسـت بهێنێـت. بەهـەمان هـۆ ئـەو وڵاتـە پیـشەسازیانە لـەدابینکردنی ووزەی پێویـست زیـاد لـەجاران پێویـستیان بەهاوکاری ئەمەریکا دەبێت، ڕاسـتی ئەم خواستە جنراڵ (فون لوهازن) لەوتارێکدا بەناونیـشانی (جەنگی کەنداو: جەنگێکە لەدژی ئەوروپا) بەجۆرە دەیخاتەڕوو (ئەنجامی جـەنگی کەنـداو، کورتهێنـانێکی گەورەیە لەسیاسـەتی ئەمـەریکا و ناکامی و شکستبوو بۆ ئەوروپا، ئەمە تاوان و بەهایەکە کە ئەوروپیەکان قبوڵیدەکەن، چونکە دەسـەڵاتیان کردە قوربانی خەرجی. ئەم جەنگە، ئەوروپای خستە پەراوێزەوە و هـەموو بڕیارەکان بەبێ جییاوازی ئەمەریکا دەریدەکات).

هەروەها جەنگی کەنداو بووەهۆی ئەوەی کە نفـوزی ئەمـەریکا لەعەرەبستانی سـعودی، کوێـت و ئیماراتی عـەرەبی، کە زیاتر لە(٣/٢) نەوتی ئەم ناوچەیە دەنێرنـەدەرەوە و ئـەم سێ وڵاتـە دەتـوانن ڕۆڵـی کاریگەر ببینن لەبڕیارەکانی ئۆپێك و دیاریکردنی نرخی نەوت لەبازاڕەکانی جیهاندان بەواتایەکیتر دەتوانین بڵێین وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا (لەڕێگای ئەم سێ وڵاتەوە) لەناوئۆپێکدا بوونی هەیە.

بەسەرنجدان لەوابەستەیی زۆری ئـەمەریکا بەنەوتی کەنداوەوە و کەمبوونەوەی یـەدەگی نـەوتی ئـەم وڵاتە لەئایندەدا، گرنگی باڵادەسـتی وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکا لـەم ناوچـەیە بەباشـی دەردەخـات بەجۆرێك کە (ویلیام ڤیبستر سەرۆکی ڕێکخـراوی (CIA) لەبـەردەم کۆمیتـەی خزمـەتگوزاری سـەربازی

ئەنجومەنی پیرانی ئەمەریکا، لە(١٩٩٠/١/٢٣) دەریخست کە هاوردەی نەوتی ئەمەریکا لەکەنداو بەشێوەیەکی سەیر لە(١٠٪) بۆ (٢٥٪) لەماوەی پێنج ساڵی ئایندەدا زیاددەکات).

**(٣) لاوازکردنی عێراق :**

لەگەڵ کۆتاییهاتنی جەنگی عێراق ئێران، بوون و گەشەی ماتۆری جەنگی سەدام لەناوچەکە ئیتر بۆ ڕۆژئاوا ئاسایی نەبوو، مەترسی گەورەی بۆ وڵاتانی ناوچەکە و ئیسرائیل دروستدەکرد. لەم ڕووەوە دەبوو لەیەك ڕووداوی حسابۆکراو و ئاڵۆزدا ئەم ماتۆری جەنگە بەتوندی سەرکوت بکرێت. ئەمکارە بەجۆرێك بکرێت کە ببێتە جێگای ڕازیکردنی هەندێك لەوڵاتانی ناوچەکە و بەپاراستنی جیهان سەیربکرێت.

لەبەرئەوە ئامانجی هاوبەشی ئەمەریکا و ئیسرائیل تێکشکاندنی ماتۆری جەنگی عێراق و سڕینەوەی ئەم وڵاتە وەك هێزێکی هەرێمی بوو، تائیسرائیل وەك هێزی سەربازی سەرەکی ناوچەکە بمێنێت و لەکاتی ئەنجامدانی هەر دانوسانێکدا لەبارەی ئایندەی ناوچەکە لەپێگەیەکی بەرزتردابێت.

بەشێك لەستراتیجی ئەمەریکا لەناوچەکە پەیوەستەبەوەی کەهێزی سەربازی و تەکنەلۆجی وڵاتانی ناوچەکە لەوەزیاتربێت کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەگونجاوی نازانێت، لەکاتێکدا ئەگەر ئەمە ڕوویدات، ئەمەریکا هەوڵدەدات (هاوسەنگی ویستراو) بەرقەراربکات، کە ئەم بارودۆخە لەعێراق بەرچاوکەوت و بە تێکشکانی عێراق لەجەنگی دووەمی کەنداو توانی هێزی سەربازی عێراق وەك هێزێکی بەرجەستە و هێرشبەر لەناوچەکە بتوێنێتەوە و بەشێکی سەرەکی کە ماوەتەوە لەژێر کۆنتڕۆڵ و ڕکێفی نێودەوڵەتیدا بهێڵێتەوە.

تێکشکاندنی ماتۆری جەنگی عێراق ئاگادارکردنەوەبوو بۆ ئەوەی کە هیچ هێزێکی سەربازی هەتا بەپێشکەوتووترین کەلوپەلی ڕووسی لەبەرامبەر هێزی وێرانکەری ڕۆژئاوا بەتایبەت ئەمەریکا ناتوانێت خۆی ڕابگرێت، ئەم هەنگاوە نەك تەنیا گورزێکی کوشندەبوو بۆ عێراق، بەڵکو دەتوانین بڵێین گورزێکی کاریگەربوو بۆ زۆربەی وڵاتانی ناوچەکە.

سەرەڕای ئەوە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دوای جەنگی کەنداو بەهەموو هێزیەوە هەوڵدەدات ڕێگابگرێت لەخۆپڕچەك کردنەوەی عێراق تا بەربگرێت لەنوژەنکردنەوەی جبەخانەکان و بەهێزکردنی هێزە سەربازیەکەی.

**(٤) فرۆشتنی چەك لەناوچەکە:**

جەنگی کەنداو بۆ ئەمەریکا لەکات و شوێنی خۆیدابوو، یەکەم بەو هۆیەی کە ملیارەها دۆلار کە لەدەیەی پێشوودا بۆ بواری چەك خەرجکرابوو، دەبوایە توانا و کاریگەریەکەی پیشانبدرێت، هەروەها پێش جەنگی کەنداو کەرگەکانی بەرهەمهێنانی چەك لەئەمەریکا و ئەوروپا بەهۆی ڕوخانی بلۆکی کۆمۆنیستی و نەمانی مەترسی یەکێتی سۆڤێت کەوتبوونە قەیرانەوە لەوەبەدواوە خواستی تازە لەسەر چەك بۆ

جێگرتنەوەی ئامێری جەنگی کاول بوو، جوڵەی لەئابووری ئەمەریکادا دروستکرد کە بەتوندی پێویستیان پێبوو.

لەدوای جەنگی کەنداو، بڕێکی زۆر لەچەك و پێویستیەکان کە لەم جەنگەدا بەکارهێنران، نەك تەنیا دەبوو جێگای ئەو چەکە بەکارهاتوانە بگرنەوە، بەڵکو ناردنی چەك بۆ وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە چەکی زیاتریان داواکردبوو، کارگەکانی چەك لەڕۆژئاوا بەتایبەت ئەمەریکا گیانی تازەیان بەبەردا هاتەوە. ((ئەمەریکا ڕازیبوو بەبەهای زیاتر لە(١٨) ملیارد دۆلار فڕۆکە و تانك و کەلوپەلی جەنگی بۆ وڵاتانی هاوپەیمانی خۆی لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دوای جەنگ بنێرێت کە بەشی زۆری بۆ عەرەبستانی سعودی نێردرا)).

((سەرکەوتنی تەکنەلۆجیا ئەمەریکا لەئۆپەراسیۆن گەردەلولی بیاباندا، بووەهۆی زۆری داواکاری وڵاتانی هاوپەیمانی ئەم وڵاتە لەسەر چەك و ڕازیبوونی کۆمپانیا ئەمەریکیەکان لەدابینکردنی. لەجیاتی ئەوەی ئەمەریکا بەسوودوەرگرتن لەپێگەی خۆی بۆ پارێزگاریکردنی نێودەوڵەتی بۆ کەمکردنەوەی فرۆشتنی چەك بەجیهانی سێیەم، حکومەتەکەی بوش پڕۆژەیەکی پەسەندکرد کە بانکی هاوردە و ناردەنی ئەمەریکا مۆڵەت بدات بەپێدانی نزیکەی (٢٣) ملیارد دۆلار قەرز بەهاوپەیمانەکانی ئەمەریکا بۆ دابینکردن و کڕینی چەکی پێشکەوتوو و ناسراوی ئەمەریکا)).

لەبەرئەوە یەکێك لەئاماانجە سەرەکیەکانی ئەمەریکا، لەدروستکردنی قەیران لەم ناوچەیە سەرەوخوارکردنی دەرامەتی نەوتی عەرەبستانی سعودی و وڵاتانیتری کەنداو بوو (بەگرانبوونی نەوت بۆ ماوەی چەند مانگ و گواستنەوەی سەرمایە لەوڵاتانیتری جیهان بۆ ناوچەی کەنداو)، تابتوانێت تێچوونی پەیوەست بەئاسانکاری سەربازی و ناسەربازی ئەمەریکایی بدات.

بەمجۆرە فرۆشتنی هەرچی زیاتری چەك و نیازمەندکردنی ناوچەکە بەتەکنەلۆجیا و سەرمایە و پسپۆری ڕۆژئاوا لەئامانجەکانی تری ئەم قەیرانەیە.

**(٥) لەئامانجەکانیتری جەنگی کەنداو ئەوەیە کە ئەمەریکا لەگۆڕەپانی ئەم جەنگەدا توانی چەکە** تازەکانی خۆی تاقیبکاتەوە و توانا و کاریگەری هەریەکەیانی هەڵسەنگاند، وەك موشەکی تازەی سەتەلایتی و جێگرتنەوەیان لەشوێنی کۆنەکان، موشەکی پاتریۆت یافڕۆکەی ستلیت و بی ٢ و چەکەکانیتر.

هەروەها ((لەگوزارشتێکی نهێنی ڕێکخراوی ناوکی بەریتانیادا پشتگیری کراوە کە نزیکەی (٤٠٠) تەن یۆرانیۆمی پیتێنراو بەسەر خەڵکدا باریوە، بەقسەی هەندێك لەپسپۆرانی ئەوروپایی دەگێڕنەوە کە عێراق گونجاوترین شوێن بووە کە ئەنجامی بەکارهێنانی یۆرانیۆمی لێوەرگیرێت، مەیدانێکی گونجاوە بۆ وێرانکردنی پاشماوەی ئەتومی بەرهەمهاتوو)).

## ستراتیجی سیاسەتی جلەوگیری دوولایەنە:

تادەستپێکی جەنگی کوێت، سیاسەتی ئەمەریکا لەسەر بنەمای تیۆری (هاوسەنگی هێز) رێکخرابوو، پێش شۆڕشی ئیسلامی ئێران پاراستنی هاوسەنگی لەنێوان ئێران، عەرەبستانی سعودی و عێراق دروستکرابوو. دوای شۆڕش لاوازکردن و بەربەست دانان لەبەردەم نفوزی ئێران لەرێگای گۆشەگیرکردنی ئێران و بەهێزکردنی عەرەبستانی سعودی و عێراق و سەپاندنی جەنگ بەسەریدا سەریهەڵدا، بەڵام ئەو ستراتیجەی سەرەوە ئەو ئەنجامەی لێکەوتەوە کە ناوچەکەی توشی قەیرانکرد لەئەنجامی ناهاوسەنگیەوە دروستبوو. دوژمنکاری عێراق بۆ سەر کوێت لەئەنجامی هەوڵدان بۆ هاوسەنگ کردنی هێز لەگەڵ ئێران لەلایەن عێراقەوە سەرچاوەی گرتووە. بۆیە دوای جەنگی کەنداو (سیاسەتی جلەوگیری دوولایەنە) بەواتا بەربەست دانان لەبەردەم نفوزی ئێران و عێراق جێگای سیاسەتی هاوسەنگی گرتەوە.

لەگەڵ هاتنەسەرکاری حکومەتەکەی کلنتۆن، دوای چەند مانگێك لێکۆڵینەوە وتوێژینەوە لەبارەی دیاریکردنی هێڵە گشتیەکان و نەسڵی ستراتیجی سیاسی ئەمەریکا کرا، سەرئەنجام ستراتیجێك بەناوی (جلەوگیری دوولایەنە) کە لەلایەن (مارتین ئیندیك) ئەندامی باڵای حکومەتەکەی کلنتۆن و یاریدەدەر لەکاروباری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دیاریکرا و ڕاگەیەندرا، ئەم ستراتیجە چوارچێوەی سیاسەتەکانی ئەمەریکای لەناوچەکە بەشێوەی گشتی و ئێران و عێراق بەشێوەی تایبەتی دیارو ئاشکراکرد.

((لەم ستراتیجەدا وڵاتانی ناوچەکەی بۆ دوو دەستەی وەك (توندڕەوی ئاینی و ناسیۆنالیزم) کە چەکی کۆمەڵکوژ و موشەکی بالستیان هەیە و (ئیسرائیل و دراوسێکانی) دابەشکردووە.

هەروەها ئەمەریکا وەك (تاکە هێزی باڵادەست لەناوچەکە) واچاوەڕوان دەکرێت کە بتوانێت کاریگەری لەسەر رێچکەی رووداوەکانی ناچەکە جێبهێڵێت)).

مارتین ئیندیك سەبارەت بەم ستراتیجە دەڵێت:

((ئەمەریکا لەمەودوا پەیوەندی بەبەردەوامی گەمەی پاراستنی هاوسەنگی نێوان ئێران و عێراقەوە نییە، چونکە هێزی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و وڵاتە دۆست و هاوپەیمانەکانی لەناوچەکە وەك میسر، ئیسرائیل، عەرەبستانی سعودی، تورکیا و وڵاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو توانای ئەوەیان هەیە کە ڕووبەڕووبوونەوە دژی هەردوو ڕژێمی بەغدا و تاران بگرنە ئەستۆی خۆیان. ئیتر پێویست ناکات بەیەکێك لەم دوو ڕژێمە لەبەرامبەر ئەویتر پەیوەست بین)).

((دواتر ئیندێك سەبارەت بەچەمکی هاتوو و دانراو لەم ستراتیجەدا دەڵێت (ئێمە ستراتیجی خۆمان لەناوچەکە بەچەمکی وابەستەیی لەبەرامبەر دوو بەشی رۆژهەڵات و رۆژئاوای ناوچەکە دەستپێدەکەین، لەم ڕووەوە جڵەوەی ئەو هەڕەشانە دەگرین کە لەئێران و عێراقەوە سەرچاوەدەگرن لەرۆژهەڵاتی ناوچەکە، کە کاریگەری لەسەر تواناکانی ئێمە بۆ ئاشتی عەرەب و ئیسرائیل لەرۆژئاوای

ناوچەکە بەجێدەهێڵێت).

یەکێك لەچەمکە گرنگەکانی ئەو ستراتیجەی بەجلەوگیری دولایەنە ناودەبرێت، هەوڵدانە بۆ کۆتایهێنان بەناکۆکیەکانی عەرەب و ئیسرائیل وەك پێشەکی و بەئامانجی پەرەپێدان و جێگیرکردنی (ئیسرائیلی ئابووری گەورە) لەناوچەکەدا، بۆیە جلەوگرتن و کۆنترۆڵی ئێران و عێراق لەپێشینەی کارەکانە. هەروەها ئیندمیك لەدرێژەی ڕونکردنەوەکانیدا سەبارەت بەململانێ ستراتیجیەکانی ئەمریکا لەناوچەکە دەڵێت:

١- بەئەنجامگەیاندنی خێرای دانوسانەکانی عەرەب و ئیسرائیل لەدژایەتیەکانی بەردەم کابینەی کلنتۆنە.

٢- میراتگری هاوسەنگی هێز لەناوچەکە و ئاستی توانای سەربازی دژ بەبەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لەناوچەکە زۆر کەمبۆتەوە. پاراستنی ئەم بارودۆخە لەبەرامبەر هەوڵی بەردەوامی ئێران و عێراق بۆ بنیاتنانی ئەمباری چەکی سەربازی، بەتایبەت لەبارەی موشەکی بالستی و ئەتۆمی لەململانێکانی کابینەی کلنتۆنە.

٣- ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست ناتوانرێت پاکبکرێتەوە بە لەناوبردنی گروپێکی توندڕەوی سەربەگۆبەن، چونکە گروپێکیتر جێگای دەگرێتەوە، ئێمە نابێت مەسەلەیەکی ئالۆز کەسەچاوەیەکی نەتەوەیی و ناوچەیی هەیە سادە وەربگرین، ئێمە نابێت هەموو چاکسازیەکی ئاینی وەك بزوتنەوەیەکی توندڕەو ڕەتبکەینەوە.

یارمەتی بەخەڵك و حکومەتەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست لەبەرامبەر ئەو هەڕەشانەی لەکاتی دەرکەوتنیدا لەململانێ گرنگەکانی کابینەی تازەی ئەمریکایە.

دواتر ئیندیك ئەو یارمەتیانەی کە بریتیەلە (بەدواداچوونی چالاکانەی دانوسانەکانی ئاشتی عەرەب و ئیسرائیل)، (جلەوگیری توندرەوی، دۆزینەوەی ڕێگاچارە بۆ پێشکەوتنی دیموکراسی و بازاڕی ئازادی ئابووری) ئاماژەی بۆکردووە.

ئیندیك سەبارەت بەپێویستی جلەوگیری ئێران و عێراق دەڵێت: سیاسەتی کابینەی کلنتۆن لەجلەوگیری دولایەنەی ئێران و عێراق لەو هەڵسەنگاندنەوە سەرچاوەی گرتووە کە ڕژێمەکانی ئێران و عێراق هەردووکیان دوژمنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکان لەناوچەکەدا)).

هەروەها ئەو پێیوایە کە ((جلەوگیری دوولایەنە بەمانای جلەوگیری دوونەوەندە نییە، ئێمە لەبەرامبەر عێراق و ئێران یەك سیاسەت پیادە ناکەین. چونکە هەریەکە لەم دوو حکومەتە بەرژەوەندیەکانی ئێمە بەجۆرێکی تایبەت دەخەنە مەترسیەوە. بۆیە بۆ ڕوبەڕووبونەوەیان بابەتی تایبەت و سیاسەتی تایبەتمان داڕشتووە.

لەعێراق لەگەڵ حکومەتێك ڕووبەڕووین کە هەم تاوانی جەنگ و هەم تاوانی دژی مرۆڤایەتی

ئەنجامداوە، حکومەتێك کە هێرشی کردۆتە سەر کوێت و چەکی کیمیایی بەکارهێناوە لەدژی میللەتەکەی خۆی و هەروەها سیاسەتی سوتماك کە تا ئێستا لەهۆرو زەنگاوەکانی باشووری عێراق بەمەبەستی سەرکوتکردنی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە بەردەوامە، بۆیە گۆڕاوە بۆ ڕژێمێکی جنایەتکار لەسەر ئاستی نێودەولەتی.

لەئێران، لەگەڵ حکومەتێك ڕووبەڕووین کە هەتا لەقۆناغی دوای خومەینیش بەردەوامە لەسەر ڕەفتاری نایاسایی. بەم هۆیەوە ئێمە لەگەڵ حکومەتی ئیسلامی نەیارنین، نامانەوێت بیروخێنین، لەڕاستیدا هەر لەسەرەتاوە گوتمان کە ئامادەی دانوسانی فەرمی و معتەبەرین لەگەڵ حکومەتی ئێراندا، هەڵبەت کاتێك ئەم دانوسانە دروست دەبێت، هەمان ڕەهەند و لایەنە تایبەتیەکانی لەڕەفتاری ئێران کە بۆتەهۆی وروژاندنی ئەم هەموو نیگەرانیە .

ئەو بەردەوام دەبێت و دەڵێت کە جلەوگیری عێراق لەگەڵ ئێران جیاوازە، سەبارەت بەعێراق ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان دوای جەنگی کەنداو هەلومەرجێکی زۆر سەختی بۆ داناوە و بڕیارەکان و گەمارۆی ئابووری بەسەردا سەپێنراوە تاعێراق نەتوانێت هەڕەشە بێت بۆسەر دراوسێکانی یاخود ئاشتی جیهان، سەرەڕای ئەوەش ڕێگانادەین دوژمنکاری بۆسەر هاولاتیەکانی خۆشی بکات. ئەو گەمارۆ ئابووریە کاریگەری زۆری لەسەر سەدام حسین و سیاسەتەکانی بەجێهێشتووە)).

(ئیندێك هەروەها سەبارەت بەجلەوگیری ئێران دەڵێت: کاتێك ئێمە ئامانج و تواناکانی ئێران هەڵدەسەنگێنین، ناوێتەی مەترسیدار بۆ بەرژەوەندیەکانی ڕۆژئاوا دەبینین). ئەو دواتر نیگەرانی نائارامی لەڕفتارەکانی ئێران سەبارەت بە پێنج بابەت باس دەکات: (پاریزگاریکردن لەتیرۆرزمی نێودەولەتی، دژایەتی دانوسانەکانی ئاشتی عەرەب و ئیسرائیل، هەولدان بۆ دەسکەوتنی چەکی کۆکوژ، پاریزگاریکردن لەبزوتنەوە ئیسلامیەکان لەناوچەکە و پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لەناو ئێراندا).

ئیندیك سەبارەت بەپێویستی ڕووبەڕووبونەوەی ئێران دەڵێت: پێویستی هەنگاوی بەپەلە دژ بەهەڕەشەکانی ئێران لەوڕاستیەوە سەرچاوەدەگرێت کە نیەتی هەرەشەکردنی ئێران لەئێستادا زیاترە لەتواناکانی ئەوە، بەلام ئەم بارودۆخە درێژەی نابێت، ئەگەر ئێمە لەهەولەکان بۆ ڕاستکردنەوەی ڕفتارەکانی ئێران سەرکەوتوو نەبین، پێنج ساڵیتر ئێران تواناکانی بۆ هەرەشەکردن لەئیسرائیل و جیهانی عەرەب و بەرژەوەندیەکانی ڕۆژئاوا لەرۆژهەلاتی ناوەڕاست زیاتر دەبێت).

ئەو ئەنجامانەی لەستراتیجی جلەوگیری دولایەنەی ئەمەریکا سەبارەت بەئێران دەتوانین بڵێن کە:

١- جلەوگیری ئێران پشت بەو گریمانەیە دەبەستێت کە بەلاوازکردنی بنەمای ئابووری/سەربازی ئێران، دەتوانرێت ڕێژەی کاریگەری ئەم ولاتە لەسەر گۆڕانکاریەکانی ناوچەکە بەتایبەتی لەسەر ئاشتی عەرەب و ئیسرائیل کەمبکرێتەوە و هەروەها ڕفتاری ئێرانیش لەهەموو بوارەکاندا بگۆڕدرێت.

٢- سیاسەتی جڵەوگیری لەڕەهەندی ئابووریدا بریتیە لەڕێگرتن لەبەرقەراربوونی هەرجۆرە پەیوەندیەکی ئابووری کە ببێتەهۆی بەهێزبوون و گەشەکردنی ئابووری ئێران و لەڕەهەندی سەربازیدا ڕێگرتنە لەدەستکەوتنی ئێران لەهەرجۆرە چەکێکی ئاسایی یان نائاسایی.

٣- لاوازی بنەمای ئابووری ئێران و ئەو زیانانەی لەم مەسەلەیە دەکەوێتەوە، گرنگترین مەسەلەیەکە کە ئەمەریکا و ئیسرائیل بۆ سەپاندنی سیاسەتی خۆیان بەدوایدا دەڕۆن. (گەمارۆی ئابووری ئێران) و چاوەڕوانی پەیدابوونی بێسەرەوبەرەیی سیاسی/ئابووری و قەیرانی ئاسایشی بەپێی هەمان بیرکردنەوەیە.

٤- بەڵگە و نیشانەکان گەواهی ئەو مەسەلەیەن کە ستراتیجی ئەمەریکا وەك دابینکەری بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکا و ئیسرائیل، ستراتیجی پایەدارە کە بەشێوەی لەسەرخۆ و دورمەودا جێبەجێ دەکرێت.

٥- ڕوبەڕووبوونەوەی سەربازی لەم ستراتیجەدا هەرچەندە بەفەرمی لەلایەن ئەمەریکاوە لەناو دەق و نوسراوە بڵاوکراوەکانی سیاسەتی جڵەوگیری وەدەرنراوە، بەڵام توانای سەربازی ئەمەریکا و باری سەربازی تەنیا دەرخستنی ئەمەریکایە بۆ کۆنترۆڵ کردنی بارودۆخی ناوچەکە. لەبەرئەوە هەرجۆرە شکستێك لەڕێچکەی ئاشتی عەرەب و ئیسرائیل و یان گۆڕانکاری لەناوەوەی عێراق دەتوانێت ئەمەریکا لەبارودۆخی پێویست، بەسودوەرگرتن لەهێزی سەربازی ڕزگارکات.

٦- جەختکردنەوە لەسەر گۆڕانی ڕەفتاری ئێران بەپێی ئەو مەسەلەیە، کە هەموو ئومێدەکان بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستە بەپێی گۆڕانکاری ناوەوەی بارودۆخەکە لەقەیرانی ئابووریەوە سەرهەڵدەدات.

یەکساڵ دوای ڕاگەیاندنی ستراتیجی ناونراو بە جڵەوگیری دوولایەنە و بڵاوبونەوەی ئەدەبیاتی پەیوەندیدار بەم باسەوە، هەرچەندە بەشێك لەڕەهەندەکانی ئاشکرابووە، بەڵام لەزۆر بواردا هێشتا ناڕۆشنی تێدایە. لەم ماوەیەدا هەندێك گوزارشتی وەك (هەڕەشەی ئێران لەسەر بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکا) و (پێویستی گۆڕانی ڕەفتاری ئێران) زۆر بەکارهێنراوە و ئەم مەسەلەیە تا ئەندازەیەك ماهیەت و ئامانجی کۆتایی ئەم ستراتیجیە دەردەخات.

(ئەنتۆنی لیك)یش یەکێکە لەنەخشەدارێژەرانی سیاسەتی دەرەوەی کلنتۆن کە وەك ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی سەرۆك کۆمار کاردەکات، دیدگاکانی واشنگتۆن سەبارەت بەهەردوو وڵاتی ئێران و عێراق ڕایدەگەیەنێت کە ((وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەبێت نەك تەنیا ئامادەیی سەربازی و تەکنەلۆجیای ئەم دوو وڵاتە سنورداربکات، بەڵکو دەبێت سیاسەت و بارودۆخێك بێنێتە پێشەوە کە ئەم دوو وڵاتە گۆشەگیربکات و هەنگاوەکانیان لەبەینببەرێت و لەڕێگای فشاری تەستەجەمعیەوە (نێودەوڵەتی) ئەمانە بخاتە ژێر کۆنترۆڵەوە و گەمارۆیان بدات.

بەبۆچونی لیك، کارەکانی ئەم سیاسەتە سەبارەت بەئێران و عێراق بەهۆی هەلومەرجی لەبار کە

دوای جەنگی کەنداو لەرۆژهەلاتی ناوەراست هاتۆتە ئاراوە، کارکردن زۆر ئاسانە، مەبەستی ئەو لەهەلومەرجی لەبار، کۆتاییهاتنی جەنگی سارد و بەرقەراری هاوسەنگی سەربازیە لەنێوان ئێران و عێراقدا دوای هەردوو جەنگی کەنداو، دوای ئەو رووداوانە بەتایبەت (نۆیەراسیۆن گەردەلولی بیابان) ولاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو رازیبوون بەبوونی هێزی سەربازی ئەمەریکا لەناوچەکەدا، هەروەها ئەنتۆنی لیك لەم بارەیەوە بەرونی جەختدەکاتەوە و دەلێت:

پێشوازی بەرچاو لەپتەوکردن و جێگیرکردنی پەیوەندی و رێکەوتننامەی تایبەت لەنێوان واشنگتۆن و هاوپەیمانەکانی وەك میسر، ئیسرائیل، تورکیا و عەرەبستانی سعودی بۆ گۆشەگیرکردنی زیاتری ئێران و عێراق ئەنجامدراوە.

هەروەها ئەو لەرۆژهەلاتی ناوەراست وەك (نمونەی سەرمەشق بۆ تێروانینەکانی ئەمەریکا سەبارەت بەجیهانی دوای جەنگی سارد) ئاماژەی بۆدەکات.

ستراتیجی جلەوگیری دوولایەنەی کلنتۆن چەند ئەمانجێك بەدوای خۆیدا دەهێنێت کە بریتیەلە:

١- پارێزگاری لەبەرژەوەندی نەتەوەیی ئەمەریکا لەناوچەی کەنداو.

٢- پشتیوانی لەحکومەتە میانرەوە عەرەبیەکانی ناوچەکە.

٣- رێگرتن لەدروستبوونی هێزێکی بان هەرێمی.

٤- جێگیرکردنی یەکێتی ئاسایشی بەبەشداری و چالاککردنی ولاتانی ناوچەکە لەناوجەرگەی (ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو).

٥- هێنانەناوەوەی ولاتانی ناوچەکە بۆ بەشداریکردن لەئاسایشی کەنداو، واتە هەمان خالی (٢+٦).

٦- بەشداریپێکردنی هێزەگەورەکان لەدابینکردنی ئاسایشی ناوچەکە لەوانە بەریتانیا و فەرەنسا.

٧- رەخساندنی زەمینەیەکی لەبار بۆ ناردنەدەرەوەی نەوت بەنرخێکی گونجاو.

لەراستیدا، ئەسلی گرنگی و بنەمای تێزی (جلەوگیری دولایەنە) بەپێچەوانەی تیۆرەکانی پێشووی ئەمەریکا تایبەت بەناوچەکە، ئەوەیە کە تیۆری تازە لەسەر بنەمای رووبەرووبوونەوە بەهەر جۆرە مەترسیەك کە لەناوچەکە دروستبێت و هەرەشەی لێبکات رێکخراوە. ئەوی شایانی باسە لەم بوارەدا ئەوەیە کە بەپێی هەمان تیۆرەکانی رابردوو، یەکێتی سۆڤێتی پێشوو وەك هەرەشەی سەرەکی پیشاندراوە و کە دەبێت رووبەرووی ببنەوە، لەکاتێکدا ئەو رووداوانەی کە ناوچەکەی بزواندووە، کاریگەری گرنگی لەسەر نرخی نەوت بەجێهێشتووە، وەك جەنگی عەرەب و ئیسرائیل لەسالی (١٩٧٣)، شۆرشی ئیسلامی ئێران لەسالی (١٩٧٩) یان جەنگی هەشت سالەی عێراق ئێران لەسالی (١٩٨٠ــ ١٩٨٨) و هەروەها داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراقەوە لەسالی (١٩٩٠) هیچ یەکێك لەمانە لەمۆسکۆوە سەریهەلنەدا.

گەرچی ستراتیجی ناونراو بەجلەوگیری ناوەرۆك و هێلی کاری ئەمەریکا لەرووبەرووبوونەوە

بەرامبەر بەئێران دیاری دەکات، بەڵام میکانیزمی جێبەجێکردنی نادیارە و جێبەجێناکرێت، بەواتایەکیتر ئەمەریکا بەپێی ئەم ستراتیجە ئومێدەوارە لەرێگای راکێشانی یابان و ئەوروپاوە گۆشەگیرکردنی نێودەوڵەتی ئێران زیاتر بکات و لەم رێگایەوە رفتارەکانی ئێران بخاتە ژێر چاودێریەوە، دوای تێپەربوونی دوو ساڵ بەسەر راگەیاندنی سیاسەتی ناونراو بەجڵەوگیری هاوکاری بازرگانی ئێران و ئەمەریکا بەردەوامی هەبوو. چونکە ئێران وڵاتێك بوو کە خاوەنی (٦٠) ملیۆن دانیشتوانی بەکاربەرە کە تەنیا لەساڵی (١٩٩٤) بە بەهای نزیکەی (١٢,٥) ملیارد دۆلار هاوردەی لەوڵاتانی ئەوروپا هێناوە بەبازاڕێکی باش دادەنرێت. لەبەرئەوە فشاری ئەمەریکا لەسەر ئەوروپا و یابان بەپێی پارێزگاری و پشتیوانی لەئەمەریکا بەبەڵگەی بەردەوامی بازرگانی ئەمەریکا لەگەڵ ئێران بێئەنجام بووە.

داماتو سیناتۆری کۆماری ئەمەریکا لە(١٥ مارس١٩٩٥) سەبارەت بە ناکامیەکانی ئەمەریکا دەڵێت: ((سیاسەتی ئەمەریکا تائەمرۆ نەبۆتەهۆی گۆڕینی ڕەفتاری ئێران و بادانەوەی ئەم وڵاتە بەناراستەی میانڕەوی، ئەم بارودۆخە لەوانەیە بەهۆی ڕەفتاری حکومەتی ئەمەریکاوە لەبەرامبەر ئێران بێت. چونکە کڕینی نەوتی ئێران لەلایەن کۆمپانیاکانی ئەمەریکاوە، هۆکاری بەردەوامی سیاسەتە دوژمنکارانەکانی ئێران بووە)).

بەپێی ئەو زانیاری و لێکۆڵینەوانەی سیناتۆر ئەلفوس داماتو کە جارێکیتر لەساڵی (١٩٩٣) پلانی گەمارۆی ئێرانی خستبووەڕوو دووبارە هەوڵەکانی خۆی خستەکار و لەکۆتاییدا کلنتۆن لەژێر فشاری کۆنگرێسدا لە(١٥ئازار١٩٩٥) بڕیاری پیادەکردنی گەمارۆی ئابووری بەسەر ئێراندا دەرکرد.

بەڵام ئەوەی لە(جڵەوگیری دولایەنە)دا جێگای سەرنجە، نارۆشنی یان پوچی ئامانجەکانی ئەمەریکایە لەبەرامبەر ئێران و عێراقدا، بەواتایەکیتر، سیاسەتی تازەی ئەمەریکا سەبارەت بەئێران و عێراق دوچاری جۆرێك لەسەرگەردانی و بێناوەرۆکی بووە، لەراستیدا ئەم سیاسەتە بەوجۆرەی کە دیارە بەپێی بنەمای ڕووخانی ئابووری/کۆمەڵایەتی ئێران و عێراق داڕێژراوە، بەو مانایەی کە ئەم دوو وڵاتە لەژێر فشاری گەمارۆی ئابووری بهێڵدرێتەوە. بۆیە دەوڵەتمەردانی واشنگتۆن پێیانباشە لەکاتی وەستانی بەرنامەی جڵەوگیری دوولایەن یان گەمارۆی ئابووری بێدەنگی هەڵبژێرن و خۆیان لەپەیامەکانی ئەم تیۆرە تازەیە پاکبکەنەوە.

لەکۆتایی ئەم باسەدا جێگای ئاماژەیە کە سیاسەتی جڵەوگیری بەنۆبەی خۆی دوو قۆناغی بڕیوە. قۆناغی یەکەم قۆناغێکی پاڵنەریە کە بۆ گۆشەگیرکردنی ئێران و عێراق دەرکەوتوو. لەم قۆناغەدا جڵەوگیری دولایەنە پاڵپێوەنەربووە کە دەیتوانی ببێتە کۆسپ بۆ ئەنجامدانی هەنگاوەکانی ئەم وڵاتانە، بەڵام نەیتوانی ئەوان ناچاربکات بەئەنجامدانی هەنگاوی تایبەت. بۆیە لەقۆناغی دووەمدا، سیاسەتی هێرشبردن گیرایە بەر و پڕۆژەی گەمارۆی (داماتو) بەباشترین نیشانەی ئەم سیاسەتە دادەنرێت.

## بەشی سێیەم

# لێکۆڵینەوە لەپێگەی ئێران و عێراق لەستراتیجی ئەمەریکادا

### سیاسەتی جلەوگیری دوولایەنەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەبەرامبەر ئێران و عێراقدا:

بەسەرنجدان لەگرنگی ستراتیجی رۆژهەلاتی ناوەراست و رۆڵ و گرنگی ژیانی (حیاتی) ناوچەی کەنداو بۆ رۆژئاوا بەگشتی و ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەتایبەتی لەرووی دابینکردنی سوتەمەنی و ووزە و بازاری گرنگ بۆ چەك و کالا پیشەسازیەکان، بەئاگابوون لەدیدی چاودێرانی سیاسی جیهان و دەوڵەتمەردان و زانایانی ئەمەریکا بۆ دیاریکردنی سیاسەتی دەرەکی ئێران تایبەتمەندی خۆی هەیە. شێوەی تێروانینی ئەمەریکا لەئێران و عێراق زۆر ئاڵۆزە و لەهەمانکاتدا تێکئاڵاوە، ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەسەرنجدان لەبارودۆخی ناوچەکە و گرنگی عێراق و ئێران وەك دوو ولاتی نارازی و نەیار لەبوونی ئەمەریکا لەکەنداو، سەرەرای جیاوازی لەپێکهاتەی حکومەتی ئەم دوو ولاتە، بۆ رێگرتن لەهاوپەیمانێتی ئەم دوو ولاتە لەگەڵ بوونی ناکۆکی لەگەڵ حکومەتەکەی سەدام بریار لەگۆرینی حکومەتەکە، ناچارە بۆ رێگرتن لەبالادەستی ئێران و بلاوبوونەوەی نفوزی لەناوچەکە و بەسەر ولاتانی ناوچەکەدا، عێراق و ئێران لەبەرامبەر یەکتردا رابگرێت، لەم بارەیەوە بۆ ئاگابوون لەم حاڵەتە، دەقی سمپوزیومی* کە لە(٢٢شباتی ١٩٩٤) لەئەنجومەنی سیاسەتی رۆژهەلاتی ناوەراست لە(واشنگتۆن دی.سی) سازدرا لەبەرچاودەگیرێت.

سیاسەتی ئەمەریکا لەبەرامبەر ئێران و عێراق کەناوی (جلەوگیری دوولایەنە)ی لێنراوە، لەدانیشتنێکی بەیانیانی ئەم سمپوزیومە خرایە بەرباس و لێکۆڵینەوە، ماهیەتی ئەم سیاسەتە و ئامانجەکانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەعێراق و ئێران مشتومالکرا، هەڵسەنگاندنی بەکارهێنانی ستراتیجیەکان یان رابەرایەتیکردن بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە لەمەسەلەکانیتر بوو کە ببووە جێگای باس و لێکۆڵینەوە، لەم بارەیەوە دەبێت ئەم پرسیارانەی خوارەوە بخەینەروو: ئایا ئەم ئامانج و ستراتیجیانە جێگای قبوڵە؟ ئایا بەسوود و بەرهەمدار دەبێت؟ ئایا رێگایتریش هەیە؟

تیۆری مارتین ئیندیك، یاریدەدەری تایبەتی سەرۆکی ئەنجومەنی سیاسەتی رۆژهەلاتی ناوەراست دەریدەخات کە: ستراتیجی حکومەتی کلنتۆن لەبارەی ئێران و عێراق بابەتێکە ناکۆکی هێناوەتە ئاراوە.

---

*) سمپوزیوم ئەنجومەنێکە کە تێدا کۆمەڵێك لە خەڵکی سەبارەت بەیەك بابەتی تایبەت قسەو باس دەکەن ـ وەرگێر.

حکومەتی کلنتۆن، سەبارەت بە ڕووبەڕووبونەوەی عێراق و ئێران، مەسەلەی هاوسەنگی هێز لەکەنداو پشتگوێ ناخات، ئەمە خۆی بەرهەمی لێکۆڵینەوە و شیکاری هاوسەنگی هێزە کە گەیشتۆتە ئەم ئەنجامەی کە ئێران و عێراق هەردووکیان لەڕووی سیاسەتی حکومەتیەوە سیاسەتێك دەگرنەبەر کە دژ بەبەرژەوەندیەکانی ئەمەریکایە، ئەم بارودۆخە کێشەیەکی تایبەت بەسیاسەت دێنێتە ئاراوە کە جێگای تێڕوانینە، لەڕابردوودا و لەبارودۆخێکدا کە هاوسەنگی هێز لەوسەردەمەدا لەکەنداو حکمی دەکرد، لەو ناوچەیەی کە لەڕووی بەرژەوەندی ئەمەریکاوە ژیانی بوو، ئەم دوو هێزە گەورەیەی ناوچەکە هەڵدەستان بەجێبەجێکردنی ڕۆڵی خۆیان لەناوچەکە و ژمارەیەك وڵاتی بچوکتریش هەبوون کە لەگەڵ ئەم دوو هێزەدا بەراورد نەدەکران، ئەمانە بۆ بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکا بەگرنگ سەیردەکران، واتە وڵاتانی نیمچەدورگەی عەرەبی، حکومەتی ئەو کاتەی ئەمەریکا هەوڵیدەدا بۆ پاریزگاریکردن لەیەکێك لەم دوو هێزە ناوچەییە بە مەبەستی پاراستن و پاسەوانیکردنی بەرژەوەندیەکانی، بۆ ئەم مەبەستە سەرەتا حکومەتی ئێرانی سەردەمی شا و پاش ڕوخاندنی شا پاریزگاری لەسەدام حسین لەعێراق دەکرد.

دەتوانین بڵێین کە سیاسەتەکان لەڕابردوودا بەرهەم و پەیامێکی زۆر باشی نەبوو، هەروەها دەتوانین بڵێن بەهۆی ڕووداوێکەوە کە ڕوودەدات، وەك شۆڕشێك، جەنگی عێراق ئێران و دواتر داگیرکردنی کوێت و جەنگ کەنداو ڕوودەدات، سیاسەتەکانی ڕابردوو کارساتی لێدەکەوێتەوە، بەهۆی ئەوەوە، هێشتا ئامانجی سەرەکی ئەمەریکا هەمان هاوسەنگی هێزە لە ناوچەکەدا بە شێوەیەك کە هەم بەرژەوەندی خۆیی و هەم بەرژەوەندی دۆستەکانی چ لەکەنداو و چ لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بپارێزێت، باوەردەکرێت کە پێگەی ناوچەکە بە جۆرێکە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەتوانێت بە \بێ پشتبەستن بە عێراق و ئێران بەئامانجە گرنگەکانی خۆی بگات.

ئەو سیفەتە باشانەی کە ڕێگا بەئەمەریکا دەدات، ئەم سیاسەتە بگرێتەبەر بەکورتی بریتیەلە:

یەکەم: کۆتاییهاتنی جەنگی سارد و هەڵوەشاندنەوەی زلهێزێکی وەك یەکێتی سۆڤێت کە بووە هۆی لەناوچوونی یەکێك لەچاودێرە گرنگەکانی ستراتیجی ئەمەریکا بەتایبەت لەکەنداو، ئیتر ناتوانێت ئەمەریکا نیگەران بکات، هەنگاوەکانی ئەمەریکا نابێت بۆ ورووژاندنی مەبەست و سیاسەتی دوژمنانەی ڕووسیا بێت، یان ببێتەهۆی چالاك کردنی ڕووسیا لەپاریزگاریکردن لەدوژمنانی ئەمەریکا لەناوچەکەدا، بەواتایەکیتر ئەم فاکتەر زۆر گرنگە بەناسانی لەمەیدانی حساب بۆکراوی ئەمەریکادا نەماوە، ئەمانی زلهێزێك کە پاریزگاری لەدوژمنەکانی ئەمەریکا دەکرد لەناوچەکە، هاوسەنگی هێزی لەبەرژەوەندی ئەمەریکا گۆڕی.

دووەم: لەماوەی دەیەی ڕابردوودا لەئەنجامی جەنگی عێراق ئێران و دوابەدوای ئەو جەنگی کەنداو، جۆرێك لەهاوسەنگی هێز دروستبوو کە لەرووی توانای سەربازیەوە بەبەراورد بەڕابردوو گرنگی کەمتربوو، ئەو دروستبوونی هاوسەنگی هێزە لەنێوان ئەم دوو وڵاتەدا ئاسانتر سازان.

سێیەم: لەئەنجامی هێرشی عێراق بۆ سەر کوێت، وڵاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو، واتا دۆستانی ئەمەریکا، بەپێچەوانەی ڕابردووەوە سەبارەت بە گرێی پەیمانی ئاسایشی لەگەڵ ئەمەریکا ئارەزووی زیاتریان پیشاندا، ئەمە خۆی توانای هێزئامایی ئەمەریکای لەناوچەکە و هەروەها ڕووبەڕووبوونەوەی هەڕەشەکانی سەر بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکا و ئەوانە لێرەدا هەڕەشە دەکەن ئاسانتر دەسازێنێت.

سەرئەنجام، هۆنینەوەی کۆمەڵێکیتر لەستراتیجی ئەمەریکا، کە لەبەهێزکردنی ئەم ڕێچکەیە کاریگەری ئەرێنی واقعی هەیە، لێرەدا مەبەست لەهەمان هاوسەنگی هێزە لەناوچەکەدا، کەتێیدا یەکەم ئەمەریکا دەتوانێت لەپارێزگاریکردن و دۆستایەتی هێزە گرنگەکانی ناوچەکە (میسر، ئیسرائیل و عەرەبستانی سعودی) دڵنیاتربێت و دووەم دەتوانێت بەسوودوەرگرتن لەژینگە و هەلومەرجی قۆناغی دوای جەنگی سارد و پەیامەکانی جەنگی کەنداو بە ڕێچکەی بەرقەراری ئاشتی نێوان ئیسرائیل و دراوسێ عەرەبەکانی بگات، ئەمە لەجێبەجێکردنی سیاسەتی جڵەوگیری دوولایەنە لەبەرامبەر عێراق و ئێرانیش گونجاوە.

هەرکاتێك ئەمەریکا لەجێگیرکردنی ئاشتی کۆمەڵگا کە لەگرنگترین بەرەوپێشچوونی حکومەتەکەی کلنتۆن بوو، سەرکەوتوبوو، هەم دەتوانێن کۆتایی بەناکۆکی عەرەب و ئیسرائیل بێنێت و هەم پەیوەندی ئاشتەوایی سوریا و ئیسرائیل بەرقەراربکات.

هەرکاتێك ئەمەریکا بتوانێت ئاسایش بەشێوەیەك لەباشووری لوبنان بەرقەرار بکات، کە ئیمکانی پاشەکشێی ئیسرائیل و واژۆکردنی پەیمانی ئاشتی نێوان ئیسرائیل و لوبنان فەراهەم دەکات و هەرکاتێك لەئەنجامی ئەم هەنگاوانە ئیمکانی چالاکی حزب الله لەباشوری لوبنان نەمێنێت و چالاکیەکانی ئەم حیزبە لەهەموو لوبنان سنوردار و کەمتربێت، دەتوانرێت گورزێکی کاریگەر لە ئاواتەکانی ئێران کە فراوانخوازی نفوزیەتی بۆ ناوجەرگەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوەشێنرێت.

بەپێی ئەوەی کەوترا، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەرکاتێك لەرەخساندنی زەمینەی ڕێکەوتنی ئاشتی ئیسرائیل سەرکەوتوو بوو، توانای سوودوەرگرتنی سەدام لەمەسەلەی فەلەستین بۆ بەدیهێنانی مەبەستەکانی لەجیهانی عەرەبی نامێنێت.

لەئەنجامی ئەم گۆڕانکاریە ستراتیجیە، بەهەمان شێوە کە لەپێشدا وترا، ئیتر پێویست ناکات بۆ پارێزگاریکردن لەهاوسەنگی هێز لەکەنداو و ناوچەکە و بۆ پاسەوانیکردنی دۆستەکانی و پاراستنی

بەرژەوەندیەکانی خۆیی و ئەوانیش و هەروەها جێگیرکردنی ئاشتی لەناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەراست پەنا بۆ ئێران و عێراق ببرێت. هۆی ئەمانەش هەمان تێگەیشتن و رێکەوتنی هاوبەشە لەنێوان ئەمەریکا و دۆستەکانیدا سەبارەت بەماهیەتی مەترسیەکان کە هەموویان رووبەرووی دەبنەوە و هەروەها لەم بوارەدا باشترین رەوش دروست بووە.

هەڵبەت، مەبەست ئەوەنییە کە ووزەی گۆران یان پێویستی چاکسازی سیاسی لەکاتی رووداوەکان و گۆرانەکان نادیدە بگیرێت یان فەرامۆش بکرێت، تا کاتێك کە ئەم گۆرانانە روویندابێت، دڵنیاین لەوەی کە دەتوانین رەوش و رێکاری ئێستا بەردەوام دەبێت و پاسەوانی و بە بەرەو پێشبردنی بەرژەوەندی و ئامانجەکانی خۆیەوە خەریك بێت.

جڵەوگیری دوولایەنە بەواتای جڵەوگیری دوونەوەندە نییە، ئەمەریکا لەبەرامبەر عێراق و ئێران یەك سیاسەت پەیرەوەی ناکات، چونکە هەریەکە لەم دوو حکومەتە بەجۆرێکی جیاواز بەرژەوەندیەکانی ئەو دەخەنە مەترسیەوە، بۆیە بۆ رووبەرووبونەوەیان سیاسەتی تایبەت دارێژراوە.

لەعێراق حکومەتێك لەسەر کارە کە هەم تاوانی جەنگی ئەنجامداوە و هەم تاوانی دژی مرۆڤایەتی، حکومەتێك کە هێرشیکردۆتە سەر کوێت و چەکی کیمیایی بەکارهێناوە دژی دانیشتوانەکەی خۆی بۆ سەرکوتکردنیان سیاسەتی سوتماکی پەیرەوەی پیادەکردووە کە تائێستا لەناوچەی هۆر و زۆنگاوەکانی باشووری عێراق بەردەوامە، بۆیە رژێمێکی جینایەتکاری نێودەوڵەتی.

لەئێران، حکومەتێك لەسەرکارە کە هەتا لەقۆناغی دوای خومەینیش بەردەوامە لەسەر رەفتاری نایاسایی، لەگەڵ ئەوەشدا ئەمەریکیەکان لەگەڵ حکومەتی ئیسلامی نەیارنییە، نایەوێت بیروخێنێت، لەراستیدا هەر لەسەرەتاوە گوتراوە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئامادەی دانوسانی فەرمی و معتەبەرە لەگەڵ حکومەتی ئێراندا، هەڵبەت کاتێك ئەم دانوسانە دروست دەبێت، کە هەمان رەهەند و لایەنی تایبەتی لەرەفتاری ئێران کە بۆتە هۆی ورووژاندنی ئەم هەموو نیگەرانیانە، دەرکەوێت .

جڵەوگیری عێراق لەگەڵ ئێران جیاوازە، سەبارەت بەعێراق رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان دوای جەنگی کەنداو هەلومەرجێکی زۆر سەختی بۆ داناوە و بریارەکان و گەمارۆی ئابووری بەسەردا سەپێنراوە تا لەمە بەدوا عێراق نەتوانێت هەرەشە بێت بۆ سەر دراوسێکانی یاخود ئاشتی جیهانی بخاتە مەترسیەوە، سەرەرای ئەوەش رێگانادەن دوژمنکاری بۆ سەر هاوڵاتیەکانی خۆشی بکات، ئەو گەمارۆ ئابووریە، ئەمرۆش کاریگەری زۆری لەسەر سەدام حسین و سیاسەتەکانی بەجێهێشتووە)).

بارودۆخی باکوری عێراق (هەرێمی کوردستان) کە ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی و تورکیا هەوڵی دامەزراندنی ناوچەی ئامن و دژەفرینیانداوە، بەجۆرێکە کە کوردەکان توانای چالاکی زیاتریان هەیە، ئەوان لەو ئازادی و پارێزگاریە سودمەندبوون کە لەمێژووی هاوچەرخدا بێوێنەیە.

باشووری عێراق لەبارودۆخێکی دژوارتردایە، ئەمەریکا نەیتوانیووە هەنگاو بنێت کە دەستی سەدام ببەستێت لەنازاردانی شیعەکان.

لێرەدا کە ئەنجام و کاریگەریەکانی گەمارۆی ئابووری هەستیپێ دەکرێت، حکومەتی سەدامیش هەستاوە بە قبولکردنی بڕیارەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان، لەگەڵ ئەوەی حکومەتی عێراق هاریکاری کۆمیتەی ناسایشی ڕێکخراوی نەتەوەکان لەبواری چەکی کۆکوژ و هەروەها چاودێری ماوەدرێژی کردووە، بەڵام دەزانین کە ئەم وڵاتە بەنهێنی لەهەوڵدایە چەکی کیمیایی و سوتەمەنی موشەکی پەیدا بکات، لەئێستادا ئەمەریکا لەبارودۆخێکدایە کەتێدا بەردەوامی پێشێلکردنی بڕیارەکانی ڕێکخراوی نەتەوەکان، واتە بڕیاری (٦٨٧) هەلومەرجی ئاگربەست و بڕیاری (٦٨٨) کە داوای کۆتاییهێنان بەسەرکوتی خەڵکی عێراق دەکات، بەجۆرێك ڕازیبووە و ڕعایەتی هەندێك بەند لەوانە چەکی کۆکوژ بەیەکەوە تێکەڵ کردووە.

ئامانجی ئەمەریکا لەلایەکەوە هاوکاری توندوتۆڵ و نزیك بە دامەزراوەی ڕێکخراوی نەتەوەکان و ڕێکخراوی نێودەوڵەتی مافەکانی مرۆڤە، لەلایەکیترەوە فشارهێنان بۆ ئەو حکومەتە تا بەتەواوی بڕیارەکانی ڕێکخراوی نەتەوەکان قبوڵ بکات. لەم بوارەدا، کاریگەری گەمارۆی ئابوری لەسەر خەڵکی عێراق بەباشی ئاگادارن بەڵام بەهەمان شێوە کە پێشتر وترا، ئەمەریکا چالاکانە سەرگەرمی ئەنجامدانی چالاکی مرۆڤدۆستانەیە لەعێراق و ناوچەی دژەفڕینی پاراستووە تابتوانێت لەبەرامبەر هەنگاوە سەرکوتکەرانەکانی حکومەتی عێراق بێتەمەیدانەوە، پارێزگاری پێویست بۆ خەڵکەکەی بەدەست بهێنێت.

سەرەڕای ئەوە، بڕیارەکانی (٦٠٧ و ٧١٢) ئەنجومەنی ناسایشی ڕێکخراوی نەتەوەکان سەدام والیدەکات کارابێت بۆ کەمکردنەوەی ئێشونازاری خەڵکی عێراق، بە سوود وەرگرتن لەم بڕیارانە، عێراق دەتوانێت بە مەبەستی دابینکردنی بەرژەوەندی پێویست بۆ کڕینی کەرەسەی خۆراکی و کەرەسەیتری پێویست بۆ خەڵکی هەنگاو بنێت، سەرەتا سەدام حسین بۆ دانوسان لەسەر ئەم بڕیارانە ناڕازی بوو، بۆیە دەبێت بۆ هەموولایەك ئاشکرا بێت کە حکومەتی سەدام بەرپرسە لە هەموو دەردەسەریەکان کە بەسەر خەڵکی عێراقدا هاتووە نەك کۆمەڵگای نێودەوڵەتی.

سەرەڕای ئەوە سوربوونی ئێمە (مەبەست ئەمەریکایە - وەرگێڕ) لەدابنکردنی ئایندەیەکی باشتر بۆ عێراق لە بەرژەوەندی ئێمەدایە، هەوڵی ئێمە بۆ دروستکردنی حکومەت دیموکراتی لەم بوارەوە سەرچاوەدەگرێت، لەبەرئەوە لەم بارەیەوە ئەمەریکا پارێزگاری لەکۆنگرەی نیشتمانی عێراق و ئامانجەکانی ئەم کۆنگریە دەکات، کە ئەم کۆنگریە پێکهاتووە لەتێکەڵەیەك لەگروپی دینی و نادینی و گروپە نەتەوەییەکانی عێراق، تا لەئایندەدا جۆرێك لەحوکمی کۆمەڵی لەجیاتی ڕژێمی ئێستا لەعێراق بێنێتە سەرکار.

لەپێشدا وترا کە شوێنەوار و پەیامەکانی گەمارۆی ئابوری هەستپێکراوە، پێگەی جەماوەری سەدام ڕۆژبەڕۆژ لەکەمبوونەوەدایە و قسەوباس لەسەر هەوڵی کودەتا لەزیاد بووندایە. دەستەبژێرانی (نخبە) عێراق ڕۆژبەڕۆژ نائارامتر و بێقەرارتردەبن، بۆیە لەڕووی سیاسەتی گشتیەوە، ئەمڕۆ نەك تەنیا دەتوانێت ڕایگەیەنێت کە حکومەتی سەدام حسێن بۆ وڵاتە دراوسێکانی عێراق هەڕەشە دروست ناکات و ئەمەریکا ئامێر وئامرازی پێویستی بۆ جڵەوگرتنی لەبەردەستایە، سەرەڕای ئەوە دەتوانین بڵێین کە فشارەکانی ئەمەریکا لەسەری بەتێپەڕبوونی کات شوێنەوار و ئەنجامی زیاتر بەجێدەهێڵێت.

بەڵام ئێران شەڕی هەم بچوك و هەم گەورەیە بۆ سیاسەتی ئەمەریکا، بچوکە لەورووەی کە ئێران ئەمڕۆ ئەو مەترسیەی نییە کە عێراق پێنج ساڵ پێش ئێستا بۆ بەرژەوەندی ئەمەریکا هەیبوو، بۆیە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەمور هەوڵەکانی دەخاتەکار تا ئێران دوای پێنج ساڵیتر نەگۆڕێت بۆ عێراقی پێش پێنج ساڵ، کێشەی ئەمەریکا لەگەڵ ئێران لەپێنج بواردایە (وەك ئەمەریکا ڕایدەگەیەنێت) ئەو پێنج خاڵەش بریتیە لە:

- یەکەم: هەڵدان بۆ دەسکەوتنی چەکی ئەتۆمی و جۆرەکانیتری چەکی کۆکوژ.

- دووەم: هەڵدان بۆ دەسکەوتنی دەسەڵاتی هێرشبەر لەبواری چەکی ئاسایدا بە مەبەستی هەڕەشە لەدراوسێکانی.

- سێیەم: پارێزگاریکردن لەتیرۆریزم لەسەرانسەری جیهاندا.

- چوارەم: هەوڵدان بە ئاراستەی ناکۆکی ڕەوتی ئاشتی عەرەب و ئیسرائیل، چ لە ڕێگای گوتاری توند وروژێنەر و چ لەڕێگای کاری توندوتیژییەوە.

- پێنجەم: هەوڵدان بە ئاراستەی سودوەرگرتن لەپێگەی دژواری خۆی کە هەندێك لەدۆستانی ئەمەریکا لەناوچەکە بەهۆی ئەمەوە گرفتار بوون.

ئەوەی وادەکات کە سیاسەت و رفتاری حکومەتی تاران لەم بوارەدا بگۆڕێت، بەرقەراری پەیوەندی ئاسایی کە جێگای قبوڵبێت، بەڵام ئێران وڵاتێکە شۆرشگێڕی (توندڕەو) کە ڕابەرەکانی تا ئێستا بەهۆی ئەوەی کە ئەمەریکا لەسەردەمی پێشوودا لەگەڵ شا پەیوەندی توندوتۆڵی هەبووە، ڕق و کینەیان دژ بەم وڵاتە هەیە. پەیامە ئاگرینەکانی ڕابەرانی ئەم وڵاتە بەئاشکرا دژ و دوژمنانەیە لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکادا.

گفتوگۆ و ململانێکانی ئەمەریکا و ئێران نابێت بەپێکدادانی شارستانیەکان بژمێرین، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هیچ کاتێك دوژمنایەتی و ناکۆکی لەگەڵ ڕەهەندی ئیسلامی کۆماری ئیسلامی ئێراندا نییە. بەپێی وتەیەکی کلنتۆن (ئێمە بەتوندی ڕێز لەئاین و فەرهەنگی ئیسلامی دەگرین، تەنیا

لەگەڵ توندڕەوەکانی ئەوان، چ بەناڵای ئایینی و چ بەبەرگی نائایینی بێت ناکۆك و دژین، لەڕاستیدا ئێمە لەگەڵ سیاسەتی تایبەتی حکومەتی ئێران ناکۆکین).

بەهەمان شێوە وتراوە، ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ مەسەلەی چەکی کۆکوژی ئێران بە بەراورد ئاسانترە، چونکە لەم بوارەدا وەك عێراق پێشکەوتوو نییە، بەڵام کاری جڵەوگرتن لە ئێران دژوارترە، چونکە بە سوودوەرگرتن لە هەمان ڕێگا کە سەبارەت بە عێراق بەکارهێنراوە، ناتوانین زەمینەی گۆڕان و گۆڕانکاری لە ڕەفتاری ئێراندا فەراهەم بکەین. سەبارەت بە ئێران نە بڕیاری ڕێکخراوی نەتەوەکان هەیە و نە گەمارۆیەك کە بتوانرێت بخرێتە قۆناغی جێبەجێکردنەوە، بە گوزارشتێکیتر وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا سەبارەت بە ئێران هێشتا نەیتوانیوە بگاتە ڕێکەوتنێکی گشتی نێودەوڵەتی پێویست.

بەڵام لایەنی باشی مەسەلەکە بریتیەلە ئیدارەکردنی ئابووری ئێران و ناڵەباری بارودۆخەکە لەبازاڕی نەوت کە هەلومەرجێکی ئابووری نەگونجاوی خستۆتەبەردەم حکومەتی ئێرانەوە، ئەم بارودۆخە بۆتەهۆی ئەوەی کە هاوپەیمانانی ئەمەریکا بڵێن بۆچی ئەمەریکا دەڵێت تاکاتێك کە ئێران بەهەڕەشە بۆسەر بەرژەوەندیەکانی ڕۆژئاوا بەردەوامبێت نابێت نێوانی ئەم وڵاتە و ڕۆژئاوا پەیوەندی ئاسایی بێت، بەتایبەت پەیوەندی ئاسایی بازرگانی بەرقەراربێت، ئێران ماوەیەکی زۆرە پێگەی خۆی وەك لایەنێکی باشی بازرگانی لەدەستداوە، هەمان خاڵ بۆتەهۆی ئەوەی کە هاوپەیمانەکانی ئەمەریکا لەباشبوونی پەیوەندی خۆیان لەگەڵ ئێران، چاوپۆشن.

بۆ بەرگرتن لەهەوڵەکانی ئێران سەبارەت بەباڵادەستی لەکەنداو، لەگەڵ دەوڵەتانی دۆست هاوکاری نزیکمان دەستپێکرد تائەم وڵاتە نەتوانێت کەلوپەلی پێویست بۆ بەرنامەی ئەتۆمی و کیمیایەکەی بەدەستبهێنێت، بەتایبەت لەچاودێریکردنی گواستنەوەی موشەك و سیستەمەکانی موشەکی بۆ دەرەوە، هەڵبەت ئامانجی شاردنەوە و بەنهێنی هێشتنەوەی ئەم کاڵایانە پەیوەندی بەکاروباری سەربازیەوە نییە. هەندێك دەڵێن ئەمەریکا لەگەڵ ئێران هاتوچۆی بازرگانی هەیە، بۆیە هەوڵی ئەو بۆ سنووردارکردنی بازرگانی هاوپەیمانەکانی لەگەڵ ئێران تەنیا خەڵەتاندن و ڕیاکردنە، ئیمە دژی بازرگانی لەگەڵ ئێراندا نیین، هیچ جۆرە گەمارۆی ئابوری نێودەوڵەتی (وەك ئەوەی بەسەر عێراق سەپێنراوە) سەبارەت بەئێران بوونی نییە، ئەمەریکا بە گواستنەوەی تەکنەلۆجیا بەسوودی دوولایەنە بۆ ئێران ڕازی نییە، چونکە بەم شێوەیە ڕێگای بەرهەمهێنانی چەکی کۆکوژ بەدەست دێنێت، بەهیچ جۆرێك ڕازیی نیین لەبەرخاتری ڕەفتاری ناشایستەی ئێران بەپێدانی قەرزی تازە بەو وڵاتە پادشتی بکەین. باسێك کە ئەمەریکا بەهاوپەیمانەکانی داوە لەکۆتاییدا کارەکە بەم شێوەیە کۆتاییدێت کەباشترین ڕێگا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئێران کامەیە، ئەوان لەوباوەڕەدان دەبێت بۆ ئێران هاندەری تەواو هەبێت، ئەوان دەڵێن لەقۆناغی هەستیاری دانوسان ئەوەی کە هاندەری باشە بێتەدی و ڕەفتاری ئێرانیش دەگۆڕێت.

ئەوان سەبارەت بەرفتاری گرفتارئامێزی ئێران لەو پێنج خاڵەی کە باسکرا لەگەڵ ئەمەریکا هاوڕان، بەڵام بیردەکەنەوە کەبارودۆخە بەرچاوەکەی ئەوان ئەنجامی باشتری لێبکەوێتەوە. ئەمەریکا لەو باوەڕەدایە بەپێی پێشنەکان سودوەرگرتن لەپاڵنەر یان هاندەرە باشەکان وەك پاڵنەری بازرگانی یان پێدانی یارمەتی لەبەدیهێنانی گۆڕانکاری ڕاستەقینە بەناراستەی ڕفتاری ئێران، کاریگەری نەبووە.

ڕەخنەگرانی سیاسەتی جلەوگیری دوولایەنەی ئەمەریکا گەیشتنە ئەو ئەنجامەی هەرچەند فشاری زیاتر بخرێتەسەر ئێران و عێراق فاکتەری نزیك بوونەوەی ئەم دووانە لەیەکتر زیاتر دەبێت، ئەو ئەگەرە دروست دەبێت کە سەبارەت بەبەرهەڵستیکردن و دژایەتیکردنی ئەمەریکا دەستبخەنە ناودەستی یەکترەوە، وادەبینرێت کە نیشانەکانی ئەو قسانەی سەرەوە ئەوەیە کە هەردوو وڵات لەگەڕاندان بەشوێن جۆرێك لەبەرژەوەندی هاوبەشدان، بەڵام جارێکیتر بەبیری دەهێنینەوە کە لێکۆڵینەوەکان ئەوە پیشاندەدەن کە ئەمانە زیاتر لەوەی کە بەشەیتانی گەورە، (واتە ئەمەریکا)، بێمتمانەبن، متمانەی خۆیان بەیەکتر لەدەستداوە، ئەوان ڕۆژبەڕۆژ پەی بەو ڕاستیەدەبەن کە دوژمنەکەیان لەوبەری شەتولعەرەبە، هیچ یەکێکیان نارەزوو ناکەن هۆیەکانی بەهێزبوون یان هەڵاتن لەسنوردارکردنێك کە ئەمەریکا بەسەر هەردووکیانیدا سەپاندوە، لەبەرئەوە وادەبینرێت کە ئەم دوو وڵاتە توانای هاوکاریان لەگەڵ یەکتردا نییە.

دەستەیەکیتر لەرەخنەگران ووتویانە بەبەردەوامی گەمارۆی ئابوری لەسەر عێراق، ئەو ئەگەرە دروست دەبێت کە ئێران بتوانێت سود لەلاوازی ئەم دەوڵەتە وەربگرێت، لەم بارەیەوە دەبێت بوترێت کە بەڵگەی ئەو قسانە نیگەرانی زیاد لەحەدی دروستکردووە، لەڕاستیدا وەك دراوسێکانیتری عێراق و هەروەها ئەمەریکا، ئێرانیش بەرواڵەت لەهەوڵدایە ڕێبگرێت لەدابەشبوونی عێراق تازەمینە بۆ هەڵوەشاندنی وڵاتەکەی خۆشی نەهێڵێت.

ئەمڕۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا گەیشتۆتە ئەو دەرئەنجامەی کە سیاسەتەکانی بەئەندازەیەك واقعبینانەبووە و کاریگەری خۆی بەدیهێناوە، لەم ماوەیەدا حکومەتەکانی ئێران و عێراق لاوازتربوون و لەگۆڕەپانی نێودەوڵەتی گۆشەگیرتربوون.

ئەوان بەئارامی، بەڵام بەشێوەی لێبڕاو یەقین ئەم خاڵە دەبینن کە ئەگەر سووربن لەمانەوەی بەشێك لەنادروستی مێژوو بن، بۆ ئەوان گران تەواو دەبێت.

هەڵبەت ئەمە هێرش نییە کە تەنیا ئەمەریکا بڕیاری ئەنجامدانی دابێت، بەڵکو هەوڵێکە واقعیە و بەهەستیاری بەرپرسیارێتی بەمەبەستی بەهێزکردنی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی پابەند بەدیموکراسی، بازاڕی ئازاد و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ئارام و جێگیر لەهەمانکاتدا پەیوەندیدار بەپاراستنی بەرژەوەندیە ژیانیەکانی ئەمەریکا لەکەنداودا.

بۆچـونێتر سـەبارەت بەجڵـەوگیری دوولایەنـە لەلایـەن تیـۆری گراهـام فولـەر، لێکۆڵـەری گـەورەی دامەزراوەی راند (Rand Corporation) پێشاندراوە کە لەخواردوە دەیخەینەڕوو:

یەکەم، وادەبینرێت کە ئەمەریکیـەکان لەدەرخـستنی سیاسـەتی خۆیانـدا سـەبارەت بەمـەترسـی و هەڕەشـەکانی ئێـران بـەجۆرێك دارشـتووەکە زیـادەرۆیی (مبالغـە) تێدادەکـەن. دووەم، پێویـستە وڵاتـە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەسیاسەتی خۆیدا لەبەرامبەر ئێران دیقـەت و وردەکـاری بـەکاربێنێت، چـونکە لەگەڵ یەکەمین کۆماری ئیـسلامی لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەرەورووبۆتەوە، ئەم کۆمارە تـەنیا کۆمـارێکی ئیـسلامی نەبووە، واتە لەرووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئەم وڵاتە وەها پێشینەیەك لەگەڵ خۆی بەجێدەهێڵێت کـە لەدوایدا بەشێوەی بەرکەوتنی ئێمە لەگەڵ کۆمارە ئیسلامیەکانیتر، بیەوێت یان نەیەوێت بـاش یـان خـراپ کاریگەری دەبێت.

وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەبێت بەئاراسـتەی دروسـتکردنی رێکخـەرێکی باشـتر لەناوچـەی کەنداو هەنگاوبنێت، ئامـاژە بەدۆسـتان و هاوسـەنگی هێـز و پاراسـتنی پێگـەی سـتراتیجی زۆر مـەنتقی بکات، بەڵام لەقۆناغی دوای جەنگی سارد دەبێت رەوشی نوێ بێتەئاراوە تـا لەناوچـەی کەنـداو ووردەوردە بارودۆخێك بێتەپێشەوە کە خۆی کێشە ئەمنیەکانی چارەسەر بکات، هەڵبەت بەسوودوەرگرتن لەیارمـەتی دەرەکی، بەڵام نەك بەشێوەیەك کە هەتا هەتایە وابەستەی ئەمەریکا بێت.

لەم چوارچێوەیەدا چارەیەك جگە لەمە نابینرێت، کە ووتمان سیاسەتی جڵەوگیری دوولایەنە بـەهیچ جۆرێك بیرو ئەندێشەی بەسوود و کاریگەر نییـە، هەڵبـەت ئاشـکرایە کـە هـەردوو وڵات جێگـای تیـرۆوانین بەشێوەی جدی، ئەم دژایەتیەش لەسیاسـەتی ئەمەریکاوە هەڵقوڵاوە، لـەم بارەیـەوە هـیچ دوودڵیـەك نییـە، بەڵام خاڵێك کە پێویستە بووترێت ئەوەیە کە زاراوەی جڵـەوگیری دوولایەنـە زۆر نارۆشـن و وروژێنـەربووە، لەبەرئـەوە دەبێـت لەبەرامبەریـدا نـارازیبن و سـوودوەرگرتن لێـی هـەم سـوودبەخش نییـە، چـونکە کاتێـك مەسـەلەی جڵەوگیری دوو وڵات خرایەڕوو، لەبەرامبـەر عێـراق دەبێـت بابـەتی هێرشـبەری وەرگـرین، بـەڵام لەبەرامبەر ئێران نەخێر، بۆیە واباشـترە سـوود لەجڵـەوگیری یەکلایەنـە وەرگریـت، بـەڵام ئەگـەر ئەتـەوێت وڵاتیتر بگرێتەوە، بۆچی سوریا ناخەیتە ناو مەیدانەکەوە، سوریایەك کە رەفتاری زۆر هێرشبەرانەترە، بۆچـی لیبیا راناکێشیت تا بەو شێوەیە بتوانیت لەسیاسەتی جڵەوگیری دوولایەنە سـوودوەرگریت، هـیچ گومـانیی تێدانییە کە لەکات و شوێنی جیاوازدا گروپیتریش دەتوانرێت بخرێتە ناو تەوەرەی شەڕەوە (محوری الشر).

لەنێوان عێراق و ئێراندا چەندین جیاوازی سەرەکی هەیە کە لەدیدی ئێمەوە بـەوردی دەردەکـەوێت بۆچی نابێت هەردووکیان لەیەك گروپ یان پۆلێك دابنێین:

١) لەعێراق یـەك کـەس حکم دەکـات، بـەڵام لـەئێران حکومـەتێك بـە ناوەنـدی جیـاواز و چـەند رەهەندێك چاودێری دەسـەڵات دەکات.

٢) لەعێراق حکمی دیکتاتۆری و تۆلیتاری دەسەڵاتدارە، بەڵام لەئێران کۆمەڵگایەکی تارادەیەك کراوە و لەحاڵەتی گەشە و گۆڕاندایە.

٣) عێراق سیستەمی چاودێری تەواوی بڵاوکراوەکان پەیڕەوەی دەکات، لەعێراق هیچ هەواڵێك بۆ جیهانی دەرەوە ڕەوانە ناکرێت، بەڵام بڵاوکراوەکانی ئێران تارادەیەك ئازادترن، لەوانەیە باشتربێت بوترێت کە ئازادی بەبەراورت بە جیهانی عەرەبی زیاترە.

٤) عێراق خاوەنی ئەنجومەنێکی دەسەکەلای حکومەتە، لەکاتێکدا ئەنجومەنی ئێران لەڕووی قسەوباسەوە گفتوگۆی باش دەکرێت کە قسەوباسی ڕەخنە ئامێزیش دەگرێتەوە.

٥) لەکۆمەڵگای عێراقیدا هیچ گۆڕانێك ڕوونادات چونکە هەموو شتەکان پەیوەستە بەسەدام حسینەوە، لەوانەیە لەکاتی نەمانی سەدام ئەگەری گەشە و گۆڕان لەکۆمەڵگا دروست بێت، بەڵام تاکاتێك ئەو دەسەڵاتدار بێت، بەهیچ جۆرێك ئەم ئەگەرە ڕوونادات، سەبارەت بەئێران دەبێت بوترێت کە کۆمەڵگای ئێران بە شێوەیەکی دیارتر لەحاڵەتی گەشە و گۆڕاندایە.

٦) لەعێراق قەیرانی شوناس بەشێوەیەکی جدی هەیە، کە دەرکەوتەیەکی زۆر قوڵە، لەکاتێکدا ئێران خاوەنی شوناسی مێژووییە.

٧) عێراق خاوەنی چەندین ڕەگەزی ناڕازین، کە هەمیشە لەبەردەم هەڵوەشاندن و دابەشکردنی ئەم وڵاتەدان، بەڵام کۆمەڵگای ئێران چەندین نەژادی ڕازین کە فەرهەنگی پارسی پایەی یەکێتی نێوانیانە. ئایا ئەم یەکێتیە سەرچاوەی کێشەیە؟ بە شێوەی حەتمی نا، بەڵام کێشەیەك لەئێران هەیە کە بەتەواوی لەگەڵ کێشەی عێراق جیاوازە.

٨) عێراق بەشێکە لەڕژێمەکانی جیهانی عەرەبی، لەبەرئەوە زۆر ئاڵۆزە و بەشێوەی گشتی بەرکەوتنی لەگەڵ ئەم مەسەلەیە کێشە دروستدەکات، بەڵام ئێران وڵاتێکی تاك و سەربەخۆیە کە ڕەهەندی کاری بەهیچ وڵاتێکەوە وابەستە نییە.

٩) عێراق خاوەنی وڵاتێکی نەتەوەیی، چەپی ئائاینیە، بەڵام ئێران وڵاتێکی ئیسلامیە.

١٠) عێراق لەماوەی پازدەساڵی ڕابردوودا دووجار لەگەڵ دراوسێکانیدا شەڕی کردووە، بەڵام ئێران توشی جەنگی نێودەوڵەتی نەبۆتەوە. هەرچەندە لەڕابردوودا لەناوچەی کەنداو تووشی ڕووبەڕوو بونەوە بووە.

لەکۆتاییدا حکومەت لەئێران دەتوانرێت بگۆڕێت بەڵام لەعێراق هەتا سەدام لەسەر دەسەڵات بێت گومانی تێدانییە هیچ گۆڕانێك ڕوونادات، هەڵبەت لێکچونیش لەنێوان ئەم دوو حکومەتەدا هەیە، گرنگترینیان هەستی دوژمنایەتیە لەگەڵ ڕۆژئاوا، لەم بارەیەوە هیچ گومانی تێدانییە کە ئێران ئەمەریکا بەدوژمنی سەرسەختی خۆی دەزانێت لەناوچەکە، سەرەڕای ئەوە مەسەلەی خۆ پڕچەك کردنی ئێران و

عێراق بەهەمان شێوە کاری بۆ دەکرێت، بەشێوەی لیبراوانە ئێران بەجدی بەدوای بەدەستهێنانی چەکی ئەتۆمییە لەم ڕێگایەدا لەهیچ هەوڵێك دریخی ناکات، ئیمە دەبێت بە توندی چاودێری ئەم کارانە بکەین.

بەبۆچوونی ئێمە دەبێت لەماوەی دەیەی داهاتوو، ئەو سەردەمەی دوای جەنگی سارد، ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ هاوسەنگی هێز بخەینەلاوە، لەجیاتی ئەوە پێکهاتەی جۆرێك کۆمەڵەی ناوچەیی ئەنجام بدرێت کەتێدا باسی ئاسایشی بەگرنگیدان بەئەندامانی ناوچەکە بکرێت. ئێران سەردەمانێکە ئامادەیە بکەوێت باس و خواسەوە هەتا دەرگای ئەم باسە کراوەبێت لەکاتێکدا عێراق ئەم کارەی نەکردوە، بەبۆچوونی ئێمە عێراقیش دوای ڕوخانی ڕژێم و نەمانی حکومەتی بەعس بۆ پەیوەست بوون بەم باسەوە دوودڵ نابێت.

هیچ کەسێك هەتا دەوڵەتانی ناوچەکە، نایانەوێت چەکی ئەتۆمی بڵاوبێتەوە، هەڵبەت هەر وڵاتێك دەیەوێت توانای ناوکی خۆی لەبەردەستدابێت، بەڵام هیچ یەکێك لەو دەوڵەتانەی ناوچەکە نایانەوێت ئەو هێزە لەبەردەستی ئەوانیتردابێت، بەڵام سەبارەت بەوەی کە باسی چەکی ناسایی دێتەپێشەوە لەکاتێکدا کە ئێرانیش شانبەشانی دۆستانی ئێستای ئەمەریکا، حەتمەن دەگوترێت کە (باشترە چەکدار بێت، چونکە لاوازبێت لەکاتی دەرکەوتنی کێشەکان لەناوچەکە ناتوانێت بەرگری لەخۆی بکات)، ئێمە خۆمان زیاتر لەتوانای ئەوان خەریك کردووە، بەڵام ئەو وڵات لەدۆستانی ئێمە نییە دوژمنی دۆستەکانمانە، بۆیە واهەستدەکرێت هەر هەنگاوێك بەرەو خۆ پڕچەك کردن ئەنجام بدرێت، لەدیدی ئەمەریکاوە هەنگاوێکی دوژمنانەیە، بۆیە دەبێت بەوردی دیاریبکەین کە چ ڕێگایەك گونجاوە لەگەڵ وڵاتێکی گەورەی وەك ئێران بگیرێتەبەر، ئەمەریکا دەبێت ئەم ڕاستیە لەبەرچاوبگرێت کە ئێران بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ کەوتۆتەبەر هێرشی عێراق و جەنگێکی خوێناوی لەنێوانیاندا ڕوبداوە.

سەبارەت بەپارێزگاری کردنی ئێران لەئیسلام، دەبێت بزانین کە بێگومان ئێران لەهەوڵدایە لەگەڵ هەر ڕێکخراو و حیزبێکی هاوبیری خۆی لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست پەیوەندی ببەستێت، چاوەڕوان دەکرێت ئەمکارە بۆ هەر حکومەتێك ئاسایی بێت کەبیەوێت لەگەڵ ئەوانیتر لەدانوساندا بێت و نفوزی خۆی فراوان بکات، بەڵام ئێمە بەتوندی لەوباوەڕەداین پەیوەندی ئێران لەگەڵ هەر بزوتنەوەیەکی ئیسلامی ناتوانێت پەیامێکی گرنگی هەبێت، میسر لەگەڵ بزوتنەوە ئیسلامیەکان دەستەویەخەیە، بەڵام بەبڕوای ئێمە ئەگەر سبەینێ حکومەت ئێران بڕوخێت نەکێشەکانی حسنی مبارك دەگۆڕێت و نەکێشەکانی جەزائیر تەواو دەبێت، هەڵبەت گوێلێبوون لەدروشم و قسەکانی ئێران نیگەرانیەکان زیاددەکات، بەڵام لەو خراپتر ئەوەیە کە میسر و جەزائیر یا پاکستان لەو باوەڕەدابن کە ئەوە فکری ئێران کێشەی بۆ ئەوان دروست کردووە نەك کێشە ناوخۆییەکانیان، ئەمەش گەورەترین مەترسیە.

ئێران بەشێوەیەکی لێبڕاوانە لەهەوڵی وەستاندنی ڕەوتی ئاشتییە و دەیەوێت پرۆسەی ئاشتی هەرەس بێنێت، هەرچەندە واشنگتۆن واهەستناکات ئەم هەوڵەی کاریگەربێت بەڵام ئەمەریکا نیگەرانە لەپاڵپشتی و یارمەتیدانی گروپەکانی وەك حەماس لەلایەن ئێرانەوە، چونکە پەیامەکانی ئەوان دەتوانن کاریگەری ئەرێنییان هەبێت، تواناکانی ئێستای ئێران لەم ڕووەوە دەبێتەهۆی دروستکردنی کێشە.

سیاسەتی ئەمەریکا دەبێت چۆن بێت؟ بۆ ئەم مەبەستە قسە لەبارەی ڕێکاری تەمێکردن دەکرێت پێش ڕێکاری وەڵامدانەوە، ڕەوشی ئەمەریکا چ تەمێکردنێك بێت باشە و چی بێت باشنییە، لەکۆتایدا بارودۆخەکە ئەوەیە کە ئێران زۆر گۆڕان ناکات، ئێران هەمیشە پارێزگاری لەحاڵەتی ئەزیەتدان کردووە، تا ماوەیەکی درێژ بێگانەتربوو وە تۆڵەستێنبوو لەبەرامبەر هێزی دەرەکی، دیارنیە کە ئەمەریکا دەتوانێت گۆڕانکاری لەم ڕۆحیەتەدا دروستدەکات یان ناوچەکە، بەڵام گومانیتێدا نییە کە سیاسەتی جڵەوگیری دوولایەنە بەشێوەیەك کە لەبەرامبەر ئێران پەیڕەوی دەکرێت ئەو ئەنجامە پێویستەی هەبووە وەك ئەوەی کەسێك بتوانێت عەکسەکەی بسەلمێنێت و خۆشحاڵی بکات، ئەگەر ئێران لایەنی میانڕەوی زیاتر پەیڕەوی بکات دەبێتە جێگای خۆشحاڵی، بەڵام خۆشبینی بوونی نییە.

لەهەمانکاتدا باشترە ئاماژە بۆ هەندێك لەبابەتی لاوەکیش بکەین لەگرنگترینی ئەو مەسەلانە بابەتی ڕۆمانی (ئایاتی شەیتانی ـ سەلمان ڕوشدییە)، دەبێت بەڕاشکاوی بڵێن ئەم بابەتە لەلایەك، بەتوندی پەیوەستە بەئازادی ڕادەربڕینەوە کە ڕۆژئاوا بەقوڵی باوەڕی پێیهەیە و پشتگیری لێدەکات، پێویستە دەوڵەتە ئیسلامیەکان یان گروپە ئیسلامیەکان ئەمە تەحەمول بکەن، هەتا بۆچوونی توندی ئەزهەر لەمیسر لەتفسیرەکانیان بۆ ئیسلام بەئاراستەی توندڕەوی هەنگاو دەنێت، هەرچەندە لایەنیتریشی هەیە، بەڵام باسی سەرەکی ئەوەیە کە تفسیری توند و ڕادیکاڵ لەجاران زیاتر و دەرکەوتووترە، ئەمەش ئێمەی زۆر نیگەران کردووە و مەسەلەی سەلمان ڕوشدیش لەوەوە سەرچاوەدەگرێت.

بەڵام لەکۆتایدا ئەگەر پرسیارکرا کە ئایا دیدەنیکردنی کلنتۆن و سەلمان ڕوشدی کاریگەری باش و کاریگەربوو، دەبێت بڵێین بەڵێ، چونکە ئێرانیەکانی توڕەکردووە و پەیامێکی تایبەتی پێگەیاندوون، بەڵام دەبێت ئەوەش لەبەرچاوبگرین کە دەیەها مسوڵمانیتر لەجیهان هەیە ئەم پەیامە دەیگرێتەوە، لەکاتێکدا ئێمە مەبەستمان ئیهانەکردنی ئەوان نەبووە و نییە، بۆیە مەسەلەکە زۆر هەستیارە، بەڵام بیردەکەمەوە کە پێش هەرشتێك دەبێت بیر لەوخاڵە بکەینەوە کە سیاسەتی ئێستای ئێمە زەمینەخۆشکردنە بەئاراستەی بەرکەوتنی ئێمە لەگەڵ کۆمارە ئیسلامیەکان لەئاییندەدا لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

پێشبینی ناکرێت کە سیاسەتی ئەمەریکا خۆبەخۆ دیارکراوبێت، ئەوان لەزۆر ڕووەوە هاوشێوەی سیاسەتی ئەمەریکا لەبەرامبەر چین کاردەکەن، زۆریان دەپرسن ئەمەریکا بۆچی خۆی لەگەڵ چین دانوسان ناکات، بەڵام دەبێت ئەوە بیربهێنینەوە کە چین پەیوەستە بەکێشەی تبتەوە و ناردنی چەك بۆ وڵاتانی

مەترسیداری ناوچەکە و فرۆشتنی تەکنەلۆجیای ناوکی بەولاتانیتر و پێشێلکردنی مافی مرۆڤ و زۆرشتیتر، بەلاَم ئەمەریکا هەر خوازیاری دانوسانە لەگەلّ چین، لەوانەیە ئەم خواستە لەسیاسەتی بازرگانی ئەمەریکاوە سەرچاوەی گرتبێت.

لەکۆتاییدا وادەبنرێت کە چارەسەری مەسەلەی ئێران دژوارە، بەلاَم واهەستدەکرێت باشترە هەردوولا خۆێنەرداربن و دەست هەلّگرن لەهەندێك بابەتی ناهەستیار و لەسیاسەتەکانیاندا گۆرانکاری بکەن تا بەلّکو ئێران خێراتر لەئێستا گۆران و پەرەپێدان ئەنجامبدات، بەگشتی پێموانیە سیاسەتی ئێستای ئێران لایەنی رووبەرووبوونەوە و دوژمنکارانەی هەبێت، بەلاَم بیردەکەمەوە لەجیاتی ئەوەی کاریگەری پێویستی هەبێت، زیاتر بالّی توندرەو لەئێران دەجولێت ئەوانە دەهێنێتە ئەو بروایەی کە هەرگیز ناتوانێت لەگەلّ ئەمەریکادا پەیوەندی دروست بکەن و باشترە هیچ کاتێك ئەو پەیوەندیە دروست نەبێت.

بابەتیتر لەم بارەیەوە تیۆرەکەی ئەنتونی کوردزمنە، پرۆفیسۆری لەبواری توێژینەوەی ئاسایشی نەتەوەیی لەزانکۆی جۆرج تاون وابەستە بە بنیادی ویدرۆ ویلسن(woodrow wilson) بوو، گرنگترین بۆچون و قسەکانی ئەو لەم باسەی خوارەوەدایە:

لەکاتی توێژینەوەی تایبەت بەسیاسەتی هەرێمی و دەستکردن بەسیاسەتی لەبەینبردن و فەرامۆشکردنی مەسەلەکانیتر کە دەبێت لەقۆناغی جێبەجێکردنی سیاسەتدا لەبەرچاوبگیرێت کارێکی زۆر سادەیە، ئەم کارە بەتایبەت کاتێك کە باسی هاوسەنگی هێز یان جلەوگیری دەکرێت بەتەواوی مصداقیەت پەیدادەکات، پێویستە چەند ساتێك بەم بابەتە تایبەتمەندی بدەین کە لە زۆرلاوە دەبێتەهۆی بەهێزکردن و پتەوکردنی سیاسەتی جلەوگیری: جلەوگیری سەربازی یان پاراستنی هاوسەنگی سەربازی لەراستیدا مەبەست لەوەنییە کە بەئەوێت گەشەی ئابووری دورمەودای ئێران و عێراق سنوورداربکەین، بۆیە بەشی زۆری هەلّسەنگاندنی بەکارخراو لەدەسەلاّتی سیاسی ئەوان بەوخواستەوە گرێداوە کە ئایا دەتوانن لەرووی سەربازیەوە دەستوەردنە کەنداوی و ناوچەکانیتر یان نا.

بەلاّم لەئەنجامی ئەمکارەدا سەرەتا دەبێت ببینین کە لەرێگای جلەوگیری سەربازی دەتوانین بە چ ئامانجێك بگەین و چ کارێك ئەنجام بدەین، هەروەها دەبێت ئەوەبزانین کە ئەوکارە تەنیا تابعی ئەوەنییە کە ئێران و عێراق چ کارێك دەتوانن ئەنجام بدەن، بەلّکو وابەستەی ئەوەیە کە نەتەوەکانی ناوچەکە دەتوانن چ کارێك ئەنجام بدەن، لەلایەکیترەوە کارەکە پەیوەستە بەتوانای ئەمەریکاوە لەسنووردارکردن و جلەوکردنی توانای سەربازی عێراق و ئێرانەوە، جلەوگیری بابەتێك نییە کە تایبەت بەسەربازی بێت کە لەوانیە یەك دوو سالّیتر لەبەینبچێت یان نەچێت، لە هەردوو ولاّت ئەگەری شۆرش و گۆرانکاری سیاسی هەیە لەدەمیەی داهاتودا بەشێوەی زۆر بەهێز و توندوتیژ بەردەوامی دەبێت، بەهیچ جۆرێك ناتوانین پێشبینی بکەین کە ئایا رژێمی نادوژمن، دیموکرات، میانرەو دەسەلاّت دەگرێتەدەست یان نا، ئێمە ناچارین لەگەلّ ئەم دوودلّی

و نادلّنیاییە خۆمان بسازێنین، وەك ئەوەی ئەو خاڵە قبوڵ بکەین دەبێت لەئایندەی دورتر لەچەند ساڵ دواتر دوای جێبەجێکردنی گەمارۆی ئابوری ڕێکخراوی نەتەوەکان دژ بەعێراق، هەڵبەت تا ئەو ئاستەی کە ڕێکخراوی ناوبراو توانای جێبەجێکردنی ئەوەی هەبێت بڕوانین.

بەبۆچونی ئێمە جڵەوگیری یا نارەزایەتی یا قەدەغەکردنی بەدەستهێنانی چەکی کۆکوژ لەعێراق یا ئێران بەتەواوی ناکرێت، سەبارەت بەئێران بەشێوەی لێبڕا و یەقین دەتوانین پێشبینی بکەین، هەوڵی بەکارهێنان بۆ ئەم مەبەستە هەرگیز کاریگەری واقعی نەبووە، چونکە ئێران لەسەردەمی شادا بوو ئەم ڕەوتەی گرتەبەر، هەر شابوو کە بەشی سەرەکی لەتەکنەلۆجیای پێویستی بەشێوەی قاچاخ لەئەمەریکا هێنا تا بتوانێت بەرنامەی چەکی ئەتۆمی خۆی لەدەیەی حەفتاکاندا بخاتەکار، ئەگەرچی هیچ کەسێك نەیتوانیوە دەستی بەدەرامەتی گرنگ و دابینکردووی سوتەمەنی ناوکی بگات، بەڵام ئەم وڵاتە سەبارەت بەدەسکەوتنی چەکی بایۆلۆجی ئارادەیەك سەرکەوتنی بەدەستهێنا، ئەم بەرنامەیە لەسەردەمی شا دەستپێکرد، بەڵام دەبێت ئەوە قبوڵ بکەین کە هیچ زانیاریەکمان نییە لەسەر ئاستی سەرکەوتنی ئەمە لەم بوارەدا، لەناوەڕاستی دەیەی هەشتاکاندا ئەوان بەرنامەی دروستکردنی چەکی کیمیایی بەشێوەی بەرفراوان دەستپێکرد، تائێستا ئەم بەرنامەیە بێوەستان بەردەوامە، ئێمە ئەو گەمارۆیەی بەسەریاندا سەپانومانە تەنیا کاریگەریەکی سنورداری هەبوود.

بەشێوەی لێبڕاوانە ئێمە هەوڵماندادوە کارێك بکەین ئائەوانە دڕەنگتر موشەك بەدەستبهێنن، بەڵام کۆریای باکور موشەکی خۆیان بەدەستهێنا، ئێستا بڕیارە تەکنەلۆجیای بەرهەمهێنانی موشەك لەکۆریای باکور و چین بەدەست بهێنێت، ئامەوێت لێرەدا ڕۆڵی چین لەم بوارەدا دەرخەم کە کاریگەری و گرنگی زۆری هەبووە، کاتێك کە کۆریای باکور سیستەمی موشەکی تازەی خۆی بەکارهێنا، ئەوان ویستیان توانای موشەکی زۆرتر بەدەست بهێنن.

سەبارەت بەعێراق واقعیەت ئەوەیە کە بەپێی هەموو بەڵگەکان عێراق پێش جێبەجێکردنی هێرشی ئاسمانی ئەمەریکا توانیبووی بەشی زۆری چەك و توانا بایەلۆجیەکانی خۆی بگوازێتەوە، هێرشی ئاسمانی ئەمەریکا نەك تایبەت بەچەکی بایەلۆجی و نەسەبارەت بەسەکۆی موشەکی سکۆد سەکەوتوو نەبوو، بەواتایەکیتر ئەم هێرشانە کاریگەریەکی فیعلی نەبوو، هەڵبەت سەبارەت بەچەکی کیمیایی سەرکەوتنی زیاتری بەدەستهێناوە، بەڵام دەبێت باسبکەین کە بەپێی گوزارشتی کۆمیسیۆنی تایبەت بەڕێکخراوەی نەتەوەکان عێراق سەرکەوتوو بوو بەشی سەرەکی جبەخانەی چەکی کیمیایی و نزیکەی (٧٠ – ١٢٠) موشەکی سکۆد و هەتا موشەکی سکۆدی دورمەودای لەناو وڵات شاردۆتەوە، جەخت دەکرێتەوە کە ئەم خواستە کەسانێك ناڵێت کە لەدەرەوەی عێراق ڕەخنەی لێگیراوە، بەڵکو ئەم زانیاریانە بەتەواوی بەسوودوەرگرتن لەگوزارشتی تایبەت بەڕێکخراوی نەتەوەکان ئامادە و کۆکراوەتەوە.

کەوتوینەتە ناونەو ڕاستیە تاڵەوە، کە هەنگاوی پێویستە بۆ کۆنترۆڵکردنی تەکنەلۆجیاش سنوردارە، هەڵبەت ئەم هەنگاوانە دەتوانێت ئەگەری بەدەستهێنانی سوتەمەنی ناوکی لەبەینبەرێت، بەلام ناتوانن بەپەنابردن بۆ ئەوەی قەدەغەکردنی گواستنەوەی بەرنامە و نەخشەی پەیوەست بەچەکی ئەتۆمی عێراق یان هەر وڵاتێکیتر، عێراق خاوەنی دوو پرۆژەی خستنەکاری چەکی ئەتۆمی بوو بەپێی خستنەڕووی ڕێکخراوی نەتەوەکان دەردەکەوێت، وڵاتانی وەك پاکستان لەماوەی پێنج ساڵی ڕابردوو پیشانیداووە کە بە بەرهەمهێنانی پلانی چەکی و دڵنیایی لەممەوە پێویستی بۆ تاقیکردنەوەی ئەتۆمی، ئیران و عێراقیش ئەم تەکنەلۆجیایە بەباشی دەناسن، هەڵبەت توانای کۆنترۆڵکردنی چەکی بایەلۆجی بوونی نییە، چونکە ئەم بەشە یەکێك لەوانەی کە سیاسەتی کونترۆڵی چەك ناتوانێت ڕووبەڕووی بێتەوە، بەناشکرا دەڵێین ئێمە نازانین چۆن لەگەڵ مەسەلەی کونترۆڵی چەك ڕوبەڕووی ببینەوە.

ئەو دەستەیە لەتاکتیکی کۆنترۆڵی چەکەکان کە سەبارەت بەم ناوچەیە بەکاردەهێنرێت، بەسەرنجدان لەوەی کە هەردوو وڵاتی ئیران و عێراق پەیمانی بڵاونەبوونەوەی چەکی ئەتۆمیان واژۆکردووە، لەڕاستیدا کاریگەریەکەی سنوردارە، لەڕاستیدا ڕیکەوتننامەی چەکی کیمیایی هیچ کاتێك بۆ پشکنین و لێکۆڵینەوە لەوڵاتێك کە چەکدارە بەچەند سەد چەکێك لەوجۆرە ڕێکنەخرابوو، ئامانجی ئەسلی ئەوان نەیاری هێزی زەمینی لەپێکدادانی لەجەنگی کیمیاییدا فراوان بووە، ڕێکەوتننامەی چەکی بایەلۆجیش خاوەنی هیچ جۆرە گرنتیەکی جێبەجێکردن نەبووە و نییە و کۆنترۆلکرنیشی لەمبارەیەوە بوونی نییە، خەڵکی بەخۆشبینی زۆر لەتێڕوانینەکانی ئاژانسی نێودەوڵەتی ووزەی ئەتۆمی ئەڕوانێت بەلام پێموایە هەموو ئەمانە خاوەنی یەك ڕووی هاوبەشن: واتە هیچ کاتێك ڕابردوو شێوەی حسابی پەیوەست بەم پشکنینە زانیاریمان نەبوو جیاوازی نێوان پشکنینی سەرکەوتوو پشکنینی ناسەرکەوتوو نازانن - مەسەلەیەك کە بیری لێدەکەمەوە ئەوەیە کە حکومەتی ئەمەریکا لەڕووبەڕووبونەوەی لەگەڵ مەسەلەی کۆریای باکوریش دوچاری ئەمە بۆتەوە، حەقیقەت ئەوەیە کە هەموو دەزانن کێشەی زۆرجدی لەم ناوچەیە بوونی هەیە، سیستەمی کۆنترۆڵی تەکنەلۆجیای موشەکی تائێستا نەیتوانیوە کەسێك کە لایەنگری بڵاوبونەوەی چەکی موشەکیە ڕێگا لەمکارە بگرێت، سەرەڕای ئەوە سەبارەت بەنەگەری دەستکەوتنی موشەکی کرۆز هەروەها لەدەستدانی هەرجۆرە مەرج دڵنیایی جێبەجێکردنی.

ئەوەی وترا ڕاستیەکە بتەوێت یان نا تاماوەیەکی دوورودرێژ یەخەی ئەمەریکا دەگرێت، سیاسەتی جڵەوگیری ناتوانێت بەربەست لەبەردەم وڵاتان دانێت بۆ دەسکەوتنی چەکی کۆکوژ، چونکە بۆ کاریگەرکردنی ئەمە بوونی ئەمەریکا و سودورگرتن لەهێزی ئەمەریکا پێویستە، تەیار و پرچەککردنی وڵاتانی حەوزی کەنداو بۆ جڵەکردنی سەربازی عێراق یان ئیران گونجاونییە، دیارنیە کە لەکاتی گۆڕانی حکومەتی ئەم

وڵاتانە لەهەوڵی خۆیان بۆ دەسکەوتنی توانای ناوکی دەستبەرداردەبن یان نا، سەبارەت بەچەکی ئاسایی ئەمەریکا ڕووبەڕووە لەگەڵ ئەمجۆرە مەسەلانە.

ئیران ـ لێرەدا پێویستە بوترێت کە لەزەمینەی گۆڕانکاری ئیران و گوێزانەوەی چەمکەکانی لەسەر ئاستی فەرمی ئەرکی زۆر کاریگەر ئەنجام نەدراوە، یەکێك لەسەرکردەکانی پێشووی (CIA) ڕایگەیاندووە کە تێچونی ساڵانەی گواستنەوەی چەکەکان بۆ ئیران دەکاتە (٢) ملیارد دۆلار، مەسەلە ئەوەیە کە خەملاندنی ئێستا لەجیاتی (٢) ملیارد دۆلار دابەزیوە بۆ ئاستی (٦٠٠ تا ٨٠٠) ملیۆن دۆلار، ئەمەریکا لەگەڵ وڵاتێکدا سەوداکارە کە نزیکەی (٤٠ تا ٦٠٪) ی چەکەکانی خۆی لەساڵی (١٩٨٨) لەدەستداوە، لەکاتێکدا لەساڵی (١٩٧٩) بەدواوە هیچ کڕین و فرۆشێکی سەربازی گرنگی نەبووە، جگە لەو موشەکانەی کە لەکاتی جەنگدا دەست ئیران کەوتووە، هەتا موشەکێکی ڕۆژئاوایش نەچوتە ناو جبەخانەکانی سەربازی ئیرانەوە کە شیاوی سودلێوەرگرتن بێت، لەگەڵ هەوڵەکانی ئیران بۆ کڕینی چەك لەبازاڕی ڕەش بەڵام نەیتوانیوە لەناوچەکانیتری جیهان سەرکەوتووبێت و بێبەش بوو لە چەکی ڕۆژئاوا، بەتایبەت لەستانداری هێزی چەکداری ئەمەریکا.

سەبارەت بەتجهیزات قسەی زۆرکراوە، بەڵام خراپ نییە گەر دڵنیابن بەپێی ئامار و ژمارە، ئیران کەمێك زیاتر لە(١٠٠٠) تانکی هەیە کە کەمترە لەژمارەی ئەو تانکانەی کە لەساڵی (١٩٧٩) هەیبووە، واتە کە لەسەردەمی شادا لەسوپادا هەبوو، ئەم وڵاتە نزیکەی (٢٥٠ تا ٢٨٠) فڕۆکەی سەربازی هەیە، کە نیوەیان بۆ چالاکی بەکاردێت، هەڵبەت ئیران لەهەوڵدایە کە تجهیزاتی پێویست بۆهێزی ئاسمانی خۆی لەڕووسیا دابینبکات هەرچەندە لەسەردەمی شادا پەیوەستبوو بەڕۆژئاواوە، ئەم بارودۆخە ئەگەری دەسکەوتنی پارچەی یەدەگ دژواردەکات، لەسەردەمی شادا هێزی ئاسمانی ئیران کە نزیکەی دوو ئەوەندەی هێزی ئاسمانی ئێستا بووە (٤١٨) فڕۆکەی جەنگی هەبووە.

ئایا مەبەست ئەوەیە کە تەیارکردنی ئیران بەچەکی ئاسایی بەمەترسی یان هەڕەشە ناژمێردرێت؟ نەخێر چۆنکە لەزۆر بواردا زۆر باش کاریکردووە، لەبەکارهێنانی مین و ژێردەریایی، جێگیرکردنی موشەك لەگەروو هورمز، جێگیرکردنی سیستەمی وەڵامدانەوە و تجهیزی هێزی دەریایی بەجۆرێك کاریکردوە کە بەتەواوی دیارە مەبەستیەتی وڵاتانی حەوزی کەنداو بترسێنێت. ئیران پەرینەوەی ئەوتبەری لەڕێگای کەنداوەوە دژوارکردووە و لەماوەیەکی دورتردا دەتوانێت وەك هێزێکی پەرچدانەوە لەبەرامبەر ئازادی کاری هێزی دەریایی ئەمەریکا لەناوچەکە بێتە مەیدانەوە، وەك ئەوەی هێزی دەریایی ڕۆژئاوا لەکەنداو بوونی نەبێت، هێزی دەریایی ئیران حەتمەن باڵادەست دەبێت بەسەر کەنداوەدا، ئیران لەکاتی کڕینی فڕۆکەی جەنگی میك-٢٩ و سوخۆ-٢٤ دایە، ناردنی فڕۆکەکان عێراق بۆ ئەو وڵاتە لەکاتی ئەنجامداندا لەڕووی جەنگیەوە زۆر کاریگەر و وردبووە، ئیران سەرقاڵی دامەزراندنی تۆڕی بەرگری ئاسمانیە، وەك ئەوەی ڕووسیا

دوو ساڵە هەوڵدەدات موشەکی (سام-١٠) بەو وڵاتە بفرۆشێت، ئەمەریکا هەنگاوینا بەڵام نەیتوانی ئەم هەوڵە لەبەینبەرێت، ئێران بەشێوەی لێبراوانە و یەقین بنەمای سەربازی خۆی لەرووی ژمارەی تانکەوە دوو بەرامبەر کردووە، لەئێستادا سەرقاڵی دابینکردنی کەشتی بازرگانیە بەتایبەتی گواستنەوە و بارکردنی خێرای کاڵاکان، کە بەهۆی دوری لەکەنداوەوە دەتوانێت کاریگەری لەسەر کەلوپەلی هێزی دەریایی ئەمەریکا هەبێت، ئەم وڵاتە لەحاڵەتی گۆڕاندایە بۆ مەترسی سەربازی کەتێدا گەورەترین هێزی ناناسایی جیهان واتە سوپای پاسدارانی شۆڕش کاریگرتۆتە دەست، سەرەڕای ئەو ڕاستیە کە جەنجاڵی و زیادەڕۆیی سەبارەت بەڕابردووی چەکداری لەناوچەکەدا، پێویستی پەیدابوونی تەفسیر و تێڕوانینی زۆرترە سەبارەت بە ئێران کە ئەسلەن واقعیەتی شاراوە نییە، بەڵام دەبێت بزانین کە لەبەردەم مەترسی و مەسەلەی جدیداین.

عێراق ــ سەبارەت بە عێراقیش دەبێت بەدیقەت و زۆرورد کاربکەین، سیاسەتی جڵەوگیری سەربازی سەبارەت بەم وڵاتە زۆر سەرکەوتووبووە، ئەگەرچی عێراق بەشێکی بەرچاو لەتوانای خۆی بنیاتناوەتەوە، بەڵام نەیتوانیوە سوود لەپێشەسازی سەربازی خۆی وەبگرێت کە لەماوەی جەنگی عێراق ئێراندا دایەزراندبوو، چونکە ئەسلەن پشتی بە هاوردەی سەربازی بەستووە (وەك دامەزراوەی تعمیر و ڕاڕەندازی و سەرجەم دامەزراوە پێویستیەکانی چالاکی پاسەوانی چەکداری لەتەکنەلۆجیای باڵاتر کە لەبەردەستیدایە)، سەرەڕای ئەوە هێزی نۆیەراسیۆنی عێراق هێشتا (٢٩٠٠) تانك و (٣٧٥) فڕۆکەی جەنگی لەبەردەستدایە، جڵەوکردنی تەواوەتی عێراق لەڕێگای هێزی ئەمەریکاوە دەبێت، هەڵبەت تصور ناکرێت کە ئەمڕۆ کەسێك دەربارەی بنیاتنانەوەی توانا سەربازیەکانی کوێت قسە بکات، بێپەردە دەبێت بووترێت بەناراستەی ڕووبەڕوبوونەوەی کوێت بەکێشەی نەژادی و هێزی سەربازی کە بەبەراورد بەهێزی سەربازی پێش هێرشی عێراق زۆر گونجاوبووە.

عەرەبستانی سعودی ــ هێزی ئاسمانی عەرەبستانی سعودی لەزەمینەی جەنگی بەرگریدا نزیکەی (٥ تا ٨) ساڵ درێژەدەکێشێت تاوەکو بتوانێت وەك عێراق کەلوپەلی پێویست بۆ بەردەوامی چالاکی سوپای خۆی بەدەستبهێنێت، هێزی تەیارکراو تەنیا وەك هێزی بەرگری و درندەی هاوشێوەی ئەوە کە لەئوستانەکانی ڕۆژهەڵات جێگیرە دەخواست. تاکاتێك کە هاوسەنگی هێز لەژێر کاریگەری ڕکەبەرایەتی ئێران و عێراق لەگەڵ یەکتر بوونی نییە، سیاسەتی جڵەوگیری و بەرپەرچدانەوە و هاوسەنگی هێز تەنیا بەئامادەیی و بەکارهێنانی هێزەکانی ئەمەریکا لەناوچەکە، شیاوی کارپێکردنە کە دەبێت بۆ ماوەیەکی درێژ بەردەوامی هەبێت.

دیدگایتر سەبارەت بەجڵەوگیری دوولایەنەی ئێران و عێراق بەپێی تیۆری (قب مار) لەمزانکۆی بەرگری نەتەوەیی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ڕایدەگەیەنێت:

جەنگی کەنداو هاوسەنگی هێزی تارادەیەك بەرقەرارکرد، بەڵام لەبەرزکردنەوەی زۆری گرژیەکان کە فاکتەری دەرکەوتنی ئەوە بووە، بێ توانا ماوەتەوە، لەئەنجامدا لەماوەی ساڵانی دوایدا بەڕێوەبردنی ناکۆکیەکان و گفتوگۆ باشترین کارە کە ئەمەریکا دەتوانێت چاوەڕوانی ئەنجامی لێبکات، بەڵام مەبەست ئەوەنییە کە کێ لەحکومەتەکانی ناوچەکە بیەوێت بەشێوەی هۆکاری چارەسەری گفتوگۆکان دەرکەوێت، ئەمەریکا لەبەرامبەری وەستاوە و دژیەتی، بەشێوەی لێبڕاو تائەو شوێنەی کە ئیمکانە دەبێت یارمەتی کەمکردنەوەی گرژیەکان بدات.

لەگەڵ ئەوەی زاراوەی (جڵەوگیری دوولایەنە) لەوانەیە زاراوەیەکی گونجاونەبێت، بەڵام بەپێوەری دژایەتیکردن و ناکۆکی دروستبووە لەژێرکاریگەری سیاسەتی سەرسام دروستبووە لەلایەکەوە هەمووشتێك سەلمێنراو دیارە، هەوڵەکانی ڕابردوو لەڕووی پاراستن یان سوودوەرگرتن لەهاوسەنگی هێز لەنێوان ئیران و عێراق ناکام و نەزۆك بووە، چونکە نەبۆتە کۆسپە لەبەردەم سەرهەڵدانی شۆڕش، ئەڵبەت ئەگەر وادانێن ئەمە قابیلی قبوڵە، ئەم هەوڵە نەبەربەستبوو لەبەردەم جەنگی هەشت ساڵەی عێراق و ئیران و نە سەرکەوتووبوو لەکۆتایی پێهێنانی، بەشێوەی گشتی نەیتوانیوە بەربگرێت لە هێرشی سەدام بۆ سەر کوێت، ئێستا دەبێت ئەو پرسیارە بخەینەڕوو کە ئایا ئەمەریکا دەتوانێت ئەوجۆرە هاوسەنگیە بێنێتەدی، سەرەڕای ئەوە مەزەندە ناکرێت کە تازەمانێك کە حکومەتی ئێستا لەسەرکارە، ئەمەریکا ئامادە بێت بۆ تەمێکردنی عێراق بەئاراستەی ئیران، دوودڵی ناوێت کە بۆ تەمێکردنی ئیران، تاکاتێك سەدام لەسەر دەسەڵات بێت بەئەندازەی عێراق لایەنگری نابێت، بەگوزارشتێکیتر لەئایندەدا شیاوی پێشبینیکردنە کە ئەمەریکا بیەوێت یان نەیەوێت مەجبورە بەپەنابردن بۆ بوونی سەربازەکانی خۆی لەکەنداو ئەم هاوسەنگی هێزەی دروستکردووە، بەڵام پێوەری فراوانی ئامادەیی بەرچاو مەسەلەیەکە شیاوی باس و لێکۆڵینەوەیە، هیچ گومانی تێدانییە کە سیاسەتی دوو ستونی کۆن هەڵوەشاوەتەوە.

لەهەمانکاتدا کە بۆ کێشەی هاوسەنگی هێز ڕێگاچارەی تایبەتی نییە، بەڵام وادەبینرێت کە سیاسەتی جڵەوگیری دوولایەنە نیگەرانی دروستکردووە، یەکەم ئەوەیە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەناوچەی کەنداو ناچاربووە بەلاوازترین ڕەگەزی هێزی سێ لایەنە واتە عەرەبستانی سعودی و ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو پشت ببەستێت، ئەم بارودۆخە لەئێستادا جێگای نیگەرانیە و قبوڵناکرێت، هەتا لەناو ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو دەبێت زیاتر سوود لەبوونی ئەمەریکا وەربگرێت.

## شیکارو لیکۆڵینەوەی ئەو بیرو بۆچونانەی خراوەتە ڕوو:

سەبارەت بەلیکۆڵینەوە لەودیدگایانەی کە خراوەتەڕوو، دکتۆر تۆماس ماتیر لیکۆڵەری سیاسی ئەنجومەنی سیاسەتی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دەڵێت:

وابەرچاو دەکەوێت کە حکومەتی ئەمەریکا لەڕاستیدا داواکاری گۆڕانی فراوانە لەحکومەتی عێراقدا، لەکاتێکدا سنوردارکردنی سەربازی وەك لەبڕیار (٦٨٧) ئەنجومەنی ئاسایشدا هاتووە لەماوەی (٦ تا ١٢) مانگ بەڕاشکاوی ڕاگەیەنراوە کە بوونی ئەمەریکا لەکەنداوی فارسی بەتوانای خۆی داواکراوە، ئایا لەمیانەی هەڵگرتنی گەمارۆی نەوتی ممکین نابێت؟ سەبارەت بەکاریگەری گەمارۆ لەسەر خەڵکی عێراق هەڵبەت بەشێوەی بەرفراوان باس نەکراوە، هەرچەندە سەدام لەئەگەر و تواناکانی کە هەیەتی وەك بڕیارەکانی (٧٠٦) و (٧١٢) بۆ کەمکردنەوەی دەردەسەریەکانی خەڵکی سودی لێوەرنەگیراوە، بەڵام بەبوونی ئەوە ئەگەر بتوانن لەسایەی ئەو بڕیارانە بەرنامەی سەربازی ئەو سنوردار بکات و بوونی ئەمەریکا بەجۆرێك چەسپاوە کە عەرەبستانی سعودی و کوێت هەست بەئاسایش بکەن، ئایا ئەگەری یان توانای لابردنی گەمارۆی لەهەمانکاتدا بەدیهێنانی ئامانجە ئەساسیەکانی ئێمەیە، واتا جڵەوگیری سەربازی و قەدەغەکرنی ئەو لەهەڕەشە دراوسێکانی بوونی نییە؟

## سیاسەتی ئەمەریکا بۆ بەرپەرچدانەوەی ئێران و عێراق *:

سەبارەت بە سیاسەتی ئەمەریکا لەبارەی ئێران و عێراقەوە توێژینەوەی زۆر لەسەر کراوە، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ئێران و عێراق وەك کۆسپ لەبەردەم خواستەکانی خۆیدا دەبینێت، لەبەرئەوە ئێران دوای شۆڕشی ئیسلامی و سەرکەوتوانە دەرچوو لەجەنگی ئێران عێراق، بەڵام عێراق لەوجەنگە و جەنگی دووەمی کەنداو لەهەردوکیان بەشکستی هاتۆتەدەرەوە بۆ بەردەوامی ئامانجە ستراتیجیەکەی خۆی لەناوچەکە کۆسپی گەورەی لەبەردەمدایە، ئەمەریکا لەهاوپەیانی نێوان وڵاتانی ناوچەکە هەراسانە و نارەزوو بۆ هاوکاری لەناوچەکەدا نییە، چونکە هەرجۆرە هاوکاریەك لەنێوان وڵاتانی ناوچەکە بوونی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لاواز دەکات، ئەگەرچی لەئایندەدا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا وەڵامی بۆ بوونی خۆی لەناوچەکە نەبۆ هاوڵاتیانی خۆی و نەبۆ خەڵکی ناوچەکە پێنییە، هەرچەندە لەئێستادا بەپێی تێبینی ستراتیجی و بەرژەوەندی نەتەوەیی خۆی هەوڵدەدات لەناوچەکەدا بوونی هەبێت و وڵاتانی ناوچەکەشی ناچارکردووە ئەمە قبوڵبکەن، بەردەوامی سیاسەتەکانی ئەمەریکا لەزەمینەی بڕیاردان بەوەی کە هەردوو وڵاتی خستۆتە ناو لیستی پشتگیریکردن لەتیرۆر و نەیاری ئاشتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەمە وایکردووە کە بەردەوامی گەمارۆی ئابووری ئەتەوە یەکگرتووەکانی سەر عێراق و گەمارۆی سەر ئێران درێژە پێبدات، بۆ ئاگاداربوون لەبۆچونی سیاسەتمەداران و دەوڵەتمەردانی ئەمەریکا دەربارەی عێراق و

---

* ) ئەم بابەتەبەشێکە لە وتاری پلترو جێگری وەزیری دەرەوەی ئەمەریکایە.

ئێران و ناشنابوون لەدیدی فەرمی سیاسی و زانستی دەربارەی عێراق و ئێران دەڕوانینە دەقی قسەکەی (پلێترو) یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا لەساڵی (١٩٩٦) کەلێرەدا گرنگترین بۆچوونەکانی دەخەینەڕوو:

نزیکەی (٢/٣) یەدەگی نەوتی دڵنیایی لەجیهاندا دەکەوێتە ئەم ناوچەیەوە و توانای گەیشتنی جیهان بەم سەرچاوەیە لەرێگای وشکانی و دەریاییەوە لەلایەن هەردوو وڵاتی ئێران و عێراق کەوتۆتە بەرهەڕەشە، ئەم دوو حکومەتە بێگومان دوژمنی دراوسێکانیانن لەکەنداو و ئیسرائیل و وڵاتانی هاوپەیمانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، سەرەڕای ئەوەش ئەم دوو وڵاتە لەوڵاتە مەترسیدارەکانن کە هەوڵدەدەن بۆ دەستکەوتنی چەکی ئەتۆمی.

نموونەی هێرشەکانی عێراق بۆ جیهان ئاشکرایە، بەڵام ئەمەریکا ڕووبەڕووی ڕفتارەکانی ئەم دواییەی بووەوە، ئێران دەستیان کردووە بەبڵاوکردنەوەی هێزە سەربازیەکانیان لەچەندین دورگەی بچوکی کەنداو لەنزیك گەروی هورمز کە (٩٠٪)ی نەوتی ناردەنی کەنداو لێرەوە تێدەپەرێت، ئێران چەندین هەزار سەربازی ئێرانی بۆ ئەم دورگانە ڕەوانەکردووە، سەرەڕای کڕینی تۆپ و موشەکی دژە کەشتی و چەکی کیمیایی و ژێردەریایی بەتوانا بۆ مین چاندن و بەلەمی تەیارکراو بەموشەکی دژەکەشتی.

ئێران لەهەوڵدایە بۆ دەستکەوتنی تەکنەلۆجیای چەکی ئەتۆمی و پشتیوانی لەتیرۆریزم و دژی ئیسرائیل و وڵاتانیترو نەیار بەرەوتی ئاشتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و پێگەی هەڕەشە ئامێزە لەکەنداو و سەرچاوەی ناارامیە لەناوچەکەدا، بەسەرنجدان لەوەی کە ئێران و عێراق دوو هێزی گەورەی سەربازی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستن، دەتوانن لەرێگای شەڕەوە ئەم ناوچەیە ڕووبەڕووی مەترسی گەورە بکەنەوە، لەبەرئەوە ئەمڕۆ دەمانەوێت سەبارەت بەشێوەی ڕووبەڕووبوونەوە لەسەر ئەم مەترسیە قسەبکەین.

گروپی سیاسەتی ئەمەریکا کە بەسیاسەتی (جڵەوگیری دولایەنە) ناودەبرێت، دوو ئاراستە لەولایەنە کە بەدوای ڕوبەڕوبونەوەین هەم لەگەڵ عێراق و هەم لەگەڵ ئێران و لەهەوڵداین بۆ نوێکردنەوە و گۆڕینی ڕەفتاری دوژمنکارانەی ئەم دوو حکومەتە، گرنگیەکی زۆری هەیە خاڵێك لێرەدا ڕوونبکەینەوە: وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دژی ئیسلام و خەڵکی ئەم دوو وڵاتە نییە، ئەوەی ئێمە دژایەتی دەکەین ڕفتاری حکومەتەکانی ئێران و عێراقە، بەتایبەت ئەمانە هەڕەشن بۆ سەر دراوسێکانیان و ناردنەدەرەوەی نەوتیش دەخەنە مەترسیەوە، تا کاتێك گۆڕان لەرفتاری ئێران و عێراق ڕوونەدات ئەم سیاسەتی بەرپەرچدانەوەیە لەکەنداو درێژەی دەبێت.

بەهەرحاڵ مەبەستی ئێمە لەباسی ئەمڕۆ گفتوگۆ سەبارەت بەم سیاسەتە نییە، بەڵکو شێوەی بەردەوامی و مانەوەی ئەم سیاسەتەیە، زۆرێك لەخەڵکی هێشتا لەفراوانی جێبەجێکردنی ئەم سیاسەتە کە لەمساڵانی دوایی دەستپێکردووە بێئاگان.

لەتشرینی یەکەمی ڕابردوو، من سەفەرم کرد بۆ کەنداو، کاتێك ئێمە لەگەڵ عێراق دوچاری کێشە بووین و ئەوان هێزیان بۆ سەر سنوری کوێت ناردبوو، جارێکیتر لەنازاردا چوومەوە بۆ ئەو ناوچەیە لەگەڵ پێنج وڵاتی (عەرەبستانی سعودی، کوێت، ئیماراتی عەرەبی، بەحرین و قەتەر) چاوپێکەوتنم لەگەڵ سەرکردەکانیان کرد، ئەمانە هەموو بەجدیەوە دەیانڕوانیە هەڕەشەکانی ئێران و عێراق، هەموویان پێشوازیان لەبوونی ئەمەریکا دەکرد، هەموویان بەگشتی ڕێکەوتوون لەسەر ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو هەڕەشانە، هەموویان ئارەزوویانە لەجێبەجێکردنی ئەم ئەخشەیەدا هاوکاریمان بکەن، ئەمە شتێکە کە دەمەوێت ئەمڕۆ لەمبارەیەوە ڕونکردنەوە بدەم.

ستراتیجی ناوبراو پێکهاتووە لە سێ بەش:

* بەشی یەکەم بەهێزکردنی ژێرخانی بەرگری هەریەك لەوڵاتانی کەنداو، لەم بوارەدا پێشکەوتنی زۆر لەدوای کۆتایی جەنگی کەنداو هاتۆتەدی، ئەمە لەکاتێکدا بوو کە بازار لەپاشەکشێ و بەرهەمی نەوت لەکەمیدا بوو، تائێستا وڵاتانی کەنداو لەهەوڵی جدیدان بۆ بەهێزکردنی ژێرخانی بەرگریان، ئێمە ئێستا لەبواری ژێرخانی بەرگریدا یارمەتی هەریەك لەو وڵاتانە دەدەین، مەبەست لەوهاوکاریە بریتیەلە کڕینی چەك، پلان و تەدریبی سەربازی و مانۆڕی هاوبەش.

بەڵێنی ئەمەریکا بۆ یارمەتی بەدۆستەکانی لەناوچەکە، تائێستا وەك خۆی ماوەتەوە تائەوانە بتوانن مەبەستی بەرگری خۆیان لەڕێگای بەدەستهێنانی سیستەمی چەکدارکردنی گونجاوەوە ڕێکبخرێت، ئەم چەکانە نەك تەنیا یارمەتی ئەوان دەدات کە ڕوبەڕووی دوژمنەکانیان ببنەوە، بەڵکو توانیویانە هێزی چەکدار بۆ هاوکاری و چالاکی لەپاڵیدا باشبکرێت، تەنیا یارمەتیەکان لەڕێگای چەکەکانەوە نابێت بەڵکو ڕاهێنانی سەربازی باشتربێت و ئەو چەکانە هاوجووت بێت لەگەڵ پێکهاتەی هێزی سەربازی، بۆنموونە هێزی ئاسمانی کوێت لەئێستادا پێویستی بەفڕۆکەی تازەنییە، بەڵکو پێویستی بەڕاهێنانی فڕۆکەوانەکانە، لەبەرئەوە ئامانجی ئەسلی هاوکاری بەرگری ئێمە لەگەڵ کوێت لایەنی ڕاهێنانی سەربازی و بەکاهێنانی چەکە.

* بەشی دووەم: لەستراتیجی ئێمەدایە هەنگاو بنێین بۆ بەهێزکردنی توانای وڵاتانی کەنداو بۆ بەرگریکردن لەخۆیان لەڕێگای ئەنجومەنی هاریکاری وڵاتانی کەنداوەوە، لەماوەی چەند ساڵی ڕابردوودا هەنگاوی گەورە لەم بوارەدا نراوە، بەڵام دەبێت دان بەوەدا بنێین کە خۆشبینی لەم بوارەدا دژوارە، ئەنجومەنی هاریکاری وڵاتانی کەنداو وەك پەیمانی ناتۆ نییە و هەرگیز ناگات بەناتۆ.

بەهۆی هەلومەرجی تایبەتی جوگرافیەوە ئەم وڵاتانە ڕێکناکەون لەسەر ئەوەی ئێران و عێراق کامیان زیاتر جێگای هەڕەشەن بۆ سەریان، سەیر نییە کە وڵاتانی باکوری کەنداو عێراق بەهەڕەشە و وڵاتانی باشوری کەندا و ئێران بەهەڕەشە دەزانن.

ڕکەبەرایەتی هەرێمی لەنێوان وڵاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو سەبارەت بە ناکۆکی سنوری هەندێکجار لەشێوەی پێکدادانی سەربازی دەرکەوتووە، وە لەکاتی پێدانی خەرجی و تێچونی پێویست بۆ هەنگاونانی ئاسایشی گشتی دووبارە ڕکەبەرایەتی دەکەوێتە نێوانیان بە پێی بڕی خەرجیەکە بۆ هەریەکە لە وڵاتەکان.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو دژوارییانەدا دەبێت وڵاتانی کەنداو بۆ پارێزگاریکردن لە هاوپەیمانێتیەکەیان زەمینەی ئەمنی بڕەخسێنن، چونکە ئەمە خۆی یارمەتیە بۆ بەرپەرچدانەوەی سیاسەتەکانی عێراق و ئێران.

* بەشی سێیەم: کە گرنگترین بەشی ستراتیجی چالاکی ئێمەیە، پاراستنی توانای بەرگری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە لە ناوچەکەدا، لەم بوارەدا هەنگاوەکان چوار قۆناغی سەرەکی دەگرێتەوە وەك لە خوارەوە باسی دەکەین:

- یەکەم پارێزگاریکردن لە مانەوەی هێزەکانی جێگیر لە ناوچانەکە، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ پێنج ساڵ پێش ئێستا، کاتێك هیچ هێزێکی جێگیرمان لەو ناوچانە نەبووە، مەبەستم لە سەردەمی کارتەرە، کاتێك کە پڕۆژەی هێزی کاردانەوەی خێرامان خستەڕوو، هیچ هێزێکی بەردەست لەو ناوچەیە بۆ ڕووبەڕووبوونەوە بەنیازی پارێزگاری لە ئاسایش نەبوو.

ئەمڕۆ ئێمە هێزێکی شیاومان لەو ناوچەیە هەیە، زۆر لەو هێزانە وەك بەشێك لە هاوپەیمانێتی نێودەوڵەتی کاردەکەن، ئەمانە ڕێکەوتننامەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان جێبەجێدەکەن (لەوانە پاراستنی ناوچەی دژەفڕین لە باکور و باشوری عێراق و سەپاندنی گەمارۆی ئابووری بەسەر عێراقدا).

بەڵام چالاکی لەناو هاوپەیمانیەکی سنوردار و کاتیدا بە تێچونێکی کەمتر دەکرێت، بەڵکو ئەم ئەگەرە زیاد دەکات و بەشێوەی قەیرانێکیتر پەیوەندی بکەن بە ئێمەوە، بەشێوەی گشتی لە ئێستادا ئەم هاوپەیمانێتیە خاوەنی (٢٠٠) فڕۆکەی جەنگی بارهەڵگرە لە گۆڕەپانی جەنگدا، ئەم فڕۆکانە کە زیاتر ئەمەریکین لە بنکەی ئاسمانی وڵاتانی ناوچەکە جێگیرن.

ئێمە ئامادەیی دەریایی بەهێزمان لە کەنداوی فارسی هەیە، لەوانە بنکەی فەرماندەیی لە بەحرێن، بۆنموونە کاتێك لە مانگی ئازار لەوێ بووم کەشتیگەلێك کە پێکهاتبوو لە(٢٠) کەشتی جەنگی، دوو کەشتیگەلی موشەك هاوێژ و چەندین بەلەم و ژێرئاوی لەناوچەکە جێگیرکراوە، تێکڕا (١٠٠) موشەکی تۆماهۆك لەسەر ئەم کەشتیانە جێگیرکراون، ئێستا هێزێکی دەریایی بەرچاومان لە ناوچەکەدا هەیە.

هەرچەندە ئەم هێزانە بەگشتی لە بەرامبەر عێراق جێگیرکراون، بەڵام بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەگەری هەر هێرشێك لەلایەن ئێرانەوە ئامادەیە، ئەم هێزانە لە مەبەستەکانی (ئێران و عێراق) ئاگادارن، بە پێچەوانەی ئەوەی کە لەسەردەمی هێرشی عێراق بۆ سەر کوێت لە ساڵی (١٩٩٠) ئەمەمان نەبوو.

- دووەم هەڵبەت ئێمە تەنیا ئامانەوێت هێزەکان بە گەورەیی لە ناوچەکە بهێڵینەوە، بەڵکو دەمانەوێت بتوانین ئەم هێزانە بەخێرایی لە شوێنی کتوپڕدا بەکاربێنین، هەڵبەتە ڕێژەی سەرکەوتنی ئێمە لەم بوارەدا بەپێی کردار و کەلوپەلی سەربازیەوە بەندە و جێگیرکردنی ئەم هێزە لە کەنداو خۆی دووەمین بابەتی ستراتیجی چالاکی ئێمە پێکدەهێنێت.

ئەمڕۆ لە کوێت کەلوپەلی سەربازی تەواو بۆ سوپایەکی تەواو تەیار بە تانك و زرێپۆشمان هەیە، کاتێك لە ئازاردا لە کەنداو بووم ڕێکەوتننامەیەکم لەگەڵ قەتەر واژۆکرد، بۆ پێدانی کەلوپەلی سەربازی بۆ دووەمین سوپای چەکدار، ئێمە ئێستا لە گفتوگۆداین لەگەڵ چەندین وڵاتیتر لەناوچەکە تا سێیەمین سوپای چەکدار ئامادە و تەیار بکەین، بوونی ئەو کەلوپەلە قورسانە لە ناوچەکە بۆ بوون و ئامادەیی ئێمە لە ناوچەکە ڕۆڵی گرنگی هەیە، ئەمە گوزارشت لە واقعی ناتۆ و هێزەکانی پامکوس (یەکە سەربازیەکانی جێگیر لە ئەوروپا) دەکات، بەواتایەکیتر بوونی کەلوپەلی قورس لە شوێنی جێگیری هێزەکان بە سوودترە لەوەی لەکاتی کتوپڕ بۆی ڕەوانەبکرێت، سەرەڕای ئەو کەلوپەلانە دوو وڵاتی کەنداو کە بریتین لە عەرەبستانی سعودی و عومان کەخاوەنی کەلوپەلی هێزی زەمینی و دەریایی و ژێردەریاین لە ئۆقیانوسی هندی وەك پێویستی بۆ پشتیوانی فڕۆکەکان لەبەردەستماندان.

- سێیەم بابەت توانایی هەرێمی ئێمەیە لەسەر ڕێکەوتننامەی پەیوەست بە ماف بەدەستهێنان، ئێمە لەم جۆرە ڕێکەوتنانە هاوکاریان لەگەڵ هەر شەش وڵاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو هەیە، ئەوانە بۆ ڕاپەڕاندنی ستراتیجی ئێمە گرنگن، بۆ نموونە لە کوێت دەتوانین مانۆڕی سەربازی ئەنجام بدەین تا بەهۆی کەلوپەلی جێگیر لە ناوچەکە کارئەنجام بدەین. دوای قەیرانی تشرینی یەکەمی ڕابردوو، ئێمە هێزەکانی خۆمان لە (قەڵای ستیوارت Fort Stewart)ی جۆرجیاوە بە فڕۆکە گواستەوە بۆ کوێت تا پەیوەندی بکەن بەو کەلوپەلانەی لە کوێت دامانناوە، بۆ ئەوەی لە مانۆڕی سەربازی بەشداری بکەن، ئەم ئامادەکاریە سەربازیە تا ناوچەی سنور دەجوڵێت، کاتێك کە ڕوداوێکی کتوپڕ دێتە پێشەوە ئێمە دەتوانین بەخێرایی لە عەرەبستانی سعودی بۆ هاتنەناوەوەی هێزی ئاسمانی باشتر مۆڵەت وەربگرین.

هەروەها لە تشرینی دووەمی ڕابردودا لەئەنجامی هەمان ئەو ڕێکەوتننامەیە توانیمان هێزە ئاسمانیەکانمان لەماوەی چەند ڕۆژێکدا سێ ئەوەندە زیاد بکەین، لەئەگەرگرتنی کەشتیەکان لەلایەن هاوکارانمان لە کەنداو ڕێگەپێدرا، ئەم ڕێکەوتننامانە پێویستیەکانی ئەمەریکا لەناوچەکە پردەکاتەوە، شتێك کە ئامانەوێت وڵاتانی کەنداویش نایانەوێت، ڕێکەوتنەکانی پەیوەست بە مافی بەدەستهێنانی

بۆئێمە زۆردەکات بەبێ زۆربوونی تێچوون و بەبێ شوێنەواری نەگەتیڤی سیاسی لەئەنجامی بوونی بارەگا سەربازیەکانمان لە ناوچەکەدا.

- چوارەم و دواین بابەت لەبەردەستابوونی نەخشەی چالاکی بۆ بەکارگرتنی هەموو ئەم هێزانەیە، ئێمە ئەوانە بۆ کاری جەنگی بەکاردەهێنین و ئەوانە لە ڕاهێنانی سەربازیدا سودیان لێوەردەگرین، هەروەها ئەوانە دەگۆڕین و تا لەگەڵ بارودۆخی گۆڕاوی ناوچەکە بسازێن، بۆ نموونە تەنیا یەك ڕۆژ بەسەر گەیشتنی هێزەکانمان بە سنوری عێراق تێپەڕیبوو، کە هێزەکانی عێراق گەڕابوونەوە سەربازگاکانیان.

سەرەڕای ئەوەی یەکەکان لە حاڵەتی ئامادە باشیدان، ئەمەریکا لە تشرینی یەکەمدا ئامادەبوو تا (١٥٠هەزار) سەربازی ژن و پیاو لەناوچەکە جێگیر بکات، فراوانی و خێرایی کاردانەوەمان جێگای سەرنج بوو، بەتایبەتی ئەگەر ئەمە بە سەردەمی (١٩٩٠) بەراورد بکەین، جیاوازی نێوان ساڵی (١٩٩٠) لەگەڵ ساڵی (١٩٩٤) لەڕووی ئەو تدارەك و ئامادەکاریەوە بوو کە ساڵانی پێشوو ئەنجام درابوو، هەندێکیان ڕاستەوخۆ دەستپێکرد و بەری بە پێشڕەوەی عێراق گرت، ماوەیەکی زۆر بۆ دانوسان لە هەموو بارودۆخێکی چالاکی لە کەنداو بەسەرچوو و ئێمە هیچ ستراتیجێکمان سەبارەت بەرێکەوتن لەگەڵ هاوپەیمانەکانمان نەبوو.

ئێستا دەبێت شوێنی ئەمەریکا لە ساڵی (١٩٩٠) و ئەمڕۆدا بەراورد بکەین ، هەروەك ئەوەی لە تشرینی یەکەم ڕابردوو سەلمێنرا، ئەنجامی ئەو جیاوازیە لە دوو شوێندا بوو کە لە ساڵی (١٩٩٠) ناچاربوونی بۆ دەرپەڕاندنی عێراق شەڕ بکەین، بەڵام لە ساڵی (١٩٩٤) کە تواناکانی ئێمەیان لە ناوچەکە بینی ناچار پاشەکشێیان کرد بێئەوەی تەقەبکرێت یان کەسێك بکوژرێت.

بەکورتی، جەنگی کەنداو لە ساڵی (١٩٩٠) نمونەیەکی باشی لە توانای سەربازی ئەمەریکا پیشاندا، ساڵی (١٩٩٤) نموونەیەکی باشی ئەم وڵاتەی بۆ بەرپەرچدانەوە پیشاندا.

ئەگەر بڕوانینە ئایندەیەکی دور، پێشکەوتنی ئەمەریکا لە توانای ناردنی خێرای هێز بۆ کەنداو بەرچاوتر دەبێت، دەبێت بزانین لە ساڵی (١٩٨٠) جیمی کارتر هێزی بەرپەرچدانەوەی خێرای بۆ ناردنی لەناکاو لە کەنداو دروست کرد.

## شوێنی ستراتیجی ئەمەریکا لەناوچەی کەنداو لەئێستادا :

یەکێك لە گرنگترین ستراتیجیە ڕاگەیەنراوەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە ناوچەکەدا بریتیەلە بوون و ئامادەیی بەردەوامی هێزە سەربازیەکانی لە ناوچەکەدا، ئەمڕۆ گواستنەوەی سەربازی و بوونی ڕاستەوخۆی ئەمەریکا لە کەنداو هەرچۆنێك بێت مانای ئەوەیە کە توانای سەربازی خۆی بۆ پشتیوانی لە سیاسەتەکانی خۆی و دابینکردنی بەرژەوەندیە نەوتیەکانی لەگەڵ بەرژەوەندی هاوپەیمانەکانی دژ بەگۆڕان و گۆڕانکاریەکانە، کە لەوانەیە لە کەنداو دور لە ئیرادەی ئەوان ڕوبدات.

(پلترو)، یاریدەدەری وەزیری دەرەکی ئەمەریکا لە وتارێکدا سەبارەت ستراتیجی ناوبراو لەو باوەڕەدایە کە ئەم ستراتیجیە لە سێ بەش پێکهاتووە:

- بەشی یەکەم بەهێزکردنی ژێرخانی بەرگری هەریەك لە وڵاتانی عەرەبی کەنداو و هاوپەیمانی ئەمەریکا بە یارمەتیدانی دۆستەکانی لە ناوچەکە، هەروەها تێدەکۆشێت تا ئەوان بتوانن پێویستیە سەربازیەکانی خۆیان لە ڕێگای بەدەست هێنانی سیستەمی چەکدارکردنەوە پڕبکەنەوە.

- بەشی دووەم ستراتیجی ئێمە هەنگاونانە بەرەو بەهێزکردنی توانای وڵاتانی کەنداو بۆ بەرگریکردن لەخۆیان لەڕێگای ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوە، لەگەڵ هەموو ئەو دژواریانە دەبێت وڵاتانی کەنداو بۆ پارێزگاریکردن لەهاوپەیمانیەتەکەیان لەبواری مەسەلە ئەمنیەکاندا هانیان بدەین، چونکە ئەمە بۆ بەپەرچدانەوەی عێراق و ئێران یارمەتییان دەدات.

- بەشی سێیەم: لەزۆر لاوە بەگرنگترین بەشی ستراتیجی چالاکی ئێمە دادەنرێت، کە بریتیەلە پارێزگاری کردن لەتوانای بەرگری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەناوچەکەدا.

هەروەها (لی هامیلتون) نوێنەری دیموکرات لەئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمەریکا لەوتارێکیدا لەساڵی (١٩٩٨) سەبارەت بە بوونی ئەمەریکا لەکەنداو پێوایە کە (ئامادەیی و بەردەوامی و بەهێزی سوپای ئەمەریکا لەناوچەی کەنداو دەبێت بەشێکی سەرەکی سیاسەتی ئێمە بێت، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و هەموو وڵاتە پێشکەوتووەکانی جیهانی پیشەسازی بەرژەوەندیە زیندوەکانیان لەبەردەوام ڕۆیشتنی نەوت لەکەنداودا دەبیننەوە، لەهەمان کاتدا هەشت وڵاتی ناوچەکە لەوانەش ئێران لەم بوارەدا خاوەنی بەرژەوەندی ژیانین، بوونی سوپای وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەکەنداو یارمەتیدەرە بۆ نارامی لەناوچەکە و هاوسەنگی سەربازی و پاراستنی ئاشتی.

ئامانجی بوونی سوپای وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەکەنداو، دژی ئێران نییە، لەڕاستیدا ئەمەریکا بەرژەوەندی بەهێزی لەدەستتێوەردانی ئێران لەمەسەلە ئاسایشیەکاندا هەیە، هەڵبەت چالاکی ئەو بەرامبەر بەئێمە و دراوسێکانی لەکەنداو لەوەوەهاتووە کە دانبەخۆداگرتن و ئاشتی ئامێز بێت).

لەبابەتیتری ستراتیجی ئەمەریکا لەناوچەکە دەتوانین بڵێین (ئەوەی بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دیاریکراوە، پاراستنی بەرژەوەندی ئەم وڵاتە بەکەمترین تێچوونی ئابووری و مرۆیی، پیاوانی دەوڵەتی ئەمەریکا پێیان وایە کە پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکا لەسیاسەتی پاراستنی بارودۆخەکەیە و لەم لایەنەوە ئەمەریکا لەستراتیج و ڕێکارەکانی بۆ ئەم کارانەیە: بەرگرتن لەپەیدابوونی هێزی سەرکەوتوو لەڕێگای پاراستی هاوسەنگی هێزەکان لەنێوان هێزە سەرەکیەکاندا کە بریتین لەئێران، عێراق و عەرەبستانی سعودی، زیادبوونی توانا سەربازیەکانی ئێران زەرورەتی ئەم سیاسەتەی پیشاندا،

ئەمەریکا لەدەستتێوەردانی ڕاستەوخۆی سەربازی لەعێراق خۆی پاراست بەڵام لەمانەوەی عێراقێکی لاواز یان دەوڵەتێکی لاواز بەتەواوی خاکەکەیەوە پشتگیری دەکات).

لێرەدا واباشە لەزەمینەی سیاسەتی ئەمەریکا لەکەنداو ئاماژە بۆ قسەی چەندین کاربەدەستی حکومەتی کلینتۆن بکەین:

(دوید ولچ) یاریدەدەری وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا بۆکاروباری ڕۆژهەڵاتی نزیك، ئامانج و سیاسەتی ئەمەریکا لەکەنداو لەحکومەتی دووەمی کلنتۆن بەمجۆرە باس دەکات:

- بەرگرتن لەململانێی ناوچەیی و جڵەوگرتنی ئێران و عێراق.
- بەرقەرارکردنی پەیوەندی توندوتۆڵ و سودمەندی دوو لایەنە لەگەڵ هاوپەیانەکانمان لەناوچەکەدا.
- ڕوبەڕوبوونەوەی تیرۆریزم و دژایەتی بڵاوبوونەوەی چەکی کۆکوژ.
- دڵنیابوون لەبەردەوامی هاتووچۆی ئازادانەی نەوت لەکەنداودا .

بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە ئاماژە بۆ چەند بابەتێك دەکەین:

یەکەم: ئەنجامی هەرکارێك پێویستە بۆ دابینکردنی ئەوەبێت کەرژێمی ئێستای عێراق (واتە ڕژێمی بەعس) جارێکیتر ئاسایشی ناوچەکە نەخاتە مەترسیەوە.

دووەم: والێکردنی حکومەتی ئێران بۆ گۆڕینی سیاسەتەکانی، چونکە ئەم سیاسەتەی ئێستا نەك هەر ئێمە (واتە ئەمەریکا) بەڵکو کۆمەڵی نێودەوڵەتیش قبوڵیناکات.

سێیەم: دۆزینەوەی ڕێگایەك بۆ پشتیوانی لەدۆستەکانمان لەسەرانسەری ناوچەکەدا، کە ئابوری، دیموکراسی، تیرۆریزم و مادە سڕکەرەکان، هەموویان ئەو ووتانەن کە ئەم بوارە دەیانگرێتەوە.

یەکێکیتر لەستراتیجی ڕاگەیەنراوی ئەمەریکا لەناوچەکە بریتیەلە کۆنترۆڵ و جڵەگرتنی ئێران و عێراق کە لەساڵی (۱۹۹۳) بەناوی (جڵەوگیری دولایەنە) ڕاگەیەنراوە، ئەم سیاسەتە شێوەی جیاوازی لەبەرامبەر ئەم دوو وڵاتە بەکارهێناوە، (دیوید ولچ) سەبارەت بەعێراق دەڵێت:

(سیاسەتی ئێمە لەبەرامبەر ڕژێمی سەدام حسین زۆر واقعیە بۆ کۆنترۆڵ و جڵەگرتنی لەبەرامبەر بەرژەوەندیە زیندوەکانمان لەناوچەی کەنداو، دۆستەکانمان پشت بەمللەت و هاوسێکانیان دەبەستن، ئێمە لەگەڵ مللەتی عێراق کێشەمان نییەوە لەجەنگدا نین و ئامانەوێت بەتەواوی لاوازی بکەین، بەڵام ئەو وتەیەش ڕاستنییە کە دەڵێت سەدام ئیتر مەترسی نییە بۆ سەر ناوچەکە.

ئێمە بۆ پارێزگاری لەسەختترین ڕژێمە نێودەوڵەتیەکان، سزای مێژوویی لەدژی عێراق و پارەی زۆرمان تەرخان کردوە، لەکاتی نەبوونی گۆڕانکاری بەرچاو لەبارودۆخی عێراقدا، ئەمەریکا هەروەها دەیەوێت پێش لەمەترسی ڕژێمی عێراق بگرێت، هەروەها کۆمەڵگای نێودەوڵەتی سەبارەت بەسزاکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان یکپارچە و یەکگرتوو ماونەتەوە.

سەبارەت بەجڵەوگرتنی ئێرانیش پێیوایە کە پاڵنەری سیاسی ئێمە لەبەرامبەر ئێران دوژمن بەرژێمی ئیسلامی نییە، بەڵکو دژ بەسیاسەتی دەرەکی ئەم وڵاتەیە کە یارمەتی تیرۆریزم دەدات و هەوڵدەدات بۆ بەدەستهێنانی چەکی کۆکوژو و نەیارە لەگەڵ ئاشتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و تێدەکۆشێت بۆ ڕوخاندنی حکومەتەکانی دراوسێی و پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ بەپێی پێوەری نێودەوڵەتی، ئامانج لەسیاسەتی ئێمە گۆڕینی ڕفتاری ئەم وڵاتەیە لەڕێی فشاری ئابوری و سیاسییەوە و لەهەمانکاتدا سنوردارکردنی تواناکانی ئێران لەدروستکردنی کێشە تا گۆڕینی سیاسەتەکانی.

ئەو پێیوایە شێوەی هەڵسوکەوت لەگەڵ ئێران دژوارترە وەك لەعێراق، چونکە کۆدەنگی نێودەوڵەتی سەبارەت بەچۆنیەتی کەمکردنەوەی دەردەسەریەکانی ئێران بوونی نییە، سیستەمێکی سزادانی ڕێکخراوی نەتەوەکان وەك ئەوەی عێراق دژ بەئێران بوونی نییە، وە لەگەڵ هاوپاێانەکانمان لەئەوروپا ناکۆکین سەبارەت بەئێران.

ئەو هەروەها سەبارەت بەسیاسەتی ئەمەریکا لەبەرامبەر گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی ئێران، پێیوایە کە ئێمە دژی گفتوگۆ لەگەڵ ئێراندانین، بەڵام تەنیا کاتێك ئەو کارە ئەنجام دەدەین کە گفتوگۆکە سەبارەت بەبوارێك بێت کە ئێمە لەگەڵ ئێراندا لەکێشەداین، لەوانە پارێزگاریکردن لەتیرۆریزم و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی چەکی کۆکوژ و لاوازکردنی ڕەوتی ئاشتی، وە چاوەڕوان دەکەین کە ئێرانیش بێت بەدەنگ ئەم بابەتەوە.

(ریچارد مورفی) سەبارەت بەستراتیجی ئەمەریکا لەناوچەکە پەیوەندیدار بەهەردوو وڵاتی ئێران و عێراق پێیوایە کە (ئێران هەرگیز گرنگی خۆی وەك کاراکتەری گرنگ لەناوچەی کەنداو واتە ئەو بەشەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە بۆتە هۆی سەرقاڵی ستراتیجی نێودەوڵەتی سەبارەت بەئاسایشی سەرچاوەی وزەی جیهان، بەپێی چاودێرانی سیاسی واشنگتۆن لەدەست نەداوە. ئێمە ساڵانێکە کەباس دەربارەی ئەنجامی هەرجۆرە هەوڵێك بۆ بنیاتنانەوەی پەیوەندی ئەمەریکا/ئێران بەئاراستەی ڕانەکردن لەبڕیارەکانی ئەمەریکا سەبارەت بەعێراق پەیوەندی خواردووە کە هاوپەیمانێتی بەسەرۆکایەتی ئەمەریکا لەساڵی (١٩٩١) عێراقیان لەکوێت کردەدەرەوە، ئەم پەیوەندیە حەزێکە بۆ بەهێزکردنی ئەو بیرۆکەیەی کە ئێران و عێراق هەردوو بەهەڕەشەی سەربازی بۆ سەر بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکا لەناوچەی کەنداو دەژمێردرێن.

ئەو بەردەوام دەبێت و دەڵێت: ئەمڕۆ واشنگتۆن هێزێکی باشتری لەکەنداودا هەیە، بۆ مەبەستی پاراستنی ئاسایشی کەنداو، لەبنەڕەتدا تێدەکۆشێت بۆ هاوسەنگکردنی لاوازی لەنێوان عێراق و ئێراندا، ئەگەر هەیە لەساڵانی ئایندەدا بەردەوامی بەمانەوەی هێزێکی سەربازی بەرچاو لەکەنداو بدات، بەڵگەی سەرەکی ئەمە گرنگی کەنداوە وەك گرنگترین دابینکەری وزەی جیهان (ئەمڕۆ نەوت و سبەی نەوت و

گاز) ئەمەریکا ئامادەیی کەنارخستنی نییە و پشت بەهیچ یەکێك لەوڵاتانی ناوچەکەش نابەستێت سەبارەت بەبڕیاری پەیوەست بەبەرهەم و نرخدانانی نەوتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە.

لێرەدا پێویستە سەبارەت بەجلەوگیری دوولایەنەی ئێران و عێراق ڕوونکردنەوە بدەین، ئەم سیاسەتە سەبارەت بە ئێران کارانییە، هەرچەندە سەبارەت بەعێراق لەژێر چاودێری ڕێکخراوەی نەتەوەکان بەهۆی گەمارۆکانی سەر عێراقەوە ئەگەری سەرکەوتنی زیاترە، بەڵام سەبارەت بەئێران ئەو کۆدەنگیە بوونی نییە واچاوەڕوان ناکرێت ئەمەریکا بتوانێت هاوپەیمانییەکی لەوجۆرە پێکبهێنێت، هەوڵەکانی ئەمەریکا بۆ گۆشەگیرکردن و جڵەکردنی ئێران نەك تەنیا سەرکەوتوو نەبوو، بەڵکو ئەنجامی پێچەوانەی لێکەوتۆتەوە، ئەمەریکا نەیتوانیووە کە هاوپەیمانە ئەورووپیەکان و دۆستە عەرەبییەکانی لەکەنداو ڕازیبکات بەهاوکاری نەکردنی ئێران، بەجۆرێك گرنگترین وڵاتی کەنداو کە عەرەبستانی سعودیەیە پەیوەندی نزیکی لەگەڵ ئێران هەیە، لەڕاستیدا ئەم سیاسەتە ئێران گۆشەگیرناکات، بەڵکو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا خۆیی بێبەش و گۆشەگیرکردووە لەبەرژەوەندی سەرمایەگوزاری لەئێراندا.

لەکۆتای ئەم باسەدا بەشێوەی گشتی دەتوانرێت بووترێت لەئێستادا بنەمای ستراتیجی ئەمەریکا بە سەرۆکایەتی (مارتین ئیندیك) خراوەتەڕوو کە بریتیەلە:

١) ڕەخساندنی زەمینەی لەبار بۆ ناردنەدەرەوەی نەوت بەنرخی گونجاو.

٢) بەرگرتن لەدەرکەوتنی هێزی هەرێمی و نێودەوڵەتی کە بەربەست بێت لەبەردەم بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکادا.

٣) هاوکاری وڵاتانی عەرەبی میانڕەوی ناوچەکە بەمەبەستی بەرزکردنەوەی توانای سەربازی و بەرگریان.

هەروەها پێویستە ئەوەش ڕونبکەینەوە کە دەسپێکردنی کاری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ گەیشتن بەستراتیجیەکانی خۆی لەکەنداو بەدوو شێوەبووە شەڕ و دژە شەڕ کە تاساڵی (١٩٩٥) لایەنی دژەشەڕی هەبووە و لەوکاتەی کە کۆنگرێسی ئەمەریکا بڕیاریدا لەسەر یاسای (دی ئاماتو) حاڵەتی شەڕی وەرگرت، بەڵام ئێستا شێوەی کاری وڵاتە یەکگرتووەکان لەم ناوچەیە لەشەڕەوە گۆڕاوە بۆ دژەشەڕ.

**(أ) ستراتیجی سیاسی ئەمەریکا لەحەوزی کەنداو:**

پلان و جێبەجێکردنی ستراتیجێکی سەربازی گونجاوی لەکەنداو بەبێ پلان و جێبەجێکردنێکی سیاسی تەواو بێمانا و ناعقلانییە، ستراتیجی سیاسیش بەنۆبەتی خۆی داپینکاری و ئامادەکاریەکی تەواوەی ستراتیجی سەربازیە لەناوچەی کەنداو، لەلایەکیترەوە دەبێت سەرنجمان بۆ ئەو خاڵە ڕابکێشین کە هەڵوەشاندن و دیاریکردنی ستراتیجیە جیاوازەکانی وڵاتێك کە یەکپارچەیە لەڕووی سەربازی و سیاسی و ئابووریە، کارێکی پڕکێشە و نەکردەنییە، چونکە هەر ستراتیجێك جیاواز لەشێوە و ئامانجی ڕاگەیەنراو

دەرکەویت، خاوەنی ئامانج و ئەنجامیتربێت، پلان و جێبەجێکردنی ستراتیجی لەهەلومەرج و هەلکەوتەی کات و شوێنەوە سەرچاوەدەگرێت.

ئامانجی ئەمەریکا لەتێکەڵ کردنی ستراتیجی سەربازی و سیاسی لەکەنداو، گەیشتنە بەئامانجەکانی خۆی و پاراستنی دەسەلاتی سیاسی و کۆنترۆلکردنی کاروباری ناوچەکەیە، پاراستنی سەروەری سیاسی ئەمەریکا لەناوچەکە گۆڕاوە بۆ پاراستنی سەروەری سیاسی لەدنیای ڕۆژئاوا و مانەوەی پێگەی سەرکردایەتی دنیای ڕۆژئاوا لەدەستی ئەمەریکادا، چونکە چارەنووسی ئەوان گرێدراوە بەکەنداوەوە و کەسێك کە کۆنترۆڵی کەنداو لەبەردەستدابێت، دەتوانێت کۆنترۆڵی جیهانی ڕۆژئاوا بکات، لەبەرئەوە دەرکەوتووە کە ئەمەریکا بەهۆی بالادەستی بەسەر کەنداو و ناوچە نەوتیەکاندا دەتوانێت خۆی وەك زلهێزێکی جیهانی بناسێنێت.

دوای جەنگی دووەمی جیهانی سەرنج و پەیوەندیەکانی ئەمەریکا سەبارەت بەناوچەی کەنداو و عەرەبستانی سعودی زیادیکردووە، لەدوای ئەو مێژووەوە پەیوەندی ئەم ولاتە لەگەڵ ولاتانی ناوچەکە چەند ڕەهەندێکی هەبووە، بەلام دەتوانین بلێین پەیوەندیەکان لەسێ تەوەرەی سەرەکیدا کۆبۆتەوە: نەوت، ناکۆکی عەرەب و ئیسرائیل، و پێشگرتن لەنفوز و فراوانخوازی یەکێتی سۆڤیەت.

لەدیدی ئەمەریکاوە دوای دەرچوونی بەریتانیا لەناوچەکە کاراکتەری سەرەکی ئاشتی و ئارامی و لەناوچەی کەنداو ولاتانی ئێران و عەرەبستانی سعودیە، بەپێی بۆچونی چاودێرانی سیاسی و سەربازی ئەمەریکا بوونی ئێران و عەرەبستانی سعودی بەهێز دەتوانێت بەربەست بێت لەبەردەم هەرجۆرە هەڕەشەیەکی دەرەکیدا، بەپێی ئەم سیاسەتەبوو لێشاوێك لەناردنەدەرەوەی چەك بۆ ئەم دوو ولاتە دەستپێکرد.

(ئەلیکسندر هیگ وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەمەریکا لەوتەیەکیدا لەبەردەم کۆمیتەی پەیوەندی سیناتی ئەمەریکا لە(١٧ئەیلولی ١٩٨١) دەریخست کە ستراتیجی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەرۆژهەلاتی ناوەڕاست دەبێت لەسەر بنەمای پاراستنی بەرژەوەندی ژیانی ئێمە بێت لەناوچەیەکی ناجێگیردا، کە نەك تەنیا دەرخستنی ناکۆکی عەرەب و ئیسرائیل بێت، بەلکو گەشەی بەردەوامی بەئاراستەی سۆڤیەت و جبەخانە مەترسیدارەکەی، لەدیدی هیگەوە ئاسایشی ناوچەکە دەتوانرێت لەرێگای سیستەمێکی سەرکەوتوو لەرێکەوتن و هاوپەیمانێتی ئاسایشی لەنێوان ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ولاتە سەرەکیەکانی ناوچەکە (میسر، ئیسرائیل، عەرەبستانی سعودی) بەدیبێت. ئەوا (چەترێکی ڕێکەوتنی ستراتیجی) کە داڕێژرابێت لەسەر پەیوەندی نزیك لەنێوان ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، کەنداوی فارسی و ناوچەکانی نزیك، هەروەها ناجێگیری لەناوچەیەك حەتمەن کاریگەری لەسەر هەموو ناوچەکە دەبێت.

هیگ دوو هەفتە دواتر لەدانیشتنێکیتردا پشتگیری لەکۆمیتەی پەیوەندی دەرەوەی سینات بۆ ڕازامەندی لەسەر فرۆشتنی فڕۆکەی ئاواکس بەعەرەبستانی سعودی کە دواتر لەبەرژەوەندی ئەمەریکا و پەیوەندیەکانی بوو لەناوچەکەدا کرد، ئەو (هیگ) چوار بنەمای پەیوەست بەستراتیجی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەناوچەی کەنداوی بەجۆرە دادەڕێژێت:

١- زیادکردنی پێگە و ئامادەیی سەربازی ئەمەریکا لەناوچەکە و دەوروبەری.

٢- بەهێزکردنی توانا سەربازیەکانی دۆستەکانمان.

٣- پتەوکردنی متمانە بەئەمەریکا وەك هاوکار کە پشتی پێببەسترێت.

٤- بەدواداچوونی ئاشتیەکی هەمیشەیی لەناوچەکەدا.

ئەمەریکا لەبەدواداچوونی ستراتیجی ناوبراو تائێستا ڕێکەوتنی سەربازی، ئابووری، هونەری، فەرهەنگی و بازرگانی زۆری لەگەڵ ولاتانی ناوچەکە کردووە.

بەسەرنجدان لەشۆڕشی ئیسلامی لەئێران، هێرشی سەربازی بۆسەر ئەفغانستان و هەڕەشە لەولاتانی حەوزی کەنداو و جەنگی عێراق ئێران کە ئەگەر هەبوو ولاتانی عەرەبی کەنداویش بگرێتەوە، هەندێك لەستراتیجیستەکان پێیانوابوو کە ئەمەریکا دەبێت بەرامبەر ئەم مەسەلانە بوەستێت و دژی هەر ڕژێمێك بێت لەناوچەکەدا کە دژ بەتوانای ئەو ڕەفتاربکات، لەبەرئەوە دەبێت هەستی زیاتری ئاسایشی پێبدات، نەك ئەو هەستە کەم بکاتەوە، لەدیدی ئەوەوە دەبێت ئەمەریکا سێ بنەمای ڕێنمایی بۆ وەڵام و کاردانەوەی گونجاو لەبەرامبەر ستراتیجی یەکێتی سۆڤێت و هەڕەشەکان کە لەهێرشی ناوچەییەوە سەرچاوە دەگرێت هەبێت:

١) بەسەرنجدان لەسنوورداریێتی توانای سیاسی، ئەمەریکا بوونی سەربازی خۆی لەناوەوە و دەوروبەری ناوچەکە پەرەپێبدات و تواناکانی خۆی بۆ بەهێزکردنی خۆی لەناوچەکە زیادبکات.

٢) بەکارهێنانی توانای ولاتانی ناوچەکە بۆ بەرگرتن و ڕووبەڕووبوونەوەی هەڕەشە ناوخۆییەکان.

٣) هاوکاری و بەشداریکردن لەگەڵ ولاتانی ناوچەکە بۆ بەڕێوەبردن و بەرەوپێشبردنی بەرنامەی پەرەپێدان و کەمکردنەوە و نەهێشتنی کێشە ناوچەییەکان، بەتایبەتی کێشەی عەرەب و ئیسرائیل.

ئەم هەڕەشانە پێویستی فراوانی بەبەشداری ئەمنی لەسەرانسەری ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست لەئیسرائیل و میسرەوە تا ولاتانی کەنداو هەیە، بەجۆرە ئەمەریکا بەپەنابردن بۆ ئەم بیانووە دەیتوانی بوونی خۆی لەناوچەی هەستیار و ستراتیجی جیهان زیادبکات، لەڕاستیدا ئەمەریکا دووبارە بەدوای دامەزراندنی ڕێکخراوی بەرگری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستبوو، لەژێر ناو و کاری جیاوازدا، کە ئامانجی ئەمە ڕێگرتنبووە لەنەگەری نفوز و هێرشی یەکێتی سۆڤێت، هەنگاوی ئاژاوەخوازانەی هەندێك لەڕژێمەکانی ناوچەکە و بەهێزکردنی توانای بەرگری ولاتە دۆستەکانی. ڕۆناڵد ڕیگان بەمەبەستی پەیڕەویکردن و

پشتیوانی لەم سیاسەتە، بەهێزکردنی (پشتێنەی ئەمنی) و چەکدارکردنی وڵاتانی ناوچەکە و بەرزکردنەوەی توانای جەنگیان لەرێگای پێکهێنان و دروستکردنی (هێزی کاردانەوەی خێرا) و سەرئەنجام بەکردار و بەشداریکردنی وڵاتانی پیشەسازی بلۆکی رۆژئاوا لەکێشەکانی ناوچەکەدا توانی بەئامانجەکانی خۆی بگات و ستراتیجی سیاسی ئەمەریکا لەکەنداو چالاکانە بەئەنجام بگەیەنێت.

سەرەرای ئەوە ئەمەریکا بەپارێزگاری کردن لەئەنجومەنی هاریکاری کەنداو و پەیرەویکردن لە(سیستەمی ئاسایشی دەستەجمعی) لەراستیدا لەبارەی ئامانجەکانی خۆیەوە لەناوچەکە کاریکرد، پێکهێنانی ئەم ئەنجومەنە توانی دۆستەکانی ئەمەریکا لەباشوری کەنداو بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خۆی هەموویانی کۆکردەوە و هاوپەیمانیەتیەکی دروستکرد.

لەئێستادا عەرەبستانی سعودی شوێنی ئاوات و ئومێدی واشنگتۆنە و بەیەکێك لەوڵاتە گرنگەکانی کەنداودادەنێت، بەسەرنجدان لەوە کە عەرەبستانی سعودی گرنگترین ناردەنی نەوتە لەجیهاندا، لەبەرئەوە واشنگتۆن هەوڵدەدات کە ئەم وڵاتە لەرێگای رایەڵەی ئابووری و سەربازیەوە بەدپلۆماسیەتی خۆیەوە ببەستێت بیکاتە پاشکۆی خۆی، بەکورتی عەرەبستانی سعودی لەبواری نەوت و کێشەکانی رۆژهەڵاتی ناوەراست ئەخشی هەستیار و گرنگ لەستراتیجی ئەمەریکادا دەبینێت.

لوتکەی ستراتیجی سیاسی ئەمەریکا لەدەیەی هەشتاکاندا توانی لەدەستتێوەردانی ئەمەریکا لەجەنگی عێراق ئێراندا لەماوەی ساڵانی (١٩٨٧-١٩٨٨) شەری نەوتبەرەکان دەرکەوت کە ئەم وڵاتە توانی بەناردنی زیاتر لە(٧٠) کەشتیی جەنگی بۆ ناوچەکە (کە پەیوەستبوو بەئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی) بۆ پارێزگاریکردن لەعێراق بنێرێت، لەرووی کرداریەوە لەپاڵ عێراقدا دژ بەئێران لەکەنداو کە ئەوکاتە رێگربوو لەبەردەم سەرکەوتنی ئێران و شکستی عێراقدا کە بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکا و وڵاتانی کەنداو خستبووە مەترسیەوە، بەبەکارهێنانی فشاری سیاسی و ئابووری و سەربازی دژ بەئێران بووەهۆی ئەوەی کە ئەم وڵاتە لەساڵی (١٩٨٨) رێکەوتننامەی (٥٩٨) ئەنجومەنی ئاسایشی ئەتەوە یەکگرتوەکان قبوڵبکات و لەئەنجامدا ئاگربەستی کاتی لەبەرەکانی جەنگ راگەیەندرا و جەنگ کۆتاییهات و رێژەی گرژی لەناوچەکە کەم بووەوە.

لەدەیەی نەوەدەکانیشدا ستراتیجی سیاسی ئەمەریکا لەکەنداو بەهێرشی عێراق بۆ سەر کوێت گەیشتە لوتکە، ئەمەریکا بەهۆی داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراقەوە بەرژەوەندیەکانی خۆی لەبەردەم مەترسیدا بینیەوە و هێزەکانی عێراقی بەمەترسی جدی دەزانی لەسەر وڵاتانی ناوچەکە و ئیسرائیل، ئەمەریکا بەئامادەیی هێزی زۆری خۆی لەناوچەکە عێراقی ناچار بەپاشەکشێ کرد، لەکوێت گورزی گەورەی سرەواند لەهێزەکانی عێراق سەرەرای ئەوە بەبریارەکانی ئەنجومەنی ئاسایش ئەم وڵاتە کەوتەژێر

گەمارۆی ئابوریەوە و بۆ ڕزگاربوون لەم گەمارۆیە دەبێت لەژێرچاودێری ڕێکخراوی نەتەوەکان هەموو چەکە کۆمەڵکوژیەکەی لەناوبەرێت .

لەگەڵ هاتنەسەر کاری حکومەتەکەی کلنتۆن ستراتیجی سیاسی ئەم وڵاتە لەحەوزی کەنداو بەپێی (جلەوگرتنی دوولایەنە) کەوتەکار، بەڵکو لەرێگای کۆنترۆڵ و جڵەوگرتنی هەردوو وڵاتی عێراق و ئێران بتوانێت توانا و هێزی ئەم دوو وڵاتە کەم بکاتەوە و هەرەشەکانی هەردوو وڵاتی ناوبراو سەبارەت بە بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکا لەناوچەکە بێکاریگەر بکات، تائێستاش ئەم سیاسەتە لەناوچەکە بەردەوامە، بەڵام ئەم سیاسەتە سەبارەت بەئێران کاریگەری زۆری نەبووە و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەخولێکی سیاسیدا بەدوای ئەوەدا دەگەرێت کە لەگەڵ ئێران پەیوەندی سیاسی بەرقەرار بکات.

بەگشتی گرنگترین چالاکی و هەنگاوەکانی ئەمەریکا بۆ جێبەجێکردنی ستراتیجی سیاسی خۆی لەناوچەکە لەدەیەی هەشتاکاندا بریتیبوو لە:

(أ) بەدەستەوە گرتنی بەرپرسیارێتی ئاسایشی ناوچەی کەنداو و مسۆگەر کردنی رێگای کەشتی نەوتی و کاڵاکان، بڕوا پێهێنانی دەسەڵاتدارانی ناوچەکە کە تەنیا ئەمەریکا بەهێزە دەریاییەکانی دەتوانێت ئاسایش لەناوچەی کەنداو و گەروی هورمز بپارێزێت.

جیمس بیکر وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەمەریکا، لەنامەیەکدا بۆ سەرانی عەرەب لەبەغدا، جەختی لەسەر ئەم پێنج بنەمایەی خوارەوە کردووە:

١- پابەندبوون ئەمەریکا بەئازادی کەشتیوانی لەکەنداو.

٢- پابەندبوونی ئەمەریکا بەتێپەربوونی ئازادانەی نەوت لەکەنداو.

٣- مانەوەی کەشتیگەلی ئەمەریکا لەناوچەکە بەمەبەستی جێبەجێکردنی ئەو خاڵانەی سەرەوە.

٤- هەرەشەنەکردن لەوڵاتانی ناوچەکە بەهۆی بوونی هێزی سەربازی ئەمەریکاوە.

٥- دروستکردنی نیگەرانی بۆ ئەمەریکا لەکاتی وەرگرتنی هەر بریارێك لەلایەن سەرانی عەرەبەوە کە تایبەت بێت بەکەمکردنەوەی هێزەکانی ئەمەریکا لەناوچەکە.

(ب) رێگرتن لەهەرەش و فراوانخوازی یەکێتی سۆڤێت لەناوچەکەدا.

(ج) بەهێزکردنی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو لەبەرامبەر ئێران و عێراق، هەروەها بەهێزکردن و پاراستنی ئەنجومەنی ناوبراو و عێراق لەبەرامبەر ئێراندا.

فراوانکردنی چالاکیە فەرهەنگیەکان لەبەرامبەر فکری شۆرشی ئیسلامی لەوڵاتانی دەوروبەری ئێران و جیهانی ئیسلامی، لەرێگای دەوڵەتی عەرەبستانی سعودیەوە بەهۆی بڵاوکردنەوەی فکری وەهابیەوە.

(هـ) لەئەستۆگرتن و بەڕێوەبردنی هەنگاوە نێودەوڵەتییەکان لەڕووداوەکانی کەنداودا، ئەم ڕەوشە ڕۆڵی ئەمەریکای لەناوچەکە زیادکرد، هەم لەڕوداوی جەنگی ئەوتبەرەکان لەساڵی (١٩٨٧) و هەم لەقەیرانی هێرشی عێراق بۆ سەر کوێت لەساڵی (١٩٩٠) دەرکەوت و لە فکری وڵاتانی باشوری کەنداو و وڵاتە هاوپەیمانەکانی لەرۆژئاوا وەك تەوەرەی نەهێشتنی مەترسیەکان ناسرا.

(و) لەئەستۆگرتنی بەڕێوەبردن و ڕێنماییکردنی چالاکیەکان و هەوڵی تایبەت بەئاشتی عەرەب ئیسرائیل کە بووەهۆی ئەوەی یەکەم نفوزی ئەمەریکا لەوڵاتانی عەرەبی و ئیسرائیل زۆرتربێت، و دووەم ئامانجی ستراتیجی ئەمەریکا لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست ـ واتە پاراستنی ئاسایش و مانەوەی ئیسرائیل ـ.

(ز) فراوانبوونی پەیوەندی لەگەڵ یەکێتی سۆڤێت و بڕواپێهێنانی ئەو وڵاتە کە خۆی بپارێزێت لەوەی کە سوودمەند دەبێت لەقەیرانەکانی ئەو ناوچەیە.

(ح) هەوڵدان بۆ بەرقەراری و پەرەپێدانی پەیوەندی سیاسی لەگەڵ ئێراندا، وەك هێزێکی ناوچەیی دژ بەئەمەریکا لەباکوری کەنداو، بەمەبەستی کەمکردنەوەی دوژمنەکانی و زیادکردنی نفوزی سیاسی خۆی لەناوچەکەدا.

(خ) هەوڵدان بەئاراستەی نائارام پیشاندانی ناوچەکە و پێویستی بۆ بەهێزکردنی هێزی بەرگری ئەم وڵاتانە لەبەرامبەر هەڕەشەکاندا، لەسایەی ئەم ستراتیجیەدا ئەمەریکا ساڵانە ڕێژەیەکی زۆر چەك ڕەوانەی ئەم وڵاتانە دەکات، کە ئەمکارە هەوڵێکە بۆ گەڕانەوەی ئەو دۆلارانەی کە لەڕێگای کڕینی ئەوتەوە ڕۆیشتووە بۆ کەنداو.

### ( ب ) ستراتیجی سەربازی ئەمەریکا لەحەوزی کەنداو :

ستراتیجی سەربازی رۆژئاوا لەکەنداو هەرچەندە بەشێوەی ڕژێمی تەواوکەر و پشتیوانیکەر لەستراتیجی سیاسی و ئابووری بەکاردەهێنرێت، بەڵام لەماهیەتدا لەتیۆری سیستەمێکی سەربەخۆ پێکدێت.

زاڵبوونی ڕۆژئاوا بەسەر ناوچە جیوستراتیجیەکانی کەنداو بەپێیی بنەمای ڕۆڵی مێژوویی ڕۆژئاوا لەم ناوچەیەوە بنیاتنراوە، ڕۆژئاوا چەندین سەدەیە لەڕێگای باڵادەستی سەربازیەوە فەرمانڕەوایی ئەم ناوچەیە دەکات، بەبێئەوەی هێزە نارۆژئاواییەکان بواریان بۆ ڕەخسابێت لەم ناوچەیە دەسەڵاتیان هەبێت، لەسەرەتای سەدەی شازدەهەم هێزە ئەوروپیەکان بەپاڵپشت بەهێزی سەربازی پەلاماری کەنداویاندا و هەرگیز شوێنە جیۆستراتیجیەکانی ئەم ناوچەیە بۆ هێزە نارۆژئاواییەکان نەگەڕایەوە، لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هاتە پاڵ هێزە ڕۆژئاواییەکان لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست و وردەوردە لەمەیدانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەرکەوتوو و نفوزی پەیداکرد.

کەنداو لەڕووی جیۆستراتیجیەوە بۆ ڕۆژئاوا گرنگییەکی گەورەی هەیە، کە ترۆمان و نیکسۆن و کارتر لەتیۆرەکانی خۆیاندا گرنگی تایبەتیان بەم ناوچەیەداوە.

ستراتیجی ئەمەریکا لەسەردەمی سەرۆك ترۆمان لەسەر بنەمای سنوردارکردنی یەکێتی سۆڤێت لەجیهاندا بووە و کە بەدرێژایی کات گۆڕاوە بۆ ستراتیجی جیاواز، لەگەڵ بەدەستهێنانی چەکی ئەتۆمی لەلایەن یەکێتی سۆڤێتەوە، ئەمەریکا سیاسەتی بەربەرچدانەوەی گرتەبەر، تیۆری نیکسۆن لەکۆتایی دەیەی شەستەکاندا لەکەنداو بەجێبەجێکردنی سیاسەتی دوو ستونی لەکەنداو پیادەکرا، ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەسەرەتای دەیەی حەفتاکاندا بەترساندنی هاوپەیمانە ڕۆژئاواییەکانی لەمەترسی فراوان بوونی نفوزی کۆمۆنیست، بەبیانووی کەمبوونەوەی هێز بەرەبەرە لەکەنداو دەسەلاتی سەربازی پەیداکرد.

هاتنەدەرەوەی ئێران لەپەیمانی سنتۆ، بەماوەیەك دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی، ئەگەری دووبارە نەبوونەوەی لەلایەن ئەمەریکاوە، ئەم ولاتەی ڕوبەرووی کێشەیەکی جدی کردەوە، تاپێش ئەم مێژووە ئەم ناوچەیە بەبەربەستێکی بەرگریکەری پتەو کە پێکهاتووە لەئێران و تورکیا و پاکستان و تارادەیەکیش ئەفغانستان دەورەدراوە، بەلام ئێران ئەمڕۆ وەك ناوچەی لەمپەر وایە لەبەردەم نفوزی سۆڤێت و بەبەربەستێکی ستراتیجی بۆ ناوچەکە دەژمێردرێت، ئەمڕۆ لەدیدی ئەمەریکاوە ئێران خۆی مەترسیە لەسەر ناوچەکە، بەواتایەکیتر لەدیدی ڕۆژئاواوە هاوسەنگی ستراتیجی بەشێوەی هەسپێکراو و ناشکرا بەسوودی یەکێتی سۆڤێت کەوتۆتەوە و بەردەوامی ئەم دۆخە عاقیبەتی دورمەودا لەسەر ناوچەکە بەجێدەهێلێت.

لەبەرئەوە ئەمەریکا سورە لەسەر ئەوەی کە کۆنترۆلی ڕاستەوخۆ کەنداو لەڕێگای زیادکردنی هێزی سەربازیەوە دەبێت لەناوچەکەدا، تیۆری کارتەر کە لە(کانونی دووەمی ١٩٨٠) ڕاگەیەنرا، لەڕاستیدا ستراتیجی تازەی ئەمەریکایە کە کەنداو دەگرتەوە، سەرۆك کۆماری ئەمەریکا هەڕەشەیکرد کە سوود لەهەموو هۆکارەکانی وەك هێزی سەربازی بۆ ڕێگرتن لەهەولی ولاتانی دەرکی بۆ کۆنترۆلکردنی حەوزی کەنداو وەردەگرێت، ئەو مەترسیانەی ڕووبەرووی هاتوچۆی نەوت لەڕۆژهەلاتی ناوەڕاستەوە بەرەو ڕۆژئاوا دەبووەوە لەلایەن یەکێتی سۆڤێتەوەیە، لەوکاتە بەدواوە ستراتیجی سەربازی گرنگی تایبەتی هەبوو و لەپاڵ ستراتیجی سیاسیدا، بووە جێگای سەرنجی جدی.

حکومەتی کارتر سیاسەتی سەربازی ئەم ولاتەی لەناوچەی کەنداو لەسەر ئەم سێ بنەمایەی خوارەوە دارشتوە:

١- بەهێزکردنی هێزی دەریایی ئەمەریکا لەئۆقیانوسی هندی، بەتایبەت لەدەروازەی کەنداو.

٢- پێکهێنانی هێزی کاردانەوەی خێرا و هەوڵدان بۆ گواستنەوەی سەرباز و کەلوپەلی سەربازی بۆ ناوچەکە.

٣- دروستکردنی پێگەی تازەی سەربازی لەکەنداو وەك سەنگەری هێزەکانی کاردانەوەی خێرا.

لەدوای گەیشتنی ڕۆناڵد ڕیگان بەدەسەڵات قەیرانی پەیوەندیەکانی نێوان ئەمەریکا و یەکێتی سۆڤێت بەهێزتربوو، حکومەت ئەمەریکا لەسەردەمی کارتەردا بەهۆی دەرکەوتنی شۆڕش لەئێران و مەسەلەی بارمتەکان لەمەیدانی ناوخۆیی و نێودەوڵەتیدا وەك حکومەتێکی لاواز ناسێنرا، ڕیگانیش بەسوودوەرگرتن لەئاوابوونی ئەمەریکا و بزواندنی هەستی نیشتمان و باڵادەستی خەڵکی ئەو وڵاتە هاتەسەرکار، ڕیگان و لایەنگرانی بزوتنەوەیەکیان دەستپێکرد کە دواتر بە(شۆڕشی ڕیگان) ناوبانگی دەرکرد، ئەو لەوتارەکانی سەردەمی هەڵبژاردنی خۆیدا بەوردی ڕایگەیاندووە کە سەردەمی لاوازی تەڵغان بووە و کاتێك لەهەڵبژاردن سەرکەوت دەیەوێت بەرنامەی سیاسی و ئابووری جێبەجێ بکات، کە بۆتەهۆی سەربەرزی و شانازی دووبارەی ئەمەریکا لەگۆڕەپانی جیهاندا، بەمجۆرە ڕیگان توانی میلیتاریزمی ئەمەریکا سەرلەنوێ بژێنێتەوە و بەهێزی بکات، کە لەسەردەمی کارتەردا دوچاری لاوازی ببوو، ڕیگان بۆ گەیشتن بەئامانجی ناوبراو سیاسەتێکی توندی دژ بەیەکێتی سۆڤێت گرتەبەر تا بەسوودوەرگرتن لەداستانی کۆنی (هەڕەشەی سۆڤێت) پیشەسازی سەربازی و جبەخانەی ئەمەریکا پەرەپێبدات.

لەئەنجامدا ڕیگان بەگرتنەبەری سیاسەتی توند دژ بەیەکێتی سۆڤێت کە بێوێنەبوو، گەورەترین چربوونەوەی سەربازی سەردەمی ئاشتی بۆ ئەمەریکا بەدەستهێنا.

ڕەخنەکانی ڕیگان لەلاوازی حکومەتی کارتەر و پروپاگەندەی سیستماتیك، جێبەجێکردنی قۆناغی یەکەمی پرۆژەی ڕیگان واتە شکڵدان بە فکری گشتی کارپێکرا، قۆناغێکیتر لەجێبەجێکردنی پلانی ڕیگان، جوڵانی بەرنامەرێژی بەئاراستەی تاقیکردنەوەی بەرنامەی ئامادەکراو، ئەم قۆناغە بەهێرشی ئەمەریکا بۆسەر گرانادا لەساڵی (١٩٨٣) دەستپێیکرد، کە نمایندەی ئامادەی دووبارەی ئەمەریکا بۆ سوودوەرگرتن لەهێز و دەسەڵاتی سەربازی خۆی لەدەرەوەی ئەمەریکا، هێرش و لەشکرکێشیەکانی دواتری ئەمەریکا لەوانە ڕووداوی لیبیا، لوبنان، کەنداو و هیتریش لەهەمان بۆچوونەوە سەرچاوەدەگرێت.

لەبەرئەوە حکومەت ڕیگان لەهەنگاوی یەکەمدا جەختی لەسەر باڵادەستی سەربازی کردووە، واتە زیادکردنی هێزی سەربازی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، گۆڕانی ستراتیجی ئەمەریکا و سوودوەرگرتن لەهێز بۆ پارێزگاری لەدیپلۆماسیەت.

(حکومەتی ڕیگان هێز و دەسەڵاتی سەربازی و بەرگری خۆی زیاددەکات لەدوای ئەوەی کە لەسەردەمی حکومەتی کارتەردا لاواز ببوو، تێچونی بەرگری لەماوەی شەش ساڵدا زیادیکرد و تێچوونی سەربازی لەماوەی ساڵانی (١٩٨٠ – ١٩٨٦) زیاد لەدوو ئەوەندە بووە، گەورەترین زیادبوونی هێزی

سەربازی سوپای ئەمەریکا لەسەردەمی ئاشتی لەسەردەمی دەسەڵاتی ریگان ئەنجامدراوە، ئەمکارە بەتازەکردنەوە و نوێسازی چەکی ستراتیجی لەوانە بۆمبهاوێژی (ب-١)، موشەکی (mx)، موشەکی کرۆز، بۆمبهاوێژی ستیلت، ترایدنت٢، موشەکی دی٥، ئاسانکاری فەرماندەیی و کۆنترۆڵ، پەرەپێدانی هێزی دەریایی و جێگیرکردنی هێز لەئۆقیانوسی هندی و دواتر لەکەنداو، بەرهەمهێنانی خێرای تانك و فرۆکەی تاکتیکی، لەکۆتایدا پرۆژەی فراوانی چەند ملیارد دۆلاری (دەستپێشخەری بەرگری ستراتیجی) یان (جەنگی ئەستێرەکان) کە لەراستیدا وەك گرنگترین بەرنامەی سەربازی ئەمەریکا بەسوودوەرگرتن لەتەکنەلۆجیای پێشکەوتووی سەربازی بووە، هەمووی لەسەردەمی حکومەتی ریگاندا بەچەندین قۆناغ جێبەجێکراوە.

لەبەرئەوە بەپێوەری جیهانی ریگان بۆ روبەرووبونەوەی سۆڤێت لەساڵی (١٩٨٣) (دەستپێشخەری بەرگری ستراتیجی) وەك ستراتیجی ئەمەریکا لەسەردەمی جەنگی ساردا راگەیاند، ئامانجی ریگان لەم کارە بریاردان بوو لە(بەرپەرچدانەوەی) بەشێوەی یەك لایەنە و بەوپێیە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەستی گەیشت بەستراتیجیکی باڵاتر.

(جێگای سەرنجە کە بودجەی سەربازی ئەمەریکا لەبڕی (١٢٦) ملیارد دۆلار لەساڵی (١٩٨٠) بۆ (١٧٠) ملیارد دۆلار لەساڵی (١٩٨١) بەرز بۆتەوە و لەساڵی (١٩٨٢) گەیشتە سنوری (٢٠٠) ملیارد دۆلار و لەساڵی (١٩٨٣)دا گەیشتۆتە (٢٩٠) ملیارد دۆلار، دەتوانین بڵێین لەساڵی (١٩٨٤) سێ ئەوەندەی ساڵی دوایی بودجەی حکومەتەکەی کارتەر بووە لەساڵی (١٩٧٦)دا، ئەم ژمارەیە لەساڵی (١٩٨٩) گەیشتۆتە (٣٠٣) ملیارد دۆلار، ئەم زیاد بوونەش تا ئێستا لەبودجەی سەربازی ئەمەریکادا بەردەوامە.

رووداوی وەك تەقینەوەی کەشتی ئاسمانی چالنجر، ئاکۆکە بەگەشەی فکری گشتی ئەمەریکا لەگەڵ بەهێزبوونی میلیتاریزم لەم وڵاتەدا، بەڵگەی ئابووری وەك کورتهێنانی بودجە و رودانی قەیرانی ئابووری لەکۆتایی دەسەڵاتی ریگان بووەهۆی ئەوەی کە حکومەتی ریگان دەوڵەتی ئەمەریکا لەسیاسەتی خۆی لەسەربنەمای میلیتاریزم دووبارە تێروانین بکاتەوە، لەبەرئەوە پلە سەربازگەرایی ئەمەریکا تا ئەندازەیەك کەمبووەوە بوجەی سەربازی ئەو وڵاتە لەساڵی (١٩٨٨) بە رێژەی (١٠٪) کەمیکرد، لەلایەکیترەوە ریگان ناچاربوو بەدانوسان لەگەڵ گۆرباچۆف سەرۆکی یەکێتی سۆڤێت سەبارەت بەکەمکردنەوەی تەرسانەی ئەتۆمی هەردوو وڵات، کە ئەمە بووەهۆی بەهێزکردنی دانوسانەکان بۆ کەمکردنەوەی چەکی ستراتیجی کە بۆ بەدیهاتنی ئەم ئەنجامانە دانرا.

لێرەدا گرنگە ئاماژە بەوخاڵە بکەین کە (ستراتیجی سەربازی ئەمەریکا لەئاسیای باشوری رۆژئاوا لەشێوەی هێرشی سۆڤێت بۆ سەر ئێران بۆ گەیشتن بە ئاوەکانی کەنداو لەدەیەی هەشتاکاندا کە بە

(ستراتیجی شاخەکانی زاگرۆس) ناودەبرێت، بەپێی ئەم ستراتیجە تیپی حەوتی (ئاوی/وشکانی) تفگداری دەریایی لەرێگای فرۆکەوە فەرماندەی ئاسمانی سەربازە بۆ ئاسیای باشوری ڕۆژئاوا گوێزێتەوە، ئەمانە بەفرۆکە لەبەندەری نادوژمن لەنزیك قەیرانەکان دابەزێنران یان لەرێگای چالاکی ئاوی/وشکانی بەشێوەی زۆرەملێ دێتە بەندەر یان فرۆکەخانەی ناوبراوەوە دەیخاتە ژێردەستی خۆیەوە.

سەبارەت بەچالاکی ئەمەریکا لەحەوزی کەنداو دەتوانین بلێین کە لەماوەی دەیەی حەفتاکاندا بەپشتبەستن بە ستراتیجی سیاسی و لەدەیەی هەشتاکاندا بەپشتبەستن بە ستراتیجی سەربازی ئامادەیی ڕاستەوخۆی سەربازی لەناوچەکەدا هەبووە.

ئەمەریکا بەمەبەستی پاراستنی بەرژەوەندی و دەستگەیشتنی خۆیان و هاوپەیمانەکانی بەنەوتی ناوچەکە و ڕووبەڕووبونەوەی هەڕەشە ناوخۆیی و دەرەکیەکان، ستراتیجی خۆی هەرچی زیاتر بۆ ئامادەیی سەربازی هاندەدات، بەسوودوەرگرتن لەبنکەی دەریایی و ئاسمانی و وشکانی وڵاتانی دراوسێ کاردەکات، ستراتیجی ئەمەریکا لەگەڵ ڕەوتی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو هاوجووت و هاوئاهەنگی تەواوی هەیە، لەڕووی کرداریەوە بۆ جێبەجێکردنی ئەم بەرنامەیە، ئەمەریکا و باقی ئەندامانی ناتۆ لەڕووی پێشکەشکردنی ئاسانکاری و شتیترەوە یارمەتیان دەدات، پەیوەندی نزیکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەگەڵ وڵاتانی ناوچەکە ڕۆڵی یەکلاکەرەوە لەبەرەوپێشبردنی لەستراتیجی سەربازی یان سیاسی لەکەنداوی و ئاسیای باشوری ڕۆژئاوا دەبینێت، یارمەتی ئاسایشی لایەنیکەم بەیەکێکە لەپرۆژە ئاسراوە قبولکراوەکانی بەرنامەی یارمەتی دەرەکی ئەمەریکا دەژمێردرێت، ئەم یارمەتیانە بەرنامەی فرۆشتنی دەرکی سەربازیە، کە توانا و ئیمکاناتی خۆجێی تازە لەناوچەکە بەتایبەت وڵاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو پەرەپێبدات، کە ئەمە لەڕاستیدا بەبەشێك لەئامانجی ستراتیجی سەربازی ئەمەریکا لەناوچەکە دەژمێردرێت.

ئەو ستراتیجیە سەربازیەی کە ڕیگان گرتبوویەبەر لەسەردەمی سەرۆکایەتی جۆرج بوشیش بەردەوامی هەبوو، سەرۆك کۆماری ئەمەریکا لەچاوپێکەوتنێکیدا ڕایگەیاند کە (حکومەتەکەی منیش بەهەمان شێوە کارکردنی هەموو سەرۆکەکانی ئەمەریکا، لەسەرۆك روزفلت تا سەرۆك ریگان ئاسایش و ئارامی کەنداو ئەگرێتە ئەستۆی خۆی).

قەیرانی هێرشی عێراق بۆ سەر کوێت لەساڵی (١٩٩٠) هەلێك بوو کە ئەمەریکا بەراگەیاندنی مانۆڕ لەناوچەی کەنداودا ستراتیجی سەربازی خۆی ئەزمون بکات و هەڵیسەنگێنێت، ئەمەریکا لەئێستادا دەرحەق بەستراتیجی سەربازی خۆی ئەم چالاکیانەی خوارەوە ئەنجام دەدات:

١) دابینکردنی یارمەتی ئەمنی بۆ وڵاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو و هەموو وڵاتە هاوپەیمانەکانی وەك پاکستان و تورکیا وەك تەواوکەری ستراتیجی سەربازی ئەمەریکا.

٢) ڕێگرتن لەبەهێزبوونی سەربازی ئێران و عێراق وەك هێزێکی ناوچەیی کە ناکۆکن لەگەڵ سیاسەتەکانی ئەمەریکادا.

٣) بەهێزکردنی سەربازی عەرەبستانی سعودی کە بەوتەی ڕیگان وەك تەنیا ستونی لایەنگری ئەمەریکا و کلیلی سەقامگیری ناوچەکە بۆ دەستتێوەردانی ئەمەریکا لەکەنداو ماوەتەوە، ئەمەریکا بەم پێیە سەرنجی تایبەتی بە کەلوپەلی سەربازی عەرەبستانی سعودی و هەوڵی بۆ مۆدێرنکردنی هەیە.

بەو شێوەیەی کە ئاماژەی بۆکرا یەکێك لەئامانجە ستراتیجیە سەربازیەکانی ئەمەریکا لەحەوزی کەنداو ڕووبەڕووبوونەوەیە لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران و عێراق، ـ هەڵبەت دژ بەعێراق دوای هێرشی بۆ سەر وڵاتی کوێت و تێکشکانی بەهۆی هێرشی فرەنەتەوە بەسەرکردایەتی ئەمەریکاـ بەجۆرە ئەمەریکا بەدروستکردن و بەهێزکردنی دوو ئەڵقەی ئەمنی لەبەرامبەر ئەم دوو وڵاتە هەنگاوی ناوە، ئەڵقەی یەکەم هەموو وڵاتانی حەوزی کەنداو دەگرێتەوە و ئەڵقەی دووەم فراوانترە لەئەڵقەی یەکەم کە وڵاتانی دەریای سور و باکوری ئەفەریقا، ڕۆژهەڵاتی ئەفەریقا، ئیسرائیل و یەکەی سەربازی دەریایی ناو دەریای عومان و ئۆقیانوسی هند و دورگەی دیگۆگارسیاش دەگرێتەوە.

لەکۆتایی ئەم باسەدا ناچارین ئاماژە بۆ ستراتیجی نوێی سەربازی ئەمەریکا لەکەنداو وەك ئەوەی لەگۆڤاری پۆلدا هاتووە بکەین:

(بنەمای ستراتیجی تازەی سەربازی ئەمەریکا تایبەتە بەچۆنیەتی بەرپەرچدانەوەی ستراتیجی، ئامادەیی پێشوەخت، وەڵامدانەوەی قەیران و توانای ڕێکخستنەوەی دووبارەی ئەو هێزانەی کە کەمبوونەتەوە و پێکهێنانەوەیان. ئامانجی سەرەکی هێزی چەکداری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و بنەمای ستراتیجی سەربازی ئەمەریکا بێگۆڕان مایەوە و هەمان بەرپەرچدانەوەی ستراتیجی بوو، بەگوزارشتێکی باشتر پێشگرتن لەداگیرکاری و لەشێوەی شکستی بەرپەرچدانەوە، بەرگریکردن لەبەرژەوەندیەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەبەرامبەر هەرجۆرە دوژمنێکی بەهێزدا، ستراتیجی نوێی سەربازی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەسەر ئەم بنەمایە جێگیربووە کە سەرکردایەتی دامەزراندنی ئاشتی و ئاسایشی جیهان دەکەوێتە سەرشانی ئەمەریکا و بەبەڵگەی گۆڕانکاریەکانی ئەم دواییە لەپەیوەندی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا و هەڵوەشاندنەوەی کۆمۆنیستی مەترسی جەنگێکی جیهانی کەمبۆتەوە بەجۆرێك ئەم جارە مەترسی هەرێمی دوای جەنگی سارد هەڕەشەبوون بۆ سەر بەرژەوەندیەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

چەمکی ئامادەیی پێشوەخت لەستراتیجی نوێی سەربازی ئەم وڵاتەدا ئەوەیە کە بەرخورد و خۆسازدان لەناوچە دوردەستەکان پێویستی بەئامادەیی چالاکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە لەناوچەی ناوبراو و ئەم ئامادەییە لەناوچەی قەیراناوی فاکتەری زیندووە لەپتەوکردنی پەیوەندی لەنێوان

هاوپەیمانان و نوێنەرەکانی ئەودا، کە پەیمانەکانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەهەنگاوی پێشوەخت پشتیوانی دەکات. ئامادەیی سەرەوە دەتوانێت بەربەرچی سنووربەزاندن، پارێزگاری لەهاوسەنگی هەرێمی، رێگرتن لەپێشبڕکێی خۆپڕچەککردن، نەهێشتنی کەمکردنەوەی هێزی ناوچەیی کە دەبێتەهۆی دروستکردن و سەرهەڵدانی شەڕ و پێکدادان. ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەجێگیرکردنی هێز و کەلوپەلی سەربازی لەناوچە قەیراناویەکان، کێشەکانی خۆی لەرێگای ناردنی هێز و کەلوپەلەوە بۆ ناوچەی قەیران کێشەکانی سەرخاکی خۆی کەم دەکاتەوە.

وەلامدانەوەی قەیران ئەم توانایە بەئەمەریکا دەدات کە بەشێوەی کاریگەر رووبەڕووی دوژمنێک کە چەکدارە بەموشەکی کرۆز، بەرگری ئاسمانی پێشکەوتوو، چەکی ئەتۆمی، موشەکی بالستی و هەتا سوپای گەورەی هەبێت ببێتەوە، توانای کاردانەوە لەبەرامبەر قەیرانە هەرێمیەکان، یەکێکە لەنیازە سەرەکیەکانی ستراتیجی ئەمەریکا، قەیرانەکان هەمەجۆر و هەمەچەشنن و ئەگەر هەیە بەخێرایی زۆر رووبدات، کاردانەوەی ئەمەریکا لەبەرامبەر قەیرانی ناوبراو یان بەشێوەیەك هێرشێکی هەڵبژاردە یان بە شێوەی ناردنی هێز بۆ ناوچەکە بۆ تێکشکاندنی هێزی سنووربەزێن لەناوچەکە، وەك ئەوەی لەقەیرانی کەنداودا بینیمان.

لەم بوارەدا باشترە کە ئاماژە بۆ ووتەکانی پلترو یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی کلینتۆن بکەین کە دەڵێت:

﴿ئەگەر بۆ ئایندەیەکی دوور بڕوانین پێشکەوتنی ئەمەریکا لەتوانای رەوانەکردنی هێز بۆ کەنداو بەرچاوتربووە، لەساڵی (١٩٨٠) کارتەر هێزی کاردانەوەی خێرای بۆ ناردنی بەپەلە بۆ کەنداو دروست کرد، راوێژکاری سەربازی من، جنراڵ پالکرن کە داوایلێکراوە پەیوەندی بەهێزی کاردانەوەی خێراوە بکات، بەمنی ووت ئەگەر لەساڵی (١٩٨٠) بیانویستایە بەخێرایی هێز بنێرن بۆ کەنداو سێ مانگ درێژەی دەکێشا تا هێزێکی بەربەرچدەرەوەی گەورە لەگۆڕەپانەکە ئامادە بکات، لەمنابی (١٩٩٠) بۆ ئێمە سێ هەفتەی خایاند و لە تشرینی یەکەمی (١٩٩٤) ئەم کارەمان لەماوەی سێ رۆژدا ئەنجامدا، ئەمڕۆ (٥٠) ساڵ تێدەپەڕێت بەسەر پەیوەندی فراکلین روزڤێلت لەکۆنگرەی یالتا لەگەڵ مەلیك عبدالعزیز دامەزرێنەری ولاتی عەرەبستانی سعودی، روزڤێلت یەکەمین سەرۆك کۆماری ئەمەریکا بوو دەریخست کە ئەم ولاتە بەرژەوەندی ژیانی هەیە لەناوچەکەدا.

ئەمڕۆ ئێمە ستراتیجێکی خۆگونجێنمان بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانمان هەیە، ئەم ستراتیجە سادە نییە، پیشت بەرێکخستنێك وەك رێکخراوی ناتۆ نابەستێت، گۆڕاوە بۆ ئامادەیی بەردەوام و پەیوەندی دوو لایەنەی سەربەخۆ و ئامادەیی هەمیشەیی بۆ چالاکی﴾.

بنەمای ستراتیجی ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ ستراتیجی نویّ سەربازی خۆی کەرەسەی وەك ئامادەیی، ئاسایشی دەستەجەمعی، کۆنترۆلّی چەك، بالاّدەستی لەبۆشایی ئاسمان، دەریا، هەوادا، چستوچالاکی ستراتیجی، پیشاندانی هێز، بالاّدەستی تەکنەلۆجیا و یەکەی هێزەکانی پێویستە .

لەکۆتاییدا لەتوانای ڕێکخستنەوەی هێزەکان کەمکراوەتەوە، ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەسەرنجدان لەمەسەلە و کێشە مادیەکان و گۆڕانکاری بەردەوامی جیهان، هێزەکانی خۆی لەسەر ئاستی پارێزگاری لەبەرژەوەندیەکانی و بەڕێوەبردنی بەرپرسیارێتی پێویست لەسەر ئاستی جیهان بەشێوەی گشتی کەمدەکاتەوە و کەمبوونەوەشی بەشێوەی ڕێکخراوەیی ئەنجامدەدرێت تابتوانێت ئامادەیی خۆی بۆ ڕووبەڕووبونەوەی ململانێ نوێیەکان بپارێزێت.

بەبڕوای چاودێرانی سیاسی ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، حکومەتە میانڕەوە عەرەبەکانی وەك عەرەبستانی سعودی توانای دابینکردنی ئاسایشی خۆی نییە و لەکاتی کەوتنە بەرهێرش و داگیرکاری دەبێت ئەمەریکا دەخالەت بکات، ئەم چاودێرانە پێیان وایە کە ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەتەنیا ناتوانن لەچالاکی بەرپەرچدانەوە یان لەئەنجامی ئۆپەراسیۆن سەربازی بەشێوەی شکست کارانەوە بکات، ئۆپەراسیۆنێکی هاوبەشی سەربازی ئەمەریکی و ئەورووپی کارێکی پێویستە و ئەمە لەکاتێکدایە کە ئەورووپا ئارەزوی جۆرێك لەم ئۆپەراسیۆنەی نییە، بەجۆرێك کە بەدرێژایی قەیرانی کەنداو، ئەورووپییەکان جگە لەبەریتانیا دوودڵ بوون لەوەی پەیوەندی بکەن بەهاوپەیمانێتیەکەوە و ئەم مەسەلەیە لای ولاّتێکی وەك فەرەنسا تا دواسات پەیوەندی پێوەنەکرد، لەکاتی جەنگی کەنداوی دووەم پشتگیریکردن لەئۆپەراسیۆنی قەڵغانی بیابان تائاستی دەرپەڕاندنی عێراق لەکوێت کرابوو، وەهیچ هێزێکی عەرەبی نەچووە ناوخاکی عێراقەوە و تەنیا هێزەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا و فەرەنسا لەناوخاکی عێراقدا شەڕیانکرد و هەستیاری عەرەبەکان بۆ داگیرکردنی بەغدا زۆربوو، بەجۆرێك ئەگەر پێشڕەوی هێزی هاوپەیمانان بەردەوام بوایە درز دەکەوتە نێوان هێزی هاوپەیمانانەوە تەنیا هێزێك کە لەمەیدانی جەنگدا دەمایەوە ئەمەریکا و بەریتانیا بوو، هەتا لەوانەبوو فەرەنسا بکشایەوە، جەنگی کەنداو لەلای بەرپرسانی سەربازی ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەجۆرە ئەنجامیدا بەدەستەوە کە ئەم ولاّتە بۆ یەکەمجار لەڕووی ستراتیجیەوە ئەوندە عاقڵ بوو کە هەم لەجەنگ و هەم لەئاشتی سەرکەوتووبوو، بەلاّم هەرچۆنێك بێت کۆسپ نەبوو لەبەردەم چاودێرانی سیاسی ئەو ولاّتەدا کە هۆشداری بدەن لەدەرکەوتنی کارەسات لەکەنداو و ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاستدا.

ئەو بابەتانەی سەرەوە پلاندانەرانی سیاسەتی سەربازی ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ ئەوە ڕاکێشا کە هاوپەیمانێتی لەگەڵ ولاّتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو نەخشەی سەربازی بۆ پاراستنی ئاسایشی ئەم ناوچەیە و بەرپەرچدانەوە لەبەرامبەر دوژمنی سەرەکی ڕیزبەند بکات.

بەرپەرچدانەوە، ئامانجی ستراتیجی سەردەمی ئاشتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەبێت، کە لەسێ رەگەزی سەرکی پێکهاتووە.

١) پاراستنی توانای ئەمەریکا لەدروستکردنی هاوپەیمانێتی لەبەرامبەر ئەگەری ئەو هەڕەشانەی بەرژەوەندی ئەمەریکا و دۆستەکانی دەخاتە مەترسیەوە.

٢) هاندانی هاوکاری بەرگری هەرێمی لەنێوان ئەمەریکا و دۆستەکانی لەوڵاتانی ناوچەکە.

٣) پاراستنی توانای گەیشتنی سەربازی و سیاسی ئەمەریکا بەدۆستە گرنگەکانی لەناوچەکەدا.

لەم نزیکانەدا تەرازووی بودجەی بەرگری ئەمەریکا بۆ ساڵی (٢٠٠٠) لەلایەن ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەم وڵاتە دەنگی لەسەردرا، کە (٢٨٨) ملیارد دۆلار بوو، کە لەسەردەمی جەنگی ساردەوە یەکەمین جارە کە بوجەی بەرگری ئەمەریکا زیاددەکات، کە بەڵگە بۆ ئەمە لەلایەن کلینتۆنەوە دەگێڕێتەوە بۆ نوێسازی لەچەکی ئەمەریکادا، زیادبوونی توانای سەربازی، ئۆپەراسیۆن لەدەرەوەی سنور و زۆری جێگیربوونی هێزەکانی ئەمەریکا لەدەرەوەی وڵات.

## سیاسەتی ئەمەریکا لەبەرامبەر ڕوخاندنی سەدام:

سوودوەرگرتن لەبەرهەڵستکارانی ناوخۆی رژێمی عێراق بۆ ڕوخاندنی سەدام یەکێکە لەپێشترین پلانەکانی سیاسەتی دەرەوەی واشنگتۆن.

کۆنگرێسی ئەمەریکا لەمانگی (تشرینی یەکەمی ١٩٩٨) بە خێرایی پرۆژەی ئازادکرنی عێراقی قبوڵ کرد، کە بەو پێیە بڕیاردرا بەپێدانی یارمەتی سەربازی (٩٧) ملیۆن دۆلار بۆ گروپە بەرهەڵستکارە دیوکراتیەکانی عێراق، ناوەندی سەرۆکایەتی کۆمار لەم بوارەدا خۆشحاڵ نەبوو، بەڵام کلینتۆن ئەم ڕێگایەی گۆڕیەوە بەرێگای جەنگ، دوای دەرکەوتنی ناکۆکیتر لەگەڵ عێراق سەبارەت بەپشکنینی چەکەکان لەلایەن ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان لەمانگی (تشرینی دووەمی ١٩٩٨) سەرۆك کۆمار بەدەرخستنی پرۆژەی نوێی حکومەت لەسەر بنەمای (بەکارخستنی هێزی گۆڕانخواز لەعێراق) توانای خۆی بۆ هەوڵ لەبارەی (بەرقەراری حکومەتی نوێ لەبەغدا کە نوێنەری خەڵکی بێت و لەجیاتی سەرکوتکردنیان ڕێزیان لێبگرێت).

ئەندێشەی سەرەکی پشتیوانی ئەم پرۆژەیە، سادەیە، واتە ئەمەریکا دەبێت بەربگرێت لەبەردەوامبوونی حکومەتی سەدام حسین، یارمەتی نەیارەکانی رژێمی عێراق بدات بۆ بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات، ولفو ویتز یاریدەدەری وەزیری بەرگری پێشوو لەرۆژنامەی نیوریپبلیك ئەوا دەنوسێت (سەرنگونکردنی سەدام تەنیا ئەنجامە کەدەتوانێت بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکا لەکەنداو بەئارامی و ئاسایشی دابینبکات، چونکە لەلایەن حکومەتە زۆردارە هاوچەرخەکانەوە ئەم بابەتە تا ئەندازەیەك لەدەستی تاکدایە، رژێمی عێراق تەنیا بەدەستی سەدام حسینەوەیە... زۆربەی زۆری عێراقیەکان لایەنگری

سەرنگونکردنی نەون، بەڵام ئەگەر ئەم خواستە بەئاشکرا پیشانبدەن ڕووبەڕووی مردن دەبنەوە، ئێمە دەبێت یارمەتی ئەمانە بدەین)، لەگەڵ ئەوەشدا پێشبینی دەکرێت جێگرتنەوەی سەدام بە تێچوونێکی کەم ئەنجام دەدرێت و هەتا زۆر لەبەرگریکەرانی ئەم پرۆژەیە دەیسەلمێنن کە بەبێ ناردنی هێزی زەمینی ئەمەریکا دەتوانن ئەم کارە ئەنجام بدات، والفو ویتز لەبەردەم کۆنگرێس شایەتیدا کە ئەگەر حکومەتی کلنتۆن تەنیا (هێزی پێویست بۆ ئەم ئامانجە ڕێکخات) جیهان لەمانەوەی سەدام ڕزگار دەکات.

کێشە لێرەدایە کە ئەمە واقعی نییە، هەتا ئەگەر پرۆژەی پاشەکشێ پێویست بێت، هەر سیاسەتێك بۆ جێبەجێکردنی ئەمە دەبێت سێ ئەزموون کە بەشێوەی جدی خراوەتە بەرباس و لێکۆڵینەوە پشتگوێ بخرێت، هەر سیاسەتێك دەبێت لەڕووی سەربازی عملی بێت، دەبێت جێگای ڕەزامەندی هاوپەیمانەکانی ئەمەریکا بێت، چونکە هاوکاری ئەوان بۆ جێبەجێکردنی پێویستە و لەدیدی خەلکی ئەمەریکاوە داواکراوبێت، بەهەر شێوەیەك بێت هەوڵی ئەمەریکا بۆ گۆڕینی سیاسەت لەجڵەوگیریەوە بۆ پاشەکشێکردن لەعێراق هەڵمیەکی مەترسیدارە کە دەتوانێت بەسادەیی ببێتە هۆی هەزاران بابەتی مەترسیداری نەخوازراو، بۆ گەیشتن بەم مەبەستە ئەم سێ ڕەوشەی خوارەوە لەبەرچاودەگرین:

یەکەم/ ڕەوشی هێزی ئاسمانی:

بۆ جێبەجێکردنی ئەم ڕەوشە بە پێچەوانەی لێکدانەوەکان، بەرهەڵستکارەکانی عێراق کە ئاگادار دەکرێنەوە هیچ پرۆژەیەکی پاشەکشێی سادە و یەکگرتوویان پێنییە، هەر لەسەرەتاوە سێ پرۆژەی دژبەیەك پێشنیاز دەکەن:

١- بەکارهێنانی هێزی ئاسمانی بۆ لابردنی سەدام.

٢- یارمەتیدانی لایەنە بەرهەڵستکارەکان بۆ داگیرکردنی ناوچە فراوانەکانی عێراق.

٣- پارێزگاریکردن لەجەنگی پارتیزانی دوژمنانی سەدام.

لەپرۆژەی یەکەمدا واتە ڕێکاری هێزی ئاسمانی، ئەمەریکا بەهاوکاری بەرهەڵستکاران، ئۆپەراسیۆنی سەربازی دیاریکراو لەدژی ڕژێمی عێراق ئەنجامی دەدات، لێرەدا کێشە ئەوەیە کە هەموو بارگرانیەکە لەسەر شانی ئەمەریکایە و ئەمەریکا بەبێ دڵنیایی لەسەرکەوتن دەبێت تێچوونێکی زۆر بخاتە ئەستۆی خۆی.

ڕێکاری هێزی ئاسمانی پێویست دەکات کە ئەمەریکا بەرهەڵستکارانی ڕژێمی عێراق لەم بوارەدا بەکاربهێنێت و ڕایانبهێنێت و یارمەتیان بدات لەڕووی کەلوپەلەوە بۆ دەیان هەزار سەرباز بۆ جەنگی ئاسایی سنوردار، هەر کاتێك ئەم سوپایە ئامادەی شەڕ بوو، ئەمەریکا بۆ تێکشکاندنی هێزەکان و پێویستیەکانیان و فەرماندەیی و کۆنترۆلکردنیان شوێنەکانی پشتی بەرەکانی شەڕی عێراق و هێزەکانی سەدام بەهێزی ئاسمانی بۆردوومان بکات، هێزە بەرهەڵستکارەکانیش لەدوای هێرشی توندی ئاسمانی بەرەو

پێش بڕۆن و هێزەکانی سەدام ناچار بکەن لەمەیدانی جەنگ کۆببەنەوە و لەم ڕووەوە هێزەکانی سەدام دەبنە ئامانجی باشتر و تێکشکاندنیان لەلایەن هێزە ئاسمانیەکانەوە.

ئەم پرۆژەیە دوو باشی هەیە یەکەم: ئەم پرۆژەیە بەدروستی پێمان دەڵێت کە تێکشکانی هێزەکانی سەدام دژوارە و بەبەرهەڵستکارانی ڕژێمی عێراق بەبێ پشتیوانی سەربازی ئەمەریکا ناتوانن هەنگاو بنێن. دووەم: ئەم پرۆژەیە لەوانیە قبوڵنەکرێت لەلایەن هاوپەیمانەکانی ئەمەریکاوە، چونکە ئەوانە کاتێك پێشنیازیان کرد کە سیاسەتی ڕوخاندنی سەدام بەشێوەیەك کە سەرکەوتن مسۆگەر بێت پشتیوانی لێدەکەن، هەروەها هەندێك لەوانە بەلابردن و ڕوخانی سەدام داخ دەردەبڕن چونکە لەو باوەڕەدان کە ئارامی و جێگیری لەناوچەکەدا نامێنێت و سنورەکان دەگۆڕدرێن.

سوپای عێراق ئیستا لە(٤٠٠) هەزار هێزی کادر، کە نزیکەی (١٠٠) هەزاری سەر بەهێزی گاردی کۆماری و گاردی تایبەتی سەرۆك کۆمارە: سەدام هەروەها خاوەنی (٢) هەزار تانك و (٢) هەزار تۆپە، هێزی نەیار کە بەچەکی سووك چەکدار کراوە لەبەرامبەر ئەم هێزە بەتایبەت گاردی کۆماری ناتوانێت بجەنگێت.

هێزی ئاسمانی هەرگیز ناتوانێت ڕژێمێکی وا ناچار بەخۆبەدەستەوەدان بکات، ئەو بەڵگەیە نەسەلمێنراوە و بێعەقڵانەیە کە هێزی ئاسمانی ئەمەریکا بەتەنیا بتوانێت هێزەکانی زەمینی عێراق تێکبشکێنێت و هەل بۆ سوپای ئۆپۆزیسیۆن بڕەخسێنێت، تا بەبێ هیچ بەربەستێك بەرەو بەغدا پێشڕەوی بکات.

زیاترلەوەش، ئەم پرۆژەیە کە باسکرا پێویست دەکات کە بەرهەڵستکارەکان، شارەکانی عێراق لەژێردەستی هێزەکانی سەدام دەربهێنن، هێزی بەرهەڵستکار دەبێت بەتەنیا لەم جەنگە فراوانەدا بجەنگێن، چونکە ئەمەریکا بەئەستەم دەتوانێت بەفڕۆکە و موشەکەکانی یەکە زەمینیەکانی عێراق کە لەدارستانە چڕەکانی شارەکاندا خۆیان شاردۆتەوە وێران بکات و یاساکانی ئەمەریکا لەپێناوی سنوردارکردنی زیانی مەدەنی بۆردومانی شارەکانی قەدەغە کردووە.

لەکۆتاییدا، ڕێکاری هێزی ئاسمانی لەوانەیە سەدام هانبدات کە چەکی کیمیایی و بایەلۆجی لەدژی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەکاربهێنێت.

لەسەر ئەمەشەوە، پلانی جەنگی پێشگیری دژی عێراق بەبەکارهێنانی هێزی بەرهەڵستکار لەجیاتی هێزی ئەمەریکا، خەرجی و مەترسیەکانی ئەم پلانە، ئەوان بۆ هەوڵی زۆر مەترسیدار و بەدناو دەگۆڕێت، هەتا ئەگەر بەمەبەستی ڕێگایەك بێت بۆ ڕوخاندنی تەواوەتی بخرێتەڕوو، ئەو ئەگەرە هەیە کە هێزە بەرهەڵستکاران بەتەواوی تێکبشکێت، ئەوکاتە سەرنێشە بۆ حکومەتی ئەمەریکا دروست دەبێت ڕێگای هەڵهاتنی سەدام نامێنێت، یان ئەوەی کە هێرشی ئاسمانی ئانەمرۆ بێبەرهەم بووە، یان هێزەکانی

ئەمەریکا بنێرێت بۆ داگیرکردنی بەغدا، لەبەرئەوە هەوڵ بۆ پاشەکشێ کردن لەرێگای هێزی ئاسمانیەوە زۆر مەترسیدارە لەوانەیە لەجیاتی ئازادی بەغدا واشنگتۆن توشی تەنگانە بکات.

دووەم/ رەوشی ناوچەی ئامین:

دوەمین هەڵبژاردە (خیارات) پاشەکشێ پێکردنی بەو جۆرەیە کە ئەمەریکا یارمەتی بە گروپی بەرهەڵستکار بەناوی (کۆنگرەی نیشتمانی عێراق) بدات، تا ناوچەی فراوان لەعێراق داگیربکات و پارێزگاری لێبکات و بە سوودوەرگرتن لەم ناوچانە حکومەتی سەدام هەڵتەکێنێت، بەڵام ئەم پرۆژەیە لەرووی سەربازیەوە پێکەنیناویە و بەبێگومان ئەم پرۆژەیە یان بەدەستتێوەردانی راستەوخۆی ئەمەریکا یان بەکوشتارو خوێنرێژیەکی زۆر کۆتایی دێت.

رێکاری ناوچەی ئامین پێویست دەکات کە ئەمەریکا کۆنگرەی نیشتمانی عێراق وەك حکومەتی دانپیانرا و یاسایی عێراق راگەیەنێت، پارە بلۆککراوەکانی عێراق بخاتە بەردەستی و لەبەکارهێنانی (سەربازگیری)، راهێنان، کەلوپەلی هێزی پیادەی سوك بۆ (١٠٠٠٠ تا ٢٠٠٠٠) کەس دابین بکات، کە زۆربەی ئەمانە پیاوانی سەربازی پێشووی عێراقن لەباکوری وڵات و هەموو ناوچەی رۆژئاوا رووباری فورات و باشووری هێڵی پانی (٣٢) کە بەشێوەی گشتی بە (عێراقی ئازاد) راگەیەنراوە بکەوێتە بەرهێرش و داگیربکرێت، ئەمەریکا گەمارۆی ئابوری لەسەر ئەم ناوچانە هەڵگرێت و بۆ بەرگریکردن لەم ناوچانە لەدژی هێرشی رژێمی سەدام هێزی ئاسمانی بەکاربهێنرێت. کۆنگرەی نیشتمانی عێراق دەیسەلمێنێت کە بەدابینکردنی پەناگایەك بۆ هەڵهاتووەکان و کەمکردنەوەی رووبەری زەوی ژێر کۆنترۆڵی تادۆڵی نێوان دوو رووبار، بەغداد، هەندێك لەناوچەکانی باکوری رۆژئاوا، ئەم ستراتیجە رژێمی عێراق والێدەکات لەبەرامبەر ئۆپەراسیۆنی سەربازی کۆنگرەی نیشتمانی عێراق زەرەرمەند بێت.

کۆنگرەی نیشتمانی عێراق پێشنیازیکردووە کە چالاکیەکان کەم خەرجی بێت، یەك یان دوو ساڵ بەدرێژی بەردەوام بێت، پێویستی بەدەستتێوەردانی سەربازی راستەوخۆ و سنورداری ئەمەریکا هەیە تا زەرەری گەورە بەرئەمەریکیەکان نەکەوێت، بەمجۆرە سەرۆکی کۆنگرەی نیشتمانی عێراق احمد چەلەبی لەبەهاری رابردوودا لەئەنجومەنی پیران دەریخست کە (بنکەی پارێزگاری لێکراو لەبەرامبەر تانکەکانی سەدام بخرێتە بەردەست کۆنگرەی نیشتمانی عێراق، بۆ دابینکردنی خۆراك و شوێنی نیشتەجێبوون و کۆنترۆڵی دانیشتوانە ئازادەکە پشتیوانی کاتی لەئێمە دەوێت، ئێمە عێراقی ئازاد و خاڵی لەچەکی کۆکوژ و داوای بازاری ئازاد دەکەین لەگەڵ ئێوەدا، گرنگ ئەوە کە کۆنگرەی نیشتمانی عێراق بۆ ئەم ئازادیە دەستپێشخەری دەکات). وەك ئەوەی پرۆژەکە ئەنجامێکی گەورە بە خەرجیەکی کەم پیشاندەدات، بۆیە بوونەتە دۆستی کۆنگرە و رەخنەگری کلنتۆن، ئەم پرۆژەیە دەتوانێت ببێتە جێگای رەزامەندی خەڵکی ئەمەریکا، بەڵام کێشە ئەوەیە کە پرۆژەی کۆنگرەی نیشتمانی عێراق ئەوندە ناتەواو و ناواقعیە کە

دەتوانێت بە شێوەی بەڵگەنەویست دووبارە رایکێشێتەوە ناو رووداوەکانی کەنداوەوە. بەرپرسانی ئەمەریکا سەرئەنجام دەبێت راستەوخۆ بێنە ناومەیدانەوە یان کوشتاری ئاژاوەگێڕی لێدەکەوێتەوە.

سەرەڕای ناکۆکی ناوخۆی بەرهەڵستکاران، هاوپەیمانانی ئەمەریکا لەناوچەکە لەم پرۆژەیە بێزاربوون، کوێت، عەرەبستانی سعودی، ئەردەن و تورکیا بەتەواوی دژی هەوڵەکانی پاشەکشێپێکردن و بەکارهێنانی راستەوخۆی هێزی سەربازی بوون، چونکە لەوەنیگەران بوون کە ئەم هەنگاوە بێنەئەنجام بێت و بکەونە بەرتوڕەیی سەدام.

مەسەلەیەکیتر ئەوەیە کە ئەم پرۆژەیە لەرووی سەربازیەوە عملی نییە بەڵام بەهەموو مانایەك مەترسیدارە، هەتا ئەگەر بتوانرێت باوەربکرێت هێزی کوردەکان، لەباکوری عێراق (هەرێمی کوردستان) بخاتە ژێر دەستی خۆیەوە، رێکاری کۆنگرەی نیشتمانی عێراق بۆ کۆنترۆلکردنی نزیکەی (١٠٠٠کم) بەرەکانی ناوەوەی باشوور و رۆژئاوا پێویستی بە (١٠ تا ٢٠) هەزار هێزی چەکدار هەیە، ئەم ژمارە هێزە سەبارەت بەناوچەی ناوبراو نامعقول دەبینرێت (بەپێی پێوەرێکی تیۆری سوپای ئەمەریکا بۆ بەرگریکردن لە(١٥ تا ٣٥) کم لەهێڵی پێشەوە پێویست بەلەشکرێکی ٢٠هەزار کەسی هەیە). ئەگەر وادابنێین هەموو ئەم لەشکر لەچالاکیدا بێننەوە، لەبەرامبەر پاسەوانی کۆماری (٧٠) هەزارکەس پاسەوانی تایبەت (٢٥) هەزارکەس رووبەڕووبنەوە، ئەمان دەبێت بەبێ کەلوپەلی زرێی بەرێژەی یەك بۆ پێنج ناوچەکە بپارێزن.

سەرەڕای ئەوە ستراتیجی بەرگری لەناوچەکانی ئامینی ناوخۆی عێراق داهێنان بەسەدام دەسپێرێت، چونکە هەر کاتێك هێزی بەرهەڵستکار بگاتە رووباری فورات و هێڵی پانی (٣٢)، سەدام دەتوانێت کات و شوێنی شەڕی دواتر هەڵبژێرێت.

ئەمەریکا لەڕاستیدا بۆ هێشتنەوەی فرۆکەی جەنگی تەواو لەکەنداو بەمەبەستی کاردانەوەی خێرا لەبەرامبەر هێرشی رژێمی عێراق بۆ سەر یەکەکانی بەرهەڵستکاران لەناوخۆی عێراق تا روخاندنی سەدام (هەتا ئەگەر چەندین مانگ و ساڵ درێژە بکێشێت) فرۆکەی گورزوەشێن لەهەر هەلومەرجێکی ئاووهەوایدا بەئەندازەی پێویست لەبەردەستدا نییە، باشوری عێراق بۆ جۆرێك لەهەڵگیرساندنی شۆرش کە کۆنگرەی نیشتمانی عێراق پێشنیازی کردووە زۆر نەگونجاوە، زەوی بیابانی کراوە لەباشوور بۆ ئۆپەراسیۆن زرێپۆشی لەبارە، و ناوچەکانی باشوری رۆژئاوای رووباری فورات کە دانیشتوان زۆر کەم و پەرشوبڵاوە، بەرهەڵستکاران دەبێت هێزی تازە لەبەسرە کە دووەمین شاری گەورەی عێراقە کە بێگومان سەدام بەتوندی بەرگری لێدەکات راکێشێت، رژێمی عێراق ئەمڕۆ لەشکرێکی (٣٠) هەزار کەسی لەدەوروبەری ئەم شارە جێگیر کردووە سێ لەشکریتر لەئایندەدا بۆ ئەم سوپایە زیاددەکات. گریمان ئەگەر سەدام بتوانێت (١٠ تا ١٥) هەزار کەس لەوەفادارانی خۆی بۆ بەرگریکردن لەبەسرە چەکدار بکات وە پشتیوانی ئاسمانی ئەمەریکا یارمەتی سنوردار لەئۆپەراسیۆنی شارەکان بکات، بەسرە دەبێتە کۆسپێکی چارەسەرنەکراو،

سوپای بچوکی کۆنگرەی نیشتمانی عێراق ناتوانێت پارێزراو بمێنێتەوە، بەبێ داگیرکردنی شار بێگومان ڕووبەڕووی تێکشکان دەبێتەوە.

کۆنگرەی نیشتمانی عێراق واهەست دەکات کە بەتیپە پیادە سوکەکانی خۆی دەتوانێت بەناسانی لەشکری زرێی قورسی عێراق بشکێنێت، بێگومان هێزی پیادەی سووکی زۆر کارامە کە بۆ سالآنێکی دوورودرێژی لەتەدریبدا بێت وەك چەکدارانی دەریایی ئەمەریکا و پەرەشووتەوانی ئیسرانیل یەکە زرێپۆشەکان لەزەویەکی کراوەدا دەشکێنن، بەلآم ئەم کارە حالەتێکی تایبەت بووە، یەکە پیادەکان بەشێوەی گشتی بۆ وەستان لەبەرامبەر هێرشی تانکە زۆرەکان پێویستیان بەئامێری دژە تانك و تۆپخانە و زرێپۆش و هەروەها هێزی ئاسمانی هەیە، لەزۆربەی شەڕەکاندا لەناوچەی کراوە لەکاتی جەنگی دووەمی جیهانیدا و دوای ئەوەش، یەکە پیادە سوکەکان بەئاسانی لەلایەن هێزی زرێپۆشی ئاساییەوە تێکشکێنراون. ڕابردووی سەربازی بەرهەڵستکارانی ڕژێمی عێراق (تا ئەمڕۆ) ئەم ڕاستیە دەسەلمێنن، لەبەسرە و کەرکوك لەسالی (١٩٩١) و جارێکیتر لەهەولێر لە(٣١ی ئابی ١٩٩٦) یەکەکانی گاردی کۆماری سوپای عێراق بەئاسانی هێزی پیادەی کورد و شیعە و کۆنگرەی نیشتمانیان سەرکوت کرد، لەکاتێکدا کە تەنیا سەرکەوتنی هێزە بەرهەڵستکارەکان، پەلاماری هێزی گەورەی کوردەکان بۆ سەر دوو تیپی لەشکری (٣٨) ی پیادەی عێراق لەدەرەوەی شاری هەولێر لەسالی (١٩٩٥) لەبەرامبەر لاوازترین یەکەی سوپای عێراق ڕوویدا، لەکاتێکدا کە ئەو یەکانە توانای مەعنەوی خۆیان لەدەستدابوو و وە لەناکاو پەلاماردران و بەبێ پشتیوانی تۆپخانە و زرێپۆشەکان مابوونەوە.

بەلآم کۆنگرەی نیشتمانی عێراق نازاپانە ڕایدەگەیاند کە دەتوانێت لەسەرکەوتنەکانی ولآتی چاد لەسالەکانی (١٩٨٦-١٩٨٨) دەرس وەرگرێت، کە ئەم ولآتە بەپێی بنەمای جەنگی مانۆڕی بەیارمەتی هێزی پیادەی سوکی زۆر بزۆك هێزی زرێپۆشی لیبیا تێکبشکێنێت، سەرکەوتنی هێزەکانی چاد ئەوە پیشاندەدات کە بۆچی بەرهەڵستکارانی ڕژێمی عێراق هەرگیز نەیانتوانیووە ئەوە دووبارە بکەنەوە:

١- چاد لەڕێژەی هێزی پێویست سوودمەندە.

٢- چاد لەسەربازانی کۆنی ڕاهێنراو لەسەر شەڕ پێکهاتبوو کە سالآنێك لەپال یەکتردا دەجەنگین و زۆر بەیەکەوە گونجاوبوون.

٣- سەرکردەی سەربازی چاد بالآبوو.

٤- هێزەکانی چاد لەجەنگی مانۆڕی ناسایی بوون، وە ئەوانە بەسوود وەرگرتن لەعارەبانەی جەنگی و ئوتومبێلی سەربازی دەسکردی فەرەنسا و ئەمەریکا کە لەنیوەی دەیەی (١٩٨٠) ئامادەکرابوو بەتەکتیکەکانی جەنگاوەری هۆزەکان کە پشت بەجولەی خێرا دەبەستێت، ئەم تاکتیکانە لێکچوونێکی تەواوی لەگەل جەنگی مانۆڕی مۆدێرندا هەیە.

٥- سوپای لیبیا لەساڵی (١٩٨٦) یەکێك لەناڵایەقترین سوپاکانی جیهانبوو.

هەرچەندە سوپای عێراق زۆرباش نییە، بەڵام پێشەییتر و بەئەزموونتر و ڕاهێنراوترە. سەرکەوتنی چاد لەسەر بنەمای ئاوێتەکردنی ئەم پێنج فاکتەرە بووە، کە کۆنگرەی نیشتمانی عێراق لەهیچ یەکێك لەو فاکتەرانە سوودمەند نییە.

لەڕاستیدا، کۆنگرەی نیشتمانی عێراق ڕێکخستنی سەربازی نییە، ئەگەر کۆنگرە هەروەك ڕابردوو کاربکات، لەوانەیە نەتوانێت هێزی کارامە بۆ مەیدانی شەڕ بنێرێت، هەتا ئەگەر ساڵانێك خەریکی ئامادەکردن و ڕاهێنانیان بێت، کۆنگرە لەڕێگای ڕاکێشانی هەڵهاتووانی سوپای عێراق کە باشترین سەربازانن، ئەمانە ووردەوورده کۆدەبنەوە و دواتر لەگەڵ نارازایانی سیاسی، ئەندامانی هۆزەکان، ڕۆشنبیران، دوژمنانیتری سەدام یەکدەگرن. هەرچەندە کۆنگرە لەساڵی (١٩٩٢-١٩٩٦) لەناو کوردستان کاردەکات، بەهۆی ناکۆکی لەگەڵ هاوپەیمانە کوردەکانەوە، هەرگیز زیاتر لەچەند سەد جەنگاوەرێکی لەبەردەستدا نەبووە، کە زیاتر لەدوو یان سێ ساڵ خزمەتیان نەکردووە، سەرەڕای ئەوە سەرۆکی کۆنگرەی نیشتمانی عێراق لەفەرماندەییکردنی شەڕێك، پیشاندانی فەرماندەیی کارامە، یان زیادبوونی کۆنترۆڵی فەرماندەیی خۆی هیچ داهێنانێکی پیشان نەداوە. هێزەکانی کۆنگرە هەروەها دەبێت بۆ لەباربردنی هێزی ناگرباری بەغدا لەجەنگی مانۆڕیدا پێشڕەوی بکات، بەڵام کۆنگرە مەبەستیەتی سەربازە هەڵهاتوەکانی سوپای عێراق لەڕیزی خۆی ڕێکخات، کە بۆ ئەو شەڕە چاوەڕوانکراوە کارامە نین، ئەستەمە ئەم هەڵهاتوە بێئاگایانە دەستیان بگات بەتوانامەندی تایبەتی جەنگی مانۆڕی کە ئانەمڕۆ لەمە بێبەش بوون. لەهەمووی خراپتر ئەوەیە کە زۆربەی ئەمانە کەسانی هەلپەرستی جاسوسی سەدام بن، دزە بکەنە ناو ڕیزەکانی بەرهەڵستکارانەوە، هەمان جۆر هەواڵنێران لەڕابردوودا هەر جۆرە هەوڵێکی بەرهەڵستکاران بۆ لێکۆڵینەوە لەم بابەت بێ ئاکامبووە، بێگومان پشتبەستن بە جەنگاوەرانی کۆنگرەی نیشتمانی عێراق لەمەیدانی شەڕ، سەرچاوەی تەواوی هەڵەکانە.

سێیەم/ ڕەوشی ئەفغانستان:

سێیەمین هەڵبژاردەی پاشەکشێپێکردن، ڕیکاری ئەفغانستانە کە دەبێت ئەمەریکا لەڕێگای بەرهەڵستکارانی عێراقەوە بەهەڵگیرساندنی شۆڕشی وەك مجاهدەکانی ئەفغان، کۆنتراکانی نیکاراگوا، یان ویت کۆنگۆ هانیان بدات، گرفت لەوەدایە کەیەکێك لەفاکتەری سەرەکی سەرکەوتنی جەنگی پارتیزانی بوونی وڵاتی دۆست و دراوسێیە کە بنکەی ئامن بۆ شۆڕشگێڕەکان دابینبکات، لەڕیزی وڵاتانی دراوسێی عێراق ئەم وڵاتە نییە.

لەڕێکاری ئەفغانستاندا، ئەمەریکا دەبێت یارمەتی بەرهەڵستکاران لەدروستکردنی بنکەی ئاسایش لەپاڵ گۆڕەپانی چالاکی و دواتر بەکارهێنان، پەروەردە و کەلوپەلی جەنگی بۆ هەڵگیرساندنی شەڕ

دژی ڕژێمی عێراق بدات، جەنگی پارتیزانی ستراتیجیکی لاوازە کە تەنیا بەرهەڵستکاران لێکۆڵینەوەی تدریجی توانای دوژمن لەهەمان کاتدا بەرهەڵستکاران هێزی ئارام و یەکڕەنگ تواناکانی خۆی سەردەخات. بەرهەڵستکارانی ڕژێمی عێراق بەسەرکەوتن لەڕێکاری کلاسیکی و سێ قۆناغە، واتە سەرەتا چالاکی پالنەر، گەیشتن بەرهەڵستکاران بە جۆرێك لەبنبەست، دواتر هەنگاونان بۆ چالاکی هێرشبەری دەبێت شەڕی بچوك بەرپابکەین و لەجەنگی ئاسایی لەگەڵ سوپای عێراق مادەم ئەگەری سەرکەوتنمان نییە خۆمان بپارێزین، دوای سالآنێك لەهەوڵ لەم بوارەدا، شۆڕشگێران ڕژێمی سەدام سەرنگون دەکەن و کۆنترۆڵی وڵات دەگرن بەدەستەوە.

ئەم پرۆژەیە کە تەنها وەفاداری و یارمەتی بەرژەوندی دەرەکی لەناستی مامناوەندی دەخوازێت و مەترسی و زەرەرەی گەورە بۆ ئەمەریکا دروستناکات، بەرهەڵستکاران بەدڵنیاییەوە دەبنە جێگای ڕەزامەندی ئەمەریکا، چونکە دەتوانن نمونەی دەیە (١٩٩٠)ی تیۆری ڕیگان بەرهەڵستکاران کۆنگرەی نیشتمانی عێراق پیشانبدات، سەرەڕای ئەوە ئەوانیتریش پیشانیانداوە کە ئەم ستراتیجە بەبوونی هەلومەرجی زۆر لەبار دەتوانێت سەرکەوتوو بێت، بەشی زۆری خاکی عێراق تەختانییە و چڕی دانیشتوان تێیدا کەمە، ئەمەش یارمەتی پارتیزانە عێراقیەکان نادات خۆیان لەچاوی هێزەکانی دەوڵەت بشارنەوە.

بەڵام کێشەی سەرەکی ئەوەیە کە پرۆژەی ئەفغانی بۆ هاوپەیمانانی ئەمەریکا لەناوچەکە جێگەی قبوڵ نییە، لەلایەکیترەوە هاوکاری ئەمان بۆ پێشخستنی پرۆژەکە پێویستە، شۆڕشێکی پارتیزانی سەرکەوتوو پێویستی بەناوچەی ئامن لەپشتی هێڵی مەیدانی شەڕەوە هەیە تا شۆڕشگێران بتوانن لەوێ هێزی تازە پەروەردەکەن، پێویستیەکانی خۆیان ئامادە بکەن، برینداەکان تیماربکەن، کەلوپەلی جەنگی و پێویستیەکان خەزن بکەن، بۆ چالاکی تازە خۆیان ئامادە بکەن و لەکاتی هێرشی دەوڵەتدا پاشەکشێ بکەن و خۆیان ڕێکخەنەوە.

بەڵام هیچ یەکێك لەوڵاتانی هاوسنوری عێراق لەئێستادا میوانداری بەرهەڵستکارانی عێراق ناکەن، ئەم وڵاتانە هیچ یەکێکیان ئامادە نین لەبارودۆخی جەنگێکی ئاشکرادا بن لەگەڵ عێراقدا.

لێرەدا دەتوانین زیاتر ئەم هەنگاوە بەخێرایی بخەینە بەرباس و لێکۆڵینەوە، بەرپرسانی عەرەبستانی سعودی چەندینجار وتویانە ئامادەی جەنگ لەگەڵ عێراق بۆ ماوەی نادیار نین، سەرەڕای ڕقلێبوونەوە سعودیەکان وتویانە ناوچەی سنوری عێراق و عەرەبستانی سعودی ناوچەیەکی بیابانی و کەم دانیشتوانە بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕش نەگونجاوە، کوێت هەرچەندە حەز بە ڕووخانی سەدام دەکات، نیگەرانی جەنگی ماوەدرێژە لەسەر سنورەکانی لەگەڵ عێراق و هەروەها سنورەکانی ئەمیش بیابانی و کەم دانیشتوانە. ئەردەن کە پێشتر پشتگیری لەو هەنگاوانە کردبوو کە بۆ ڕووخانی سەدام نرابوو، بەڵام چەندجار نارەزایی دەربڕیبوو لەهەڵبژاردنی خاکەکەی بۆ هێرشی ڕاستەوخۆ بۆ سەر عێراق، سنوری ئەمیش

وەك كویت و عەرەبستانی سعودی بیابانی و کەم دانیشتوانە، سوریاش یەکێك لەئەندامە دوودڵەکانی هاوپەیمانی دژ بەسەدام بوو، هیچ وەختێك هەتا لەکاتی جەنگی کەنداویشدا ئامادەی بەشداری لەئۆپەراسیۆنی سەربازی ڕاستەوخۆ دژی عێراق نەبوو، جگەلەوەش سنورەکانی ئەم وڵاتەش ناوچەی بیابانیە. لەم بوارەدا تەنیا دوو ئەگەری ماوەتەوە کە بریتیە لەتورکیا و ئێران، بەدڵنیاییەوە تورکیا لەڕووی جوگرافیەوە لەبارترە ناوچەی سنوری نێوان تورکیا و عێراق شاخاوی و دارستانییە و پڕدانیشتوانە بەڵام بەداخەوە تورکیا هەرجۆرە شۆڕش و ڕاپەڕینێك دژی سەدام لەتورکیا و باکوری عێراق و دەوروبەری ناوچە کوردیەکان ڕوبدات خۆی بەتەواوی لێدادەبڕێت، ئەنکەرە نیگەرانە لەوەی کە پشتیوانی لەمجۆرە هەنگاوانە بەشێوەی گشتی ببێتە هۆی هاتنەدی ئاواتە سیاسیەکانی کوردەکان و شۆڕشگێڕە کوردەکانی وڵاتەکەی خۆشی بووروژێن، بەهۆی پەیانە یەکبەدوایەکەکانی بەرپرسانی ئەمەریکاوە، تورکیا ئەخوازێت کە سەدام لەسەر دەسەڵات بمێنێتەوە و هەتا لایەنگری لەهەنگاوەکانی ئەو دەکەن بۆ کۆنترۆڵ کردنەوەی کوردستانی عێراق. ئێران لەماوەی چوار دەیەدا دوا پێگەی پاراستنی پارتیزانە کوردو شیعەکان بووە، سنوری ئێران لەگەڵ عێراق شاخاوی، گردۆلکە، دارستان و زۆنگاوی زۆر هەیە، لەسەر سنورەکان کۆمەڵگای جیاجیا دەژین، بەڵام چونکە ئەمەریکا و ئێران پەیوەندی نزیکیان نییە وایکردوە یارمەتیدان و پشتگیری لەهەڵگیرساندی شۆڕش دژی سەدام لەلایەن ئێرانەوە کارێکی ئاسان نییە.

کێشەیەکیتری پەیوەست بە ڕێکاری ئەفغانی لەچوارچێوەی کاتێکی دوورودرێژدا بۆ کاریگەرکردن لەواقعەوەوە سەرچاوەدەگرێت، یەکەم ئەوەیە کەجەنگی پارتیزانی دوورودرێژی ناڕاستەکراو لەدەرەوەی وڵاتی عێراق، سەرئەنجام، ئایندەیەکی ڕوونی فکری گشتی بەجیهان نادات.

لەکۆتاییدا هەتا ئەگەر ڕێکاری ئەفغانی سەرکەوتوو بێت، لەوانەیە کۆمەڵێك لەکێشەی چارەسەر نەکراو لەگەڵ خۆی بێنێت، ڕووخانی سەدام بەمانای هاتنەسەرکاری حکومەتێك کە پارێزگاری لەبەرژەوەندیەکانی ئەمەریکا بکات لەبەغدا نییە. نائارامی لەعێراق دەتوانێت سەرئەنجام بەکودەتای سەربازی یان ناسایشی/هەوالگری بگات، بەڵام ئەمکارە بەکۆنگرەی نیشتمانی عێراق و گروپی لایەنگری ڕۆژئاوا بۆ گەیشتن بەدەسەڵات ئەنجام نادرێت، لەوانەیە عێراق توشی جەنگی ناوخۆیی بێت، یان لەئەنجامی شۆڕش بە شێوەی ئەفغانستان بارودۆخی بێسەروبەر وەك ئەوەی لەئەفغانستان ڕوویدا دروستببێت.

### هەڵبژاردەی بەردەم ئەمەریکا:

چونکە ئەمەریکا هەتا ئێستا توانای بەڕێوەبردنی پرۆژەی ڕوخاندنی سەدام یان دووبارە قبولکردنەوەی لەکۆمەڵگای نێودەوڵەتیدا نییە، تەنیا یەك هەڵبژاردن لەسیاسەتیدا دەردەکەوێت کە زۆر خۆشەویست نییە ئەویش (کۆنترۆڵ و جڵەوگیری)ە. ڕەخنەگران لەحکومەتەکەی کلنتۆن لەم بوارەدا لەسەر حەقن کە سیستەمی جڵەوگیری ئێستا لەحاڵەتی هەڵوەشاندنەوەدایە، لێکۆڵینەوەی گەمارۆی ئابوری

ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان و کۆتایی خولی گۆشەگیرکردنی عێراق، هەلی بۆ سەدام خۆشکرد کە دووبارە دەسەلاتی خۆی لەناو ولاتدا بنیاتبنێتەوە. سەرپێچی سەدام لەهاوکاریکردنی چاودیرانی چەکەکانی سەر بەنونسکام توانی پاریزگاری لەهەندێك لەبەرنامەی چەکە کۆکوژەکانی بکات، ئەگەر گۆشەگیرکردنی سەدام کەمبێتەوە، هێزە سەربازیەکانی بەهێز دەکاتەوە. شەری واقعی و بەهێزی ناسراوی ئەمەریکا لەعێراق ئەوەیە کە ئایا سیاسەتی جڵەوگیری سەدام بۆ دۆزینەوەی هەڵبژاردنێکی باشتر کە بوونی دەرەکی نەبێت، یا ئەوەی کە شێوەکانی جڵەوگیری بەهێز بکرێت.

ئەم کارە دەتوانێت بە دوو ڕەوش ئەنجام بدرێت، کە هەریەکەیان بەهای قورسی خۆی هەیە. یەکەمیان ڕێکاری پاراستنی جڵەوگیری عێراق بەهەمان ئەو شێوەیەی کە هەیە، هاوکات لەگەڵ چەندین جۆر لە گەمارۆی ئابوری، چاودێری و هەنگاونان بۆ گۆشەگیرکردنی دیپلۆماسی، ئەمەریکا بۆ ئەم مەبەستە دەبێت هاوپەیمانی دژی سەدام جارێکیتر ڕێکبخات و هاوکاری دووبارە و پێویستی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی فراوانکات، کە ئاریشە و گرفتی وەك چین، فەرەنسا و ڕووسیا لەرێگای پێدانی ئیمتیازات لەبوارەکانی سیاسەتی دەرەکی وەك فراوانکردنی ناتۆ، کۆسۆڤۆ، ئێران، یارمەتی ئابووری، قەرزەکانی ڕێکخراوی نەتەوەکان و .... بۆخۆی ڕاکێشێت. ئەمەریکا هەروەها دەبێت بۆ ڕووبەڕووبونەوە بەهەنگاوەکانی سەدام سوود لەهەرەشە یان کاری توندوتیژ وەرگرێت و هەرجۆرە هەنگاوێکی سەربازی پێویست بۆ ناچارکردنی ئەوبێت تاپەنا بۆ ئاشتی و سازش بەرێت. کورتەی ئەمە ئەوەیە کە دەبێت حکومەتی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بابەتی عێراق لەپێشەوەی سیاسەتی دەرکی خۆی دانێت تا ئایندەی پێشبینکراو لەبەرچاو بێت و سەرمایەی دیپلۆماسی سەرەکی بۆ سنووردارکردنی سەدام بخاتەکار.

ڕێکاری دووەم، گۆڕانی بابەتی جڵەوگیری سنووردارە، لەم سیناریۆیەدا ئەمەریکا بە هەڵوەشاندنەوەی گەمارۆی ئابوری لەسەر عێراق و هەڵوەشاندنەوەی ناوچەی دژە فڕین و قەدەغەکردنی بنیاتنانەوەی چەکی کۆکوژ و دەسکەوتنی چەکی ئاسایی نوێی وەك تانك، تۆپ، فڕۆکەی هلیکۆپتەری هێرشبەر لەسەر ئاستێکی فراوان بۆ عێراق قبوڵ بکات.

بەکورتی ئەمەریکا دەبێت لەچەندین فاکتەری ئەگونجاو ڕژێمی جڵەوکراوی ئێستا ڕێگاپێدانی سنوردا لەبەکارهێنانی چالاکی ئاسمانی لەدژی سەدام بۆ وەستاندنی بەرنامەی چەکە کۆکوژەکانی یان پێشگیری لەبنیاتنانەوەی چەکی ئاسایی مەترسیداری سەربازی چاو بپۆشێت.

هەرچۆنێك بێت هەریەك لەم دوو ڕێکارە کە هەڵبژێردراوە، بۆ پاریزگاری کردن لەبەرهەڵستکارانی عێراق دەتوانێت و دەبێت یەکێك لەبەشەکانی سیاسەتی ئەمەریکا لەم بوارەدا بێت، بەلام تەنیا هەرکاتێك ئەم پاریزگاری کردنە بە ئاشکرا دەرهەق بەجڵەوگیری بوو وە جێگرەوەی ئەو بوو، پێدانی یارمەتی سەربازی، سیاسی و دارایی سنوردار بەبەرهەڵستکارانی عێراق، ئەوانی ئامادەکرد بۆ سەرهواندنی گورز

لەپەیکەری رژێمی عێراق و ئەمەریکاش لەسیاسەتی پاشەکشێپێکردن کە پێشتر باسکرا دڵنیا دەبێت، ئەمجۆرە رێکارە لەرووی سیاسی، دیپلۆماسی و سەربازیەوە شیاوی جێبەجێکردنە و ئامانجە جۆربەجۆرەکانی ئەمەریکا دێنێتەدی.

لەمانگەکانی دوایدا یەکێتی نیشتمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان بەدژواری ئاشتیان لەنێوان خۆیاندا بەدیهێنا و بەمجۆرە هەریەکەیان لەهەرێمی کوردستان دەیویست پارێزگاری لەسنوری دەسەڵاتی خۆی بکات و لەجیاتی کوشتنی یەکتر هێزەکانیان لەبەرامبەر سەدام کۆبکەنەوە، سەرەڕای خیانەتەکانی ئەمەریکا لەشۆڕشی کوردی، کوردەکان دووبارە رازین بەهاوکاریکردنی ئەمەریکا.

ئەمەریکا دەبێت یارمەتی گروپە شیعەکانی باشوریش بکات، واشنگتۆن تائێستا بەخۆپاراستەوە لەپەیوەندی راستەوخۆ لەگەڵ شیعەکان و هەتا لەگەڵ چالاکترین گروپەکانیان لەوانە ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی بەبیانووی بونیادگرایی و پەیوەندی تونده‌وتۆڵی لەگەڵ ئێراندا، ئەمەریکا دەبێت بێ دوودڵی لەبارودۆخی گونجاودا گروپە میانڕەوەکانی شیعەکان بەهێز بکات و چەك و پارە بخاتە خزمەتیانەوە، ئەمەریکا هەتا دەبێت پشتیوانی لەئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی بەبەڵگەی میانڕەوکردنی دیدگاکانیان و زیادکردنی دوژمنانی سەدام بخاتە بەرباس و لێکۆڵینەوە.

ئەمەریکا دەبێت بۆ بەهێزکردنی بەرهەڵستکارانی ناوخۆ پایەگاکانی فراوان بکات، لێرەدا راگەیاندنی کۆنگرەی نیشتمانی عێراق گونجاوە: تەنیا رێکخراوێکی گەورە و سەرەکی بەتایبەت لەشێوەی ناردنی یارمەتیە جیاوازەکانی ئەمەریکا بۆ کوردو شیعەکان بۆ دروستکردنی یەکێتی لەنێوان بزوتنەوە بەرشوبڵاوەکانی دژ بەسەدام، ئەگەر رێکخراوی گەورە و سەرەکی هەڵبژاردەی واشنگتۆن هەمان کۆنگرەی نیشتمانی عێراق بێت، دەبێت هێز و توانای پێبدرێت تا بتوانێت دەسەڵاتی خۆی لەعێراق زیادبکات و سەربازی زیاتر لەژێر ئاڵای خۆی کۆبکاتەوە .

ئەم پلانە بەدڵنیاییەوە سەدام بەرەو سەرنگونکردن نابات، بەڵام سەدام لەبەرامبەر ئەیارەکانی هاوسەنگی لەدەستدەدا و کارەکانی سنوردا دەکات، ئەم پلانە لەوانەیە نارەزایەتی دەستەبژێرانی عێراق بوروژێنێت و هەتا ئەگەری سەرنگونکردنی سەدام دوردەخاتەوە، ناکامی سەدام لەسەرکوتکردنی بەرهەڵستکاران لەسەرەتای ساڵی (١٩٩٠) بووە هۆی ئەنجامدانی چەندین کودەتای سەرنەکەوتوو و پێگەی هێزەکانی ئەوی کردەوە.

پشتیوانی لەبەرهەڵستکاران دەبێتەهۆی کەمکردنەوەی رەنج و بەخشیشەکانی کورد و شیعەکانی عێراق، واشنگتۆن تائێستا چەندینجار کوردەکانی بۆ شۆڕش هانداوە بەڵام لەدوایدا بەبەغدای سپاردوون، واشنگتۆن لەساڵی (١٩٧٥) ئەوانی فرۆشت، لەساڵی (١٩٨٧ -١٩٨٨) کە پرۆسەی بەدناوی ئەنفال روویدا ئەمەریکا بێدەنگبوو تاسەدام کوردەکان کۆمەڵکوژ بکات، دوای پرۆسەی گەردەلوولی بیابان

لەساڵی (١٩٩١) جارێکیتر ئەمەریکا کوردەکانی بەتەنیا بەجێهێشت لەبەردەم سوپای عێراقدا، دوای هێرشی سەدام بۆ سەر هەرێمی کوردستان لە(٣١ئابی ١٩٩٦) ئەمەریکا بێدەنگ بوو وتەنیا چەند هەلوێستێکی جزئی پیشاندا، شیعەکانیش لەخەباتیاندا هەمیشە ڕوبەڕووی ڕەنج و عەزاب بونەتەوە، سەدام زۆنگاوەکانی باشوری عێراقی وشککرد و ئەوانی زۆر دڕندانە سەرکوتکرد، ئەگەر ئەمەریکا یارمەتی هێزە نەیارەکان بکات، بەبێ ئەوەی ئەوان بۆ ئامانجەکانی خۆی بجوڵێنێت دەبێت پەیمانەکانی خۆی بۆ ئەوان بەدیبێنێت و ئامرازە پێویستەکان بۆ بەهێزکردنی بەرگری بخاتە بەردەستیان.

هەندێك لەهاوپەیمانانی ئەمەریکا لەبەرامبەر هەر هەنگاوێکی جدی بۆ یارمەتیدانی بەرهەڵستکارانی عێراق دژایەتی دەکەن، بەڵام دەتوانێت بەسەر ئەم کێشەیەدا سەرکەوێت، نیگەرانیەکانی تورکیا ئەوەیە کە یارمەتیدان و پارێزگاریکردن لەکوردەکانی عێراق درێژە بکێشێت بۆ پارێزگاریکردن لەشۆڕشگێرانی کوردی تورکیاش وەك پارتی کرێکارانی کوردستان، واشنگتۆن بۆ دڵنیایدان بەئەنقەرە دەبێت زەمینە بڕەخسێنێت تا ئەم وڵاتە ڕۆڵی گرنگ بۆ جێبەجێکردنی ئەم سیاسەتە ببینێت و فشار بخاتە سەر حیزبە کوردیەکانی عێراق تا زیاتر جەخت لەسەر خودمختاری بکەنەوە نەك سەربەخۆیی، ئەمەریکا دەبێت بیری تورکیای بخاتەوە کە پارتی دیموکراتی کوردستان لەڕاستیدا چەندینجار بۆ سەرکوتکردنی پارتی کرێکارانی کوردستان یارمەتی تورکیای داوە و لە ئایندەشدا بەردەوام دەبێت، ئەگەر تورکەکان بازدەن بەسەر هاوکاریدا ئەوا حکومەتی تورکیا بۆ هاتنەناوەوەیان بۆ گۆڕەپانەکە ئیمتیازاتی تریان لە بواری سیاسەتی دەرکیدا بداتێ.

میرنشینەکانی کەنداویش دووچاری دوودڵی بوون، بەڵام ئەوانە سەبارەت بە سیاسەتەکانیتری ئەمەریکا ڕەشبینترن، بەدیارخستنی ئەم ڕاستیە کە واشنگتۆن خوازیاری ئەوەنییە کە جێگرەوەی سەدام ڕژێمێکی کوردی یان شیعی بێت، چونکە هیچ یەکێك لەو دووانە ڕێگایەکی گونجاو نییە بۆ حکومەتی عێراق، وڵاتانی کەنداو ئەگەر دڵنیا بکرێنەوە لەوەی کە پارێزگاریکردن لەبەرهەڵستکارانی عێراق لەچوارچێوەی بەشێك لەسیاسەتی جڵەوگیریە، کە لەلایەن هەموویانەوە قبوڵە بەڕووداوێکی مەترسیدار ناژمێردرێت و زیاتر هەست بەئاسایش و ئارامی دەکەن.

ئەم سیاسەتە دەبێت لەئەمەریکاش قبولکرێت، چونکە ئەگەرچی دەستتێوەردانی ئەمەریکا سنوردار دەکات، بەڵام کاریگەری لەسەر بەرەوپێشبردنی بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکا هەیە، بەپێچەوانەی خەیاڵ فراوانانی پەیوەست بەپاشەکشێپێکردن سودوەرگرتن لەبەرهەڵستکاران بەمەبەستی بەشێك لەسیاسەتی زیندوکردنەوەی جڵەوگیری پێویستی بەبڕی زۆر لەپارە یان هێزی سەربازیتر نییە، لەڕاستیدا گەورەترین مەترسی کەمبونەوەی پاراستنی ناوخۆیی و دڵنیاییە لەسەرهەڵدانی جەنگی فراوان، بەهێزکردنی سیاسەتی جڵەوگیری بەپێدانی یارمەتی بەرهەڵستکارانی عێراق بۆ بەردەوامی جێبەجێکردنی

ڕۆڵ لەگۆڕەپانی کارو ماندوو کردنی ڕژێمەکەی سەدام، زۆر تێڕوانین لەجیهاندا ناوروژێنرێت، سیاسەتی سنورداری جلەوکردن بەشێوەی ئیلزامی ئەمەریکا بەخواستەکانی ناگەیەنێت، بەڵکو لەدابینکردنی خواستەکانی ئەمەریکادا بەسوودە دەبێت.

هەتا بەپێی گریانەی خۆشبینەکان لەکۆی (٢٣) فرقەی عێراق تەنیا (١٢) فرقەیان کە (٦) فیرقەیان هێزی وشکانی و (٦) فرقەیان گاردی کۆمارین دەجەنگن و هەر فیرقەیەك دەتوانرێت بە (٥٠٠) بۆردومانی فڕۆکە تێکبشکێنرێت، تەنیا بۆ سەرکوت کردنی ئەم فیرقانە (٦٠٠٠) ئۆپەراسیۆنی ئاسمانی پێویستە، کەم وزۆر ئەم ژمارەیە لەکاتی هێرشکردن بۆ سەر دامەزراوە سەربازی و پشتیوانیە لۆجستیەکان و بنکەی فەرماندەیی وکۆنترۆڵی تاکتیکی پێویستی بە (١٢٠٠٠) ئۆپەراسیۆنی ئاسمانی هەیە، ئەمەش تۆزێك زیاترە لەنیوەی ئەو ئۆپەراسیۆنە ئاسمانییەیە (٢٢٠٠٠) کە لەکاتی گەردەلوولی بیاباندا دژی هێزەکانی سەدام بەکارهێنرا.

بەڵام ئۆپەراسیۆن ئاسمانی بۆ پشتیوانی لەهێرشی زەمینی بەرهەڵستکارانی ڕژێمی بۆ بەدیهێنانی ئامانجێکیتر، لەئۆپەراسیۆن گەردەلولی بیابان ئەولەویەتی باڵای نەبوو، ئەمەریکا دەبێت ناوبەناو هێرش بۆ سەر سوپای قورسی عێراق لەبەرامبەر یەکە سوکەکانی بەرهەڵستکاران بکات، بۆ ڕوبەڕووبونەوەی تەنیا یەکێك لەوهێرشانە کە دوو فیرقەی قورسی عێراق لەخەفجی لەکانونی یەکەمی ساڵی (١٩٩٠) ڕێکخرابوو (١٠٠٠) ئۆپەراسیۆن ئاسمانی ئەنجامدرا، بەڵام هێزەکانی عێراق بەسەلامەتی دەرچوون و دوای پاشەکشێ جارێکیتر لەجەنگی زەمینی بەشداریان کرد، هەتا ئەگەر بە چاوی ئومێدەواری بڕوانین بۆ بەهێزکردنی چالاکیەکانی ئەمەریکا و ڕوخاندنی وورەی عێراقیەکان ژمارەی فڕینەکان لەئێستادا بۆ نیوە کەمکەینەوە، بەڵام هەم پێویستی ڕووبەڕووبونەوەی چەندین هێرشی عێراق و پاراستنی هۆشیاری و ئامادەیی بۆ ڕوبەڕووبونەوە هێرشی دواتر، کە لەوانەیە ژمارەی هەموو هێرشە ئاسمانیەکان بگاتە ئاستی هێرشی ئاسمانی ئۆپەراسیۆنی گەردەلوولی بیابان.

ئۆپەراسیۆن ئاسمانی هەروەها دەبێت کار وفەرمانەکانیتری وەك هێرش و پشتیوانی وەك فڕۆکەی جەنگی، تێکشکاندنی دژئاسمانیەکانی دوژمن، تێکشکاندنی موشەکی سکۆد لەئاسماندا، سوتەمەنی وەرگرتنی ئاسمانی، گواستنەوە و گەیاندن بگرێتەوە. لەئۆپەراسیۆن گەردەلولی بیاباندا (٢٢٠٠٠) ئۆپەراسیۆنی ئاسمانی دژی هێزی زەمینی تاکتیکی عێراق ئەنجامدرا کە تەنیا بەشێکە لەو(١١١٠٠٠) ئۆپەراسیۆنە ئاسمانیانە کە ئەنجامدراوە، لەئۆپەراسیۆنی دواتردا ئەم ڕێژەیە کەمتر دەبێتەوە چونکە ئەمەریکا ئیتر نابێت هەمان ژمارەی ئامانجەکانی پێشوو بۆردومان بکات، بەڵام ئەم ڕێژەیە زۆر کەمتر نابێتەوە، چونکە ئەم ئۆپەراسیۆنە ئاسمانیە ماوەی زۆرتر دەخایەنێت، هێزەکانی ئەمەریکا بۆ تێکشکاندنی چەند یەکەی عێراقی چەند هەفتەیەك پێوەی خەریك دەبێت، لەچاوەڕوانی چونەناوەوەی هێزە

بەرهەڵستکاران بۆناو گۆڕەپانی جەنگ تا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هێرشەکان کاریگەرکات، دواتر ژمارەی یەکە زەمینیەکانیتری عێراق تێکبشکێنێت و بەمشێوەیە بەردەوام بێت.

خێرایی ئەم جەنگە ئاسمانیە لاوازی و بێئەزموونی یەکە بەرهەڵستکارەکان دیاریدەکات، چونکە ئاماجی یەکە شەرکەرەکان دەبێت بەدرێژایی چەندین مانگ سەرکوت و پارچەپارچەکرێت بەم شێوەیە ژمارەی هەموو ئۆپەراسیۆنی ئاسمانی بۆ ئەم جەنگە ئاسمانیە دەگاتە (٨٠ تا ١٠٠) هەزار.[1]

## سیاسەتی ئەمەریکا لەبەرامبەر عێراقدا :[2]

سەرۆك کۆماری ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە(١٥ تشرینی دووەمی ١٩٩٨) پێوەری تایبەتی ڕاگەیاند کە بەپێی ئەوە، عێراق دەبێت بەپێی ڕێکەوتننامەی ڕێکخراوی نەتەوەکان کاربکات ئەگەرنا ئەو ڕووبەڕووی هەڵەکانی پێشوو دەبێتەوە، هەمان هەرەشەکانی دوایی هەر قەیرانێك لەکاردایە، ئەمجارە بۆ حکومەتی ئەمەریکا جێبەجێکردنی کارێکی عملی و ئاسان نییە. ئەگەر سەدام حسین تاکتیکەکانی پێشووی خۆی لەسەر بنەمای ناڕەزایەتی سەبارەت بەخواستەکانی گروپی بپشکنین ئەنجامدات، ئەگەری ڕێکەوتنی بۆچوونەکان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی لەبەرژەوەندی هەنگاوی قەرەبووکردنەوە هەتا لەسەر ئاستی حکومی کەمڕەنگتر دەبێت.

بەدوور دەبینرێت کە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بتوانێت کۆدەنگی نێودەوڵەتی وەك ئەوەی لەکاتی هێرش و دەرپەڕاندنی لەکوێت هەبوو بەدەستی بێنێت، ئەمە تێڕوانینێکی مەترسیدارە، پێشتر ڕێکەوتن لەسەر بۆچوونەکان ئەنجامی هەلومەرجەکەبوو، سەدام حسین بەشێوەی گشتی لەهەنگاوەکانی پشکنینی ڕێکخراوی نەتەوەکان ڕێگری کردبوو، هەروەها هەڵبژاردنی چاوەڕواننەکراوی حکومەت ئەمەریکا و ڕێکەوتنی دانوسانی (wye)، قەیرانی دارایی جیهان بەتایبەت لەڕوسیا و سەرگەرمی فەرەنسا بە مەسەلەکانی ئەوروپا لەمەسەلە گرنگەکان بوو، کاریگەری ئەو قەیرانانە عێراقی توشی ئەم کۆسپ و شکستانەی خوارەوەکرد:

+ لەهەر قەیرانێکدا، سیاسەتی ئەمەریکا بۆ ڕێکەوتنی بۆچوونی ڕێکخراوی نەتەوەکان ڕووبەڕووی تێکشکان دەبێت، کلینتۆن لەبەیاننامەی (١٥تشرینی دووەمی ١٩٩٨)دا، دەجار لەکۆمەڵگای نێودەوڵەتی داواکردووە بەڵام یەکجار لەسەر بەرژەوەندیە نەتەوەییەکانی ئەمەریکا قسەی کردووە.

---

[1] ) کورتەیەك لە ووتاری (The Rollback) لە نوسینی دانیال بایمن (توێژەری سیاسی دامەزراوەی ڕاند)، کنت پالاك (پرۆفیسۆری بەناوبانگی کاروباری لێکۆڵینەوەی زانکۆیی بەرگری نەتەوەیی)، گیون ڕوز (یاریدەدەری توێژینەوەی ئاسایشی نەتەوەیی ئەندامی فەخری ئەنجومەنی پەیوەندیەکانی دەرەوە) کە لە گۆڤاری (Foreign Affairs) لە کانونی دووەم و شباتی سالی (١٩٩٩) لاپەرە (١تا١١) بلاوکراوەتەوە

[2] ) نوسینی هنری کیسینجر وەرگیراوە لە گۆڤاری (Washington Post, ٢٩ Nov ١٩٩٨) وەرگێرانی، مرزیە ساقیان بولتن، دەفتەری زانیاری سیاسی و نێودەوڵەتی، سالی دوانزەیەم، ژمارە ١٢١ سالی ١٩٩٨.

+ هەر قەیرانێك پاراستی ئێمە لەنێوان وڵاتانی کەنداو و ڕۆژئاوا ڕووشاندووە، ئەمانە نایانەوێت باوەڕکەن کە بۆ ماوەی دوورودرێژ لەناوچەکە بین.

+ هەر هەنگاوێکی سەربازی بێسوودبوون و ئەخلاقیەتی هێزە سەربازیەکانی ئەمەریکا لاواز دەکات.

+ لەهەر قەیرانێکدا، نەتەوەکان نارازین لەهەنگاونانی سەربازی، (سکرتێری ڕێکخراوی نەتەوەکان) کۆتایهاتنی گەمارۆی ئابووری بۆ هاندانی سەدام حسین بەستەوە بەرێگەدان بەپشکنینەوە، باسی سەدام لەسەر بنەمای ئەوەی کە گەمارۆ مەسەلەیەکی سەرەکیە، بۆیە جێگای بەرگری لێکردنە.

+ مادلن ئۆلبرات، سیاسەتی ئێمەی باسکردووە و ئەوەی بۆ پارێزگاری لەسەدام (لەجێگای خۆی In his box) زانیووە، بەلاَم ئەو ئامانجە ئەستەمە بەدەست بێت، ئۆنکسۆم (گروپی پشکنینی سەر بەرێکخراوی نەتەوەکان) ئامرازێکی لاوازە، دوای چەندین ساڵ بەسەر تێپەرینی تەمەنی ئەم گروپەدا، هێشتا نازانێت کە ئایا سەدام خاوەنی چەکی کۆکوژە یان نا؟

بەلاَم ئەگەر ئۆنکسۆم بیەوێت بەشێوەی پێویست کاربکات، بابەتی گەمارۆی ئابوری دەبێت بخرێتە بەرباس و لێکۆڵینەوە و سیستەمی پشکنین بگۆڕێت بۆ چاودێری، هەتا سیستەمی پشکنین باشتر کاربکات سنورداری بۆ عێراق خێراتر دەبێت و سەدام حسین جارێکیتر ناتوانێت خۆی پڕچەك بکاتەوە.

حکومەت قبوڵناکات، ئۆنکسۆم مەسەلەی سەرەکی نییە، بەڵکو حکومەتی سەدام بابەتی ئەسلیە، کلنتۆن پلانێکی بۆ ڕوخاندنی سەدام نەخستۆتەروو، ڕواڵەتەن ئەو پەنا بۆ ڕێگاچارەی سەربازی نابات، ئاراستەیەك کە ئەو بۆ بێهودەیی هەنگاوی سەربازی دەیخاتەڕوو ئەوەیە کە ئەگەر ئێمە هەنگاوی سەربازی بنێین، تواناکانی سەدام بۆ پەرەپێدانی چەکە کۆکوژەکانی بەستووە، بەلاَم ئەمە بەمانای کۆتایهاتنی کارەکانی ئۆنکسۆم دەبێت.

ئەم بابەتە سێ گریمانەی لێدەکەوێتەوە:

١) سەدام لەوانەیە تانایندەیەکی نزیك لەدەسەلاَتدا بمێنێتەوە.

٢) توانای سەربازی ئێمە لەڕووی بێبەهاکردنی توانای ستراتیجی ڕژێمی عێراقەوە کەمتر لەپشکنینەکان بەسودە.

٣) ڕژێمی سەدام لەبەرامبەر هەنگاوی پێبژاردنی ئەمەریکا لەمەیدانەکە ناچێتەدەرەوە.

حکومەت لەپلانە سەربازیەکانی خۆیدا، ڕواڵەتەن لەگەڵ سنوورداریێتی ڕووبەڕووە نارەزوی ڕوبەڕووبوونەوەی نییە لەمەسەلەی بەردەوامی حکومەتی سەدام بۆ قەیرانی کەنداو بگەڕێتەوە، بوش لەو ڕووەوە کە هاوپەیمانێتی جیهانی بۆ ڕووبەڕووبوونەوە دژ بەسەدام ڕێکخست شیاوی ڕێزگرتنە، بەلاَم ئێمە نەمانتوانی سەدام بڕوخێنین، چونکە لەوباوەڕەدا بووین بەئازاد کردنی کوێت ئێمە کارەکانی ڕێکخراوی

نەتەوەکانمان ڕاستکردووە و درێژەدان بەجەنگ دەبێتەهۆی بەرکەوتنی زیانی گەورەتر لەولات و سەدام سەرنگون دەبێت.

کاتێك سەدام سەلامەت بۆی دەرچوو، ئەمەریکا ڕووبەرووی سێ هەڵبژاردەیە:

١- ئاشتەوای لەگەڵ سەدام.

٢- پەشتنەوەی سەدام لە (جێگای خۆی).

٣- ڕوخاندنی سەدام لەڕێگای سیاسەتێکی نیشتمانی حساب بۆکراوەوە.

کێشەی سیاسەتی حکومەت ئەمەریکا ئەوەیە کە حکومەت یان باڵەکانی ناوی، پەیڕەوی لەسێ سیاسەت لەیەککاتدا دەکەن، کلینتۆن لەوتەکانیدا لە(١٠تشرینی دووەم) وتی: (ئەگەر ئێمە بتوانین پارێزگاری لەئونکسۆم بکەین و جارێکیتر ئەو چانسە (هەلە) بەسەدام بدەین تا ڕێکەوتننامەکانی ڕێکخراوی نەتەوەکان قبوڵبکات، دەگەینە ئەنجامێك).

هیچ یەکێك لەهاوپەیمانانی ئێمە لەکەنداو یان ناوچەکە لەوباوەڕەدا نیین کە ئاسۆیی (ئاشتەوایی نابرومەندانە) بەپێی ڕێکەوتننامەکانی ڕێکخراوی نەتەوەکان بۆ ماوەی چەند مانگێك بەردەوام بێت، هەموویان لەو باوەڕەدان کە عێراق هەوڵدەدات بۆ هەڵوەشاندنەوەی گەمارۆی ئابوری تا خۆی پرچەك بکاتەوە و ڕێکخراوی نەتەوەکان بەدوای بیانویەکەوەیە کە گەمارۆی ئابوری هەڵوەشێنێتەوە، ولاتانی ناوچەکە پشت بەئێمە دەبەستن سەبارەت بەڕووخاندنی سەدام یان لاوازکردنی تاوەکو جارێکیتر بەهێزی هەرەشەکەر نەژمێردرێت، هەنگاوە سەربازیەکانی ئەمەریکا لەکەنداو ئاماژەیە بۆ پەنانەبردن بۆ زەبروزەنگ، لەوەلامدانەوە بۆ پلانەکانی عێراق بۆ تیرۆکردنی بوش لەساڵی (١٩٩٣) موشەکی کرۆز تەنیا بەر بینایەی چۆڵ لەبەغدا کەوت، لە(٣١ئابی ١٩٩٦)دا کاتێك کە سەدام گورزی سەرەواند لەجولانەوەی بەرنگاری کوردەکان لەهەرێمی کوردستان کە لەژێر چاودێری ئەمەریکادا بوون، حکومەت بەموشەکی کرۆز وێستگەی ڕاداری بەدوری سەدان میل لەباشور بۆردومانکرد، لەم سێ شەڕەدا سەدام لەساڵی ڕابردوو پاشەکشێی کرد.

+ ئەم دوودڵیە لەپەیوەندی ئێمە لەگەڵ ئێران کە گەورەترین ولاتی ناوچەکەیە کۆسپە لەبەردەم ڕووبەڕووبوونەوەدا.

+ لەهەلومەرجی کرداریدا (فعلی) ئێمە توانای پاراستنی ئارامی و جێگیری لەکەنداو لەبەرامبەر ئێران و عێراقدا نیین، ئێمە نەدەتوانین لەبەرامبەر ولاتی هێرشکەری ئێران بوەستین ئەگەر نەتوانین لەعێراقێکی شکستخواردوو بیبینەوە، ئێمە ناتوانین میانڕەوی لەئێران هانبدەین ئەگەر سەرکردەکانی ئێران تیرۆانیستیان وابێت خەباتکردن دژ بەئەمەریکا ئاسان و کاریگەرە، سیاسەتی لێبڕاوانەتر لەبەرامبەر سەدام دوچاری سنورداری بووە، چونکە ئەو باسە هەیە کە ئێمە دەبێت لەکۆمەلگای نێودەولەتی

سەرکردایەتی و ڕێگاچارە داوابکەین، دەبێت هەنگاوەکانی خۆمان پەیوەست بەجوڵەی تایبەت بەعێراق بخەینەڕوو ئەگەر نەتوانیین لەڕەهەندی سەربازی شتێك بەدەست بێنین، باشتروایە کارێك ئەنجام نەدەین، تەواوی ئەم بۆچونانە لەحکومەتەوە دەرکەوتووە.

هەرکاتێك کە ئێمە لەکاری هەڕەشەکردن ڕووبەڕووی شکست دەبینەوە لەهەنگاوی دوایدا هاوکات بەهەوڵی زۆرتر مەجبور بەکاری هەڕەشەی زۆرتر دەبینەوە، لەکۆتایی ئەم ئەڵقەی زنجیرەییەدا، ئێمە یان دەبێت پاشەکشێ بکەین یان ڕووبەڕووی هێرشی هەمەلایەن دەبینەوە، ئەگەر ڕازیبین کە سەدام خاوەنی شارەزاییە، لەبەرئەوە لەوانەیە بێ ئاگایی و نەخوازراو دەرکەوێت.

ئەم باوەڕە تاکاتێك نەچینە ناو بەغداوە ناتوانین ببینەهۆی لاوازکردنی سەدام، لەڕووی ستراتیجی و ئیرادەی سیاسی و توانای سەربازی زلهێزێکەوە دورە، ئەوە کە ئێمە ناتوانین ڕێبگرین لەتواناکانی عێراق بۆ هەڕەشەکردن لەدراوسێکانی و جێگیرکردنی هێزە ئەمەریکایەکان دەبێتەهۆی ئەوەی لەهەموولایەکەوە شکست بخۆین، دوژمنانی ڕادیکاڵ لەم بابەتەی ئێمە هەراساننابن یان باوەڕناکەن کە دەتوانن سەبارەت بەناماڵجەکانی خۆیان ئەوە کۆنترۆڵ بکەن، کاریگەری دەبێت لەسەر هەیبەتی ئەمەریکا لای دۆستەکانمان، کەسانێك کە لەپاڵماندا وەستاون چاودێریکن بەڵگە بەسنورداری نابینن.

دەبێت ئاگاداربین کە چالاکی نهێنی دەتوانێت ئێمە بەتواناکات تاناڵۆزیەکانی ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازی چارەسەربکات، من لایەنگری پارێزگاریم لەبزووتنەوەی بەرهەڵستکاری عێراق بەڵام بەچاودێری و پشتبەستن بەناوخۆ، سێ بابەت لەبەرچاو دەگرم، ئەمە دەبێت پیشەیی (حرفەیی) جێبەجێبکرێت نەك سەرمایەگوزاری، دەبێت بەرژەوەندی وڵاتانی دراوسێ بەتایبەت تورکیا و عەرەبستانی سعودی و ئەردەن لەبەرچاو بگرین ئەوانە کاتێك دوچاری کێشە دەبنەوە پێویستیان بەخواستی ئەمەریکا لەپارێزگاری بزوتنەوەی بەرهەڵستکارەکان، کە بەشێوەی پێویست هێزەکانی ئەمەریکا دەبێت پارێزگاریان لێبکات، یان ئێمە ڕووبەڕووی گرفت و ئابڕووچوونەکانی وەك باکوری عێراق لەساڵی (١٩٧٥) و (٣١ی ئابی ١٩٩٦) دەبینەوە، کاتێك کە پارێزگاریمان لەزۆربەی کەسەکان کردووە یان لەگۆڕەپانەکە دەرچووە یان گۆشەگیربوو، ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم مەسەلەیە سەبارەت بەئەفغانستان قورسترە، بۆیە ئەم بنەمایانەی خوارەوە پێشنیاز دەکرێت:

١- کێشەی کۆتایی لەکەنداو پشکنین نییە، بەڵکو حکومەتی عێراق کێشەی سەرەکییە.

٢- جوڵان و هاندەری ئەم دواییەی سەدام نەك لەڕووی خاڵی تێروانیین هێرشە، بەڵکو بەرەو پێشبردنی ستراتیجی خۆی دەبێت لەبەرچاو بگرین، کاردانەوەی سەربازی دەبێت ببێتەهۆی وێرانکردنی بنکەکانی سەدام و شوێنی شاردنەوەی چەکەکۆکوژەکان و پاسەوانە تایبەتیەکانی، بەشێوەی گشتی بەبۆچونی من (کیسینجر)، ئەم کارە بەپشتبەستن بەبزووتنەوەی ڕزگاریخوا لەناوخۆ باشترە، ئەگەر بەجدی

کار بۆ پارێزگاریکردن لەبزووتنەوەی ڕزگاریخوازی عێراق بکەین، دەبێت ئەوانە تەیاربکەین و ڕایانبێنین و پێکهاتەی فەرماندەیی ئەوان ڕێکخەین و لەلایەن هێزەکانی خۆمانەوە پارێزگاریان لێبکەین.

وەك بەشێك لەهەوڵی جدی بۆ ڕوخاندنی سەدام، دەبێت بارودۆخی عێراق لەرێبەریکردنی چالاکی سەربازی لەناوخۆیی هەردوو ناوچەی دژەفڕین یان لەبەرامبەر دراوسێکانی ئەم وڵاتە کە بەناوچەی سنوردارکردنی جووڵەی هێزەکانی عێراق دادەنرێت وە کۆنترۆڵی ژمارەیەك لەورێگایانە بکرێت.

خەڵکی عێراق دەبێت بزانن کە دوژمنی سەرەکیان سەدام و دەستوپێوەندەکەیەتی، خەڵکی عێراق بەشێکن لەهاوپەیمانانی ئێمە نەك ئامانجی ئێمە.

ئەگەر ئارەزوو ناکەین ئەم ڕێکخستن و بڕیارانە لەبەرچاو بگرین، سیاسەتی ئێمە ڕووبەڕووی شکست دەبێتەوە و ئارامی و جێگیری کەنداو و ناوچەکە دەکەوێتە مەترسیەوە.

ئەو بابەتانەی پێشەوە ئەوە دەخوازێت کە چاودێرانی ئەمەریکا ئەوە دەرخەن کە ئەوانە مسلمانن، گۆڕانکاری ئەفغانستان و ڕوخاندنی حکومەتی تالیبان و ستراتیجی نوێی بوش سەبارەت بەرۆژهەڵاتی نزیکی گەورە ئەگەر زۆرە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەتا بەبێ ڕەزامەندی هەموو هاوپەیمانەکانی دەست بەچالاکی سەربازی بکات بەڵام بەشێوەی جیاواز لەوانەی پێشوو، وەئێستا ناتوانین ئەمە پێشبینی بکەین بەڵام جێبەجێکردنی کارێکی حەتمیە.

## بەشی چوارەم

# هاوکاریەکانی ئێران و عێراق

یەکێك لەگرنگترین دەرکەوتە کاریگەرەکان لەوەرگرتنی ستراتیجی نەتەوەیی و نێودەوڵەتیدا، ڕۆڵی فاکتەری جوگرافیای وڵاتێکە لەناو کۆی سیستەمی جیهانیدا کە بەجیوپۆلەتیك گوزارشت دەکرێت. (جیوپۆلەتیك ڕێکارێکە بۆ سیاسەتی دەرەوەی وڵاتێك کە بەسەرنجدان لەژینگەی سروشتی و بەرروونکردنەوە و پێشبینی کردنی ڕەفتاری سیاسی و توانا سەربازیەکانەوە خەریك دەبێت) و زانستیکە توێژینەوە لەیەکەی سیاسی لەناوقاڵبی جیهان و ڕۆڵی فاکتەری جوگرافی لەچارەنووسی سیاسیدا دەخاتە بەرباس ولێکۆڵینەوە.

یەکە سیاسیەکان لەژێر کاریگەری هەڵکەوتەی جیوپۆلەتیکیدا، هەریەکەیان بەجۆرێك لەگەڵ وڵاتانیتر بەتایبەت هێزە جیهانیەکان هەڵسوکەوت دەکەن. هەندێك لەوڵاتان بەهۆی گۆشەگیری شوێنەکانیانەوە یان هەلومەرجی جوگرافیانەوە لەدوژمنکاری دەرەکی پارێزراون، لەبەرامبەردا وڵاتانیتری وەك عێراق و ئێران لەژێر کاریگەری شوێنی جیوپۆلەتیکیان هەمیشە گۆڕەپانی ناکۆکی هێزە جیهانیەکان بوون و ڕۆڵی تایبەتیان لەستراتیجی سەربازی/سیاسی لەئەستۆدا بووە. هەمان مەسەلە بۆتەهۆی ئەوەی کە لەڕابردوودا وڵاتانی بەهێز بەشێوەیەك دەستوەربدەن لەکاروباری ئەم وڵاتانە.

ئاگاداربوون لەگرنگی مەسەلە جیوپۆلەتیکیەکان، هێزە گەورەکانی لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا هاندا، بەسوودوەرگرتن لەدەسکەوتە زانستیەکان و لەواقعیەتی جوگرافیای جیهان لەبەرژەوەندی سیاسەتی خۆیان کەڵکی لێوەردەگرن، ئەم مەسەلەیە پێشبڕکی فراوانتری لەنێوان یەکە سیاسە بەهێزەکانی ئەو کاتەدا دروستکرد، بەجۆرێك کە هەریەك لەم وڵاتانە هەوڵیاندەدا دەسەڵاتی خۆیان زیاترکەن و سەرزەمینی زیاتر بخەنە ژێردەستی خۆیانەوە، ئەم بابەتە تیۆریزەکرا لەلایەن کەسانی وەك ڕۆدۆلف کیلن، ئەلفرید تایر ماهان، هالفورد ماکندەر، سپایکمن و هاوس هۆفەر کە دواتر بووە تیۆری جیوپۆلەتیکی ناسراو.

### ئەو فاکتەرانەی کاریگەریان لە پێکهاتەی جیوپۆلەتیکی عێراقدا هەیە:

فاکتەری کاریگەر لەپێکهاتەی جیوپۆلەتیکی هەروڵاتێك بۆ دوو بەشی وەك فاکتەری جێگیر (نەگۆڕ) و فاکتەری ناجێگیر (گۆڕاو) دابەش دەبێت و سەبارەت بەعێراق فاکتەری جێگیر (تۆڕی ناوەکان) و چەند فاکتەرێکی گۆڕاو (نەوت، کوردەکان و شیعەکان) لەپێشەوەی فاکتەرەکانیتر کاریگەریان لەپێکهاتەی جیوپۆلەتیکی ئەم وڵاتەدا هەیە.

## جیوپۆڵەتیکی ئاو:

تۆڕی ئاوی هەروڵاتێك ڕۆڵی سەرەکی لەدروستکردنی یەکێتی زەوی یان پارچەپارچە کردنی، توانای ئابووری، پەیوەندیەکان، گواستنەوە وگەیاندن و بەشێوەی گشتی لەتوانای نەتەوەیی هەروەڵاتێك دەبینێت.

ئاو دەرامەتێکی سروشتیە، کە توانای هێزی ئەو لەسروشتدایە، بەتێڕوانیین لەسوڕی ئاو لەسروشتدا ئەم مەسەلەیەی سەلماندووە کە ڕێژەی ئاو لەقۆناغە جیاوازەکاندا تارادەیەك جێگیربووە، بەڵام ئەوەی بەڵگەنەویستە ئەوەیە کە مرۆڤ دەتوانێت ئەم سوڕی ئاوە لەسروشتدا بگۆڕێت. مرۆڤ لەبەرکەوتن لەگەڵ ئاودا پێش هەرشتێك پاشکۆی هەلومەرجی سروشتیە و چالاکیەکانیشی لەژێر کاریگەری ئەم بەرکەوتنەدایە، بەڵام پێشکەوتنی تەکنەلۆجیا، زۆربوونی دانیشتوان، هەمەچەشنی پێویستیەکان، پێش هەرشتێك کاریگەری لەسەر ئەوماددە ژیانیە هەیە و تائەو ئاستەی کە ئەمڕۆ مەسەلەی ژینگەی ئاو شێوە و جێگای تایبەتی بەدەستهێناوە. ئەم مەسەلەیە نابێت بەدوور بگیرێت تاکاتێك کە پێویستیەکانی مرۆڤ و دەرئەنجامەکانی سروشت پەیوەست بەئاو تارادەیەك هاوئاهەنگی هەبێت، ئەم مادەیە مەسەلەیەکی دروست نەکردووە، بەڵام لەبەرامبەر دەستکەوتنی یان دەست نەکەوتنیدا، ئەم مادە سروشتیە لەدیاریکردنی لایەنی باشە یان خراپەی چالاکیەکانی مرۆڤ ڕۆڵ دەبینێت.

بەڕێوەبردن و ئاراستەی تایبەتمەنی دەرامەتی ئاو لەوانەیە گرنگترین بابەتی ژینگەیی بێت کە لەباسی سیاسی و ئەندێشەی ستراتیجی شوێن و گرنگی زۆری بەدەستهێناوە. دەرامەتی ئاو بەزۆری وەك کێشەیەکی ئاسایشی لەسەر ئاستی نەتەوەیی و نێودەوڵەتی سەیر دەکرێت، لەزۆر لەوڵاتان بەڕێوەبردنی دەرامەتی ئاو چاودێری توندی لەلایەن گروپە ناوخۆییەکانەوە لەسەرە، کە هەریەکەیان خاوەنی دەرامەت و پەیوەندی تایبەتی خۆیەتی. بزواندن و کۆنترۆلکردن و چاودێریکردنی دەرامەتی ئاوی نێودەوڵەتی، ئاوبەئاو دەبێتەهۆی دروستکردنی گرژی وئالۆزی لەنێوان وڵاتاندا. لەم بوارەدا نموونەی زۆر لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەدیدەکرێت، چونکە زۆربوونی دانیشتوان و ڕەوتی گەشەی کشتوکاڵ، دەرامەتی ئاو بەتوندی دەخاتە ژێر فشارەوە، لەم ناوچەیە بێ متمانەیی سیاسی لەئاستێکدایە کە دەسەڵات بۆ خستنەڕووی ئاو، بەڕاست یان هەڵە وەك لایەنێکی ستراتیجی دەزگای شەڕ یان جەنگی سیاسی کە لەهاوسەنگی هێزی ناوچەکە کاریگەری بەرچاوی هەیە و بەهەند وەردەگیرێت، مەسەلەی تایبەتمەندی دابەشکردنی دادپەروەرانەی دەرامەتی ئاوی ناوچەکە وەك ڕەگەزێکی گرنگ لەهەر پەیمانێکی ئاشتی کە لەئایندەدا واژۆبکرێت بوونی هەیە.

لەبەیانات و چاوپێکەوتنی تارادەیەك توندی سیاسیەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست باس لەوەدەکەن (چەکی ئەوت) بایەخی کەمتر بۆتەوە، بەشێوەیەك کە تورگوت ئۆزال سەرۆك کۆماری پێشووی تورکیا لەسەر حەتمیەتی جەنگی ئاو قسەیەکی کردووە و پەترۆس غالی وەزیری دەرەوەی پێشووتری میسر بەتوندی

دەریخستبوو کە میسر ئامادەیە بۆ مسۆگەرکردنی ئاوی ڕووباری نیل بکەوێتە جەنگەوە. لەگفتوگۆکانی عەرەب و ئیسرائیل گفتوگۆی ئاشتی ئیسرائیل و وڵاتانی لوبنان، سوریا و فەلەستین سێیەمین بەندی نەخشە ڕێگای پەیوەست بەنرخاندنی ئاوە کە گرنگی تایبەتی خۆی هەیە.

### دیجلە و فورات و مەسەلە جیوپۆلەتیکیەکان:

ڕووبارەکانی دیجلە و فورات وەك شاخوێنبەری ژیانی عێراق لەفاکتەرە کاریگەرەکانی پێکهاتەی جیوپۆلەتیکی ئەم وڵاتە دەژمێردرێت، عێراق سەبارەت بەرێژەی سوودوەرگرتن لەم دوو ڕووبارە و کەشتیوانی و ڕێکخستنی ئاسایشی لەگەڵ دراوسێکانی وەك تورکیا، سوریا و ئێران ناکۆکی و گرژی هەیە.

زیادبوونی ژمارەی پرۆژەی بەنداوەکان بۆ چەند مەبەستێکە و هاوکاتە لەگەڵ ڕکەبەرایەتی و بەدەستهێنانی ڕابەری سیاسی و ئابووریە لەناوچەکەدا بۆتە هۆی گرژی هەمیشەیی لەحەوزی (ئاوزێڵی) ڕوباری دیجلە و فوراتدا. تێڕوانینی هەمەجۆر لەپەیامە ژینگەیی و خولیا ئابووریەکانی پرۆژەی باشوری ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ کاریگەریەکەی لەسەر گرژی پەیوەندیەکانی نێوان تورکیا لەگەڵ عێراق و سوریا هەیە.

ناکۆکی دێرینەی نێوان عێراق و سوریاش جارجارە لەژێر کاریگەری بابەتی مافی وڵاتانی کەناری ڕووبارەکان سەرهەڵدەدات. فشاری لەسەر دەرامەتی ئاوی ئەم ناوچەیە زیادیکردووە بۆیە واچاوەڕوان دەکرێت کە دانیشتوان ئەم وڵاتانە لەساڵی (١٩٩٠) کە گەیشتۆتە (٨٨) ملیۆن کەس لەساڵی (٢٠٠٠) بەرزبۆتەوە بۆ (١١٤) ملیۆن کەس.

لەدەیەی حەفتاکان بەدواوە پەیوەندی نێوان عێراق لەگەڵ سوریا و تورکیادا ناکۆکی و گفتوگۆی زۆری لەسەر مافی وڵاتان کەنار ڕووبار تێکەوتووە، لەگفتوگۆیەکی جدیدا کە لەساڵی (١٩٧٥) لەنێوان عێراق و سوریادا پەیدابوو، بەهۆی کەمبوونەوەی ئاوی فوراتەوە دوای تەواوبوونی بەنداوی (الثورة)ی سوریەوە کە بەهۆی ناوبژیوانەی عەرەبستانی سعودی و کۆمکاری عەرەبەوە شەڕ ڕوونەدا. لەکانونی دووەمی (١٩٩٠) داخستنی دوا تونێلی لادەری بەنداوی ئەتاتورك بۆ ماوەیەکی کاتی هاتنی ئاوی فوراتی بۆ سوریا و عێراق بۆ ماوەی یەك مانگ کەمکردەوە و ناڕزیەکانی ئەم دوو وڵاتە سەرانسەری وڵاتانی عەرەبی وروژاند. لەم هەلومەرجەدا بەسەرنجدان لەزۆرداری تورکیا سەبارەت بەئاوی ڕووباری فورات سەرۆك وەزیرانی ئەوکاتەی تورکیا بەمجۆرە ڕوونیدەکاتەوە کە (بەبۆچوونی من هەڕەشەکان سەبارەت بەجەنگ لەئەنجامی جێبەجێکردنی پرۆژەی پەرەپێدان لەتورکیا خراوەتەڕوو، جێگای نیگەرانی نییە. ئەگەر هەڕەشەیەك هەبێت ئێمە بەرپەرچی دەدەینەوە، تورکیا فاکتەری بەرپەرچدانەوەی لەبەردەستدایە و لەئایندەدا توانای ئەم بەرپەرچدانەوەیەی زیاد دەکات). بە ووتەی سەرۆك وەزیرانی تورکیا ئەگەر ئەم وڵاتە پێگەی شوێنکەوتوو و لاوەکی خۆی لەپەیوەندی بە ئەوتەوە قبوڵ دەکات، بۆیە جێگای سەرنجە کە لەهەڵکەوتەی بالاتری خۆی وەك سوودوەرگرتن لەسەرچاوەکانی پەیوەست بەدەرامەتی ئاوەوە کەڵك

وەربگرێت. بە شێوەی گشتی تورکیا بە ڕێکەوتنی گرووپی و سێ لایەنە لەبارەی هاوبەشیکردنی ناوی دیجلە و فورات نەیار و ناکۆکە کە سەبارەت بەبەشێك لەم ڕووبارانە کە لەخاکی ئەم وڵاتەوە دێت، حاکمیەتی هەیە، بەڵام لەهەمانکاتدا دەخوازێت لەپرۆژە هاوبەشەکان لەگەڵ دراوسێکانی لە(خواری ڕووبار) هاوکاری بکات.

## جیوپۆلەتیکی نەوت:

لەلێکۆڵینەوەی گشتیدا هیچ جۆرە چالاکیەك بەبێ سەرفکردنی ووزە جێگای قبوڵ نییە، بەجۆرێك کە زانایان لەوبڕوایەدان بوونەوەرە زیندووەکان لەکاتی خەو و پشوودانیشدادا بەڕێژەی پێویست ووزە سەرفدەکەن، هەرکاتێك بەشێوازی سنورداتر لەبۆچوونی گشتی لەچوارچێوەی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بیرکەینەوە بە ڕوونی دەردەکەوێت کە بزوێنەری (ماتۆڕی) ئابووری ئەو کۆمەڵگایە بەبێ سەرفکردنی ووزە نابزوێت و ڕیشەی ئابووری هەر کۆمەڵگایەك بەچەمکی گشتی ئەو، کە هەموو لایەنە مادیەکانی ژیانی مرۆڤەکان دەگرێتەوە، بەبێ لەبەرچاوگرتنی ڕۆڵی ووزە تێدا وێنەیەکی ڕاستمان ناداتێ. بۆیە دۆزینەوەی ووزەی هەڵمی ناو بەخاڵی دەسپێکردنی شۆڕشی پیشەسازی دەژمێردرێت، کە بەنۆبەی خۆی پیشەسازی بوونی ئەورووپا و وڵاتانیتر و پێویستی بەووزەی زیاتر و هەرزانتر هەیە، لەڕابردوودا ئاشکرابوو کە گۆڕانکاریەکانی ئەم دواییە لەم بوارەدا ڕەوتی هەوڵەکانی خێراترکردووە.

بەسەرنجدان لەڕۆڵی سەرەکی و پڕگرنگی ووزە، وڵاتانی جیهان لەڕابردوویەکی دووردا، بەڕێژەی توانا و خواستەکانیان، هەوڵی زۆریانداوە تا ووزەی بەکارهێنراوی خۆیان لەنزیکترین و ئاسانترین سەرچاوەوە دابینبکات. تاپێش قۆناغی شۆڕشی پیشەسازی کە لەوکاتەدا پێوستی بۆ ووزە زیادیکرد و هەتا چەند سەدەیەك دوای ئەوە، واتە تاپێش دەستپێکردنی سەدەی بیست، ڕۆڵی سەرچاوەی ووزە بۆ ژیانی ئابووری کۆمەڵگای مرۆڤایەتی هاوشێوەیە لەگەڵ ڕۆڵی ناو لەژیانی ڕۆژانەدا. بەشی زۆری ووزەی جیهان لەسەرچاوەیەکەوە دابیندەکرا کە ئەمڕۆ کەوتۆتە ناو کۆمەڵگای هەژاری ئەفریقا و ئاسیاوە. دوای ئەوەی خەڵوزی بەردین بەکارهێنرا لەداهێنراوی ئامێری هەڵم، واتە کۆتایی سەدەی هەژدەهەم دەستپێکرد و لەماوەیەکی کەمدا بووە هۆی پێشکەوتنێکی سەرنجڕاکێش لەپیشەسازیدا، لە ڕاستیدا دەتوانین بڵێین کە سەرەتای پێشکەوتنی پیشەسازی لە سەدەی بیستدا قەرزاری خەڵوزی بەردینە. لەبەرئەوەی بەریتانیا خاوەنی سەرچاوەی دەوڵەمەندی خەڵوز بوو بۆیە وەك پێشەنگی وڵاتانی پیشەسازی لەجیهاندا دەرکەوت. ئەم وڵاتە توانی بەسوودوەرگرتن لەخەڵوزی بەردین توانای ئابووری و سیاسی خۆی لە ئەورووپا و جیهان پێشبخات و بە پشتبەستن بەم ووزەیە لەجەنگی یەکەمی جیهانیدا ڕۆڵی گرنگی هەبێت.

بەکارهێنانی خەڵوزی بەردین تا جەنگی یەکەمی جیهانی گەیشتە بەرزترین پلە، بەڵام وردەوردە نەوت وەك ڕکەبەری سەرەکی خەڵوز هاتە مەیدانەکەوە. هەرچەندە نەوت وەك مادەیەکی سوتەمەنی

لەسەردەمانی زۆرکۆنەوە بەشێوەی سەرەتایی سوودی لێوەرگیراوە لەلایەن مرۆڤەوە، بەڵام گۆڕانکاری کاتێك دەستی پێکرد کە (کلنل دریك)ی ئەمەریکی لەساڵی (١٨٥٩) لەویلایەتی پەنسلڤانیا سەرکەوتوو بوو لەداهێنانەکەی کە توانی ڕۆچێتە ناوچینەکانی زەویەوە، لەوکاتە بەدواوە لەناوچە جیاوازەکانی گۆی زەوی نەوت بەشێوەی جیاواز بەرێگای پیشەسازی دەرهێنرا.

لەسەدەی بیستەمدا بەشێوەی گشتی نەوت وەك مادەی سەرەکی ووزە لەپیشەسازی و گۆستنەوە و گەیاندن گرنگیەکەی زیادیکرد، بەجۆرێك کە ڕکەبەرایەتی بەهێز کەوتە نیوان زلهێزە گەورەکان بۆ بەدەستهێنانی و کۆنترۆلکردنی ئەم دەرامەتە گرنگە، ئەم هێزانە بۆ بەدیهێنانی ئەماعکاریەکانی خۆیان لەدیپلۆماسیەوە تا دەگات بەبەکارهێنانی هێزی سەربازی سڵیان نەکردەوە. لەماوەی زیاتر لەنیو سەدە لەبەکارهێنانی دەرامەتی نەوت زانایانی بواری ووزە و ئابووری توانای تازەیان بەنەوت بەخشیووە کە گرنگیەکەی بەتێپەڕبوونی ڕۆژگار زیاددەکات، بەجۆرێك کە لەماوەی جەنگی دووەمی جیهانیدا نەوت وەك مادەیەکی ستراتیجی ناسێنرا. زۆر لەلێکۆڵەرەوان پێشکەوتنی ئابووری ئەمەریکا لەچەند دەیەی ڕابردوودا دەگێڕنەوە بۆ دەرامەتی نەوت لەم وڵاتەدا. لەدڵی پیشەسازی نەوتی ئەمەریکا مەزنترین زەبەلاحی (عملاق) ئابووری ئەم وڵاتەیە، واتە کۆمپانیا گەورە پیشەسازیەکان دەرکەوت کە لەڕاستیدا لەماوەی نیو سەدەی ڕابردوودا زۆر لەسیاسەتە ئابووری و سیاسیەکانی جیهانی خستۆتە ژێر کاریگەری خۆیەوە.

لەبەرئەوە ئەگەر لێکۆڵینەوە لەمێژووی پیشەسازی نەوتی جیهان و لەسەروویانەوە پیشەسازی نەوتی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و بەتایبەت لەنێوان هەردوو جەنگی جیهانیدا بکەین، سەرنج دەدەین کە گۆڕانکاری زۆر ڕوویداوە، لەنێوان هەردوو جەنگی جیهانیدا تەنیا وڵاتێك کە بەرهەمهێنان ودابەشکردن و بەکارهێنانی نەوتی بەرێژەی زۆر کۆنترۆلکرد بەریتانیا بوو، کە بەڵگەی ئەمە بوونی سیستەمێك بوو کە لەماوەی سێ سەدەدا بەدەستیهێنابوو. لەگەڵ دەسپێکردنی جەنگی دووەمی جیهانی ماشێنی جەنگی هەردوو لایەنی بەشەڕ هاتوو زۆر زیاتر لەوەی جەنگی یەکەمی جیهانی پێویستیان بەسووتەمەنی هەبوو، بەجۆرێك کە بەرهەمی نەوتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست نەیتوانی پێویستیەکانیان دابینبکات و ناچاربوون داوای یارمەتی لەئەمەریکا بکەن.

دوای کۆتاییهاتنی جەنگ، ژمارەی ئەو کۆمپانیایانەی کە چالاکی نەوتیان دەکرد زۆر زیادیکرد. دوو جەمسەری بوونی جیهان، هاتنەدەرەوەی بەریتانیا لەڕیزی زلهێزەکان و دەرکەوتنی یەکێتی سۆڤێت و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، پێش هەرشتێك کاریگەری لەسەر بازاڕی نەوت و وڵاتە نەوتیەکان بەجێهێشت، بەو مانایەی کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەیویست هەر ڕاپەڕینێك کە خاوەنی ئامانجێك بێت بەمەبەستی پێچانەوەی دەسەڵاتی بەریتانیا سوودمەندبێت بەتایبەت دوای ئەوەی کە نرخ و گرنگی نەوت لەجەنگی دووەمی جیهانی بەتەواوەتی دەرکەوت. هەموو گۆڕانکاریەکان کە دوای جەنگی

دووەمی جیهانی لەرۆژهەلاّتی ناوەراست روویدا لەراستیدا لایەنێکی مەسەلەکە هەولّی ولاّتان بوو بۆ رزگاربوون لەقەیدوبوندێك کە هێزە رۆژئاواییەکان بۆ ئەمانیان دروستکردبوو، لەلایەکیترەوە خواستی پشتیوانی نێودەولّەتیشی هەبوو.

لەلایەکیترەوە، پێکهێنانی رێکخراوی ولاّتە نەوت فرۆشەکان لەئۆپیکدا بەشێوەیەك لەبەرامبەر کۆبوونەوەی ولاّتە پیشەسازیە رۆژئاواییەکان لەچوارچێوەی (ئاژانسی نێودەولّەتی ووزە) بازاری جیهانیان خستەژێر کاریگەریەوە، بەکۆتاییهاتنی ململانێکانی قۆناغی جەنگی سارد و بەسەرنجدان لەپەیامەکانی دوای جەنگی کەنداو و دەسکەوتنی ئاسانتری ئەمەریکا بەسەرچاوەی نەوتی عەرەبی بارودۆخی ئایندەی نەوت وادەبینرێت لەگەلّ رابردوودا جیاوازبێت.

گرنگی ژیانی و ستراتیجی رۆژانەی نەوت لەسەرەتای دۆزینەوەی و سوودلێوەرگرتنی تاجۆری پەیوەندی ناوەکی نێوان لایەنی ئابووری ئەم مادەیە وەك کالاّیەك لەلایەك و ئامرازی سیاسی کە بۆ بەدەستهێنان و بەردەوامی سوودوەرگرتن لێی بەکارهێنراوە، لەلایەکیترەوە دروستکردنی لەقۆناغە جیاوازەکاندا گونجاوە لەگەلّ هەلومەرجی ئابووری لەولاّتانی پیشەسازی و جولّەی پەیوەندی سیاسی نێوان جەمسەرەکانی جیهان، کە لایەنێك لەسەر لایەنەکەیتری زیاددەکات.

کارەکانی ئەم سیاسەتە لەولاّتانی تازەپێگەیشتوو بەتایبەت ولاّتانی خاوەن نەوتی رۆژهەلاّتی ناوەراست لەماوەی دەیەکانی رابردوودا زیاتر لەناوچەکانیتر هەستپێکرا بوو، کۆمپانیا گەورەکانی نەوتی ئەمەریکا کە دەستبەکارانی سەرەکی چالاکی دۆزینەوە و سوودوەرگرتن لەنەوت بوون و دواتریش پیشەسازی گەورەی نەوتی ئەمەریکایان دامەزراند، سەرکەوتوو بوون لەپێکهێنانی بالّی سیاسی بەهێز و خاوەن نفوز لەسیاسەتی گەورەی حکومەتدا، سیاسەتەکانیان بۆ بەدەستهێنان و کۆنترۆلّی سەرچاوەکانی نەوتی ولاّتانیتر لەوبەری ئۆقیانووسەکان خستەکار.

ولاّتانی حەوزەی کەنداو کە خاوەنی زیاتر لە(٦٥٪) یەدەگی نەوتی جیهانن، زیاتر لەناوچەکانیتر بوونەتە جێگای سەرنجی ولاّتە پیشەسازیەکان، کە بۆ بەردەوامیدان بەگوری پیشەسازیەکەیان پێویستیان بەدۆزینەوەی بەردەوام و مسۆگەریان بە سەرچاوەی نەوت هەیە. لەراستیدا لەکاتی دەرکەوتنی قەیرانە سیاسی و سەربازیەکان لەجیهاندا لەوانە قەیرانی عێراق لەگەلّ کوێت، سەرنجدان لەم ناوچەیە بەشێوەی جیاواز هەبوو، لەوانە ناردنی هێزی سەربازی و دەستتێوەردانی سیاسی نهێنی و ئاشکرا لەکاروبارەکانی ئەم ولاّتانەدا ئاسایتر و هەستپێکراوتر بووە.

باس لەبارەی ئاسایشی دابنکردنی ووزە لەجیهاندا نیگەرانیەکانی ولاّتانی پیشەسازی لەدەستنەکەوتنی بەردەوامی نەوت بەنرخی داواکراو، دیارترینیان قەیرانی نەوت لەسالّی (١٩٧٣) رەهەندی تازەتر و جدیتری بەخۆیەوە بینی.

ئێستا لەگەڵ گۆڕانکاری زۆر لەلایەنگیری و پێکهاتەی سیستەمی نێودەوڵەتی لەکاتی دروست بووندایە، ئەو نیگەرانیانەیە کە لەئەنجامی دابنکردنی خواست وخستنەڕووی نەوت پێویستە بەشێوەی بنەڕەتی چارەسەربکرێت و بنەمای پایەدارتر و بەردەوامتر لەجیهانی سیاسی و ئابووری بۆ دەیەکانی داهاتوو ڕێکبخرێت.

ئەم بابەتە گرنگیەکەی کاتێك زیاددەکات، کە دەرکەوت لەکۆی یەدەگی دڵنیایی نەوتی جیهان ڕێژەی (٢١٪) کەوتۆتە نیوەگۆی ڕۆژئاوا (واتە هەردوو کیشوەری ئەمەریکا) و (٧٩٪) کەوتۆتە نیوەگۆی ڕۆژهەڵاتەوە. وڵاتانی ئەندامی ئۆپێك زیاتر لە(٧٠٪) و وڵاتانی حەوزەی کەنداو نزیکەی لە(٦٠٪) یەدەگی دڵنیای نەوتی جیهانیان هەیە.

## پێگەی نەوتی عێراق :

یەدەگی دڵنیایی نەوتی عێراق دەگاتە سەد ملیارد بەرمیل، بە پێی چالاکی دۆزینەوەیی و بە سوودوەرگرتن لەئامێری پێشکەوتووی دۆزینەوە ئەم ژمارەیە لەوانەیە زیادبکات بۆ (١٨٠)ملیارد بەرمیل، بەتەواوکردنی چالاکی دۆزینەوە لە(٧٥) ناوچەی نەوتی کە تائێستا لەعێراق دۆزراوەتەوە، ناوچەی نەوتی کەرکوك و ڕومێلە تێکڕا (٢٢) ملیارد بەرمیل نەوتی یەدەگی تێدایە، یەدەگی دڵنیایی مەجنون نزیکەی (٢٠) ملیارد بەرمیلی تێدایە، لەسەرەتای هەڵگیرساندنی جەنگی عێراق ئێران لەلایەن سەدامەوە، قۆناغی لاوازبوونی پیشەسازی نەوت لەعێراق دەستیپێکرد، پچڕانی چەندجارەی ناردنی نەوت لەساڵانی جەنگ بووە هۆی کەمبوونەوەی بەرهەمی نەوت لە(٣,٨) ملیۆن بەرمیل لەڕۆژێکدا بۆ یەك ملیۆن لەدوای ئەیلولی ساڵی (١٩٨٠)وە، ئەم کەمبوونەوەیەی بەرهەم بۆ زیاتر لەپێنج ساڵ دریژەی هەبوو، ئەم کەمبوونەوەیە نە تەنیا بەهۆی لەدەستدانی پشکی عێراق لەبازاڕی نەوت نەبوو، بەڵکو لاوازی عێراق لەبەرهەمهێنانی نەوت کە بەئاشکرا پێوەی دیاربوو، لەکاتی جەنگی کەنداویش خواست لەسەر نەوتی ئۆپێك کەمبۆوە، بۆیە کەمبوونەوەی پشکی نەوتی عێراق لەبازارەکان لەبەرژەوەندی وڵاتانی ئۆپێکبوو.

## جەنگی دووەمی کەنداو و کاریگەریەکەی لەسەر توانای بەرهەمی نەوتی عێراق:

ئەمەریکا و هێزە هێرشبەرەکان لەجەنگی کەنداودا، دامەزراوە نەوتیەکانی عێراقیان بەشێوەیەکی حساب بۆکراو خستەژێر هێرشەکانیانەوە، زۆربەی خەسارەتەکان ئاراستەی بەندەرەکانی ناردنەدەرەوە دەکرا، کێڵگە نەوتیەکان زەرەری کەمتریان بەرکەوت، کێڵگە نەوتیەکانی باشوور زیاتر لەباکوور زەرەریان بەرکەوت، بەڵام گۆرزی کاریگەر لەپیشەسازی نەوتی عێراق لەدوای دانانی گەمارۆی ئابوری ڕێکخراوی نەتەوکان و وەستاندنی بەرهەمی نەوتەوە بەبەراورد گەورەتربوو لەگورزی جەنگ، هەڵبەت بەرپرسانی عێراق و هەندێك لەچاودێران لەوباوەڕەدان کە زۆربەی چاڵەکان نۆژەنکراونەتەوە و لەئێستادا توانای

بەرهەمهێنانیان زیاترە لەپێش جەنگ، لەماوەی ئۆپەراسیۆن سەربازی دژی عێراق، پیشەسازی پاڵاوتنیش بەتووندی گورزی بەرکەوت، بەتایبەتی سێ پاڵاوگە سەرەکیەکەی ئەم وڵاتە هێرشی قورسیان کرایەسەر. حکومەتی عێراق رایدەگەیەنێت کە نزیکەی (٨٠٪) پاڵاوگەکانی نۆژەن کردۆتەوە.

## سیاسەتی جیهانی و بارودۆخی ئایندەی نەوتی عێراق :

بابەتی ئایندەی نەوتی عێراق یەکێك لەمەسەلە گرنگەکانی ئەم وڵاتەیە، هەڵبەت بۆ پیشەسازی نەوتی دنیاش ئایندەی نەوتی عێراق نیگەرانی زۆر دروستدەکات، ئەم نیگەرانیە ئەوەیە کە چ وەختێك و چۆن گەمارۆی ئابوری لەسەر عێراق هەڵدەگیرێت و ئەمکارە چ کاریگەریەك لەسەر نرخی نەوت و پیشەسازیەکانی بەجێدەهێڵێت، بۆ بازاڕی نەوت و وڵاتانی بەرهەمهێنی نەوتی نۆپێك، کات و هەلومەرجێك کە لەچوارچێوەی گەمارۆی ئابوریەی نەوتی عێراق لەلایەن ئەمەریکا و رێکخراوی نەتەوەکانەوە هەڵوەشێتەوە زۆر گرنگ و هەستیارە، گومانیتێدا نییە کە لەدەسپێکردنەوەی ناردنەدەرەوەی نەوتی عێراق بۆ بازارەکانی جیهان کاریگەری نەگەتیفی دەبێت و پێویستە رێژەکەی گونجاو بێت لەکاتی هەڵوەشاندنەوەی گەمارۆی ئابوری و زیادبوونی داواکاری بۆ نەوتی خاوی نۆپێك، عێراق لەکاتێکدا ئەگەر بێتە بازارەوە کە پێویستی زۆری بەدراو و پارە هەیە بەهەر پێوەرێك کە بتوانێت نەوتی خۆی بەهەر نرخێك کە بازار بخوازێت دەنێرێتە دەرەوە، بەڵام لەکاتی ناردنەدەرەوەی عێراقدا کەمکردنەوەی بەرهەمی نەوتی خاوی نۆپێك پێویستی بەسیستەمی پشکبەندی ناردەنی دەکات، ئەوەی کە عێراق چ رێژەیەك لەنەوت و لە چ کاتێکدا دەتوانێت بنێرێتە دەرەوە، لەبنەرەتدا پرسیارێکی سیاسی دەکرێت، پرسیارێك کە زیاتر پەیوەستە بەجوگرافی سیاسی ناوچەکە و جیهانەوە، نەك بارودۆخی پیشەسازی نەوتەوە، لەراستیدا.ئەگەر عێراق خۆی لەگەڵ بریارەکانی رێکخراوی نەتەوەکان هاوئاهەنگ نەکات، هیچ جۆرە گۆرانێك لەسیاسەتی گەمارۆی ئابوری نێودەوڵەتی روونادات، بەتایبەت ئەوەی کە پەیوەستە بەمافەکانی مرۆڤەوە، سەرەرای ئەوە مەسەلەی جێبەجێکردنی بریارەکان لەلای عێراق دەبێت بەدیدی فراوانتری جوگرافی سیاسی سەیربکرێت، چونکە ئەم مەسەلەیە لەستراتیجی رۆژئاوادا لەناوچەی کەنداو جێگای هەڵوەشاندنەوە نییە. لەکاتی هەلگرتنی گەمارۆی ئابوری بەتەواوەتی و دەسپێکردنەوەی ناردنەدەرەوەی نەوت لەلایەن عێراقەوە، بەهۆی دارمانی بەشێکی زۆری دامەزراوە دەریاییەکانی ناردنەدەرەوەی نەوتی ئەم وڵاتە لەلایەن ئێرانەوە لەکاتی جەنگدا، جگە لە(٦٠٠) هەزار بەرمیل لەرۆژێکدا، عێراق تەنیا دەتوانێت بۆ ناردنەدەرەوەی نەوت سوود لەسێ بۆری نەوتی لەرێگای تورکیا و عەرەبستانی سعودی و سوریا وەربگرێت.

عێراق بۆ ناردنەدەرەوەی نەوتی خۆی دەتوانێت بەدوای تێپەربوونی کات و هەڵوەشاندنەوەی گەمارۆی ئابوری وردەوردە بگەرێتەوە بۆ ئاستی بەرهەم و ناردەنی پێشووی خۆی، بەمەرجێك کە توانای بەرهەمی نەوتی بەهۆی داخستنی بیرەنەوتەکانەوە کەمی نەکردبێت، تا ئاستێك عێراق بۆ دەسپێکردن

بەرووبەڕوو بوونەوەی کێشەی ئاسایشی لولە نەوتیەکانی خۆی، بەشێوەی گشتی عێراق توانای ئامادەسازی هەیە و پسپۆری هونەری ئەندازیارانی نەوتی عێراق لێبڕاوانە دەتوانن بەخێرایی کاریگەریان لەم بوارەدا هەبێت. لەهەمانکاتدا نۆژەنکردنەوەی هەموو سیستەمی نەوتی بەشی باشوور و هێڵی بۆری کە دامەزراوەکانی باشوور بەباکورەوە دەبەستێتەوە تێچونی کەمی دەوێت.

## جیوپۆلەتیکی کوردەکان:

شوێنی ژیان ونیشتەجێبوونی کوردەکان کەوتۆتە دامێنی چیاکانی ئارارات و زاگرۆسەوە، کوردەکان وەك یەکێك لەنەتەوە ئاریەکان، لەلایەك لەگەڵ لور* و فارسەکان و لەلایەکیتر لەگەڵ عەرەب و تورکەکان و لەبەشی چیاکانی ئارارات لەگەڵ ئەرمەنیەکان هاوسنورن. لەئێستادا تەنیا سێیەکی ئەم ناوچانە کەوتۆتە ئێرانەوە و بەشی سەرەکی و زۆری ئەم ناوچانە کەوتۆتە تورکیا و عێراقەوە، هەرچەندە ئەمڕۆ سنوری سیاسی ناوچە کوردنشینەکانی (کوردستان) بۆ پێنج بەش دابەشبووە. بەڵام ئەم ناوچانە لەپێشینەی مێژوویی خۆیدا بەمجۆرە نەبووە، لەژێر بێنەوبەرەی ئیمپراتۆری هخامەنشینی لەگەڵ یۆنانیەکان و ئاشکانیەکان و بیزەنتیەکان و دواتریش ئیمپراتۆری عوسمانی و سەفەویدابووە. دوو ڕووداوی مێژوویی جەنگی یەکەمی جیهانی و ساڵی (۱۹۱۹) لەشێوەگرتنی بارودۆخی فعلی ناوچە کوردنشینەکان ڕۆڵی کاریگەری هەبووە. لەپێش ئەوەدا شوناسی میللی چەمکێکی نەبوو، بەگشتی شوناسە نەتەوەییەکان لەچوارچێوەی سیستەمی ئیمپراتۆریدا کێشەیەکی ئەوتۆیان نەبووە، چونکە شوناسی نەتەوەیی لەگەڵ شوناسێکی فراوانتر کە لەلایەن هەموانەوە قبوڵ بوو (واتە شناسی ئایینی) نەك ناکۆك نەبوو، بەڵکو بۆ هەزاران ساڵ توانیویەتی کاری تایبەتی خۆی بکات. ئیمپراتۆری ئیسلامی چوارچێوەیەك بوو کە هەموو نەتەوە و شوناسە لاوەکیەکانی لەناوخۆیدا کۆکردبۆوە و لەگەڵ یەکتر دەژیان، هەرکەسێك لەهەر نەتەوەیەك بوایە دەیتوانی لەسەرەوەی ئەم هەرەمە جێگیر بێت، سەردەمانێك عەرەب، سەردەمانێك میسری و یان کوردێك هەروەك چۆن سەلاحەدینی ئەیوبی فەرمانڕەوایەتی گرتەدەست، لەم ڕووەوە ووتەزاکانی نەتەوەیی و نەژادی مەسەلەی لاوەکی بوون، بەڵام لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ڕەهەندە جیاوازەکانی شارستانیەتی ئەوروپا و هاوکات لەگەڵ بیری پەیوەست بەدەوڵەتی نەتەوەیی و نەتەوەگەرایی، هاوسەنگی نیسبی قۆناغی ڕابردووی ئیمپراتۆرە ڕۆژهەڵاتیەکان و لەناویشیاندا جیهانی ئیسلامی لەبەرژەوەندی بارودۆخی نوێی هاتنەناوەوەی ئەوروپا تێکدا. نەتەوە و گروپەکان هەوڵیاندا تادەوڵەتی نەتەوەیی دروست بکەن، هەرچەندە کە چەمکی نەتەوە لەناوخودی ئەوروپاش چەمکێکی ئاشکراو ڕۆشن نەبوو، سەرەڕای ئەوە کێشەکانی ناوخۆیی

---

*) هەموو بەڵگە مێژووییەکان دەیسەلمێنن کە لورەکانیش بەشێکی سەرەکین لە نەتەوەی کورد، وە خۆشیان پێیان وایە بەشێکن لەنەتەوەی کورد، بەڵام فارسەکان ئەم بەشە بە نەتەوەیەکی جیا لەکورد حساب دەکەن بۆ کەمکردنەوەی ڕێژە و ڕووبەری کوردستان لەناو خاکی ئێراندا. وەرگێڕ.

ئیمپراتۆری عوسمانی شەپۆلێکی ئازادیخوازی هێنایە ئاراوە و بەهەڵوەشاندنەوەی ئەم ئیمپراتۆریەتە کۆتاییهات. هەر لەسەرەتاوە سنور و مەرزەکانی دەوڵەتی نەتەوەیی وەك گرفتی سەرەکی نێوان تورکەکان، کوردەکان و عەرەبەکان دەرکەوت، لەگەڵ بوونی هەندێك ڕێکەوتن بەڵام هەرگیز نەیتوانی بەشێوەی کۆتایی و بەرەزامەندی هەردوولا چارەسەر بکرێت.

یەکێك لەفاکتەرە سەرەکیەکان کە بەربەستە لەبەردەم هەوڵی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بەخەباتی کوردەکان تێکەڵ بووە، بەتایبەتی قوڵی و ناجێگیری ئەم مەسەلەیەیە، هەرجۆرە ڕێگاچارەیەك بۆ جیابوونەوەی کوردەکان بەتایبەت لەقەڵەمڕەو و بەرژەوەندی هەردوو وڵاتی تورکیا و عێراق کارەساتبارە و بەشی زۆری کێڵگە نەوتیەکانی عێراق ئەوان خاوەنین و بۆ تورکیاش دەوڵەتی کوردی مانای لەدەستدانی تەواوی سنوری دەسەڵاتی تورکیای باشوورە، بێگومان کوردەکان بەبەڵگەی ڕیشەیی نەتەوەیی و فەرهەنگی لەگەڵ باقی نەتەوەکانی ئێراندا، بەبەشێکی هاوڕەنگی ئێران دەژمێردرێن و ئەو کێشەیەیان نییە کە لەگەڵ عەرەب و تورکەکان لە عێراق و تورکیادا هەیە*.

**مەسەلەی کورد لەعێراق :**

مەسەلەی کورد لەعێراق پەیوەستە بەدروست بوونی ئەم وڵاتەوە. هەر لەسەرەتای دروستبوونی دەوڵەتی عێراقەوە، جەنگی کورد و عەرەب دەستیپێکرد، لەماوەی سێ قۆناغدا (١٩١٥-١٩٢٥ ، ١٩٢٥-١٩٧٥ ، ١٩٧٦-١٩٩١) بەهێزبووە. هەڵبەت تاکاتێك حکومەتی عێراق پاشایەتی بوو، کوردەکان تا ڕادەیەك خودمختار بوون، بەڵام لەگەڵ کودەتای ساڵی (١٩٥٨)ی عبدالكريم قاسم و دروستبوونی ڕژێمی کۆماری، هەوڵی بەغدا بۆ کۆنترۆڵکردنی شارە کوردیەکان ڕووبەڕووبوونەوەی جدیتری وەرگرت. کوردەکان بۆ خۆڕێکخستنی باشتری خەبات لەگەڵ حکومەتی ناوەندی عێراق، لەساڵی (١٩٤٦) و بەدەستهێنانی خودمختاری، پارتی دیموکراتی کوردستانیان بەسەرۆکایەتی مەلا مستەفا دامەزراند، سەرئەنجام دوای ماوەیەك لەشەڕ و پێکدادان لەسەرەتای دەیەی حەفتاکاندا حکومەتی عێراق شێوەیەك لەخودمختاری (ئۆتۆنۆمی) بەکوردەکانی ئەم ناوچەیە بەخشی، بەڵام دواتر پەیوەندیەکانی نێوانیان گرژی تێکەوت، دوای دەستپێکردنی جەنگ و فراوانبوونی، لەئەنجامی پچراندنی یارمەتیەکانی ڕژێمی ئێران، شۆڕشگێڕە کوردەکان لەبەرامبەر حکومەتی ناوەندی شکستیان خوارد و بارزانی لەگەڵ (٢٠٠) هەزار کەس لەخەڵکی کوردستانی عێراق بوونە پەناهەندە لەئێران، دواتر گروپ و پارتیتر بۆ خەباتکردن لەم ناوچەیە دامەزران کە مێژووی هاوچەرخی کوردستانیان پێکهێنا.

---

* ) ڕاستە لەگەڵ فارسەکاندا لەڕووی نەژادەوە ئارین و لەڕووی زمانەوە هەردووکیان سەر بەزمانی هندۆئەوروپین، بەڵام لەڕووی ئازادی نەتەوەییەوە کوردەکانی ئێرانیش کێشەکانیان کەمتر نییە لەکێشەی کوردەکانی تورکیا و سوریا و عێراقی سەردەمی سەدام حسێن. وەرگێڕ.

لێرەوە کوردستان و مەسەلەی کورد دەتوانێت وەك فاکتەری هاوبەشی بەهێزی نێوان ئێران و عێراق ببێتەهۆی دەرکەوتنی قەیران و کێشەکان لەنێوان ئەم دوو وڵاتەدا، پێویستە لەسەرەتدا تایبەتمەندی ناوچەکانی کوردستانی عێراق و ئێران هەریەکەیان بەشێوەی جیا باس بکەین.

## کوردستانی عێراق :

کوردستانی عێراق یان (کوردستانی باشوور) لەڕاستیدا لەناو سنوری کوردەکانی ناوچەکەدا، پێگەی ناوەند و باشووری هەیە. ئەم بەشە ئەلقەی پەیوەندی نێوان کوردستانی تورکیا یان (کوردستانی باکور) و کوردستانی ئێران یان (کوردستانی ڕۆژهەلات) و ناوچەکوردنشینیەکانی سوریا (کوردستانی باشوری بچوك)ە.

کوردستانی عێراق خاکێکی دەوڵەمەند و شاخاوییە، کە بەشێکی بەدارستان داپۆشراوە و لەمزنجیرە چیاکانی زاگرۆس لەکوردستانی ئێرانەوە بەناراستەی چیاکانی تورکیا کۆتایی دێت. بەرزترین شاخی حەسارۆستە کە لوتکەکەی دەگاتە (٣٦٠٨م) کەدەڕوانێت بەسەر ڕێگای سەربازی (هاملتون) لەنزیك سنوری ئێران، لێژی شاخەکان بە ئاراستەی باشوور و باشووری ڕۆژئاوایە. دەشتە بەپیتەکانی (هەولێر و حەریر و شارەزور) کەوتۆتە ئەم دامێنانەوە، زنجیرە چیای نزم و رووتەن بەناوی (چیای حەمرین) دەشتەکانی کوردستان لەدەشتە لیتەییەکانی خواروو جیادەکاتەوە و سنوری سروشتی نێوان کوردەکان و عەرەبەکان پێکدەهێنێت.

ئاووهەوای دەشتەکان ئاووهەوای دەریای ناوەڕاستە و بارانیشی تارادەیەك زۆرە، بەلام ناوچە شاخاویەکان ساردە و بەفر دەیگرێتەوە، ڕووبارەکانی دیجلە و زێی گەورە و بچوك و دیالە کە کوردەکان پێیدەڵێن (سیروان) لێرەوە تێدەپەڕێت. شاخەکان بەتایبەت لەباکوری عێراق لەناوچەی بادینان بەداری بەڕوو داپۆشراون. هەندێك لەناوچەکان خاوەنی کانزای ئاسن و کرۆمن کە تائێستا بەشێوەی پێویست سوودی لێوەرنەگیراوە، سەرچاوەی سامانی ناوچەکە بێگومان نەوتە کە کورد هیچ داهاتێکی لێدەست نەکەوتووە.

ئەو سەرژمێریانەی لەناوچەکە کراوە واقعی نین، بەلام ئەوەی کە دەرکەتووە دانیشتوانی ناوچە کوردنشینەکانی عێراق کە لەساڵی (١٩٦٥) لەلایەن بەرپرسانی بەغداوە ئەنجامدراوە نزیکەی (٢٦٪) هەموو دانیشتوانی عێراق پێکدەهێنێت بەپێی ئەم سەرژمێریە دانیشتوانی هەموو عێراق (٨,٢٦١,٠٠٠) کەسە و دانیشتوانی ناوچە کوردنشینەکان (٢,١٤٧,٨٦٠) کەس بووە، لەزانیاریە ئاماریەکانی ساڵی (١٩٧٥)دا دانیشتوانی عێراق (١١,١٢٤,٠٠٠) کەس و ناوچە کوردنشینەکان نزیکەی (٣,١١٤,٧٢٠) کەس بووە. کە (٢٨٪) دانیشتوانی عێراق بووە.

لەزانیاریە ئامارییەکانی ساڵی (١٩٨٥)دا، دانیشتوانی عێراق گەیشتۆتە (١٣) ملیۆن کەس کە سەرژمێری ورد لەم ساڵەدا ئەنجام نەدراوە و لەسەرەتای ساڵی (١٩٩٥) ئامارە نافەرمییەکان دانیشتوانی ئەم وڵاتە بەنزیکەی (١٥ تا ١٦) ملیۆن کەس ڕاگەیاندووە.

ئەوەی کە دەتوانین پشتی پێببەستین ئەوەیە کە کوردەکانی عێراق (٢٨٪) هەموو دانیشتوان و خاکەکەی زیاتر لە (١٧٪)* هەموو خاکی عێراق پێکدەهێنێت، ڕێژەی لەدایکبوون و بەپێی لەلای کوردەکان بەبەڵگەی جیاواز (دابونەریت و ئابووری گوندی) بەرزترە لەباقی خەڵکەکانیتری عێراق، ڕێژەی گەشەی دانیشتوان لەم ناوچەیە زیاترە لە (٣٪) یە و لە کوردستانی تورکیا (٣,٢٧٪).

حکومەت عێراق لەسەرژمێریەکاندا تەنیا پارێزگا کوردیەکان باس دەکات کە پارێزگاکانی سلیمانی، هەولێر، دهۆك و کەرکوك دەگرێتەوە. لەکاتێکدا سێیەکی (٣/١) دانیشتوانی کورد لەپارێزگاکانیتری موسڵ، دیالە، سەلاحەدین، کوت و بەغدا نیشتەجێن.

چڕی دانیشتوان لەناوچە کوردیەکان بەگشتی زیاترە لەهەموو ناوچەکانیتری عێراق، زانیاریەکانی ساڵی (١٩٧٥) چڕی دانیشتوانی ناوچە کوردیەکانی بە (٣٩,٤کەس/کم٢) وە ناوچەکانیتری عێراق (٢٥,٣کەس/کم٢) پیشاندەدەن**. زیاتر لەنیوەی دانیشتوانە کوردنشینەکان لەگوندەکان دەژین***.

گەورەترین شاری کوردستانی عێراق کەرکوکە، کەخاوەنی گرنگترین ناوەندی حەوزی نەوتە لەعێراقدا، ژمارەیەکی زۆر تورکمان لەم شارەدا دەژی، کە ڕیشەیان لەگەڵ تورکەکانی تورکیا یەکە، هەولێر و سلێمانی بە ناوەندی فەرهەنگی نەتەوەی کوردستان دادەنرێن و زۆربەی دانیشتوانەکەی لەکورد پێکهاتووە، هەولێر بەپایتەختی ناوچە خودموختارەکە دادەنرێت.

دوای جەنگی یەکەمی جیهانی (سرئارنۆلد ویلسن)خاوەنی پلەی سیاسی باڵای بەریتانیا لەوتەیەکیدا ئەم ناوچەیەی ڕاگەیاند کە (کوردەکان نەدەیانەوێت لەژێردەسەڵات و نفوزی حکومەت

---

*) هەموو سەرچاوە عیراقیەکان ڕووبەری کوردستانی عێراق بە (٢٠٪) یان (٢١٪) ی ڕوبەری عێراق دادەنێن. وەرگێڕ.

**) بەپێی سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧) چڕی دانیشتوانە کوردنشینەکان (٢٠,٧کەس/کم٢) لەکاتێکدا لە عێراق (١٤کەس/کم٢) بوو. وەلە سەرژمێری ساڵی (١٩٨٧) چڕی گشتی هەرێمی کوردستان دانیشتوانە کوردنشینەکان بەرز بۆتەوە بۆ(٧٤,٨کەس/کم٢) لەکاتێکدا لە عێراقدا بووە بە (٣٧,٢کەس/کم٢) بوو. وەرگێڕ.

***) ئەم زانیاریەی سەرەوە ڕەهایە و بەبێ ئەوەی ئاماژە بۆ ساڵ بکات خراوەتە ڕوو، وە ناتوانرێت گشتاندنی بۆبکرێت بەسەر هەموو ساڵ و هەموو سەرژمێریەکاندا بۆنموونە ڕێژەی گوندنشین لەهەرێمی کوردستان لەساڵی (١٩٥٧) نزیکەی لە (٧١٪) دانیشتوان بووە. لە ساڵی (١٩٦٥) ڕێژەی گوندنشین هاتۆتەخوارەوە بۆ لە (٦٣٪) تێکڕای دانیشتوان. بەڵام ڕێژەی گوندنشین لە ساڵی (١٩٨٧) بەشێوەیەکی بەرچاو و نائاسایی کەمیکردوە بۆ (٣٠٪) کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سیاسەتە دڕندانە و نامرۆڤانەیەی سەدام و بەعس دژ بەگەلی کورد بەڕادەیەك کە لە دوای ساڵی (١٩٨٨) پرۆسەی ئەنفال بەدناو و ڕووخاندنی هەموو گوندەکانی کوردستانی عێراق ڕێژەی گوندنشین بەڕادەیەك کەمیکرد کە نزیك بوو لە سفرەوە. وە لەدوای ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٩١) و ڕزگاربوونی بەشێکی هەرێمی کوردستان و ئاوەدان بوونەوەی گوندە ڕووخاوەکان ڕێژەی گوندنشینان دوبارە زیادیکردەوە بەڵام کەمتر لەجاران وە بەپێی سەرژمێری نارەسمی ساڵی (٢٠٠٢) ڕێژەی گوندنشینان گەیشتۆتە لە (٢٠٪). وەرگێڕ.

تورکیادا بن و نە لەژێر فەرمانی حکومەت عێراقدا ... لەبیری دامەزراندنی کوردستانی سەربەخۆدان و لەناو کوردەکاندا لایەنگر زۆرە... نزیکەی هەموو کوردەکان سورن لەسەر ئەوەی کە پەیوەندی خۆیان لەگەڵ تورکەکان بپچڕێنن).

بەڵام حکومەتی بەریتانیا کە باڵادەستبوو بەسەر باروودۆخەکەدا. بەمەبەستی دەسکەوتنی نەوتی باشوری کوردستان، گوێنەدا بەخواست و نارەزوەکانی کوردەکان و بڕیاری دامەزراندنی حکومەتێکی لەهەر سێ ویلایەتی بەغدا و بەسرە و موسڵ دا. بەریتانیا بە ڕێکەوتن لەگەڵ فەرەنسا ناوی (عێراق)ی لەم وڵاتە ناو مەلیك فەیسەڵی کوڕی شریفی مەککەی وەك پادشای ئەم وڵاتە دەست نیشانکرد.

ویلسن لەبەرامبەر کۆمیتەی ڕۆژهەڵات لەلەندەن ئامۆژگاری حکومەتەکەی خۆی کرد لە(نیسانی ١٩١٩) کە ((هەموو ناوچەکانی کوردستان کە ئەمڕۆ ویلایەتی موسڵ پێکدەهێنن وە هەروەها هەموو ناوچەکانی باکووری ویلایەتی ناوبراو کە بڕیارە ببێتە بەشێك لەوڵاتی داهاتووی ئەرمەنستان، بەتایبەت ناوچەی ناوزێلی زێی گەورە ببێتە بەشێك لەعێراق ... بەڵام مەسەلەی پێدانی دەسەڵاتی خودموختاری بە کوردەکان باشترە نێمە مەسەلەکە بەدڵی خومان چارەسەربکەین و مەسەلەی دەوڵەت کوردی بەهیچ جۆرێك نەگرینە ئەستۆی خۆمان)).

بەڵام (پریزدنت ویلسن) سەرۆك کۆماری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، جەختی لەسەر دامەزراندنی سێ وڵاتی ئەرمەنستان، کوردستان و عەرەبستان کردەوە.

کوردەکان بۆ بەدەستهێنانی ئەو خواستەی بەریتانیا، جەنراڵ (شریف پاشا) یان بۆ بەدەستهێنانی مافەکانی کورد لەدامەزراندنی وڵاتێکی سەربەخۆ بۆ کۆنفرانسی ئاشتی ڕەوانە کرد، بڕیارنامەکانی ئەم پەیمانە لە(سیڤەر) لەبەندەکانی (٦٢ ، ٦٣ ، ٦٤) جەختی لەدامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ دەکرد... بەڵام لە(٢٣ ئاب ١٩٢١) ڕاپرسیەکی نیوە فەرمی کە لەوسێ ویلایەتەدا ئەنجامدرا و ئەمیر فیسەڵ وەك پاشای عێراق دەست نیشانکرا، ویلایەتی موسڵ کە زۆربەی خەڵکەکەی لەم ڕاپرسیەدا بەشداریان کرد و بە عێراقەوە پەیوەستکران، خواستی کوردەکان لەبەدەستەوەگرتنی حکومەتی کوردی بێبەرهەم مایەوە. لەساڵی (١٩٢٢) (مستەفا کەمال) کە دواتر بە(ئەتاتورك) ناسرا لەتورکیا بەیارمەتی تورکەکان و کوردەکان حکومەتی گرتەدەست و دوای سەرکەوتنی بەبیری کەمالیزم سەرقاڵی سەرکوتکردنی کوردەکان بوو، کە گورزێکیتر بوو بەر پەیکەری نیوەگیانی کورد لەناوچەکەدا کەوت. سەرکەوتنی سیاسەتی کەمالیستەکان وای لەهاوپەیمانەکان کرد لەساڵی (١٩٢٢) پەیمانی لۆزان ببەستن و کوردەکان وەك کەمینە لەدەوڵەتەکانی تورکیا و عێراق بناسرێنرێت...

بەڵام بەئاراستەی مسۆگەرکردنی مانەوەی عێراق لەڕووی ئابووری و بۆ دابینکردنی خواستەکانی بەریتانیا بڕیاردرا کە:

١) ولآتی عیّراق بۆ ماوەی (٢٥) ساڵ لەژێر سەرپەرشتی کۆمەڵەی گەلاندا بێت.

٢) خواستی نەتەوەی کورد لەبوارەکانی بەڕێوەبردن و دادوەری و پەروەردە و خوێندن لەسەر خاکی خۆیان بەدەستی خۆیان بێت و بەزمانی کوردی لەهەموو مەیدانەکانی چالاکی وەك زمانی فەرمی لەناوچەکە بەرگری لێبکرێت و ببێتە جێگای ڕەزامەندی.

لە(١٩٢٣) مۆڵەتیان بە کوردەکانی عێراقدا کە بەزمانی کوردی بخوێنن، بەلآم تەنیا لەناستی سەرەتاییدا و ئەمەش تەنیا لەپارێزگای سلێمانی و بەشێك لەپارێزگای هەولێر پەیرەویکرا، بلآوکردنەوەی تایبەت و کتێبی ڕێپێدرا و وەزیرە کوردەکان لەناو هەموو حکومەتەکانی کە لەم ولآتە دادەمەزرا دەیانتوانی بەشداری بکەن.

لەساڵی (١٩٣٠) پەیمانی تازەی نێوان بەریتانیا و عێراق، کۆتایی بە سەرپەرشتی (ئینتداب) بریتانیا هێناو سەربەخۆیی ڕواڵەتی بۆ ئەم ولآتەی بەفەرمی ناساند، لەم پەیمانەدا لەبارەی کوردەکانەوە هیچ قسەیەك نەکرا، لەئەنجامدا لەسلێمانی خەڵکی ڕاپەڕینیان بەرپاکرد، لە(٢٨ تەموز ١٩٣٢) بابەتەکە گەڕایەوە بەردەم کۆمەڵەی گەلآن... بەلآم ئەنجامەکان بەپێی بەخواستی شۆڕشگێران نەبوو.

لە(٨ تەموزی ١٩٣٧) حکومەتەکانی تورکیا و ئێران و عێراق پەیمانی سعدئابادیان واژۆکرد. مادەی حەوتی ئەم بەڵگەنامەیە بایەخدەدات بە﴿پێکهێنانی و چالاکی کۆمەڵەکان و ڕێکخراوەکان، یان گروپە چەکدارەکان بە مەبەستی بەدیهێنانی دامەزراوەی جێگیر (لەو ولآتانەی واژۆیانکردووە) لەناوبەرن﴾، بەواتایەکی ڕوون و ئاشکرا مەبەستیان لەبزووتنەوەی کوردی بوو.

لەساڵی (١٩٤٣) مستەفا بارزانی دووبارە لەبارزان لەباکوری عێراق، ڕاپەڕین و شۆڕشێکی فراوانی هەڵگیرساند، سوپای عێراق نەگەری تێکشکانی هەبوو بۆیە بەناچاری لەناوچەیەکی فراوانی هەولێر و بارزان کشایەوە، لەساڵی (١٩٤٥) هێزی ئاسمانی شانشینی بەریتانیا توانی شۆڕشگێرانی کورد بۆ ئێران هەڵبرێت. کە لەساڵی (١٩٤٦) کۆماری دیموکراتی خودموختاری مهاباد لەکوردستانی ئێران دامەزرابوو، یەك ساڵ دواتر ئەم کۆمارە بچکۆلەیە شکستی خوارد و لە(حوزەیرانی ١٩٤٧) بارزانی و ژمارەیەك لەباشترین ئەندامانی دەستەکەی لەنێوان هێڵی دوژمنانی کە لەڕووی ژمارە و چەکەوە لەوان باشتربوون لەناوچە شاخاویەکانی باکوری ئێران و ڕۆژهەلآتی تورکیادا خۆیان گەیاندە یەکێتی سۆڤێت، ژمارەیان نزیکەی پێنج سەد کەس دەبوو کە یەکێتی سۆڤێتی پێشوو مافی پەنابەری بەبارزانی و هاوڕێکانیدا بۆ ماوەی یازدە ساڵ لەم ولآتە مانەوە.

دوای کۆتاییهاتنی جەنگی دووەمی جیهانی، بەرهەڵستکارانی سەرەکی حکومەت عێراق لەسێ پارتی چەپدا چالاکیەکانیان چڕ کردبۆوە. پارتی کۆمۆنیستی عێراق (حزبی شیوعی عیراق) کە لەکورد و

عەرەب و کەمینەکانیتر پێکهاتبوو. پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق: کە هەموویان کورد بوون، حزبی دیموکراتی نیشتمانی: هەموو بەرهەڵستکاران خوێندەوارانی چەپگەرا بوون.

پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق: ئەم پارتە لەسەر ڕاسپاردەی مستەفا بارزانی و بەپێی بنەما و پەیڕەوی حزبی دیموکراتی کوردستان ئێران دامەزرا و پارتی ناوبراو پەیڕەوەی لەمارکسیزم/لینینیزم دەکرد و ئامانجی ئازادی کوردستان و نەتەوەی کورد و بەدیهێنانی دیموکراتی بۆ عێراق بوو.

لە(١٤ تەموزی ١٩٥٨) عبدلکریم قاسم ڕژێمی پاشایەتی ڕووخاند و ڕژێمی کۆماری ڕاگەیاند. لەم کودەتایەدا کە بەشۆڕش ناودەبرێت. پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق پشتیوانی لێکرد و دەستوری کاتی عێراق کە لە(٢٧ تەموز) بلاوکرایەوە ئازادی سیاسی سەر لەنوێ بەرقەرارکرد. سەبارەت بەکوردەکان ڕایگەیاند کە:

((کۆمەڵگای عێراقی بیناکراوە بە هاوکاری نێوان هەموو ئەندامانی و ڕێز لەمافەکان و ئازادەیەکانیان دەگیرێت، عەرەب و کورد لەم ولاتەدا هاوبەش و یەکسانن، دەستور مافی نەتەوەیی ئەوان لەناو عێراقێکی یەکپارچەدا دابین دەکات)). (مادەی ٣).

قاسم پارتی دیموکراتی کوردستانی یاسایی ناساد و ڕاگەیاند، لەگەڕانەوەی مستەفا بارزانی لەیەکێتی سۆڤێت ئەو وەك قارەمان پێشوازی لێکرد و بلاوکردنەوەی (١٤) ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردی لەوانە خەبات، ژین، هەتاو، ئازادی ... ڕاگەیاند.

بەلام ئەم ئازادیە بۆ نەتەوەی کورد و عەرەب زۆر بەردەوام نەبوو، لەساڵی (١٩٦٠) چالاکی پارتە کوردیەکان قەدەغەکرا، قاسم خودختاری کوردەکانی هەڵوەشاندەوە و بەرپرسانی بلاوکراوە و ڕێکخراوە کوردیەکانی خستەژێر چاودێری و ئازارەوە.

کوردەکان بەسەرۆکایەتی بارزانی هەنگاوی تۆلەسێنانەیان دژی قاسم ڕێکخست و ژمارەی پێشمەرگەکانی خۆی گەیاندە (٢٠٠٠٠) کەس و زۆربەی ناوچە کوردنشینەکانی باکوری عێراقیان ئازاد کرد و دەزگای بەڕێوەبردن و فەرماندەیی تایبەتیان تێدا دامەزران، عبدلکریم قاسم توانای خەلکی کورد و ڕاپەڕینەکەی بێبایەخکرد، جەنگ لەگەڵ کوردەکان ئەوی لەڕووی سەربازی/سیاسی زۆر لاوازکرد و لەکۆتایدا ڕوخاندنی ئەوی لێکەوتەوە.

بەلام ناکۆکی لەڕووی بنەما و چۆنیەتی هەنگاوەکان لەدژی قاسم لەنێوان دوو پارتی بەرهەڵستکار (حزبی شیوعی عێراق و پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق) سەریهەڵدا و لەئەنجامدا لەبەرژەوەندی حزبی بەعس کەوتەوە، لە(٨ شباتی ١٩٦٣) ئەفسەرانی بەعسی، حکومەتی قاسمیان ڕوخاند و حکومەتێکی درندەیان بەسەر خەلکی کورد و عەرەبدا سەپاند کە تا ئێستا بەردەوامە (ساڵی ٢٠٠٣). دوای ڕوخانی قاسم، عبدالسلام عارف (کە خۆی بەعسی نەبوو) بووە سەرۆك کۆمار و احمد حسن بکر بەسەرۆك وەزیران،

لەهەمان سەردەمدا لە(حزیرانی ۱۹٦۳) ئۆپەراسیۆنێکی دڕندانە دژی کوردستان دەستپێکرد، کوشتاری بەکۆمەڵی کوردەکان و بەرنامەی بەعەرەبکردنی ناوچە کوردیەکان لەناویاندا پارێزگای کەرکوك و دەرکردنی کوردەکان و دورخستنەوەیان لەهەنگاوە سەرەتاییەکانی حکومەتی عێراق بووە.

لەساڵی (۱۹٦٥) عبدالسلام عارف لەئەنجامی کەوتنەخوارەوەی هلیکۆپتەرەکەی کوژرا و براکەی جنراڵ عبدالرحمان عارف جێگای ئەوی گرتەوە و بەردەوامبوو لەسەر جەنگ لەکوردستاندا، لە(۱۷تەموزی ۱۹٦۸) احمد حسن بکر سەرۆك وەزیری سەردەمی عبدالسلام کە لەکارخراو بوو لەکودەتایەکی خوێناویدا دەسەڵاتی گرتەدەست و سەدام حسینی وەك جێگری خۆی هەڵبژارد.

لە(نیسانی ۱۹٦۹) رژێمی تازە چوارەمین جەنگی لەکوردستان دەستپێکرد، کە لەئەنجامدا رێکەوتنی (۱۱ئازاری ۱۹۷۰)ی لێکەوتەوە، دانوسانە دورودرێژەکەی نێوان بارزانی و احمد حسن بکر بەپێی ئەم رێکەوتننامەیە ئاوا راگەیەنرا بوو:

(بەفەرمی ناساندنی نەتەوەی کورد، بەفەرمی ناساندنی زمانی کوردی وەك زمانی پەروەردە و خوێندن، هەڵبژاردنی بەرپرسانی شارەکان لەلایەن کوردەکانەوە، هەڵبژاردنی یەکێك لەجێگرانی سەرۆك کۆمار لەلایەن کوردەکانەوە.....).

لە(۹شباتی ۱۹۷۳) ئاگربارانی ناوچە کوردنشینەکان لەلایەن حکومەتی عێراقەوە دەستپێکرد کە خۆی سەرەتابوو بۆ کۆچ و دەرکردنی کوردەکان لەباکوری عێراق، لەساڵی (۱۹۷٤) کرێکاران و تەکنیککارانی کورد لەکۆمپانیای نەوتی کەرکوك دەرکران، بارزانی لەدوو کاری تیرۆرستی رزگاری بوو.

لەساڵی (۱۹۷٤) کۆمیتەی حزبی شیوعی عێراق کەوتە ژێر فشارەکانی حکومەتەوە و پشتی لەپارتی دیموکراتی کوردستان کرد و ئەوچەکانەی لەیەکێتی سۆڤیێتی دەستکەوتبوو دژی کوردەکان بەکارهێنا، لەم هەلومەرجەدا بارزانی پەیوەندی دووبارەی لەگەڵ تاران بەست.

لەرووی ئابووریەوە کوردستان بووە شوێنی وەبەرهێنانی حکومەت بەعس و سیاسەتی فەرق و جیاوازی لەهەموو عێراقدا لەلایەن بەعسیەکانەوە جێبەجێکرا.

توانا پەروەردەیی و تەندروستیەکان لەناوچە کوردنشینەکان بەراورد نەدەکرا بەناوچەکانیتر، رێژەی قبولکردنی خوێندکارانی کورد لەزانکۆ کەمتربوو لە(٦٪)، وەگیران لەکۆلێجە سەربازی و شارەداریەکان کەمتربوو لە(۲٪) و تەنیا (۳تا٤٪) لەخوێندکارانی کورد یارمەتی خەرجی خوێندنیان وەردەگرت، لە(۵۰۰) دیپلۆماتی پەیوەست بەوەزارەتی دەرەوە تەنیا (۱۰) کەسیان کورد بوون.

سەبارەت بەبارودۆخی ئابووری فەرق وجیاوازیەکە زۆر نامرۆڤانەتر بوو، لەناوچە کوردنشینەکان تەنیا (۷ تا ۱۲٪) ی بودجەی ئاوەدانکردنەوەی عێراق دەیگرتەوە، لە(۱۵۰) پرۆژەی ئاوەدانکردنەوەی عێراق تەنیا چوار پرۆژەیان بۆ کوردستان رێکخرا بوو، پرۆژەی پیشەسازیە پۆڵاکان تەنیا تایبەت بوو

بەعێراقی عەرەبی لەکاتێکدا خاوی ناسن لەکوردستان دابین دەبوو، پالاوگەی نەوت بۆ نەوتی کەرکوك، لەناوچە عەرەبیەکان دامەزراوە، بارودۆخی ڕێگاوبان لەکوردستان زۆر خراپ و نالەبارە.

لەبواری کشتوکاڵیدا بەرهەمی سەرەکی توتنی عێراق لەکوردستان بەرهەم دەهێنرێت بەڵام کڕینی قۆرخکراوە بۆ حکومەت، کە نزیکەی (٨٥٪)ی ئەم بەرهەمە دەنێردرێت بۆ عەرەبستانی سعودی و کوێت، لەم بوارەدا قازانج بۆ حکومەتە نەك بۆ کوردەکان.

سەبارەت بەنەوت: بەشی زۆری بەرهەمی نەوتی عێراق دەکەوێتە کەرکوك و خانەقین و عەینزالەوە، کە هەرسێکیان بەشێکن لەکوردستانی عێراق، نەوتی دەرهێنراوی ئەم سێ کێڵگەیە بەسێ بۆری لەخاکی سوریاوە دەگەیەنرێتە بەندەری بانیاس و تەرابلسی لوبنانی لەسەر دەریایی ناوەڕاست (نیستا ئەم هێڵە داخراوە و لەکارکەوتووە). سێ هێڵی بۆریتر کێڵگەکانی نەوتی ڕمێلە و زبێری نزیك بەسرە دەگەیەنێتە بەندەری فاو لەسەر کەنداو.

ناوچە کوردنشینەکان زیاتر لە(٨٠٪) بەرهەمی نەوتی پێکدەهێنن، ناردەنیی ئەم نەوتە زیاتر لە(٤٠) ملیۆن تەنە لەساڵێکدا و نزیکەی (٧٦٪) داهاتی دەوڵەت و (٩٠٪) هەموو ناردەنی ئەم وڵاتە پێکدەهێنێت. نەوتی کەرکوك بەتەنیا (٧٠٪) بەرهەمی نەوتی عێراق پێکدەهێنێت*.

لەگەڵ ئەوەی کە داهاتی گشتی لەڕێگای نادنەدەرەوەی نەوتی کوردستان دەست دەکەوێت بەڵام هەموو سودو کەڵکەکەی بۆ عێراقی عەرەبیە و پەرەپێدانی ئەو ناوچانەیە و بەکاردەهێنرێت بۆ کڕینی چەك، ئەوەی تا ئەمڕۆ بەر ناوچە کوردنشینەکان کەوتووە تەنیا شەڕو ماڵوێرانی و نائارامییە.

لە(٨/ئازار/١٩٧٤) سەدام حسین بۆ ڕێگرتن لەهەڵگیرسانەوەی شۆڕشی کوردەکان، کوڕەکەی بارزانی (ئیدریس) بانگرد و کەوتە گفتوگۆی دوورودرێژ و نهێنی و بڕیاربوو کە ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی بەعس یاسای تایبەت بەئۆتۆنۆمی کوردستان بڵاوبکاتەوە، لەدوایدا (پارتی دیموکراتی کوردستان پەردەی هەڵدایەوە لەسەر ناوەڕۆکی گفتوگۆکان و ڕێکەوتنی خۆی لەگەڵ حکومەتی بەعس ڕاگەیاند هەرچەندە گرفتی زۆر لەسەر ڕێگای جێبەجێکردنی بەندەکاندا هەبوو، لەکوردستان بڕیاردرا (١١ئازار) سنوری ناوچە کوردنشینەکان لەگەڵ سەرژمێری کە بڕیاربوو بکرێت ئەنجامبدرێت. ناوچەکە وەك بەشێکی جیانەبووەوە لەعێراق دەستنیشان کرا. ئۆتۆنۆمی ڕاگەیەندرا لەچوارچێوەی یاسایی و سیاسی و ئابووری کۆماری عێراقدا.

بەپێی ئەو ڕێکەوتنە، سەرژمێری گشتی کۆسپی کەوتە بەردەم و هەرنەنجام نەدرا. حکومەتی بەعس لەشەش بەشی ناوچەی کەرکوك تەنیا دوو بەشی (کەلار و چەمچەماڵ) وەك بەشێك لەناوچەی ئۆتۆنۆمی ناساند، تەنیا پارێزگاکانی هەولێر و دهۆك و سلێمانی بەناوچەی کوردنشین (لەناو ئۆتۆنۆمی

---

*) ئەم ژمارانە تاڕادەیەك کۆنە. وەرگێڕ.

کوردستان ـ وەرگێڕ) دانا، حکومەت لەپێدانی هەرجۆرە مافێکی دادوەری و یاسایی و پۆلیس و سوپا سەرپێچی کرد، لەژمارەی (٨٠) کەس لەئەنجومەنی یاسادانانی ناوچەی کوردستان (ئۆتۆنۆمی) (٧٢) کەسیان لەلایەن احمد حسن بکرەوە دادەنرا.

کوردەکان بەناوی ئۆتۆنۆمیەوە جارێکیتر فریویان خوارد. لەدوای دەرکردنی بەکۆمەڵی کرێکارە کوردەکان لەپیشەسازی نەوتی کەرکوک و ڕوخاندنی گوندە کوردیەکانی کەرکوک و دەرکردنی دانیشتوانەکەی، شۆڕش و سەرهەڵدان ناوچەکەی گرتەوە، پازدە ڕۆژیان مۆڵەت بەبارزانیدا کە فەرمانی ژمارە (٣٣) ئەنجومەنی سەرۆکایەتی شۆڕشی بەعس قبوڵبکات، ئەم داواکاریە لەلایەن کوردەکانەوە بەرپەرچدرایەوە و ڕادیۆیی کوردستان ڕایگەیاند کە (تا بەدیهێنانی هەموو مافەکانی خەڵکی کوردستان خەبات بەردەوام دەبێت). لەسەر داوای پارتی دیموکراتی کوردستان زیاتر لە(١٠٠٠٠٠) کوردی نیشتمان پەروەر لەشارە جیاوازەکانی کوردستانەوە ڕوویانکردە (ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستان) کە ژمارەی دانیشتوانیان دەگەیشتە (١,٥) ملیۆن کەس. لە(١١ی ئازار)دا پێنج وەزیری کورد وازیانهێنا و بەرەو بارەگاکانی پارتی لەدۆڵی چۆمان ڕۆیشتن و جەنگە لەکوردستان دەستپێکرد.

سیاسەتی بەعرەبکردن توندتربوو، توندوتیژی پۆلیس (مەبەستی ئەمنە ـ وەرگێڕ) و فشاری سوپا دەیەها هەزار گوندنشین و شارنشینی ئاوارەکرد، ڕەوتی کۆچکردن زیاتر بەرەو بادینان و دۆڵی چۆمان بوو. فەرماندەیی سوپای کوردستان ناچاربوو بەشێك لەم ئاوارانە لەرێگای یارمەتی شێروخورشیدی ئێرانەوە بگوێزێتەوە بۆ ئێران ئەمە سەرەتای دەستپێکردنی کێشەکان بوو بۆ پەنابەرە کوردەکان لەئێران، کۆچکردن لەئەنجامی گەمارۆی ئابوری کە سەدام خستبوویە سەر ناوچە ئازادەکانی کوردستان خێراتربوو، ئاوارەکان لەهیچ جۆرە ئاسانکاریەکی تەندروستی و خۆراکی سوودمەند نەبوون، بڕینی ڕێگای دوری شاخاوی لەگەڵ ئاووهەوای سارد و بەفراوی و بڵاوبونەوەی نەخۆشی زیاتر لەنیوەی کۆچەرانی لەپەلوپۆخست، لەگەڵ ئەوەشدا بۆردومانی حکومەت عێراق بەسەختی بەردەوامی هەبوو، ژمارەی پەنابەران لەئێران لەکۆتایی جەنگدا لە(ئازاری ١٩٧٥) گەیشتبووە (٣٠٠) هەزار کەس.

بەغدا زیاتر لەهەشت لەشکری (نزیکەی ١٢٠هەزار سەرباز) لەسوپای خۆی بەهەموو پێویستی و کەلوپەلێکی زەمینی و ئاسمانیەوە بۆ سەرکوتکردنی کوردستان ئامادە و بەکارهێنا.

لەگەڵ ئەوەی لەم جەنگەدا کوردەکان زیانی گیانی وماڵی زۆریان بەرکەوت بەڵام هیچ وەختێك لەبەرامبەر سوپای عێراقدا خۆیان نەدا بەدەستەوە، بەڵام لەدوای ڕێکەوتنێکی جیهان (ڕێکەوتننامەی ١٩٧٥ی جەزائیر) ئەوەی لەماوەی جەنگەکانی ڕابردوو تاناستێك بەدەست هاتبوو بەیەکجاری لەدەستیانداو دەست بەتاڵ بوون و جارێکیتر بوونەوە بە قوربانی سیاسەتی پشتبەستن بەدراوسێی دەرکی و پەنابردن بۆ هێزی دەرکی.

له(١٩/٤/ ١٩٧٢) پەیماننامەی دۆستایەتی لەنێوان عێراق و یەکێتی سۆڤێت بەسترا، یەکێتی سۆڤێت لەبەرامبەر بەکارهێنانی بەندەرە عێراقیەکان بۆ کەشتیگەلەکانی، پەیمانی پێدانی چەك و پسپۆری سەربازی بەم وڵاتەدا، دوای واژۆکردنی ئەم بڕیارە یەکێتی سۆڤێت خیانەتی لەئامانجی کوردەکان کرد کە پارێزەی سۆسیالیزم بوون، بارزانی دەستەیەکی بۆ گلەیی و شکات بۆ مۆسکۆ ڕەوانەکرد بەڵام بێئەنجام بوو. لەکۆتایی ساڵی (١٩٧٢) چەکی ڕووسی هاتە ناو عێراقەوە، لەدوای ئەوە بارزانی بڕیاری هاوپەیمانێتی لەگەڵ شای ئێراندا، لەم بوارەدا ڕۆڵی دەزگای هەواڵگری ئەمەریکای (CIA) و حکومەتەکەی نیکسون گرنگ بوو، شای ئێران داوای لەسەرۆك کۆماری ئەمەریکا کرد کە یارمەتی کوردەکان بدات تا ژیان لەدراوسێ و دوژمنەکەی تاڵکات (بەهۆی لادانی عێراق بەرەو یەکێتی سۆڤێت)، مستەفا بارزانی و هاوڕێکانی بەجۆرە ناچاربوو پێشنیازەکانی یارمەتی سەربازی شا قبوڵ بکەن، هەرچەندە بارزانی بەهیچ جۆرێك متمانەی بە ئێران نەبوو، دەوڵەتی ئێران یارمەتیەکانی خۆی بۆ کوردەکان دەسپێکرد و ئەمەریکا (١٦) ملیۆن دۆلاری خستە خزمەت کوردەکانەوە، کە لەبەرامبەر یارمەتیەکانی شا کەمبوو، بەڵام ئەمکارە پڕۆژەیەکی ئەمەریکا و نیکسۆن بوو بۆ فشار خستنەسەر عێراق نەك یارمەتیدانی کوردەکان.

وتەکانی (پایك) لەکۆنگرێسی ئەمەریکا له(١٩/١/١٩٧٦) دەریدەخات کە (ئەسەرۆکی وڵاتێکی دەرەوە (واتە شا) ئەسەرۆك کۆمار و ئەتیۆرەکەی کیسینجر، هیچ یەکێکیان لایەنگری سەرکەوتنی لایەنی یارمەتیداراو (واتە کوردەکان) نەبوون، ئەمانە تەنیا ئومێدەوار بوون کە شۆڕشگێڕان بتوانن دوژمنایەتی لەناسێکدا ڕابگرن کە سەرچاوە و تواناکانی وڵاتی دراوسێ ڕابگرێت) لەیاداشتی (٢٢/٢/١٩٧٤) (CIA) دا لەقسەکانی (پایك)دا بەجۆرە هاتووە: (ئێمە لەوباوەڕەداین کە شای ئێران بەهیچ جۆرێك لایەنگری دامەزراندنی حکومەتێکی خودمختاری کوردنییە، هەم ئێران و هەم وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئومێدەوارن لەم بارودۆخەی کە ئەگەری چارەسەر کردنی نییە ببێتەهۆی دەستهەڵنەگرتنی کوردەکان لەشوێن و پێگەی نیمچە سەربەخۆی خۆیان، سوودوەربگرن لەلاواز کردنی عێراق، نە ئێران و نە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هیچ یەکێکیان ئارەزووی ئەوە ناکەن کە کێشەکان بەرەو چارەسەر بەرن... شای ئێران یارمەتیەکانی بۆ کوردەکان وەك کارتێك دەبینێت تا لەناکۆکی لەگەڵ دراوسێکانی سوودی لێوەربگرێت...).

بەم بڕیار و کارانە کوردەکان بەیارمەتی ئێران کەوتنە شەڕ و شۆڕشی خۆیان لەناوچە کوردنشینەکان درێژە پێدا و حکومەت عێراقیان ڕووبەڕووی کێشەی جدی کردەوە، حکومەتی عێراق بارودۆخەکەی بەزەرەری خۆی و سوودی کوردەکان دەبینی داواکاری پەیوەندی بەستن بوو لەگەڵ ئێراندا کە لەو ڕێگایەوە بتوانێت پارێزگاریکردن و یارمەتی ئێران بۆ کوردەکان کەمبکاتەوە و لەم بوارەدا ڕۆڵی میسر و جەزائیر نابێت نادیدە بگیرێت. لەئەنجامدا لەخولی کۆنفرانسی ئۆپیك له(٦/٣/١٩٧٥) لەجەزائیر

ڕێکەوتن لەنێوان ئێران و عێراق ئەنجامدرا و شای ئێران بڕیاریدا کە سنورەکانی لەگەڵ عێراق لەناوچەکانی کوردستان و دەربەندە شاخاویەکان کە شوێنی پەرینەوەی پێشمەرگە کوردەکان بوو داخات و ڕێبگرێت لەهاتنەناوەوەی کوردەکان بۆناو وڵاتەکەی ﴿ئەو کوردانەی کە پێشتر شا بەقارەمانی نەتەوەیی ناوی دەبردن و دەیووت ( برا کوردەکانمان، ئەو ئاریە جەنگاوەرانەن و نوکی ڕمی نەتەوەی ئارین)﴾.

عێراق ڕازیبوو سنوری نزیك عەبادان کە دوای ڕێکەوتننامەی (١٩١٣) ی نێوان ئێران و عوسمانی بەناوەڕاستی شەتلعەرەبدا تێدەپەڕی و لەساڵی (١٩٣٧) بەیارمەتی بەریتانیا بووە بەشێك لەخاکی عێراق، لەم ڕێکەوتنەدا هێڵی تالوگ دیاریکرا کەناری ڕاست بەئێران و کەناری چەپ بەعێراق درا، سەرۆك کۆماری جەزائیر (هاواری بۆمەدین) هەتا گروپێك لەئەفسەرانی خۆی بۆ داخستنی سنورەکانی ئێران بەڕووی کوردەکاندا ڕەوانەی ناوچەکە کرد. (پایك) دەنوسێت : (CIA ماوەیەك پێشتر ئاگاداربوو کە هاوپەیمانەکەمان واتە (شای ئێران) لەکاتێکدا ئەگەر بتوانێت سەبارەت بەململانێکانی سنور لەگەڵ دوژمنەکەی خۆی واتە (عێراق) ڕێکەوێت، گروپی نەتەوەی ناوبراو واتە(کوردەکان) وازلێدێنێت).

کیسینجر دەنوسێت (کوردەکان کارتێکن یاریان پێدەکرێت و ژتونێکن* لەناو یاریدا دەگۆڕدرێنەوە).

لەکاتی ڕێکەوتنی بڕیارنامەی جەزائیردا، بارزانی لەتاران بوو، شا دوای ئەوەی گەڕایەوە لەجەزائیر سێ ڕێگای خستەبەردەمی سەرکردەی کورد بارزانی:

١) پێش کۆتاییهاتنی ئەم مانگە و بەسەرچوونی ماوەی لێبوردنە گشتیەکەی کە بەغدا دەریکردبوو خۆیبدات بەدەستەوە.

٢) لەئێران ببێتە پەنابەر.

٣) دوای داخستن و کۆنترۆلکردنی سنورەکان لەلایەن ئێران و عێراق و جەزائیرەوە بەجۆرێك کە ڕێکەوتنەکە بڕیاری لێداوە درێژە بەجەنگی پارتیزانی بدات.

بارزان لەتارانەوە تەلەگرافێکی ڕەمزی (جفرە) نارد بۆ کۆمیتەی ناوەندی پارتەکەی کە بڕیار بدەن، پارتی بڕیاری درێژەدانی جەنگیداوە بەشێوەی پارتیزانی، بەڵام لە(١٩٧٥/٣/١٨) بارزانی لەدانشتنێکی فراوانتردا بڕیاری خۆی گۆڕی بڕیاریدا درێژە بەجەنگ نەدات و بۆ ناو خاکی ئێران پاشەکشێ بکات، چونکە تورکیا لەگەڵ عێراق ڕێکەوتوون کە عێراق ئەوت بەهەرزان بدات بەتورکیا و لەبەرامبەردا تورکیا سنورەکانی خۆی بەڕووی کوردەکاندا داخات.

---

*) پولێکە یان فیشێکە کە لە قوماردا لە جیاتی پارە دادەنرێت . وەرگێر.

کۆچکردن بەرەو ئێران دەستپێکرد، نزیکەی (٤٠) هەزار پێشمەرگەی کورد و زیاتر لە(١٠٠) هەزار کەس لەخەڵکی ئاسایی کوردستان بەرەو ئێران کۆچیان کرد، بەڵگە بۆ ئەم بڕیارەی بارزانی چی بوو؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لەباسەکەی ئێمەدا جێگای نییە.

لەسەرەتای مانگی (مایس ١٩٧٦) لەنێوان یەکە سەربازیەکانی سوپای عێراق و پێشمەرگە کوردەکان پێکدادانێك ڕوویدا، بەشی زۆری پێکدادانەکان لەناوچەکانی بادینان، ئامێدی، دهۆك، زاخۆ ڕوویدا، هێزی ئاسمانی عێراق زۆربەی ناوچە کوردنشینەکان کە جێگای کۆبوونەوەی پارتیزانەکان بوو لە(سورداش و ناوچەی ڕەواندز و ناوچە شاخاویەکانی دەوروبەری خانەقین و پارێزگای سلێمانی بۆردوومان کرد، لەناوەڕاستی حزیرانی ساڵی (١٩٧٦) پارتیزانەکان دامەزراوەی نەوتی چەمەبۆریان (جمبور) تەقاندەوە.

پارتیزانەکانی کە لەکوردستان چەکیان هەڵگرتبوو بەشێوەی خۆجۆشدان و بێ پەیوەندی و ڕاوێژ لەگەڵ ڕێکخراوە سیاسیەکانیتر، هەنگاویان بۆ ئەمکارە هەڵگرت، دوو گروپی سیاسی ڕکەبەر بانگەشەی ڕابەرایەتی هەڵسانەوەی شۆڕشیان دەکرد و تێکۆشان ئەو بۆشاییە سیاسیەی کە لەدوای پاشەکشێی پارتی دیوکرات بەسەرۆکایەتی بارزانی لەناوچەکە درووست ببوو پڕیکەنەوە.

یەکێك لەو دوو گروپە (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) بوو کە لەدیمشق لەلایەن جەلال تاڵەبانی و هاوڕێکانی سەرکردایەتی دەکرا، دووەمیان (قیادەی موقت) کە هەر پارتی دیوکراتی کوردستانە کە لەدوورەوڵات لەلایەن ئەندامانی نوێنەری سەرۆکی پێشوو کە هەندێکیان توانیبویان لەئێرانەوە بەرەو ئەورووپای ڕۆژئاوا بڕۆن دامەزراوە. هەردوو گروپ خۆیان بە مارکسیست/لینینیست دەزانی.

یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەگەڵ سەرکردایەتی پێشووی لەناوێندا بارزانی زۆر ناکۆك و دژبوون و ئەویان تاوانباردەکرد کە سەرکردایەتی شۆڕشی بەشێوەی خێڵەکی کردووە و لەگەڵ ئیمپریالیزمدا لەپەیوەندیدا بووە و پارتی دیوکراتی کوردستان لەبەرئەوەی پەیوەندی لەگەڵ شا و ئیمپریالیزم هەبووە بەخیانەتکار تۆمەتباری دەکەن.

بە لەکارخستنی احمد حسن بکر و هاتنەسەرکاری سەدام حسێن لەساڵی (١٩٧٩) هێزە ئەمنی و پۆلیسیەکان زۆر بە توندی چالاکیان ئەنجامدەدا و مەیدانەکە بۆ خەڵکی کورد تەسك بووەوە. زۆربەی پێشمەرگەکانی کورد یان پەرتەوازەی وڵاتان بوون یان خۆیان دابەدەست هێزەکانی دەوڵەتەوە، سیاسەتی بەعەرەبکردن (تعريب) لەناوچە نەوتیەکانی کەرکوك و خانەقین بەتوندی پەیرەوی دەکرا، هێزی ڕێکخراوی بەعس لەزۆربەی ناوچەکانی کوردستان جێگیرکران و سنوری ناوچەی ئۆتۆنۆمی هەموو ڕۆژێك بچوك دەکرایەوە.

دەرکەوتن و زیادبوونی ناکۆکی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان (بارزانی و تاڵەبانی) بووەهۆی ئەوەی کە هەرگیز ئەم دوو سەرکردەیە نەتوانن ستراتیجێکی ڕاست بگرنەبەر، تێهەڵکێش بوونی پیاوانی بەعس لەناو سەرانی کورددا بووە هۆی زەمینە خۆشکردن بۆ خیانەت لە نێوانیاندا، ئامانجی سەربەخۆیی کورد فەرامۆش بکەن و سەرکردەکانی حیزبەکان هەریەکەیان لەهەوڵی بەهێزکردن و قایمکردنی پێگەی خۆیاندا بوو.

دوای وازهێنانی احمد حسن بکر لەسەرۆکایەتی کۆماری عێراق لەتەموزی ساڵی (١٩٧٩) سەرئەنجام سەدام سەرۆکایەتی کۆماری گرتەدەست، ئەو بەخێرایی پاکسازی لەپێکهاتەی حکومەتدا دەستپێکرد، گرنگترین ڕوداوێك کە لەم بوارەدا ئەنجامدرا پاکسازی بوو لەناو ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشدا.

(کەنعان مەکییە) ڕۆشنبیرو نوسەری بەناوبانگی عێراق لەمبارەیەوە دەڵێت ((لەم پاکسازیەدا کۆبوونەوەیەك پێکهێنرا بەبەشداری فەرماندە سەربازی و سەرکردە حیزبەکان و کەسانێك کە سەرکردەی پایەبڵندی حیزی بەعس بوون، هاتن و دەستیان بەدانپێدانان (اعتراف) کرد، ڕێك وەك ئەو دادگا نمایشتیەی ستالین وایە کە لەساڵی (١٩٣٠) کردی، سەدام دانیشتبوو گوێی لەم دانپێدانانە دەگرت و لەهەمانکاتدا کە ئەوانەی دانیان بەکارەکانیاندادەنا، هێزی ئاسایش ئەوانەی ڕادەکێشا و دەیبردن، بەڵام ئێستا دەزانم کە تەواوی ئەو قسانەی کە ئەوان دەیانوت (واتە دانپێدانانەکان) هەموو دروستکراو بوو)).

سەدام حسێن دوای گەیشتن بەدەسەڵات لەسیستەمی سیاسی وڵات گۆڕانکاری کرد، دەسەڵاتی یاسایی سەرۆك کۆمار و کابینەکەشی زیادکرد، دواتریش ئەو بۆ مسۆگەرکردنی حکمی دەسەڵاتی هەنگاوی زۆری نا، نوری زادە دەڵێت: ((یەکەمین کارێك کەسەدام کردی ئەوەبوو کە لەپاڵ حزبی بەعسی عێراق میلیشیایەکی چەکداری وابەستە بەحیزبی بەعسی دامەزران و ئەوانە ئەندامێك بوون کە کارمەند بوون، شۆفێری پاس بوون و بەکورتی هەرکارێکیان هەبوو، هەموویان چەکدار و خاوەنی چەکی سوك و فیشەك بوون، بۆ هەریەکەیان شوێنێکی تایبەت دیاریکرابوو، لەکاتێکدا وڵات تووشی کودەتا یان شۆڕش دەبوو یان هەر ڕووداوێکیتر ئەمانە کاریان ئەوەبوو سەرکوت و کۆنترۆڵی بارودۆخەکە بکەن، بەپەنابردن بۆ ئەم هێزە سەدام سەرکەوتوو بوو لەدروستکردنی هێزێکی نیمچە سەربازی لەپاڵ سوپادا، مەسەلەی دوایی ئەوەبوو ئەو ئەندامانەی متمانەیان پێدەکرا ئەندامانی خوارەوەبوون لەسوپادا شوێنیان نەبوو، ئەمانە پلەی سەربازی بەرزیان وەرگرت و فەرماندەیی لەشکرەکانی عێراق بەمانە سپێردرا و هەموو دەسەڵاتەکانیان لەعێراق گرتەدەست)).

(ئافرایم کارش) مامۆستا لەزانکۆی لینگر لەلەندەن ئاوادەڵێت (لەنزیکترین ئەو کەسانەی کە دەسەڵاتی سەدامیان قایمکرد، تکریتیەکان و ئەندامانی خێزانەکەی و بەپلەی یەکەم هەردوو کوڕەکەی و

زاواکانی بوون، ئەمانە ئەندامێك بوون کە ئەو لە هەموو کەس زیاتر متمانەی پێیان هەبوو، ئەندامانی خێڵ و خزمانی نزیکی پاسەوانی سەرۆکایەتی و هێزە ئەمنیەکانیان پێکدەهێنا کە هەمووی لە پێناوی پاراستنی دەسەڵاتەکەی سەدامدا بوون، دوای ئەوانە، ئەو بازنەیەکی گەورەتری لە ئەندامانی سەربازی و ناسەربازی کە سەدام متمانەی پێیان بوو لە دەوری خۆی کۆیکردنەوە کەزۆربەیان بەعسی بوون).

لاوازی ژێرخانی دارایی و بەرگری پێشمەرگە کوردەکان، خیانەتی وڵاتای دەرەکی، ناکۆکی لەنێوان کوردەکان لەسەر چۆنیەتی بەردەوامی خەبات، لاوازی نابووری خێزانەکان و وێرانی زۆر لەئەنجامی جەنگ و ناارامی و ... هتد، هۆکارێك بوون کە یارمەتی سەدامیاندا تابتوانێت دەسەڵاتی دیکتاتۆری خۆی بۆ نزیکەی دوو دەیە بەسەر ئەم خەڵکەدا بسەپێنێت، تا دوای هەڵگیرساندنی جەنگی کەنداو (عێراق و کوێت) وایکرد شێوەیەکی گشتی تارادەیەك نارامیەکی بۆ کوردستانی عێراق بەدەستهێنا.

سەرکوتکردن بەردەوام و ترس و سام هەموو کوردستانی گرتبووەوە، هێرشی عێراق بۆ سەر کوێت لەساڵی (١٩٩٠) دەرگایەکی تازەی بەڕووی خەباتی کوردەکاندا کردەوە، هێرشی هاوپەیمانان بەسەرۆکایەتی ئەمەریکا بۆ سەر عێراق و دەرپەڕاندنی سوپای سەدام لەکوێت و لاوازی حکومەتی بەعس باشترین هەلی بۆ ڕاپەڕینی کوردەکان لەباکور و شیعەکان لەباشوور ناوەڕاست ڕەخساند. کوردەکان بەیارمەتی دەرەکی و ناوخۆیی بەخێرایی ناوچە کوردنشینەکانیان (ڕاستروایە بڵێین بەشێك لەناوچە کوردیەکان - وەرگێڕ) خودموختاریان ڕاگەیاند و هەردوو پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەستیان بەڕێکخستنەوەی هێزەکانی خۆیانکرد و بەرێکەوتن لەگەڵ یەکتر دژ بەحکومەتی عێراق کەوتنە خەباتەوە، خودموختاری ڕاگەیەندراو بەشێکی ناوچە کوردیەکانی گرتەوە و هاوکاری کوردەکان و شیعەکان لەعێراق بووەهۆی ئەوەی حکومەتی عێراقی لەناوخۆدا ڕووبەڕووی کێشە ببێتەوە، حکومەتی عێراق بەهۆی شکستی گەورەی خۆیی و لەناوچوونی هەموو توانا خۆشگوزەرانی و ژێرخانی وڵات و لەناوچوونی (٩٠٪) ی سوپاکەی، بەشکست و ناشتی ڕازیبوو، هێزە شکستخواردووەکەی بۆ ناوەوەی وڵات کێشایەوە. تێکشکانی سەدام و ڕاپەڕینی کورد و شیعەکان لەناو عێراق بارودۆخێکی ناجێگیر و بێسەروبەری لەو وڵاتەدا دروستکرد و سەدام و حیزبی بەعسی بەخێرایی لەڕوخاندن نزیك کردەوە. لەم بارودۆخە قەیراناویەدا وڵاتانی ڕۆژئاوا و لەسەریانەوە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو ستراتیجی خۆیان گۆڕی و بەپێی تیۆری جورج بوش جەختیان لەسەر مانەوەی حزبی بەعس لەعێراق دەکردەوە، سیا لەوباوەڕەدابوو ئەگەر زیاتر لەوە سەدام و سوپاکەی لاوازبێت، ئەوا ڕوخاندنی حیزبی بەعس حەتمی دەبێت و شیعەکان کە زۆرینەی خەڵکی ئەو وڵاتە پێکدەهێنن بەیارمەتی ئێران دەسەڵات دەگرنەدەست و کێشەی گەورە بۆ بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکا و پارێزگاریکردنی ئەو لەئیسرائیل لەناوچەکە دروست دەکەن.

لەدوای ئەوەوە سیا و هاوپەیمانانی ئەمەریکا و هەموو وڵاتانی پشتیوان لەناویاندا خودی روسیاش جەختیان لە مانەوەی سەدام حسین دەکرد.

بەخێرایی سەدام دەستیکرد بەڕێکخستنەوەی هێزەکانی و سەرکوتی هێزە نەیارەکانی بەتایبەت شیعەکان، لەماوەی دوو مانگدا هەموو نەیارەکانی لەناوەڕاست و باشوور بەتوندترین شێوە سەرکوتکرد و هێزی بەئاراستەی باکوور و ناوچە کوردیەکان ڕەوانەکرد، بەڵام ناوچە کوردیەکان بەناوچەی خودمختار و ناوچەی دژەفڕین ناسرابوو، حکومەت عێراق نەیدەتوانی لەڕێگای فڕۆکەوە ناوچەکە بۆردومان بکات، لەلایەکیترەوە ناوچەکە کەوتبووە ژێر پارێزگاری نێودەوڵەتیەوە (بۆ دەستەمۆکردنی سەدام) لەناوچەی کوردستانی تورکیا لەبنکەی ئەنجەرلیك هێزی ئەمەریکایی بەناوی (چەکوشی ئامادە) جێگیرکرابوو بۆ کۆنترۆڵ کردنی جوولە و کارەکانی سەدام*. هێزەکانی چەکوشی ئامادە ئامانجەکەی واراگەیاندبوو کە پارێزگاریکردنە لەناوچە کوردیەکان و ناوچەی دژەفڕین لەباکوری عێراق. هێزەکانی چەکوشی ئامادە مەکتەبی پەیوەندیان لەباکوری عێراق (کوردستان) هەیە.

بەیارمەتی ڕۆژئاوا لەهەرێمی کوردستان بۆ دابینکردنی ئەم ناوچە ئازادە، زۆربەی خوێندەواران و کۆچکردوان و دورخراوەکان گەڕانەوە بۆ هەرێمی کوردستان، مسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی سەرۆکایەتی سیاسەتی خەڵکیان گرتەدەست و دەستیان بەپێکهێنان و دامەزراندنی ڕێکخراو و دامەزراوەی جیاوازکرد.

ئەمڕۆ کوردەکان نەوت لەناوچەکانی کەرکوك و خانەقینەوە بەتانکەر بۆ تورکیا ڕەوانەدەکەن و دەیفرۆشن* بە قسەی ئەوان پێویستیەکانی خۆیانی پێدابیندەکەن، قسەی کراو ئەوەیە کە وڵاتە

---

*) ناوچەی کوردستان لەکاتی ڕاپەڕیندا ناوچەی دژەفڕین نەبوو وهەروەها هێزی چەکوشی ئامادەش لەکوردستانی تورکیا جێگیر نەکرابوو، بەپێچەوانەوە هێزەکانی سەدام و بەعس زۆر بەدڕندانە و لەڕێگای بەکارهێنانی فڕۆکەی هەلیکۆپتەرەوە پەلاماری ناوچە کوردیەکانیاندا و کوشت وکوشتارێکی زۆریان دژی هاوڵاتیانی کورد و خەڵی ڕاپەڕوو ئەنجامدا، بۆیە لەترسی دڕندەیی هێزەکانی سەدام و بەکارهێنانی چەکی کیمیایی هەموو خەڵکی کوردستان بە ژن و پیاو منداڵ و پیرەوە کوردوستانیان بەجێهێشت و ڕوویان لەسنورەکانی ئێران و تورکیا کرد. وەلەئەنجامی ئەو کارەساتە مرۆییە کە بە (ڕەوەیی ملیۆنی) ناوبرا، وەکاریگەری ڕاگەیاندنەکانی ڕۆژئاوا لەپیشاندانی کارەساتەکەدا وڵاتانی ڕۆژئاوا بەگشتی هاتنەناوەوە و بۆبەرگرتن لەو کارەساتە چەندین بڕیاریان دەرکرد لەوانە (دانانی ناوچەی دژەفڕین بۆ فڕۆکەی عێراق تا هێڵی (٣٦) و دانانی چەکوشی ئامادە لەبنکەی ئەنجەرلیکی کوردستانی تورکیا و سەپاندنی بڕیاری ٦٨٨ و پارێزگاری نێودەوڵەتی و گێڕانەوەی کوردەکان بۆسەر ماڵ و حاڵی خۆیان و دەرکردنی هێزەکانی عێراق لەبەشێکی زۆری خاکی کوردستان) واتە نووسەر لەوەدا بەهەڵەداچووە کە وادەزانێت ڕاپەڕین بەهۆی ئەو بڕیارانەوە سەرکوت نەکرا لەکوردستان، بەپێچەوانەوە ئەو بڕیارانە لەئەنجامی سەرکوتی ڕاپەڕین و ڕەوەی ملیۆنیەوە دەرچووە، بەڵام دوای ڕەوەکە و لەژێرسایەی هێزی پێشمەرگە دوبارە فشار خرایەسەر هێزەکانی عیراق بۆیە ناچاربوو بەشێکی شارەگەورەکانی کوردستانی چۆڵکرد و ئیدارەی دەوڵەتی کێشایەوە بۆ شارەکانی کەرکوك و موصل.. (وەرگێڕ)

*) لەکاتی نووسینی ئەم کتێبەدا ساڵی (٢٠٠٢) هێشتا کەرکوك و خانەقین ئازاد نەکراوە بۆیە کوردەکان دەسەڵاتیان بەسەر ئەم ناوچەیەدا نەبوو تا نەوتەکەی ڕەوانەی دەرەوە بکەن. وە ئێستاش دوای ڕوخانی سەدام چارەنوسی ئەم ناچانە یەکلانەکراوەتەوە بەپێی مادەی (١٤٠) بۆیە تا ئێستا لەژێر دەسەڵاتی ناوەند (بەغدا) دایە کوردەکان ناتوانن نەوت لەم دوو ناوچەیە ڕەوانەی دەرەوە بکەن. بەڵام پێموایە نوسەر مەبەستی نەوتی ناوچەی شیواشۆکە. وەرگێڕ.

یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەم ناوچەیە دەستیان بەدروستکردنی فرۆکەخانەکردوە و حکومەتی ئەڵمانیا، دروستکردن و نۆژەنکردنەوەی ڕێگاکانی ئەم ناوچەیەی گرتۆتەئەستۆ. حکومەتی فەرەنسا بەتایبەت پشتیوانی حزبی سۆسیالستی فەرەنسا، بۆ دروستکردنی نەخۆشخانە و ناردنی پزیشك و دەرمان بۆ ئەم ناوچەیە، ئەمانە هەمووی یارمەتی کوردەکانیانداوە بۆ پارێزگاریکردن لەوناوچە خودمختاریەکەمیان. ناوچە کوردیەکانی باکوری عێراق (هەرێمی کوردستان) ئەمڕۆ پەناگایە بۆ گریلا کوردەکانی نەیاری حکومەت تورکیا، دەوڵەتی تورکیا بە شێوەی بەردەوام هەرێمی کوردستان بۆردومان دەکات بەبەهانەی سەرکوتکردنی گریلا کوردەکان.

کێشەی تازە کە لەئێستادا سەریهەڵداوە ناکۆکی گەورەی نێوان هەردوو پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستانە کە بۆتەهۆی هەڵگیرساندنی جەنگی ناوخۆیی (براکوژی) خوێناوی. ئەم دوو پارتە بۆ داگیرکردنی شارەکانی هەرێمی کوردستان و کۆنترۆلکردنی، هەمیشە لەحاڵەتی مشتومڕدان و هەرڕۆژە بەهێرش کردن بۆسەر سەنگەرەکانی یەکتر و پاکسازی گوندەکانی ئەو ناوچەیە لەیەکتر ڕووبەڕووی شەڕ و پێکداداان دەبنەوە کە بەڵگە و هۆکاری جیاوازی هەیە.

## پارت و گروپە سیاسیەکانی کوردستانی عێراق و خواستەکانیان لەهەلومەرجی ئێستادا:

### (١) پارتی دیموکراتی کوردستان:

ئەم پارتە داوای خودمختاری دەکات بۆناوچە کوردیەکانی باکوری عێراق، لەناو وڵاتانی پەیوەندیدار بەقەیرانی هەرێمی کوردستانەوە ئەم گروپە زیاتر پەیوەندی لەگەڵ تورکیادا هەیە، لەهاوینی (١٩٩٦) ئەم گروپە لەگەڵ سوپای تورکیادا ئۆپەراسیۆنێکی هاوبەشی لەدژی گریلا کوردەکانی تورکیا و یەکێتی نیشتمانی کوردستان ئەنجامدا. مسعود بارزانی بەگشتی لەشارۆچکەی سەلاحەدین نیشتەجێیە، بەڵام ناوەندی حکومەت و پەرلەمانەکەی لەشاری هەولێرە.

### (٢) یەکێتی نیشتمانی کوردستان :

ئەم گروپە لەژێر سەرکردایەتی جەلال تاڵەبانیدایە. ئەو لەدەورانی شۆرشی کوردەکانی عێراق لەدەیەی (١٩٧٠) هاوکاری ملا مستەفای دەکرد، بەڵام دوایی بەرخنەگرتن لە بارزانی ڕێکخراوی یەکێتی نیشتمانی کوردستانی دامەزراند. ئەم گروپە لەناوچەکانی سلێمانی، باشووری هەولێر و خانەقین و شارەکانی کفری و کەلار لەباشوری کوردستان دەسەڵات و نفوزی هەیە. ئەم ڕێکخراوە ئەندامە لە(سۆشیاڵ ئەنترناشناڵی جیهانی)دا، بەرگری لەدیدی خودمختاری (فیدراڵی) لەناوچە کوردیەکانی باکوری عێراق دەکات. ئەم گروپە پەیوەندی نزیکی لەگەڵ سوریادا هەیە، جەلال تاڵەبانی سەرکردەی ئەم گروپە لەناوچەی سەربازی نزیك سلێمانی (قەڵاچوالان ـ وەرگێر) نیشتەجێیە، بەڵام بنکەی حکومەتەکەی لەناو شاری

سلێمانی دایە. یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەلایەن تورکیاوە بەوە تاوانبار دەکرێت کە یارمەتی گریلاکانی پارتی کرێکارانی کوردستان دەدات.

**(٣) حزب اللەی شۆڕشگێڕی کورد*:**

ئەم گروپە بەرابەرایەتی ئەدهەم بارزانی چالاکی دەکات. پەیدابوونی ئەم گروپە لەئەنجامی گەشەی بیری ئیسلامیەوە بووە لەم یەك دوو دەیەی دواییدا، ئەم گروپە لەگەڵ ئەوەی دژی حکومەتی عێراق لە خەبات و چالاکیدایە، بەڵام کەمتر لەو دوو گروپەی پێشەوە خەریکن بەمەسەلەی خودمختاریەوە، لەگەڵ ئەوەی ئەسڵ و بنچەی ئەندامان و سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان و حزب اللەی شۆڕشگێڕی کورد سەر بەعشیرەتی بارزانن، بەڵام لەشەڕەکانی ڕابردوو لەهەرێمی کوردستان لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان و سوپای تورکیاوە هاتۆتە مەیدانی جەنگەوە، ناوچەی نفوزی ئەم گروپە لەناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانی عێراقە کە هاوسنورە لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران بەتایبەت لەناوچەکانی حاجی ئۆمەران.

**(٤) بەرەی تورکمانی عێراق :**

ئەم بەرەیە خۆی بەنوێنەری (٣٠٠) هەزار تورکمان لەهەرێمی کوردستان دەزانێت، ناوچەی چالاکی ئەم گروپە دەکەوێتە هەولێر و حاجی ئۆمەران و ناوچەکانی نزیك لەسنوری تورکیا، ئەم گروپە سوودمەندە لەیارمەتی و پشتیوانی جدی تورکیا و حکومەتی تورکیا بەپرچەککردنی هێزەکانی ئەم گروپە وەك هێزی چاودێر بۆ ئاگربەست لەهەرێمی کوردستان سوودیان لێوەردەگرێت، سەرکردەی ئەم گروپە (سینان چلەبیە).

## جیوپۆلەتیکی شیعەکان:

شیعەکانی عێراق لەماوەی سەد ساڵی ڕابردوودا، عێراقیان لەویلایەتێکی دواکەوتووی ئیمپراتۆری عوسمانیەوە گۆڕی بۆ وڵاتێکی دەرکەوتوو. ڕۆحانیەکانی شیعە لەعێراق پەیوەندی توندوتۆڵیان بەمەسەلە سیاسیەکانی ئێرانەوە هەیە و هەتا پاشاکانی ئێرانیش نفوزی معنەوەی و سیاسی ئەوانیان لەکاروباری ئێراندا بەرەسمی ناسیوە. لەڕاستیدا زۆر لەڕۆحانیەکانی شیعە ئێرانین یان بەبنەچە ئێرانین و خوێنی ئێرانی لەناو کۆمەڵگای شیعەی عێراقدا هاتوچۆ دەکات، فەرهەنگی شیعەیی لەهەر دوو وڵات ناتوانرێت بەناسانی لەیەکتر جیابکرێتەوە، بەرێکەوت نیە کە امام خومەینی لەساڵی (١٩٦٤) لەکاتی ئاوارەیی و دورخستنەوەی لەشاری نەجەف لەعێراق جێگیربوو تا ئەو کاتەی کە شای ئێران سەدامی ناچارکرد ڕابەری شۆڕشی ئیسلامی ئێران (خومەینی) ناچاربکات عێراق بەجێبهێڵێت.

---

* ) ئەم گروپە هەر لەسەرەتاوە سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستان بووە و سەرکردەکەشی سەر بەبنەماڵەی بارزانییە و لەدواییشدا دووبارە چووەوەناو هەمان پارت. لەهەرێمی کوردستان چەندین پارت و ڕێکخراوی بەناوبانگترو بە نفوزتر هەیە و هەبووە بەڵام نووسەر ئاماژەی بۆنەکردووە، ئەمەش پێناچێت لەبەر نەشارەزایی نووسەربێت، بەڵام لەبەر هەرهۆیەك بێت پەیوەندی بە نوسەرەوەیە ـ وەرگێڕ.

پێگەی گرنگی شیعەکانی عێراق لەژیانی فکری عێراقدا بەشێوەی سروشتی نەبۆتەهۆی ئەوەی کە ئەمانە لەخەباتی نەتەوەیی عێراقدا بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی ڕۆڵی بەرچاو ببینن. لەدوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی، عێراق وەك وڵاتێکی تازە دروستبوو بەفەرمی ناسرا.

سەرکێشی و یاخیبوونی فکری کۆمەڵگای شیعی عێراق لەدوای ساڵی (١٩٥٨)ەوە بەتووندی ڕووبەڕووی حکومەتەکانی ژێردەسەڵاتی سنی بووەوە، ڕۆحانیەکانی شیعە بێدەنگی چەند ساڵەی خۆیان شکاند وبەگشتی لەرێگای نوسینەکانی سید محمد باقر صدرەوە بەدیدگا مەزهەبیەکانی خۆیان خەریکبوون.

جەنگی ئێران عێراق قۆناغێکی سەختتر لەئەزمونی شیعەکانی عێراق بوو، پرسیاری گرنگ و سەرەکی ئەوەبوو کە ئەوانە لەنێوانی وەفاداری دژبەیەکی حکومەتی عێراقی و عەرەببوون لەلایەك و پەیوەندی مەزهەبی و فەرهەنگی لەگەڵ ئێران لەلایەکیتر، دەبێت چ کاردانەوەیەك پیشانبدەن. لەڕووی مێژوییەوە لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست، پەیوەندیەکانی ئایین و مەزهەب لەپێگەیەکی هێزی سەپێنراوی کۆمەڵایەتی/سیاسیدا بەئەندازەی نەتەوەیی بەهێزە بووە. بەڵام حکومەتی بەعسی عێراق چاوەڕوانی کاردانەوەی شیعەکانی نەکرد. هەستا بەهەڵمەتێکی دەستگیرکردن و دەرکردن و لەسێدارەدانیان، ترسیان لەپیاوە ناودارەکانی شیعە هەبوو، لەوانە ڕابەری بەناوبانگی شیعەکان، ئایەتوالله سید محمد باقر صدر و خێزانەکەی کە لە(نیسانی ١٩٨٠) لەسێدارەدا.

کارە توند و داپلۆسێنەرەکانی هێزە ئەمنیەکانی عێراق، دوودڵیەکیان نەهێشتەوە، لەهەر جۆرە دوودڵیەك بۆ لایەنگری لەحکومەت، بەتوندی سزایان دەدا و ڕووبەڕووی دەبونەوە، دەیەها یان سەدەها هەزار شیعەی عێراقی دورخرانەوە یان لەوڵات هەڵهاتن کە زۆربەیان ئەو عێراقیە بەڕەچەڵەك ئێرانیانە بوون، لەهەمانکاتدا سەرۆك کۆماری عێراق بەسوودوەرگرتن لەسیاسەتی پاداشتی کەم و کوتەکی قورس، بەباشبوونی چۆنیەتی ژیانی شیعەکان و پێدانی پشکی زۆرتر لەبودجەی گشتی بە شارەشیعەنشینەکان لەوانە شارەکانی کەربەلا و نەجەف هەنگاوین.

جەنگی عێراق ئێران نیشاندەرێك بوو سەبارەت بەخەسڵەتی شیعەکانی عێراق کە زۆرینەی سوپایان پێکدەهێنا، سەرئەنجام شیعەکان وەفاداری خۆیان بۆ ڕژێمی عێراق پیشاندا، هەرچەندە دەربارەی هەستە تایبەتیەکان ئەوان وادەردەکەوت کە هەستی تەواو لێکچوویان نەبووبێت. هەڵبەت سزای کارێکی خیانەتکارانە لەکاتی جەنگدا جێگایەکی بۆ دوودڵی نەهێشتۆتەوە.

لەدوای تێکشکانی عێراق لەجەنگی ساڵی (١٩٩١) تا ئێستا (٢٠٠٢) ژمارەیەك لەرێبەرانی پلەیەکی شیعە کە بوونەتە جێگای نیگەرانی حکومەتی عێراق تیرۆرکراون، ئەمجۆرە کارانە پیشانی دەدات کە ململانێی نێوان حکومەت و شیعەکان بەو زووییە کۆتایی نایەت، واچاوەڕوان دەکرێت یەکسانی ڕاستەقینە بۆ شیعەکان تەنیا لەدیموکراتیدا بەدەستدێت. بەڵام دیموکراتی ڕاستەقینە، دەستەبژێری (نخبەی)

سونی ڕووبەڕووی ئەو گرفتە دەکاتەوە کە شیعەکان زۆرینە پێکدەهێنن و لەهەڵبژاردنێکی ئازاددا شیعەکان ئەگەری ئەوەیان هەیە بێنەسەر گۆڕەپانی سیاسی عێراق و دەسەڵات بگرنەدەست،* هەڵبەت ئاساییە مادام دوو کۆمەڵگای مەزهەبی لەعێراق هەیە ئازادانە جۆری پێکەوە ژیان هەڵبژێرن و دوور لەبەکارهێنانی دەسەڵاتی توندوتیژ، دیموکراتیانە لەمەیدانی سیاسی عێراق ڕۆڵی گرنگ ببینن.

دوای ئەوەی حکومەتی سەدام و حیزبی بەعس لەئەنجامی کار و فشارەکانی ئەمەریکا نابوود بوو، ناسەقامگیری لەوڵاتەدا زیاتربوو و نفوزی سیاسی شیعەکان خۆبەخۆ زیاددەکات، چالاکیەکانی زۆرینەی شیعە لەعێراق، کاریگەری بێئەندازە لەسەر سیستەمی سیاسی ئەم وڵاتە بەجێدەهێڵێت، لەوانەیە ببێتەهۆی ئەوەی ڕوبەڕووبونەوەیەکی توندوتیژ لەنێوان شیعە و سونەدا بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات ڕووبدات*، کە دەسەڵاتدارانی باڵادەستی حیزبی بەعس ئەوانی سەرکوت کردووە.

لەبەرامبەردا، ڕۆڵی مەزهەبی و حەوزەی شاری پیرۆزی نەجەف لەوانەیە کەمببێتەوە و بگۆڕێت. نەجەف کە سەردەمانێك ناوەندی بێ منافسی پەروەردەی جیهانی شیعە بووە، لەئەنجامی جیابوونەوەی زۆر لەماوەی دوو دەیەدا تا ئەندازەیەك دابەزیوە. بەوجۆرە بەناوبانگترین ڕۆحانیەکانی ئێران لەم شارە دوورخراونەتەوە. لەباتی ئەوە شاری ئایینی (قوم) لەم ماوەیەدا پەرەیسەندووە و لەئێستادا لەزۆر لایەنەوە وەك ڕکەبەری نەجەف سەیردەکرێت.

## کوردستانی ئێران :

بەسەرنجدان لەوەی کە نەتەوەی کورد لەناوچەیەك بەناوی کوردستان بەشێوەی دابەشکراو لەنێوان چوار وڵاتی ئێران، عێراق، تورکیا و سوریا لەنێوان چەند ڕژێمێکی جیاواز دابەشبووە و یەکێك لەمەسەلە هاوبەشەکانی ئێران و عێراق لەڕووی ڕەهەندی فەرهەنگی و سیاسیەوە کوردەکان پێکیدەهێنن، بۆیە دوای لێکۆڵینەوە لەکوردستانی عێراق، پێویستە کوردستانی ئێرانیش بخرێتە ژێرباس و لێکۆڵینەوەوە، ئەوەی لەم لێکۆڵینەوەیەدا وەك کوردستانی ئێران ناودەبرێت مەبەست لەوبەشەی ناوچە کوردنشینەکانە کە لەساڵانی ڕابردوودا تووشی قەیران بووە و زۆربەی دانیشتوانەکەی کوردزمانن و لەڕووی مەزهەبیەوە

* ) هەروەك ئەوەی لەدوای ڕووخانی سەدام تا ئەمڕۆ هەمیشە زۆرینەی کورسیەکانی پەرلەمانی عێراقیان بەدەست شیعەکانەوەیە و حکومەتی عێراقشیان بەدەستەوەیە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەهەمیشە کورد دەنگ بەکورد و شیعە دەنگ بەشیعە و سونە دەنگ بەسونە دەدات کە بەڵگەی ئەوەیە عێراق لەسەر بنەمای ئەم سێ پێکهاتەیە یان دەبێت دابەشبێت بۆ سێ دەوڵەت یان لە باشترین حاڵەتدا دابەشبێت بۆ سێ فیدراڵی سونە و شیعە و کورد، چونکە سیمای سونەبوون و شیعە بوون و کوردبوون و باڵادەسترە لە سیمای عێراقی بوون ـ وەرگێڕ.

* ) وەك ئەوەی لەدوای ڕووخانی سەدامەوە ڕوویدا و تائێستاش شەڕی شیعە و سونە لەهەموو ئەو شار و ناوچانە بەردەوامە کەردوو تایەفەکەی تێدایە بەتایبەتی بەغدا و دیالە و بابل و سامەڕا ... هتد ـ وەرگێڕ.

زۆربەی سونین. ئەم ناوچەیە بریتیە لەهەشت شار و زیاتر لەهەشت بەشی پاریزگاکانی ئازەربایجانی رۆژئاوا و کوردستان و کرماشان کە دانیشتوانەکەی خۆیدەدات لە(٢,٥) ملیۆن کەس*.

ئەوشارانە بریتین لەپیرانشهر، سەردەشت، بانە، سقز، مهاباد، سنە، مەریوان و پاوە. هەشت بەشەکەش بریتیە لە: سومای برادۆست، سیلوانا، شنۆ، بۆکان، کامیّران، دیواندەرە، ئەوسوود و ساولاّود.

لەسالّی (١٩٩٠) کۆی ژمارەی کوردەکان لەهەر چوار ولاّتی ئیران، عیّراق، تورکیا وسوریا (١٦,٥) ملیۆن کەس بوو، کە (٩) ملیۆن کەس لەتورکیا و (٤) ملیۆن کەس لە عیّراق و (٢,٥) ملیۆن کەس لە ئیّران و (٨٠٠) هەزار کەس لەسووریا و کۆمارەکانی سۆڤیّتی پیّشوو دەژین.

❊❊❊

دوای ڕووخاندنی ئیمپراتۆری عوسمانی و لەکۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، مەسەلەی کورد و کوردستان گۆڕا بۆ مەسەلەیەکی جیهانی، ئەم قەیرانە بەبەلگەی ڕوخاندنی ئیمپراتۆری عوسمانی و دابەشبوونی خاکی کوردەکان لەنێوان تورکیای نوێ و دەولەتی پاشایی عیّراق و سوریادا. هەرچەندە خاکی کوردەکانی دانیشتووی ئیّران هەروەك خۆیان لەژیّردەستی ئیّران مانەوە، لەگەلّ دروست بوونی کۆماری تورکیای نوی و پادشانشینی عیّراق گۆڕانکاری بەسەر خاکی کوردستانی ئیّراندا نەهات، بەوجۆرە کوردەکانی ناو ئەم دوو ولاّتە بزووتنەوەی ئازادیخوازیان بۆ پیّکهیّنانی دەولەتی سەربەخۆ لەناوچەکە دامەزراند، بەم هۆیەوە تاپیّش جەنگی جیهانی دووەمی بزووتنەوەی جدی لەناو کوردەکانی ئیّران بوونی نەبوو، ئەگەرچی تاپیّش جەنگی جیهانی دووەم لەگەلّ ئەو هەلومەرجەی لەکوردستان بوونی هەبوو، بەشیّك لەکەسایەتی ناوچەکە بەپشتیوانی هیّزی دەرەکی بەسوودوەرگرتن لەنەمانی دەسەلاّتی ناوەندی لەناوچەکە شەرو بەربەرەکانیان دروست کردبوو کە زۆربەی ئەو جولاّنەوانە خۆبەخۆ و بیّبنەمابوو، لەوقۆناغەدا لەناوچە جیاوازەکانی ئاسیای بچووك و ڕۆژئاوا ئەمە ڕوویدابوو. لەم بارەیەوە دەتوانیین ئاماژە بۆ شێخ عبدالله و حمزەئاغا وسمایل ئاغا شکاك (سمکۆ) بکەین، بەلاّم دوای دەستپیّکردنی جەنگی دووەمی جیهانی و داگیرکردنی ئازەربایجان لەلایەن سوپای یەکیّتی سۆڤیّتەوە، سەرهەلّدانی سەربەخۆخوازی و خودمختاری لەسالّەکانی (١٩٤٥ و ١٩٤٦) شکلی وەرگرت.

---

* ) ئەمرِوونکردنەوەیەی نووسەر لەسەر کوردەکانی ئیّران لەوەوە هاتووە کە خەلکی و حکومەتی ئیّران تەنیا بە پاریزگای سنە دەلّیّن کوردستان. هەرچەندە نووسەر زۆرناوچەی کورد نشین هەیە ناوی نەبردوو وەك پاریّزگای ئیلام و هەموو ناوچەکانی لورستان و بەشیّکی هەمەدان. نووسەر کەوتۆتە هەلّەی گەورە وە لە بارەی ژمارەی دانیشتوانی کوردەکانی ئیّرانەوە. لەبەرامبەردا د. عبداللە غفور لە کتیّبەکەیدا بە ناونیشانی (جوگرافیای کوردستان) ژمارەی دانیشتوانی ناوچەکانی کوردستانی ڕۆژهەلاّت (کوردستانی ئیّران) بەپیّی خەملاّندنی سالّی (٢٠٠٠) دەگاتە (١٣ملیۆن) کەس. وەرگیّڕ.

لەساڵی (١٩٤١) بیری سیاسی خودمختاری وەك یەکەمین هەنگاو بۆ سەربەخۆی کوردەکان، یەکەمجار لەکوردستانی عێراق و تورکیاوە هاتە ناو ئێرانەوە. بەتایبەت کە ئەمجۆرە خودمختاریە لەیەکێتی سۆڤیێت بەژمارەیەکی زۆر لەکەمینەکان درابوو. بەلەناوچوونی ئیمپراتۆری عوسمانی کوردەکان بەهۆی ئەوەی کە نەیاندەویست لەرێچکەی سەربەخۆیخوازی تورك و عەرەبەکان دوابکەون، داوای خودمختاری و لەکۆتاییدا سەربەخۆییان ڕاگەیاند، بەڵام ئەم خواستە لەدەرەوەی سنوری سیاسی ئێران بوو، بۆیە بەپێچەوانەی تورکیا و عێراق کە کوردەکانیان وەك کەمینە و بێگانە بە فەرهەنگی تورکیا و عەرەبی دەزانی، ئەوان لەئێران بەخانەوادەی یەك زمان دەژمێردران و زمانی کوردی لەپاڵ زمانی فارسیدا سەر بەبنەماڵەی زمانی هندۆ ئێرانیە، بەم هۆیەوە کە کوردەکان لەنەژادی ئاری بوون و فەرهەنگ و شارستانیەتی ئەوان هەمان فەرهەنگ و شارستانیەتی ئێرانییە.

قۆناغی داواکاری خودمختاری کوردەکانی ئێران، سەرەتا لەژێر کاریگەری چالاکی سەبەخۆییخوازی گروپی دیموکراتی ئازەربایجان بوو، لەباشووری ئازەربایجانی ڕۆژئاوا بەرە و ناوەندی مهاباد (سابلاغ) شێوەدەگرێت. ڕێکخستن و دامەزراندنی ڕێکخراو لەلایەن ڕۆشنبیرانی کوردی ئێران بەتایبەت ئەندامان و لایەنگرانی حزبی تودەی ئێران و بەسوودوەرگرتن لەهەلومەرجی ئەوکاتە پێکهات و زەمینەی گونجاوی بۆ شۆڕشی کوردکان و داواکاری خودمختاری ئەوان بەدیهێنا، تا ئەو جێگایەی کە لەساڵی (١٩٤٥) لەشاری مهاباد کۆماری خودمختاری کوردی ڕاگەیەندرا و بۆ ماوەی یەك ساڵ بەردەوام بوو.

بەدەستپێکردنی جەنگی دووەمی جیهانی و لەساڵی (١٩٤١) هێزەکانی سۆڤیێت (لەسەردەمی ستالین) باکوری ڕۆژئاوای ئێران و لەناویشیانە بەشی باکوری کوردستانی ئێران بەناوەندی مهابادەوە داگیرکرد و بۆ ماوەی (٥) ساڵ (تا دوای کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانی) ناوچەکە لەژێردەستی ئەواندا مایەوە. لەم قۆناغەدا دوو ڕێکخراوی گرنگی سیاسی لەناوچەکە بەناوەکانی (کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد ـ کۆمەڵەی ژ.ك) و (حیزبی دیموکراتی کوردستان) پێکهات و (کۆماری خودمختاری کوردستان) ڕاگەیەندرا.

(کۆمەڵەی ژ.ك) وەك یەکەمین دامەزراوەی سیاسی کوردی بەشێوەی نهێنی لەشاری مهاباد یەکێك لەسیاسیترین شارەکانی کوردستانی ئێران دامەزرا و چالاکیەکانی خۆی دەست پێکرد. هەلومەرجی بوون بەئەندام لەم ڕێکخراوەدا بەم بڕیارانەبوو:

١- هیچ وەختێك خیانەت لەکورد نەکات.

٢- بۆ خودمختاری کوردستان هەوڵبدات.

٣- نە بەووتن و نە بەنوسراو نهێنیەکانی ڕێکخستن نەدرکێنێت.

٤- تا مردن ئەندامی کۆمەڵە بێت.

٥- هەموو پیاوان و ژنانی کورد بەخوشك و برای خۆی بزانێت.

٦- بەبێ وەرگرتنی مۆڵەت، نەبێتە ئەندام لەهیچ حیزب و دەستەیەکدا.

دوای داگیرکردنی ناوچەکانی باکوری ئێران لەلایەن یەکێتی سۆڤێت و تێکچوونی بارودۆخەی ناوچەکە و بەتایبەتی شاری مهاباد، قازی محمدی کوری قازی علی قازی شاری مهاباد، وەك پیاوێکی ئایینی دڵسۆز بەخەڵکی بەشێوەیەکی چالاك هاتە مەیدانەکەوە و دەستیکرد بەرێکخستنەوەی کاروباری خەڵك و هەتا ژمارەیەك لەخەڵکی لەلایەن پارێزگاری شار و ئامادەکردنی خۆراك و کاروباری بژێوی خەڵکیان رێکدەخست و بۆ چارەسەری کێشە و دعوای ئاسایی خەڵکی دادگای پێکهێنا، بەجۆرێك کە لەماوەیەکی کەمدا، قازی محمد وەك کەسایەتیەکی سیاسی/کۆمەڵایەتی ناوچەی باکوری کوردستانی ئێران و پیاوی ژمارەیەکی شاری (مهاباد ـ سابلاخ) ناسرا.

قازی محمد هەرچەندە لەسەرەتادا زیاتر پیاوێکی ئایینی/کۆمەڵایەتی بوو، هەوڵیدەدا لەڕووداوە سیاسیەکاندا بەشداری نەکات، بەڵام بەهۆی رووداوە تازەکانەوە، شێوەی سیاسی و کۆمەڵایەتی بەخۆی دەدا و ئارەزووی زۆری بەلای (کۆماری ئازەربایجان)دا پەیداکرد.

لەماوەی باڵادەستی هێزی سۆڤێتدا، جەنەراڵەکانی ئەم وڵاتە، لەناوچەکانی ئازەربایجان و کوردستان هەمووی لەژێر چاودێری سەرۆك کۆماری ئازەربایجانی سۆڤێت کاروفەرمانیان دەکرد، خەریکی پیادەکردنی بیروڕایەك بوون کە سەرۆك کۆماری سۆڤێت داوای لێدەکردن.

ئەو دەیویست و پێیوابوو بەلکاندنی دانیشتوانی ئازەربایجان و کوردستانی ئێران بەئازەربایجانی سۆڤێتەوە و فراوانکردنی خاکی یەکێتی سۆڤێت، خۆی دەگەیەنێتە ئەندامیەتی کادری سەرکردایەتی سۆڤێت. چونکە بەم لکاندنە دانیشتوانی ئازەربایجانی سۆڤێت دەگاتە زیاتر لەهەشت ملیۆن کەس، هەر کۆمارێك دانیشتوانەکەی لەهەشت ملیۆن کەس زیاتر بێت سەرۆك کۆماری ئەو کۆمارە دەتوانێت ببێتە ئەندامی کادری سەرکردایەتی. هەرچەندە لکاندنی ناوچە کوردیەکانی باکوری ئێران لەگەڵ سیاسەتی کۆنی روسیای قەیسەری هاوجوتە بۆ گەیشتن بەئاوی کەنداو (ئاوەگەرمەکان).

لەهەمان کاتدا، دەستتێوەردانی یەکێتی سۆڤێت و ئامادەیی سەربازی داگیرکەری سۆڤێت لەئێران بووەهۆی دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردستان و حیزبی دیموکراتی ئازەربایجان، کە ڕاستەوخۆ لەلایەن حکومەت یەکێتی سۆڤێتەوە پشتیوانیانی لێدەکرا.

سەرانی یەکێتی سۆڤێت بۆ بەدیهێنانی ئارەزووەکانیان، لەلایەن نوێنەرەکانیانەوە دووجار قازی محمدیان بانگهێشتکرد بۆ ئازەربایجانی سۆڤێت، لەسەفەری دووەمدا قازی محمد لەگەڵ سۆڤێتدا بوو، کە سەرۆکی کۆماری ئازەربایجانی سۆڤێت لەگەڵ قازی محمد گەیشتنە رێکەوتن.

قازی محمد دوای گەڕانەوەی لەئازەربایجانی سۆڤیێت زەمینـەی بـۆ دامـەزرانـدنی حیزبـی دیـوکراتی کوردستان خۆشکرد، سەرئەنجام لەساڵی (١٩٤٥) حیزبی دیوکراتی کوردستانی ئێران بەسەرۆکایەتی قـازی محمد لەشاری مهاباد دامەزرا و پەیڕەو و پرۆگرامی حیزبی ناوبراو بەم جۆرەی خوارەوە ڕاگەیەندرا:

١- نەتەوەی کورد لەناو ئێراندا بۆ هەڵسوڕانی کاروبـاری خـۆجێی خـۆی سـەربەخۆ و ئـازاد بێـت لەسنوری دەوڵەتی ئێراندا، وەخودمختاری خۆی بەدەست بێنێت.

٢- خوێندن بەزمانی کوردی بێت و ئەم زمانە بەفەرمی بناسرێت.

٣- ئەنجومـەنی ولایـەتی کوردسـتان لەتـەواوی کـارە کۆمـەڵایـەتی و حکومەتیـەکان چـاودێر بێـت بەسـەریاندا.

٤- کاربەدەستانی دەوڵەت لەم ناوچانە دەبێت لەخەڵکی ناوچەکە بن.

٥- هەموو داهاتی ناوچەکە بۆناوچەکە خەرج بکرێت.

٦- حیزبی دیوکراتی کوردستان تێدەکۆشـێت لەگـەڵ نەتـەوە و حیزبـەکانی ئازەربایجـان یـەکێتی و برایەتی پێکبهێنێت.

٧- حیزبی دیوکراتی کوردستان بەسوودوەرگرتن لەدەرامەتی کشتوکاڵی و بازرگانی خـۆی خـەبات دەکات بۆ خۆشگوزەرانی خەڵکی کوردستان.

قازی محمد دوای دامەزرانـدنی حیزبـی دیـوکراتی کوردسـتان لـەڕۆژی (١٩٤٦/١/٢٢) لەمەیـدانی چوارچرای شاری مهاباد کۆماری خودمختاری کوردستانی دامەزراند و ڕایگەیاند: خەڵکی کـورد خـەڵکێکی تەنیان، خاکەکەیان داگیرکراو دابەشکراوە، لەسەرەتایترین مافـەکانیان کـە مـافی دیـاریکردنی چارەنوسـە بێبەشن...

لـەو ڕۆژەدا قـازی محمـد بەجلوبـەرگی جەنـەراڵی ڕووسـی سـەربازەکانی پشکنی و نـاوی کابینـەی حکومەتەکەی ڕاگەیانـد. هێشتا یەکسـاڵ بەسـەر تەمـەنی حیزبـی دیـوکراتی کوردسـتان و دامەزرانـدنی کۆماری مهابادا تێنەپەڕیبوو کـە قـوام سـەلتەنە لەگەڵ حکومـەتی سۆڤیێت ڕێکـەوت لەسـەر چۆنیەتی کـشانەوەی هێزەکـانی سـۆڤیێت. سـتالین لـەباتی ئـەوەی بۆچـونەکانی وەزیـری بـەرگری و سـەرۆك کۆمـاری ئازەربایجـانی سـۆڤیێت لەبەرچـاوبگرێت، بۆچـونەکانی وەزیـری دەرەوەی خـۆی بـەگرنگ زانـی و کارەکـانی بەشـێوەی سیاسـی تـەواوکرد، زەمینـەی چـونەدەرەوەی هێزەکـانی سـۆڤیێتی لـەئێران فەراهـەم کـرد، بەچوونەدەردوەی هێزەکانی سۆڤیێت لـەخاکی ئێـران، سـوپای ئێـران لەزسـتانی سـاڵی (١٩٤٦) بـەبێ شـەڕ چوونە ناو شاری مهابادەوە و دوای سێ ڕۆژ قازی محمد و هاوڕێکانی خۆیاندا بەدەستەوە و سـەد ڕۆژ دواتـر لەکاتێکدا کە سوپا لەهەموو بەشەکانی باکوری کوردستانی ئێران جێگیربوون، قازی محمد و صەدری قـازی

(برای قـازی محمـد) و محمد حسین سیف قـازی (کـوڕی مـامی قـازی محمـد) لەهـەمان مەیدانی چوارچـرا لەسێدارەدران.

دوای لەسێدارەدانی قازی محمد و دەستگیرکردنی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی دیموکرات و ڕوخانی کۆماری مهاباد، مەسەلەی کوردستان ئارام بووەوە.

لەساڵی (١٩٤٧) تا تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٧٨) نزیکەی سی ساڵ لەکوردستان ئارامیـەکی نسبی بەرقەرار بوو، وە قەیرانی سیاسی نـەبوو، تـەنیا ڕژێمـی پەهلـەوی لەگـەڵ مەسـەلەی کـورد لـەدیوی سنوری عێراق ڕووبەڕوو بوو.

هەڵبەت لەساڵی (١٩٤٧) ئەندامانی ئەنجومەنی حیزبی دیوکراتی کوردستانی ئێـران دووبـارە بـە یارمەتی حیزبی تودە بەسەرۆکایەتی عبدالله اسحاقی (احمد توفیق) لەدەرەوەی وڵات خۆیان ڕێکخستەوە، بەڵام لەبارەی ڕەوتی خەباتی خۆی و حزبی دیوکرات و حیزی تودە ڕێك نەکـەوتن و هـێچ کارێکیـان ئـەنجام نەدا. هەروەها لەساڵی (١٩٤٧)کۆمیتەیەکی شۆڕشگێڕی بەرەوتێکی چەکدارانە بـەناوی حیـزی دیموکرات پەیوەندی خۆی لەگەڵ حزبی تودە پچڕاند و بەئەندامانی خۆیانـەوە چـونە ئێرانـەوە و دەسـتیانگرت بەسـەر بارەگایەکی جەندرمەی پیرانشار و چەکیانکردن، دوای تێپـەڕبوونی هـەژدە مـانگ بەسـەر ئـەم ڕووداوەدا لەساڵی (١٩٤٨) هێزی سەربازی بەفەرماندەیی سپهبد نویسی فەرمانـداری ئـەو وەختـە دەسـتی بەگـەران بەدوای ئەوانەدا کرد (١٠٤) کەسی لە(٢٠٠) کەسی ئەندامانی ئەو حیزبە دەسـتگیرکرد، (٢٣) کەسـیانی کوشت و (٢٨) کەسیتریان خۆیاندا بەدەست هێزە سەربازیەکانەوە و کێشکە کۆتایی پێهات.

## مەسەلەی کوردستان دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی:

بەسەرکەوتنی شۆڕشی ئیـسلامی خواسـتی خودمختـاری و هـەوڵی کوردەکـان بـۆ وەرگرتنـی مـافی چارەی خۆنووسین لەحکومەتی ناوەندی بەهێزتر بوو، پارتی سیاسی جۆراوجۆر بەتایبەتی حیزبی دیموکراتی کوردستان داوای ئەم مافەی لەحکومەتی ناوەندی ئێران دەکرد.

لەلایەك چونکە کۆماری ئیـسلامی ئەیاری ڕاستەوخۆی بەرژەوندیە ژیانیەکانی دەوڵەتە زلهێزەکـانی وەك ئەمەریکا و وڵاتـانیتری ڕۆژئـاوا بـوو، سـوودیان لـەم هەسـتی خودمختـاری کوردەکـان وەردەگـرت وەك بارێکی گرنگ دژی حکومەتی ناوەندی ئێران و کوردستانی ئێران بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بـووە ناوچـەیەکی قەیراناوی. ئەم ڕووداوە سەرەکیانە تێدا ڕوویدا:

١- لەلوتکەی خەباتی سیاسی ئایینی خەلکی ئێران دژ بەرژێمی پەهلەوی، واتە لـەکۆتایی سـاڵی (١٩٧٨)، سێ ڕەوتی سیاسی کـوردی لەناوچە کوردنشینەکانی ئێـران چـالاك بـوو. یەکـەم: ڕەوتـی نـوێ کردنەوەی ڕێکخستنەکانی حیزبی دیوکراتی کوردستان، لە(تشرینی یەکـەمی ١٩٧٨) دکتـۆر عبـدالرحمان قاسملو وەك سکرتێری گشتی ئەم حیزبە لەسـەر سنوری کوردستانی عێراق، هاتە ناو کوردستانی ئێرانـەوە و

چالاکی دووبارەی حیزبی دیموکراتی بەدروشمەکانی خودمختاری بۆ کوردستان و دیموکراتی بۆ ئێران دەستپێکرد، چەقی چڕکردنەوەی بزوتنەوەی سیاسی و سەربازی ئەم حیزبە لەباکوری کوردستانی ئێران بەتایبەت لەشارەکانی ناوچەی مهاباد بوو.

دووەم: ڕەوتی ڕێکخراوەی خوێندکارانی کورد بوو، کە لەڕووی ئارەزووی سیاسی و ئایدۆلۆجییەوە ماویزم بوو وە لەو باوەڕەدا بوون کە سەرەتا کوردستان و دواتر ئێران لەڕێگای ڕێکخراوەی خەباتی جوتیاری لەناو گوندەکانەوە دەبنە پێشەنگی ڕزگاری، چەقی چڕکردنەوەی ئەم فکر و ئارەزووە لەناو شاری سنەدا بوو، ئەم ڕێکخراوە دوای بەناوی کۆمەڵە ناوبانگی دەرکرد، ئەندامانی کۆمەڵەی ئێران لەخوێندکاران و ڕۆشنبیرانی کورد و بەگشتی لەنەوەی خانەدان و بنەماڵە دەرەبەگەکان بوو، کە دوای شۆڕش بەناوی ڕێکخراوی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران دەرکەوتن کە بیری مارکسی و پەیڕەوی ماویان هەبوو، ئەمانە لەڕاستیدا پشتیان لەچینی خۆیان کردبوو و لایەنگیری کرێکاران و زەحمەتکێشان بوون و زۆربەی ئەمانە لایەنگری بیری ئەنوەر خواجە بوون، ڕێکخراوی شۆڕشگێری زەحمەتکێشانی ئێران (کۆمەڵە) لەساڵی (١٩٨١) ناوی خۆی گۆڕی بۆ حیزبی کۆمنیستی ئێران.

سێیەم: ڕەوتی گردبوونەوەی لاوانی مسلمانی کورد بوو کەڕابەرایەتی ئەمانە مفتی زاد گرتبوویە ئەستۆی خۆی، لەگەڵ ئەوەی ئەم بزووتنەوەیە جیاوازبوو لەهەردوو بزووتنەوەکەی پێشوو، بەڵام لەمەسەلەی خودمختاری بۆ کوردەکان لەگەڵ هەردوو بزووتنەوەکەی پێشوو هاوبەشی بیروڕایان هەبوو، چەقی چالاکی ئەم بزووتنەوەیە لەشاری سنە بوو.

٢- گرنگترین جوڵانەوەی گشتی سەربازی لەهەمان ڕۆژەکانی یەکەمی سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی لەلایەن هەردوو حیزبی دیموکرات و کۆمەڵە لەناوچە کوردنشینەکان دەستپێکرد.

حیزبی دیوکرات هێرشی کردە سەر بنکەی تیپی ٣مهاباد و فوجی جەندرمەی و هەموو ڕەبایەکان و چەکی کردن. ئەم حیزبە لەسەرەتای بەهاری ساڵی (١٩٧٩) ڕێپێوانێکی سەربازی گەورەی لەشاری هەستیاری (نەغەدە) ئەنجامدا و زەمینەی بۆ جەنگێکی خوێناوی لەم شارەدا فەراهەم کرد. نزیکەی (٣/٢)ی دانیشتوانی ئەم شارە تورك زمانن و مەزهەبی شیعە بوون، لەگەڵ کوردەکان لەم شارەدا دەژیان. ئەگەر ئەم شارە بەدەستی حیزبی دیموکرات بروخایە، ئەگەری چەککردنی سێ بنکەی سەربازیتر واتە پیرانشهر، پسوە و جلدیان هەبوو چونکە ئەم شارە لەسەر ڕێگای ئەم سێ بنکەیە بوو. لەکۆتاییدا دوای خوێنڕژانێکی زۆر حیزبی دیوکرات نەیتوانی کۆنترۆڵی ئەم شارە بکات.

لەهەمانکاتدا بەڕێوەبەری جاندرمەی سنە ڕووخا و بنکە و بارەگای لەشکری (٢٨) گەمارۆدرا، بەڵام بەهۆی بەرگری زۆرەوە ئەو بنکەیە نەڕووخا.

٣- دەسەڵاتی سیاسی و کۆنترۆڵ و ڕێکخستن و سەربازی ناوچەکە لەساڵی (١٩٧٩) لەلایەن بزووتنەوە سیاسیەکان بەتایبەت حیزبی دیموکرات و کۆمەڵە کە خوازیاری خودمختاری بوون بۆ کوردەکان دابەشبوو، حکومەتی ناوەندی ئێران تەنیا توانیبووی بەدرێژایی ئەو ماوەیە ڕێبگرێت لەڕووخانی بنکە سەربازیەکانی سنە، سەقز، پیرانشەهر، جلدیان، پسوە و بانە، بەڵام لەرووی کرداریەوە کۆنترۆڵ و پارێزگاری ناوچەکەی لەدەست دابوو.

٤- نوێنەرانی ئەو سێ بزووتنەوەیە یان ئەو ڕەوتە حیزبییەی پێشەوە، هەر یەکەیان سەرگەرمی جێگیرکردن ڕێکخستنە سیاسی و سەربازیەکانی خۆیان بوون لەکوردستاندا، بۆ بەدەستهێنانی خودمختاری و بەرەسمی ناسینیان سەفەری تاران و قومیان کرد، بەبۆچوونی ئەوان کوردەکان خودمختاریان بەدەست هێناوە تەنیا بەرەسمیەت ناسینیان دەوێت، دکتۆر قاسملو سکرتێری گشتی حیزبی دیموکرات جەختی کردبوو کە ئەگەر خودمختاری لەلایەن دەوڵەتی ئێران بەرەسمی نەناسرێت کوردستان ئاگردەگرێت.

٥- لەبەرامبەر ئەو بارودۆخەی لەکوردستان دروستبوو، لەناوەندی وڵات دوو بۆچوون لەبەرامبەر مەسەلەی کوردستان هەبوو.

(أ) بۆچوونێك دەیویست قەیرانی کوردستان بەرێگای سیاسی چارەسەر بکات، کە زادەی بیری حکومەتی کاتی ئێران بوو، کە خوازیاری گفتوگۆی سیاسی بوون لەگەڵ هەرسێ ڕوتەکەی پێشەوە لەکوردستان. حکومەتی کاتی بەڕوانەکردنی سێ نوێنەری کۆماری ئیسلامی بۆ ناوچەکە و دەرکردنی پەیامی (٦) ی مادەی ئیمام خومەینی بۆ ناوچەی کوردستان خوازیاری چارەسەری مەسەلەکەن، دەستەکە لەدوو سەفەری خۆیدا ڕووبەڕووی شکست بوونەوە، نوێنەرانی هەرسێ ڕەوتەکەی کوردیش سووربوون لەسەر بابەتەکانی خۆیان و ئەگەری بەرقەراری ڕێکخستنی سیاسیان لەلایەن حکومەتی ناوەندیەوە ڕەتدەکردەوە.

(ب) بۆچوونەکەیتر لەتاران ئەوەبوو کە ڕووداوێك لەدوای شۆڕشی ئیسلامی لەکوردستان هاتۆتە پێش کە لەچوارچێوەی دوژمنانی شۆڕشی ئیسلامی دەیبینن، ئەیارانێك کە نایانەوێت کۆماری ئیسلامی سەربگرێت، بەبۆچوونی ئەمانە سیاسەتی ئارامی و چاوەڕوانی واتە لەدەستدانی کوردستانی ئێرانە، واتە کوردستان وەك ناوچەیەك ڕێخۆشکەرە دژی شۆڕشی ئیسلامی ئێران تاهەموو ناوچەکانی لەدەست دەربهێنێت، تایبەتمەندیەکانی ئەم بۆچوونە ئەوە بوو: سازش نەکەن لەگەڵ گروپەکان، ئامادەکاری سەربازی لەناوچەکە و ڕێگرتن لەبالادەستی سیاسی/سەربازی گروپەکان لەکوردستان، بەرقەرارکردنی ئاسایش بۆ خەڵکی و ئامادەکردنی بارودۆخی ناوچەکە بۆ ئاوەدانکردنەوەی کوردستان، بۆیە ئامادەبوونی سوپای پاسدارانی لەکوردستان لەبەر ئەم هۆیەبوو.

٦- حیزبی دیموکرات و کۆمەڵە وەك دوو ڕەوتی ئەسڵی لەکوردستان لەوکاتەدا دیدێکی هاوبەشیان سەبارەت بەبارودۆخی سیاسی کوردستان و ئێران هەبوو، ئەوان لەوباوەڕەدا بوون کە: (خەڵکی کوردستان

لەگەڵ دروشمەکانی ئەوان کە خودمختاری بوو هاوڕان، حکومەتی ناوەندی دەسەڵاتی سیاسی و سەربازی لەکوردستان لەدەستداوە و ئەگەر لەناوچەکە دەسەڵات پەیداکات و دەست بەناوەدانی بکات، پێگەی ئێمە لەناوچەکە لاوازدەبێت، ناکۆکیمان لەگەڵ حکومەتی ناوەندی زۆرە وحکومەت ڕازی نییە ڕێکەوتنی سیاسی بەرقەراربکات، وڵاتی عێراق و ئێران ناکۆکی لەمێژینەیان هەیە، بەدامەزراندنی کۆماری ئیسلامی لەنێران ئەم ناکۆکیە قوڵتردەبێت و حکومەتی عێراق پشتگیری لەگروپە کوردە بەرهەڵستکارەکان دەکات، هەتا لەهەلێکی نزیکدا حکومەتی کۆماری ئیسلامی دەروخێت و کورد و ئێران ڕووبەڕووی قەیرانی دەسەڵات دەبنەوە.

بەپێی ئەو بۆچوون و لێکدانەوانەی سەرەوە بوو کە دوو گروپی ناوبراو هەر لەسەرەتای سەرکەوتنی شۆڕشەوە: یەکەم: تا ئەو جێگایەی توانیان بنکە سەربازیەکانیان چەك کرد. دووەم: هەستان بەڕێکخستنی سیاسی و بەتایبەتی سەربازی خۆیان. سێیەم: بەهیچ جۆرێك ڕێگەیان بەبەرقەرارکردنی دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی نەدا لەناوچەکانیان و لەبەرامبەر ئەمەدا چالاکی سەربازی و پێشمەرگایەتیان ئەنجام دەدا و ژمارەیەك پاسدار و جیهادگەریان کوشت.

٧- بەوجۆرە دوو بۆچوون دەرکەوت و هەریەکەیان بەخواستە تایبەتیەکانی خۆی لەگۆڕەپانی سیاسی کوردستان ڕوبەڕووی یەکتر بوونەوە، لەلایەك گروپ و ڕەوتە سیاسیەکان لەکوردستان جێگایان بۆ چالاکیەکانی خۆیان نامادەکرد و لەگەڵ هێزی سەربازی بەتایبەت سوپای پاسدارانی شۆڕشی ئیسلامی کەوتنە شەڕەوە و هەتا لەوبارەیەوە کەلەگەڵ نوێنەرانی حکومەتی کاتی نەگەیشتنە ئەنجام نیگەران نەبوون.

حیزبی دیموکرات دەستی بەکارەکانی خۆی لەناوچە کوردنشینەکان کرد، کە بەپێی ئەو بەهانە و بەڵگانەی خوارەوە ئاوا ئاراستەی دەکرد:

١- خۆی بەبەرپرسی مافەکانی خەڵکی کوردستان دادەنا.

٢- خۆی بەدرێژەپێدەری ڕێگایەك دادەنا کە لەوڕێگایەوە خەڵکی کوردستان ڕزگاری بەدەست دێنن، واتە خودمختاری، ڕێگایەك کە قازی محمد گیانی خۆی لەپێناودا بەخشی.

٣- حکومەتی کۆماری ئیسلامی هەروەك هەموو حکومەتەکانیتر دەناساند و لەوبڕوایەدا بوو کە: (ئیمەی کورد خۆمان دەبێت مافی خۆمان بەدەست بهێنین و حکومەتی ئێران وەك هەموو حکومەتەکانیتر ماف بەئێمە نادات).

لەلایەکیترەوە، هێزەکانی لایەنگری شۆڕشی ئیسلامی ناوچەی کوردستانیان بەمەترسی دەزانی، بەتوندی دژی ئەو بارودۆخەبوون، لەبەرامبەر ڕووداوی جودایی خوازی بەتوندی بەرگریان دەکرد.

٨- دەتوانین ڕووداوەکانی قەیرانی کوردستان کە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ڕوویدا بەجۆرە دابەش بکەین: ساڵانی (٧٩، ٨٠، ٨١ تا ٨٥، لەکۆتایی ٨٥ ەوە تا ساڵانی دوایی) و لەخوارەوە باسی هەریەکەیان بکەین:

(أ) ڕووداوەکانی ساڵی (٧٩): گرنگترینی ئەم ڕووداوانە بریتیە لەڕووخانی بنکە و فەوجەکانی جەندرمەی مهاباد و ڕەبایەکانی جەندرمە، جەنگی نەغەدە، پێکهێنانی سیاسی سەربازی حیزبی دیموکرات و گفتوگۆی سیاسی ڕابەرانی ئەم گروپە لەگەڵ نوێنەرانی حکومەتی کاتی، نارەزایی گروپە کوردیەکان بەبوونی سوپای پاسداران لەناوشارەکانی ناوچە کوردیەکان، فەرمانی ئیمام لەشکستی گەمارۆی شاری پاوە، دواتر داگیرکردنەوەی شارەکانی وەك بانە، سردەشت، مەریوان و ... لەلایەن هێزەکانی سوپا و پاسدارانەوە دوای پەیامەکەی ئیمام.

(ب) ڕووداوەکانی ساڵی (٨٠): لەمانگی ئەیلولی ئەو ساڵەدا ئێران کەوتە بەر هێرشی عێراق و جەنگ دەستی پێکرد، گروپەکان بەچالاکی سەربازی و پارتیزانی گۆڕەپانەکەیان بۆ هێزەکانی لایەنگری شۆڕش بەگشتی ناوچەیی و ناناوچەیی و سەربازی و ناسەربازی تەنگ کردەوە و ڕێکخراوی کۆمەڵە دامەزرا.

(ج) ڕووداوەکانی ساڵی (٨١): حکومەت بەجێگیرکردنی بارەگای هاوبەشی چالاکیەکان لەباشور و باکوری کوردستان، کەپێکهاتبوو لەسوپا و پاسدار و جەندرمە هەوڵیاندا ئاسایش لەناوچە کوردنشینەکان جێگیربکەن، بەڵام توندوتیژی قەیرانەکان هەر بەردەوام بوو.

(د) لەساڵی (٨١ تا ٨٥): لەناوچە کوردیەکان قەرارگای حەمزە پێکهێنرا کە لەهێزەکانی سوپا و پاسداران و جەندرمە پێکهاتبوو، ئەم قەرارگایە توانی لەماوەی سێ ساڵدا ئارامی نسبی بۆ کوردستان بگێڕێتەوە.

ئەم قەرارگایە لەوماوەیەدا هەموو شارەکان، گوندەکان، جادە سەرەکیەکان و سنوری کوردستانی ئێران لەگەڵ عێراق دڵنیابکاتەوە، دوای داگیرکردنی بارەگاکانی ئەو دوو حیزبە (دیموکرات و کۆمەڵە)، ئەو دوو حیزبە بارەگا سیاسی و سەربازیەکانی خۆیان لەئێران دەرکرد و گواستیانەوە بۆ کوردستانی عێراق .

(هـ) بەدرێژایی قەیرانە ئەمنیەکان لەکوردستان پێشمەرگەکانی کۆمەڵە و دیموکرات لەقۆناغی یەکەم هەوڵیاندا هێرش بۆ سەر بارەگای هێزەکانی کۆماری ئیسلامی ئەوان بشکێنن (وەك گەمارۆدانی بارەگای جلدیان لەساڵی ٧٩)، لەقۆناغی دووەم کاتێك هێزەکانی کۆماری ئیسلامی بوونی خۆیان لەکوردستان سەلماند و سەپاند، پەنایان بۆ پەیڕەوەیکردن ئەم تاکتیکانەی خوارەوە دەبرد:

١- کەمین و دانانی مین لەسەر ڕێگای هێزە سەربازیەکان لەسەر جادەی خۆڵ و بنکە سەربازیەکان.

٢- کوشتن و ترساندنی خەڵکی ناوچەکە دەرەوەی ناوچەکە کە هاوکاری شۆرشی ئیسلامیان لەکوردستان دەکرد.

٣- هێرشکردن و داگیرکردن و سوتاندنی بنکە دەوڵەتیەکان.

٤- وەرگرتنی پارە لەخەڵکی.

(و) لەکۆتایی ساڵی (٨٥) و دواتر: لەدوای گرتنەوەی تەواوی ناوچەکان دەرکردنی هێزی پێشمەرگە سەرکەوتنی بەرچاوی هێزەکانی دەوڵەت لەهەموو بەرەکانی باشور و رۆژئاوا بەسەر بەعسی عێراقدا و بۆردومانکردنی بارەگاکانی دیموکرات و کۆمەڵە لەناوخاکی عێراق، تواناکانیان زۆر لاواز بوو، پاشان لەچۆنیەتی ئاراستەکردنی چالاکیەکانیان خۆیان ناکۆکی کەوتە نێوان سەرکردەکانی هەردوو حیزبەکەو پەیوەندیەکانیان بەبنبەست گەیشت، بەڵام لەژێر فشاری سەدام پارمەتی دارایی ئەوان لەلایەن حکومەتی عێراقەوە ناکۆکیەکانیان تا کۆتایی جەنگی ئێران و عێراق بێدەنگکرا،* بەدرێژایی ماوەی نێوان (١٩٨٥ تا ١٩٨٩) زۆربەی لایەنگرانی ئەو دوو حیزبە وازیان لەو دوو حیزب هێنا و پێشمەرگە کوردەکان لەدرێژەکێشانی ماوەی شەر و شکستی لەسەرخۆی هێزەکانیان و قبولکردنی بریاری (٥٩٨) لەلایەن ئێرانەو** کشانەوەی هێزەکانی بۆ ناوەوەی وڵات، ئەم دوو حیزبە تووشی قەیرانێکی مادی و مەعنەوەی بوون و دەستیان لەخەباتی چەکداری هەڵگرت و لەودیوی سنور (واتە هەرێمی کوردستان) جێگیربوون.

ئێستا لەتەواوی ناوچە کوردیەکان ئاسایش بەرقەرارە، بودجەی زیاتر بۆ ئەم ناوچانە تەرخانکراوە و پرۆژەی گەورە لەرووی بەرهەمی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری و پیشەسازی لەم ناوچانە جێبەجێدەکرێت.

ئەوەی شایانی باسە لەکۆتایی ساڵی (١٩٩١) حیزبی دیموکرات خاوەنی (١٥٠٠) کەسە لەهێزی پێشمەرگە و کۆمەڵەش خاوەنی (٥٠٠) کەسە کە لەکوردستانی عێراق جێگیرن و هەریەکە لەم دوو حیزبە خاوەنی ئیسگەیەکی رادیۆیین کە بۆماوەی یەك کاتژمێر لەرۆژێکدا بەرنامەکانی بۆ ناوچە کوردنشینەکان بڵاو دەکەنەوە (ئەمرۆ ئەم حیزبانە خاوەنی کەناڵی تەلەفیزیۆنی سەتەلایتین - وەرگێر). لەدوای هێرشی عێراق بۆسەر کوێت بەرپابوونی جەنگی کەنداو و راپەرینی کوردەکان لەباکور و شیعەکان لەباشور و دانانی ناوچەی دژەفرین لەلایەن رێکخراوی نەتەوەکانەوە و پاڵپشتی نەکردنی ئێران لەسەدام حسین لەماوەی جەنگەی کەنداودا، رێکەوتنێك لەنێوان ئەو دووحیزبە هەیە لەگەڵ حکومەتی ئێراندا کە هیچ هێرشێك بۆسەر کۆماری ئیسلامی ئەنجام نەدەن.

---

* ) لەراستیدا ئەم دوو هێزە لەناوچە ئازادکراوەکانی کوردستانی عێراق کە لەژێر دەسەڵاتی یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا جێگیر بووبوون وە رۆڵی یەکێتی زۆربوو لەنزیککردنەوەی ئەم دوو حیزبە و وەستاندنی شەری براکوژی نێوانیان نەك سەدام و حکومەتی عێراق - وەرگێر.

** ) ئەم بریار لەلایەن نەتەوەیەکگرتووەکانەوە سەپێنرا بەسەر عێراق و ئێراندا بۆ راگرتنی شەریماڵوێرانکەری نێوانیان بەڵام ئێران لەسەرەتادا قبوڵی نەکرد بەڵام لەدوای ساڵێك لەژێرفشاری نێودەوڵەتی قبوڵیکرد و خومەینی دوای سەرسەختیەکی زۆر و بەکوشتدانی سەدان هەزار لە رۆڵەی وڵاتەکەی قبولکردنی ئەم بریارەی بە خواردنەوەی جامێك ژەهر چوواند - وەرگێر.

## کۆدە جیوپۆلەتیکیەکانی (Geopolitical Codes) نێران دەربارەی عێراق:

کۆدە جیوپۆلەتیکیەکان گریمانەی ستراتیجین کە دەوڵەتەکان لەفۆرمەلەبوونی سیاسەتی دەرەکی خۆیاندا لەبەرامبەر وڵاتانیتر ئامادەی دەکەن، ئەم کۆدانە پەیوەندی توندوتۆڵی لەگەڵ (بەرنامە هاوشێوەکاندا) هەیە، ئەوکۆدانە چالاکیەکانی ئەودیو سنوری دەوڵەتێك بەپێی گرنگی ستراتیجیان و هەرەشە ڕاستەقینەکانیان هەڵدەسەنگێنێت، کۆدی جیوپۆلەتیکی تەنیا بۆحکومەتی ناوەندی نییە، ئەمانە لەدیدگای تایبەتی و مجردی حکومەتەکانەوە دەربارەی جیهانیش بەکاردەهێنرێت، ئەم کۆدانە بەپێی ناساندنی، وێناکردنی زۆر دەمارگیرانە لەجیهاندا دەردەخات، بەهۆی ئەمەوە ئێمە دەبێت لەگەڵ ئەوانە سازش بکەین و ئەوانە وەك خشتی بینای عەقڵی جیوپۆلەتیك جیهان هەستپێبکەین.

کۆدە جیوپۆلەتیکیەکان لەسەر سێ ئاست کاری پێدەکرێت (ناوخۆیی، ناوچەیی و جیهانی)، کۆدەکان لەسەرئاستی ناوخۆیی دەبێت جێگای هەڵسەنگاندنی دەوڵەتە دراوسێکان بێت، حکومەتی هەموو وڵاتان، هەرچەندە بچوك بێت یان گەورە دەبێت ئەو کۆدانەی هەبێت، کۆدەکان لەسەر ئاستی ناوچەیی بۆ دەوڵەتەکان جێگای گرنگی پێدانە کە لەئارەزوو پیشاندانی دەسەڵاتی خۆی بەبێ وەستان لەبەردەم دەوڵەتانی دراوسێدا هەیە، دەوڵەتە زلهێزە ناوچەییەکان و دەسەڵاتە بەهێزە ناوچەییەکان پێویستە کۆدێکی وا لەسەر نەخشە پیادە بکەن سەرئەنجام چەند دەوڵەتێکی کەم هەیە کە لەسیاسەتەکانی جیهاندا کۆدی جیوپۆلەتیکیان لەسەر ئاستی جیهان بۆخۆیان بەدەستهێناوە.

هەرکاتێك ناوچەیەك یان قەڵەمرەوێکی جوگرافیای بخرێتە ژێر باس و لێکۆڵینەوەی جیوپۆلەتیکیەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە زاراوەی کۆدی جیوپۆلەتیکی پێبووترێت.

کۆدی جیوپۆلەتیکی لەڕاستیدا باس و ئەرکی دەوڵەتەکان لەکاروباری سیاسەتی دەرکی دیاریدەکات. لەڕاستیدا وڵاتان بە هەڵبژاردن و دیاریکردنی کۆدی جیوپۆلەتیکی باشتر دەتوانن بەمەبەست و ئامانجە ستراتیجیەکانی خۆیان بگەن، دیاریکردنی ئەو کۆدانە دەوڵەتەکانی ئەوبەری دەریا لەهەلومەرجی گرنگی ستراتیجی بەئاراستەی هەرەشە بەهێزەکان هەڵدەسەنگێنێت، دیاریکردنی ئەو کۆدانە تایبەت بە هێزە گەورەکان نییە، بەڵکو هەموو وڵاتان دەتوانن کەڵك لەمە وەربگرن، کۆدە جیوپۆلەتیکیەکان خاوەنی چەمکی تایبەتن چونکە وڵاتانی جیهان هەریەکەیان دەیەوێت بەئاراستەیەك بڕوات کە خۆی هەستی پێدەکات، ئەم هەستەش بەزۆری دروستکراو و هەڵبژاردەی بیری ژمارەیەکی کەمی دانیشتوانی وڵاتن و لەوڵاتانی تازەپێگەیشتوو هەندێکجار لەیەك کەسدا کۆدەبێتەوە، بەڵام کۆدی جیوپۆلەتیکی ئەو وڵاتانە بەئاراستەیەك ڕێنوێنی دەکرێت کە بتوانێت لەگەڵ پێکهاتە جیوپۆلەتیکیەکانیتردا هاوئاهەنگی تەواوی هەبێت.

سیستەمی جیوپۆلەتیکی بەهەر سێ پێوەری ناوخۆیی، ناوچەیی و جیهانی دەبێتە جیگای باس و لێکۆڵینەوەیە، کۆدی جیوپۆلەتیکی ناوچەیی ڕێنمای وڵاتان دەکات کە وەك هێزی ناوچەیی خۆیان بناسێنن یا ئەو وڵاتانەی کە بەشێوەی بەهێز دەتوانن وەك هێزێکی ناوچەیی دەرکەون، بەڵام دیاریکردنی کۆدی جیوپۆلەتیکی جیهانی تایبەتە بەهێزە جیهانیەکان و هیچ پێویست ناکات وڵاتانێك کە بەهۆکاری جیاوازی جیوپۆلەتیکی و جیوستراتیجی ناتوانن بەشێوەی هێزی جیهانی دەرکەون لەنیازی تۆمارکردنی کۆدی جیوپۆلەتیکی جیهانیدابن، بەڵام دیاریکردنی کۆدی ناوخۆیی یان نەتەوەیی بۆ هەموو وڵاتان پێویستە و ڕێنمایی دەکرێت، ئەمە بەو مانایە نییە کە وڵاتێکی پلە (٢ یان ٣) لەفراوانکردنی بیرکردنەوەی جیوپۆلەتیکیدا لەگەڵ هەموان لەدژایەتیدا نەبێت، چونکە هەندێك کات کۆدەکان لەگەڵ یەکتر هاوئاهەنگیان نییە، بۆ نموونە کۆدی جیوپۆلەتیکی ناوچەیی و گشتی لەرۆژهەڵاتی دەریایی ناوەڕاست لەگەڵ یەکتر دژبەیەکن، نێوانی تورکیا و یۆنان، ئەوە بەهۆی لاوازی جیوستراتیجی تورکیا لەکەنارەکانی دەریای ناوەڕاست و هەبوونی توانایەکی زۆر بەرزی جیوستراتیجی لەلایەن یۆنانەوە، مەسەلەی داگیرکردنی قبرسیش لە ناکۆکی کۆدی ناوخۆیی و ناوچەییەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەگەر کۆدە ناوخۆیی و ناوچەییەکان لەگەڵ یەکتر ناکۆکبن، لەوانەیە هێزێکی جیهانی لەم لاوازی جیوپۆلەتیکیە سوودوەرگرێت مەگەر لەو دژایەتیە بەرژەوەندیەکانی بەشێوەیەك بپارێزرێت، بۆیە ئەم داواکاریە بەووردی لەکارەکانی تورکیادا هاوئاهەنگی هەیە و لەم بارەیەوە پەیمانی ناتۆ ناچارە لەنێوان هەردوولادا هاوسەنگی ڕابگرێت، بۆیە وڵاتانێك کە لەدیاریکردنی کۆدی جیوپۆلەتیکی خۆیدا هەست دەکات لەدژایەتیدایە، دەبێت بەهەر شێوەیەك بێت بچێتە ناو پەیمان و ڕێکەوتن و یەکگرتنەکانەوە بەجۆرێك کە قازانج و بەرژەوەندیە نەتەوییەکانی نەخاتە مەترسیەوە تا لەسایەی ئەو پەیماننامەیەدا ڕێبگرێت لەولێکەوتە نەخوازراوانەی کە ڕووبەڕووی دەبێتەوە، لەبەرئەوە پەیماننامەکان باشترین دەرکەوتەی کۆدەکانە بە تایبەت لە پێوەرە ناوچەییەکاندا، ئەگەر ئێمە مێژووی جەنگەکان بەتایبەت لەسەدەی بیستەمدا کە بەسەدەی کارەساتەکان ناودەبرێت بکۆڵینەوە هەستدەکەین کە ئەگەر وڵاتانی بەشەرهاتوو لەجەنگدا بەتایبەت وڵاتانی بچووك کۆدە جیوپۆلەتیکیە ناوخۆییەکانی ڕاست و دروست دیاریکردبێت تا ئاستێکی زۆر لەدەرکەوتنی جەنگ و پێکدادانە ناوخۆیی و ناوچەییەکان خۆیان پاراستوو، بێ هۆنییە کە ئەمڕۆ گەیشتوونەتە ئەو باوەڕەی کە ئەگەر جوگرافیزانانی سیاسی هەوڵبدەن و لەجوگرافیای ستراتیجی بکۆڵنەوە بەسوودوەرگرتن لەهۆیەکانی جەنگەکان و قەیرانەکان نموونەیەکی لەبار هەڵدەبژێرن و تا ئاستێکی بەرز ڕێدەگرن لەهەڵگیرساندنی جەنگەکان، ئەزموونی جەنگە ناوخۆیی، ناوچەیی و جیهانیەکان چ لەڕابردو و ئێستا چ لەئایندەدا لایەنگری ئەوە دەبێت کە فاکتەری سەرەکی هەڵگیرساندنی جەنگەکان بەهۆی ناکۆکی کۆدە جیوپۆلەتیکیەکانی دراوسێکانەوە ڕوویانداوە، ئەگەر ئێمە بتوانین کۆدی ناوخۆیی بەسەرکەوتوانە

بخەینەکار ڕێگا بۆ پێشەوایی ناوچەکە هەموارکەین سەرکەتن لەم قۆناغەدا زۆرتردەبێت، وەك ئەوەی ئەگەر ئێمە چاوێك بەسوڕانەوەی هێز لەجیهاندا بخشێنین هەمان ڕەوت هەست پێدەکەین و باشترین مۆدێل بۆ ئەمکارە ڕەوتی گۆڕانی سیاسی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە لەهەوڵدانی بۆ زاڵبوون بەسەر جیهان و دەوروبەری خۆیدا و تائەو جێگایەی بووە باڵادەسترین هێزی جیهانی، بۆنموونە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا تاپێش جەنگی دووەمی جیهانی سوودی لەکۆدی جیوپۆلەتیکی سنوردار وەردەگرت کە خۆی بەشێوەی کۆمەڵە چالاکیەك كاریدەکرد کە لەڕاستیدا بنەمای سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکای پێکدەهێنا.

یەکەمین گۆڕان لەدیاریکردنی کۆدی جیوپۆلەتیکی وڵاتە یەکگرتووەکان کاتێك دەستپێکرد کە گادیز (Gaddis) خستیەڕوو کە هەموو ناوچەکانی جیهان بۆ ئاسایش و بەرژەوەندی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەیەك ئەندازە گرنگنییە، بەڵکو هەندێك ناوچە لەسەر ئاستی گۆی زەوی ڕۆڵی گرنگتری هەیە و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ بەرەوپێشبردنی ئامانجە ستراتیجیەکانی خۆی دەبێت زیاتر سەرنج لەم ناوچانە بدات کە بریتین لەڕێگای پەیوەندی کەنەدا لەگەڵ ئەورووپای ڕۆژئاوا لەڕێگای ئۆقیانوسی ئەتلەسیەوە، حەوزی دەریای ناوەڕاست و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست کە لەم بوارەدا ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست لەپلەی یەکەمدایە و لەناو وڵاتانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستیشدا ئێران لەپێشەوەیە، ئەم بیرکردنەوە جیوپۆلەتیکیە تاپێش جەنگی سارد جێگای سەرنجی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بوو، وەدوای جەنگی سارد لەگەل سەرنجدان لەوهەموو گۆڕانکاریە فراوانە کە لەناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست ڕوویدا، وڵاتی عێراقیش هاتە ڕیزی ئێرانەوە و لەم بوارەدا پێگەیەکی ستراتیجی تازەی وەرگرت.

بەشێوەیەکی گشتی گۆڕانکاریەك کە ئێستا لەجیهاندا خەملیوە مەبەست لێی ئەوەیە کە پێکهاتەیەکی جیوپۆلەتیکی لەحاڵەتی فۆرمەلەبووندایە. ئەم پێکهاتەیە تارادەیەکی زۆر کارتێکراوە لەڕووخاندنی قەڵەمڕەوی جیۆستراتیجی و شوێنکەوتووی ستراتیجێکی گشتیە، لەبەرئەوە ئەگەر وڵاتێك لەلێکدانەوەی جیوپۆلەتیکی خۆیدا سەرنج لەبیرکردنەوەی تاکی یان گروپی بدات، ناتوانێت واقیعەتی جوگرافیای وڵاتەکە هەست پێبکات، لەکاتێکدا کە ئێمە لەلێکۆڵینەوەی کۆدی جیوپۆلەتیکی زیاتردەبێت لەگەڵ چەمکی جوگرافی سەروکارو پەیوەندیان هەبێت، ئەو چەمکانەی کە ئێمە بەرەوو ڕێکاری کرداری و ئەرێنی ئاراستە دەکات.

وڵاتی عێراق کە لێرەدا شوێنی باسەکەمانە مەسەلە جیوپۆلەتیکیەکانی ئەوەندە ئاڵۆزە کە بەبێ ئاسۆی جیهانی و ناوچەیی دیاریکردنی کۆدی جیوپۆلەتیکی بۆی بەشێوەی تەواو کارساز نییە، چونکە ناوێتەکردن و گونجاندنی ئەو فاکتەرە جوگرافیە سروشتی و مرۆییانەی کە لەم وڵاتەدا هەیە لەحاڵەتێکی ناوازەدایە، بۆیە نادیدەگرتن یان گوێپێنەدان بەهاوتاهەنگی دەرئەنجامەکان، سەرئەنجام لەوانەیە بگۆڕێت بۆ کێشەی ناوچەیی و جیهانی.

لەبەرئەوە بۆ رووە جیاوازەکانی ئەرکانەکانی کۆدی جیوپۆلەتیکی دەبێت زۆر بەووردی بابەتەکان شیبکەینەوە بەشبەش لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەین و دواتر بەناوێتەکردنی ئەنجامەکان بریاری گشتی لێبدەین.

## پەیوەندی عێراق :

بەسەرنجدان لەرەوتی گۆڕانکاریەکان کە لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی لەسەر عێراق روویداوە، ئەوەی پەیوەندیدارە بەدەوڵەتی عێراقەوە دەتوانین ئاماژە بۆ دوو قۆناغی گشتی بکەین، قۆناغێکیان لەجەنگی یەکەمی جیهانی تاساڵی (١٩٥٨) دەگرێتەوە، لەم قۆناغەدا بەهۆی بەرقەراری رژێمی پاشایەتی فەرمانڕەواوە پەیوەندی بنەماڵەیی لەگەڵ فەرمانڕەوایانی دراوسێی وەك ئەردەن و عەرەبستانی سعودی، سەرنجیان زیاتر بەوئاراستەیە بوو کە پەیوەندی بنەماڵەیی وەك ژێرخانی بەرقەراری پەیوەندی باش و ئاشتیخوازی لەنێوان ولاتانی عەرەبی ناوچەکە رۆڵی دەبینی، بەلام بەهۆی خێرایی گەشەی فکرەی لەناوچەکە بووەهۆی گۆڕانکاری لەحوکمرانیدا، لەلایەکیترەوە جیهانی دوو جەمسەری بەسەرۆکایەتی ئەمەریکا و یەکێتی سۆڤێت هەریەکەیان هەوڵیدەدا دەستبخاتە ناوچەکانی نفوزی یەکترەوە، ولاتی عێراق یەکەمین ولات بوو کە توانی لەناوچەی تێفکریندا هێڵی رەوتی خۆی لەرۆژهەلاتی ناوەراست پیادەبکات و بەو هۆیەوە جێپێیەك بۆخۆی دروستبکات، بەچەندین هۆکاری جیاجیا لەوانە ناکاملی سیاسی پاشا یەکەمین ستراتیجی فراوانکردنی فکری سۆسیالیزم بەسەرۆکایەتی یەکێتی سۆڤێت لەعێراق گەیشتە ئەنجام و بەکودەتای (١٩٥٨) دەسەلاتی پاشایەتی روخێنراو و رژێمی کۆماری جێگای گرتەوە، ئەم ئالوگۆڕوو و گۆڕانکاریە وەك بوومەلەرزەیەکی بەهێز هەموو ولاتانی ناوچەکەی لەرزاند، دەتوانین بلێین دوای شۆکی (صدمە) جەنگی دووەمی جیهانی، ئەم شۆکە گرنگترین تایبەتمەندی خۆی هەبوو، چونکە بەیەکجاری پەیوەندی دەوڵەتی لەحاڵەتی تاکەوە راکێشا بۆ حاڵەتی کۆ و بەسەرەتای گۆڕانکاریەکی گەورە دەژمێردرێت.

لەوسەردەمەدا پێکهاتەی سیاسی/ئابووری و سەربازی عێراق بەشێوەیەك بوو کە سەربازەکان وتەی کۆتاییان دەووت و ئەم گۆڕان و وەرچەرخانە دەسەلاتی ئەوانی زیادکرد، بۆیە گۆڕانکاریەکان بەشێوەیەك پێشدەکەوت کە پەیوەندی دەوڵەت بەئاراستەی بەهێزکردنی دەسەلاتی سەربازی، زۆرداری، ترس و هەرەش و لەناویاندا هەرەش بۆسەر دراوسێکان بووە بەشێك لەسیاسەتی ئەم دەوڵەتە، ئەم بیرکردنەوە سەربازیە لای دەسەلاتدارانی عێراق لەلایەن دەسەلاتێکی نێودەوڵەتیەوە بەهێزدەکرا، لەبەرئەوە پەیوەندی دەوڵەت لەکۆیلەیەکی زۆر کورتدا بەشێوەی ناوخۆیی و جیهان لەسەر یەکتر هاوجووت دەبوو، بەجۆرێك کە گۆڕانکاریەکان شوێنکەوتووی رێکخەرێکی کاتیبوون، بەبێ ئەوەی کە پەیوەندی ولات گۆڕانی زۆری بەسەردابێت، پەیوەندیداری نەتەوەیی لەسەر بنەمایی جیهانی ئامانجی ستراتیجی ووشکانی بۆخۆی

وەرگرت کە وەردەوردە کاریگەری لەسەر وڵاتانیتری ناوچەکە بەجێهێشت لەوانە سوریا، ئەم دوو وڵاتە بەهۆی جیاوازی حیزبییەوە لەیەکتر جیابوونەوە، ئەو پەیوەندیدارییەی کە بەدرێژایی قەیرانەکان کە عێراق رووبەرووی بووەوە، توانی خۆی بگەیەنێت بەئامانجی ستراتیجی ووشکانی، لەکاتێکدا خۆگونجاندن و یەکپارچەیی دانیشتوانی وڵات بەمەبەستی گۆران بۆ هێزێکی یەکگرتوو دەرکەوت. بەهەمان ئاراستە، عێراق لەم بوارەدا جارجار فشارەکانی دەخستە سەر دراوسێکانی, کە دەیویست ئامانجە ستراتیجیە جیهانیەکانی هێزی وشکانی لەمڕێگا بەرزکردنەوەی بەرژەوەندی نەتەوەیی و پەرەپێدانی ئامانجە نەتەوەییەکان سەرنجبدات کەلەم ڕێگایەوە تارادەیەك سەرکەوتن بەدەستبهێنێت، ئەم بارودۆخە بەخێرایی لەدروستبووندا بوو کە بەرووخاندنی یەکێتی سۆڤیێتی پێشوو، وڵاتانێك کە شوێنی تایبەتیان لەستراتیجی رۆژئاوا و رۆژهەڵاتدا هەبوو کەوتنە ژێرکاریگەریەوە، لەم بارەدا عێراق پێش سووریا کەوتە ژێرکایگەریەوە، ئەو رووداوانەی کە لەپێشداڕوویدا بەیەکجاری ئامانجەکانی کە لەبیری فەرمانڕەوایانی ئەم وڵاتە و سیستەمی حکومەتەکەی وەك کۆمەڵێکی حیزبی کاریانەدەکرد و گۆڕانیان بەسەرداهات چونکە بیرکردنەوەی سەرەتایی کە بووەهۆی پەیدابوونی حیزبی بەعس و پێکهێنانی حکومەت و دیاریکردنی پەیوەندی حکومەت بوو، رووخان و بەڵگەی مانەوەی نەما کە لەژێر کۆمەڵێك هێزە بەرگریدا هەیبوو. لەئەنجامدا بەهۆی نەمانی ئەو پشتیوانیەی لەرووی ستراتیجیەوە هەیبوو، عێراق بۆ مانەوەی خۆگونجاندنی بەشێوەیەك کە ناتەبابوو، ناچاربوو لەوڵاتانی ناوچەکە نزیك بێتەوە و لەم بوارەدا دەیەوێت لەبەشێك لەوبابەتانەی کە پەیوەندیداری سەرەتاییە هەڵوەشێنێتەوە کە بەشێوەی نموونە بەبێ هیچ مەرجێك لەگەڵ دراوسێ عەرەب و ناعەرەبەکاندا رووبدا. بەسەرنجدان لەگۆرانکاریە خێرا نێودەوڵەتیەکان و رووداوەکان کە لەم وڵاتەدا روویاندا دەبێت چاوەڕوان بکرێت عێراق لەپەیوەندیەکانی خۆی تێڕوانینی تازەی هەبێت.

**هەڕەشەکان:**

یەکێك لەفاکتەرە گرنگەکان کە بەشێوەی بەرفراوان کاریگەری لەسەر پێکهاتەی سیاسی وڵاتەکان بەشێوەی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بەجێدەهێڵێت مەسەلەی هەڕەشەیە، هەرچەندە هەڕەشەکان بەشێوەی کلاسیکی خۆی کاریگەری لەسەرژیانی نەتەوەیی وڵاتەکانە کەمبۆتەوە بەڵام بەتەواوی لەناونەچووە، گرنگترین تەوەرەی ئامانجی ستراتیجی سەربازی پشت بەهەرەشەکانی سەرزەوی دەبەستێت، لەم بوارەدا هەرسێ پێوەری ناوخۆیی، ناوچەیی و جیهانی راستە. لەڕابردوویەکی تارادەیەك دووردا سەرهەڵدانی هەر قەیرانێك لەناوچەکانی جیهان بەهەرەشەی سنورە سیاسی و نێودەوڵەتیەکان دەستیپێدەکرد، ئەم مەسەلەیە تانێستاش بەجۆرێك هەرماوە، بەڵام بەتێڕوانینێك لەڕوەتی گۆڕانکاری جەنگەکان و گۆڕانێك کە لەئامانجەکانی دێتە پێشەوە، هەڕەشەی سنورە سیاسیەکان ئەمڕۆ بەشێکە لەئامانجی ستراتیجی جەنگە بێسنورەکان، لەتایبەتمەندیەکانی ئەم جەنگانە ئەوەیەکە سنورەکان گۆڕانیان بەسەردادێت، جێگای

باسکردنە کە جەنگی بێسنور بۆ گۆڕان لەسنوری سیاسیدانییە، بەڵکو یەکێك لەپەیامەکانی جەنگی بێسنور گۆڕانی شێوەی سنورەکانە لەڕێگای هەڕەشە سەربازیەکانەوە، ئەمڕۆ ئەگەری هەڵگیرسانی جەنگی بێسنور زۆر کەمە، بۆیە هیچ بەڵگەیەك نییە کە سنورە سیاسیەکان بەبچوکترین گۆڕانکاری نێوان وڵاتەکان دوچاری گۆڕان و گۆڕانکاری ببێت، لەبەرئەوە ئامانج لەهەڕەشەکان ڕووی جیاوازی ئەوانە کە بەشێوەی باو و ناسراو لەوانەیە بۆ وڵاتێك پەیدابێت، لەم بارەیەوە لەوانەیە بەشێوەی سیاسی، یائابووری و یابەشێوەی سەربازی دەرکەوێت، یەکێك لەتایبەتمەندیەکانی گۆڕانکاریەکانی ئەم دواییەی جیهان ئەوەیە کە بەپێچەوانەی ڕابردووەوە بۆ سەپاندنی ئیرادەی وڵاتەکان بەسەر وڵاتانیتردا ڕاستەوخۆ پەنا نابرێتەبەر جەنگ، ئەمڕۆ جەنگ یەکێکە لەوەسیلەکانی هەڕەشی کرداری بەڵام بەدواهەمین ڕێگا دەژمێردرێت، لەبەرئەوە هەڕەشەی سیاسی، ئابووری و سەربازی کە بەشێوەی باو کاریپێکراوە، ڕاگەیاندن ڕۆڵی گرنگ دەگێڕێت و لەم بارەیەوە پەیوەندیەکان و هاوئاهەنگی نێودەوڵەتی ڕۆڵی تایبەتی هەیە.

بەگۆڕانکاریەك کە لەسەرەتای دروستبووندایە، هەڕەشەکان زۆرتر لایەنی ئابووری پێکهێناوە، بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە کە هەڕەشەکانیتری سیاسی و سەربازی نییە، بەڵکو پێوەری جیاجیا هەیە، بەواتە لەپێوەری جیهانیدا هەڕەشەی ئابووری بەڵام لەپێوەری ناوخۆیی و ناوچەیی هەڕەشەی خاك هەیە، کە وەك سەرچاوەی کاریگەر هەمیشەیی نەبێت بەڵکو وەك باسکێکی فشار بۆ سەپاندنی ئیرادە و مەبەستی تایبەتیە ڕۆڵ دەبینێت، بۆیە دەتوانین بڵێین هەڕەشەکان لەناوخۆی سنوری سیاسی وڵاتەکان چڕبۆتەوە و ئەگەر بەشێوەی ناوچەیی ئەم هەڕەشەیە دەرکەوێت کاتی بووە، کە ئامانجی بەهێزکردنی قەیرانی ناوخۆیە و خۆشکردنی زەمینەیە بۆ بیرکرنەوەی ستراتیجی.

عێراق وڵاتێکە بەپێی پێگەی تایبەتی خۆی کە بەپێی ڕێچکەی گۆڕانکاریەکانی جیهان، ئەگەری هەڕەشەی سیاسی و ئابووری لەسەری زۆرترە وەك لەهەڕەشەی سەربازی، ئەم شێوازە زادەی بیرکردنەوەی سیستەمی نوێی جیهانە کە ئەگەری هەڕەشەی سەربازی ناوچەیی تا ڕێژەیەکی زۆر ئەستەمە، هەڵبەت ئەمجۆرە شێوازی بیرکردنەوەیە لەڕووی پێکهاتەی سەربازی وڵاتەکان کاریگەری ئەوتۆی نییە بەڵام ئامانجەکانی ئەوان تائاستێك دەگۆڕێت.

لەئێستادا دەتوانین سەرچاوەی سەرەکی هەڕەشەکانی عێراق لەدوو گروپی سەرەکی وەك فاکتەری ناوخۆیی (ناوەوەی سنور) و هەروەها فاکتەری دەرەکی (دەرەوەی سنور) دیاری بکەین و لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لەسەر هەریەکەیان بکەین.

## فاکتەرە ناوخۆییە هەڕەشەئامێزەکان:

فاکتەری ناوخۆییش بۆ دوو بەشی سەرەکی دابەش دەکرێت کە بریتییە لەفاکتەری مرۆیی و سروشتی، بۆیە لێکۆڵینەوە لەیەکبەیەکی سەرچاوەکانی هەڕەشە دەتوانێت یارمەتی وڵات لەوەرگرتنی ڕێکاری گونجاو کە پێویستە بۆ کۆدی جیوپۆلەتیکی بدات، لەبەرئەوە ئەگەر وڵاتێک نەتوانێت سەرچاوەکانی هەڕەشە بەباشی بناسێت و هەڵیسەنگێنێت، ناتوانێت بەشێوەیەکی ژیرانە ڕووبەڕووی بێتەوە.

عێراق لەڕووی پێکهاتەی مرۆییەوە هەمەچەشنە و ئەم پێکهاتەیەش هەلومەرجێکی نالەباری سروشتی و ناسازگاری پێبەخشیوە، بەڵام ئەگەر چاوێك بگێڕین بەمێژووی دروستبوونی وڵاتی عێراقدا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم فاکتەری مرۆییە بەتایبەت نەژادی کورد نەك تەنیا بۆ عێراق وەك سەرچاوەیەکی هەڕەشە ڕۆڵی کاریگەر دەبینێت، بەڵکو وڵاتانی ئێران و تورکیا و سوریاش سەبارەت بەم هەڕەشەیە لەئارامیدا نین، کە لەماوەی جیاجیای مێژوویدا ئەم فاکتەرە ڕۆڵی لەسەریان هەبووە.

بەسەرنجدان لەپێگە و شوێنی عێراق، ئەم پێکهاتە مرۆییە هەندێکجار بەشێك بووە لەنامانجی ستراتیجی جیهانی، بەهەمان هۆ ئێستا چارەسەری کێشەی کورد لەعێراق چووتە دەرەوەی سنوری ئەم وڵاتە و لەسەر ئاستی جیهان قسەو باسی لێوەدەکرێت، بۆ وڵاتانیتری ناوچەك واتە تورکیا ئەم سەرچاوەی هەڕەشەیە تەنیا لایەنی ناوخۆیی هەیە و لەهاریکاری و یارمەتی نێودەوڵەتی بەدوورە، ئەمە لەکاتێکدایە کە ڕێژەی هەڕەشە لەسەر تورکیا هەم لەڕووی قەبارەوە زیاترە و هەم لەڕووی ڕووبەڕووەی خاکەوە زیاترە، بەهەمان شێوە ئێرانیش هەروەك تورکیا بەپلەیەکی کەمتر ئەم هەڕەشەیەی لەسەرە، لەبەرئەوە دەبینرێت عێراق لەم بارەیەوە هەڕەشەی زیاتری لەسەرە، لەگەڵ ئەوەی هەوڵدەدات ئەم کێشەیە بەشێوەی ئیشتمانی بەبێ ئاماژەکردن بۆ نەژاد لەوڵاتدا چارەسەربکات، حکومەتی عێراق پێوایە ئەم هەڕەشانە دروستکراوی دەستی بێگانەیە و میللەتی عێراق بەپێکهاتەو و تایبەتمەنی جیاوازەی دانیشتوانەوە لەژێر یەکدەسەڵاتدان و هەموویان خوازیاری بەدیهێنانی ئامانجە ئیشتمانیەکان و پاراستنی ژیان و بەرژەوەندی ئیشتمانین، هەرچەندە تائێستا بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە سەرکەوتوو نەبووە بەڵام حکومەت نایەوێت خۆی فاکتەربێت بۆ بەهێزکردنی ئەم سەرچاوەی هەڕەشەیە.

فاکتەری دووەمی سەرچاوەی هەڕەشەی سەر عێراق ناوەندەکانی کۆبوونەوەی مرۆییە لەباشوری عێراقدا، کە لەڕووی بیرکردنەوە و ئەندێشەوە لەناوچەکانی ناوەڕاستی وڵات جیاوازن و لەگەڵ دەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی لەئێران جێگای تایبەتیان پەیداکرد، شوێنی جوگرافیای ئەمان (واتە شیعەکانی عێراق - وەرگێڕ) بەشێوەیەکە جیاوازە لەسەرچاوەی هەڕەشە لەباکور کە ڕێکاری سیاسی ئابووری هەیە، هەروەها ڕێکاری سەربازی کاریگەری لەڕێکاری سیاسی و ئابووری زیاترە، بەجۆرێك کە ئەمە خاڵی لاوازە بۆ ئەم

سەرچاوەی هەڕەشـەیە، بـەهۆی بێتوانـایی لەڕووبەڕووبونـەوەدا دەپێوڕێت مەگـەر لـەڕێگای کۆمـەڵگای نێودەوڵەتیەوە پارێزگاری لێبکرێت، هەڵبەت دەوڵەتی عێـراق دەتوانێـت لـەم بارەیـەوە ڕێکـاری سیاسـی و ئابووری بۆ چارەسـەری کاتی مەسـەلەکە وەك چـالاکی دواخـستن سـودی لێوەربگرێـت و ئەمـەش بەدراوسـێ ڕۆژهەڵاتیەکەیەوە (ئێران) پەیوەستە، هەتا ئەندازەی پەیوەندیەکانی لەگـەڵ دراوسـێکەی فراوانبێـت ڕۆڵـی هەڕەشەی باشور کەم دەبێت، لەوانەشە ڕۆژێك بێت بەتەواوی ئەم هەڕەشەیە بڕەوێتـەوە، ئـەم بیرکردنەوەیـە لەم سـەرچاوەی هەڕەشەیە لەگەڵ ئامانجی ستراتیجی جیهانیشدا هاوئاهەنگی هەیە.

لەناوفاکتەرە ناوخۆییـەکانـدا فاکتـەری سروشـتیش وەك سەرچـاوەیەکی هەڕەشـە دەژمێردرێـت کـە لەناونەم فاکتەرە سروشتیانەدا دەرامەتی ژێرزەوی بەتایبەت نەوت شوێنێکی تایبـەتی هەیـە و تانـەمڕۆش بەردەوامە، ئەگەر ئەم وڵاتە نەتوانێت تێبینیە جیوپۆلەتیکیەکانی نەوت چاودێرییکات، بەدڵنیاییـەوە وەك سەرچاوەیەکی هەڕەشە کاردەکات.

**فاکتەرە دەرکییە هەڕەشەئامێزەکان:**

دیاریکردنی کۆدی جیوپۆلەتیکی لەبەرامبەر قەڵـەمڕەوی جوگرافیـایی جیـاوازە، هـەروەك ئـەوەی ئاماژەی بۆکرا پێویستە کۆدی جیوپۆلەتیکی ناوخۆیی و ناوچـەیی و جیهـانی لەپەیوەندیـەکی گونجـاودابن، مەسـەلەکانی دەرەوەی سنوری وڵاتی عێراق دەکرێت لایەنێکی ناوخۆیی و لایەنێکی نێودەوڵەتیان هـەبێت، هەردووکیان بۆ عێراق پەیامی جۆراوجۆریـان هەیـە و لـەڕابردوودا لەناوچـەی جیاجیـا بەشـێوەی بەشـبەش کاریانکردووە، عێراق لەکۆتایی سنوری باشوری ڕۆژهەڵات لەقورنەوە تا فاو بە درێژیی نزیکەی (٣٠٠)کم، کە شەتولعەرەب بەشێك لەسنوری هاوبەشی نێوان عێراق و ئێران پێکدەهێنێت، ڕێڕەوی ئەم ڕووبارە لەهەر لایەك توانای کەشتیوانی هەیە، بەڵام ئەم یەکیە لەشوێنی نەمانی ڕووباری (خێن) تێکدەچێت، لەئەنجامـدا دەسـتگرتن بەسـەر حاکمیەتی شەتولعەرەبدا بەشێکە لـەئامانجی سـتراتیجی سـەربازی ئـەم وڵاتـە و دەبێتـە جێگای جەختکردنەوە لەسەری، بەم هۆیەوە لەگەڵ ئەوەی پەیوەندی نێـوان هـەردوو وڵاتـی عێـراق و ئێـران ئاڵۆزبێت بەدواداچون بۆ ئەم کۆدە جیوپۆلەتیکیە هەڵدەستن بەهەنگاوی بەرگرتن.

هەروەها ئامانجی نێودەوڵەتی ئەمـە لەقۆناغـە جیاجیاکانـدا جیـاوازە بـووە، لەسـاڵی (١٩٥٨ تـا ١٩٨٩) تێکشکانی ئیسرائیل لەئامانجـەکانی بـووە ئـەوەی بـۆ خـۆی وەك هەڕەشـەیەکی جیهـانی سـەیری کـردووە و هەوڵیـداوە سـەبارەت بـەم سـتراتیجە لەتـەواوی توانـا ناوچـەیی و نێودەوڵەتیـەکانی خـۆی سودوەرگرێت، بەڵام لەدوای ساڵی (١٩٨٩) ئامـانجێکی گـرنگتر جێگـای ئـەم ئامانجـەی پێـشووی گرتـەوە لەبەرئەوە کۆدی جیوپۆلەتیکی نێودەوڵەتی ئەو لەگەڵ پێوەری جیهانی ڕووبەڕووبووەوە، لەجەنگی دووەمـی کەنداودا ئەم هەڕەشە نێودەوڵەتیە لەنزیکەوە هەسـتپێکرا و تانەمڕۆش بەردەوامە.

لەبەرئەوە ئەگەر عێراق نەتوانێت بەم دیاردە ناوخۆیی و ناوچەیی و جیهانیە پەیوەندیەکی ستراتیجی بەرقەرار بسازێنێت ئەگەری گۆڕانکاری تازەتری هەیە. (وەك ئەوەی ڕوویدا و ڕوخانی سەدام و حیزبی بەعسی لێکەوتەوە ـ وەرگێڕ).

## شێوازی ڕووبەڕووبوونەوەی هەڕەشەکان:

دەرکەوتنی هەر قەیرانێك لەهەر سنورێکی جیاوازی جوگرافیدا هاوڕایە لەگەڵ کار و کاردانەوەی جیاوازدا، بۆیە هەوڵی ڕوبەڕووبوونەوە لەگەڵ قەیرانەکان ناتوانرێت سوود لەنوسراوێك (پلانێك) بەتایبەت لەناوچە جیاوازە جوگرافیەکان وەرگیرێت، چونکە ئەزمونەکان سەلماندویانە کە هەر بیرکردنەوەیەك سەبارەت بەهەر دیاردەیەك ئەگەر سەرکەوتوبێت یان شکست بێنێت، مانای وانییە کە هەمان ئەزموون لەهەمان ژینگەی جوگرافی بۆ جارێکیتریش هەمان چارەنووسی دەبێت.

ناوچە لەجیهاندا هەیە کە خاوەنی بەهای ستراتیجیە، هەر کاردانەوەیەك لەبەرامبەر هەر کردارێك لەم ناوچەیە ڕوودات، ڕوبەڕووی پەرچەکردارێکی زۆر بەهێز لەسەر زەمینێکی دورتر لەڕووی جوگرافیەوە دەبێتەوە، ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بەگشتی خاوەنی ئەم جۆرە هەلومەرجیە و ولاتی عێراقیش هەستیاریەکی تایبەتی هەیە و ئەمەش بەلگەی جیاوازیەتی لەگەڵ ولاتانیتری عەرەبی لەناوچەکەدا، بۆیە ئەگەر عێراق لەبارەی هەرەشەی ناوخۆیی و ناوچەیی و جیهانیەوە پەرچەکرداریش بەتەواوی و بەشێوەی لێبڕاوانە لەبارەی پاراستنی بەرژەوەندی و ژیانی نیشتمانیەوە بێت و تێبینیتر لەبەرچاو نەگیرێت توشی شکست دەبێتەوە. لەبەرئەوە عێراق لەلایەن بەرزکردنەوەی کێشەکان دەبێت سوود لە ستراتیجی یەکێتی و هاوپەیانی وەرگرێت و ئەم سیاسەتەش ڕۆژ بەرۆژ بەهای زیاتر پەیدادەکات و بەکارهێنای زۆرتردەبێت. ئەزمونەکانی ڕابردوو پیشانیداوە کە لەسایەی یەکێتی و هاوپەیانی بەرێگای جیاوازی سیاسی، سەربازی، ئابووری، کۆمەلایەتی و فەرهەنگی باشتر دەتوانێت پارێزگاری لە بەرژەوەندی و ژیانی نیشتمانی ولات بکات.

عێراق لەڕابردوودا نەیتوانیوە، لە شێوەکانی ڕوبەڕووبونەوە لەگەڵ هەڕەشەکان بە مۆدێلی جیهانی خۆی بسازێنێت، بۆیە تا ئەمڕۆ شێوەکانی بەرکەوتن لەگەڵ هەڕەشەکان بەهەموو پێوەرێك ڕووبەڕووی شکست بۆتەوە و ئەگەر سەرکەوتنی بچووکیشی بەدەست هێنابێت نەوکاتەبووە کە هاوئاهەنگی لەگەڵ مۆدێلە جیهانیەکان کردووە، نمونەی بەرچاوی ئەمەش مەسەلەی کوردە ئەگەر شەڕوپێکادان لەگەڵ کوردەکان هەندێکجار نەمابێت نەوا ویست لەدەستی حکومەتی عێراقدا نەبووە بەلکو مەرکەزیەت لەکۆتاییهاتنی جەنگ ڕۆلی بینیوە.

بەسەرنجدان لەمەسەلەی ئاشتی عەرەب ئیسرائیل هەڕەشەی ناوچەیی لەسەر عێراق دامرکاندۆتەوە و بەلام هێشتا ڕوبەڕووی دوو هەڕەشەی ناوخۆیی و جیهانی بۆتەوە، بەسەرنجدان لەسیستەمی جیوپۆلەتیکی جیهان کە لەبەردەم پێکهاتندایە، پەرچەکرداری سەربازی ناتوانێت شێوازی ڕوبەڕووبونەوە

بێت لەبەرامبەر هەڕەشەکاندا، چونکە لەگەڵ مۆدێلی جیهانی هاوناهەنگی نییە، ئەگەر عێراق نەتوانێت لەم کاتە هەستیارەدا لەکۆتایی سەدەی بیستەم خۆگونجاندن لەنێوان تامانجە ناوخۆیی و ناوچەیی و جیهانیەکانی خۆیدا بەرقەرار بکات، نابێت چاوەڕوان بکرێت کە زەمینەی جیوپۆلەتیکی لەم بوارەدا توشی هێرش نەبێتەوە.

## ناڕاستەیەك سەبارەت بەجۆرەی ڕوویەڕووبوونەوەی هەڕەشەکان:

بەتێڕوانین لەڕەوتی گۆڕانکاریەکانی جیهان و شێوەکانی ڕوبەڕوبونەوەی قەیرانەکان تێبینی دەکرێت کە گۆڕان و گۆڕانکاریەکی بنەڕەتی سەبارەت بەلابردنی قەیرانەکان و هەڕەشەکان و کێشەکانیتری بەمجۆرە هاتۆتە ناراوە، تاپێش ڕوخانی یەکێتی سۆڤێت ڕوبەڕووبوونەوەی هەڕەشەکان لەهەر ئاستێکدا بووبێت هاوڕابووە لەگەڵ لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی هەمەلایەندایە، بۆیە بچوکترین گوێپێنەدان بۆتە مایەی دروستبوونی کێشەیەك کە قەرەبونەکراوەتەوە، بەڵام ئەو گۆڕانکاریەی کە لەجیهاندا دوای ڕوخانی یەکێتی سۆڤێت لەحاڵەتی دروستبووندایە ئەوەی سەلماند کە دەبێت بۆ ڕوبەڕووبوونەوەی هەر هەڕەشەیەك ناراستەی هاوئاهەنگی بەڕەوتی گۆڕانکاریەکان لەدنیادا بگرین، جەنگی دووەمی کەنداو پێشنەوەی لەڕووی کرداریەوە دەستپێبکات، لەرێگای گەرانەوەی نێودەوڵەتی و لایەنە پەیوەندیدارەکان بەشێوەیەك خرایەڕوو کە ئەگەر بەرووبەڕوبونەوەی بەهێز نەبێت ڕەوتی گۆڕانکاری جیوپۆلەتیکی جیهان دەخاتە مەترسیەوە کە لەبەرژەوەندی وڵاتانی ناوچەکە و جیهاندا نییە، بەم هۆیەوە کاتێکی زۆری ویست تا ئەم بۆچونە توانی لەسەر ئاستی جیاواز شوێنی خۆی بکاتەوە و تائەوکاتەی زۆربەی وڵاتان بەشداربیکەن لەپلانی چالاکیەکەدا و تابەتەواوی بەئامانجی ستراتیجی پەرچەکردار ناشنانەبن و هیچ جۆرە هەنگاوێك نەنێن، سەرەڕای ئەوە بەجۆرێك بەرنامەڕێژی کرا کە هەندێك لەوڵاتانی ناوچەکە هیچ پەرچەکردارێکی نەگونجا و ناهاوئاهەنگ پیشاننەدەن و هەتا هەندێك لەوانە بەپێی ئەوەی بۆیان ڕوونکرابۆوە بەشداریان لەئۆپەراسیۆنەکەدا کرد، لەکاتێکدا ئەم مەسەلەیە لەگەڵ کۆدی ناوخۆیی ئەوانە هاوناهەنگ نەبوو، بەڵام تائەو جێگایەی کە بابەتی بیرکردنەوەی جیهان بوو پەیرەویان لەستراتیجێکی گەورە دەکرد، بۆیە بەبێ هیچ گرفتێك ئەم یەکێتی و هاوپەیمانێتیە بەئەنجامی خۆی گەیشت.

عێراق بەپەیرەویکردن لەمۆدێلی جیهانی دەبوایە بۆ دیاریکردنی کۆدی جیوپۆلەتیکی خۆی تەواوی ئەو ڕووداو و گۆڕانکاریانەی لەبەرچاو بگرتایە، گۆڕان و گۆڕانکاریەك کە لەبەشی باشوری ڕۆژئاوای ئاسیا دوای ڕوخانی یەکێتی سۆڤێت شێوەی گرتووە لەهەموو ناوچەکانیتری جیهان زۆرترە، لەبەرئەوە شێوەگرتنی ڕاستی ئەم گۆڕانکاریە دەبێت بەپێوەری ناوخۆیی و ناوچەیی هۆشیارانە کاربکرێت، چونکە ئەمڕۆ بنەمای ستراتیجیەکان تاناستێکی زۆر لەگەڵ یەکتر نزیکبوونەتەوە جگە لەهەندێك لایەنی بچوك نەبێت ناکۆکی لەنێوانیاندا نەماوە. دەرکەوتووە کە لەڕوبەڕوبونەوە لەگەڵ گۆڕانکاریەکانی ناوچەکە پێنج دەسەڵاتی فعلی

جیهان لەیەك ناوچەدا كە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستە زیاتر لەهەموو ناوچەكانیتر جێگای تێڕوانینە و سەبارەت بەڕوداوەكانی عێراق و مەسەلەی ولاتانی كەنداو ئەمە جێگای تێڕوانینە، بۆیە پێویستە عێراق یان هەر ولاتێكیتری وەك ئەو ئاگادار پەرچەكردای خۆی بێت.

## پێشنیاز و نواندنی ڕێكارەكان:

یەكێك لەجیاوازیە دیار و ئاشكراكان، كە لەنێوان زانستی تازەی جیوپۆلەتیك و هەموو زانستە هاوشێوەكانیدا هەیە ئەوەیە كە زانستی مرۆڤایەتی و كۆمەلایەتی مەسەلە و كێشەكانی كە لەناوچەیەك یان یەكەیەكی سیاسی لەگەل ئەو بەركەوتنیان هەیە، ئەو كێشەیە بەشێوەی بەربلاو و ورد دەخرێتە بەرباس و لێكۆلینەوەوە، بەگوزارشتێكی سادەتر لەخستنەڕووی كێشەكان قەرار دەگرێت و لەبواری پسپۆڕیەكانیدا نارەزووی بەربلاوی دەكات و بەبێ ئەوەی كە بوون یان نەبوونی پێكدادان و هاوبەشیكردن بخرێتە بەرباس و لێكۆلینەوە، لەكاتێكدا كە زانستی جیوپۆلەتیك دەرهەق بەكێشەكان جێگیردەكرێت، تێبینی لەسەر هەموو مەسەلەكان دادەنێت، لێكۆلینەوە لەكار و كاردانەوەكان دەكات و پاشان بەسەرنجدان لەپێوەرەكان، چەمكەكان، پێكهاتە و هاوكێشە پێكهاتووەكان ڕێكار بۆ چارەسەری كێشەكان دەخاتەڕوو، ڕاستە لەوانەیە ئەم ڕێكارە كێشەكە لەسەداسەد لانەبات، بەلام تا ئاستێكی بالا بەسوودە، بۆیە ئەم لێكۆلینەوەیە هەولدەدا لەم دیاردەیە سوودوەربگرێت.

هەر دیاردەیەك لەجیهاندا لەژێر كاریگەری دوو فاكتەردایە كەیەكێكیان ڕەهەندی كاتە و ئەویتریان ڕەهەندی شوێنە، مەبەست لەكات مێژووە و شوێنیش جوگرافیایە، وە هیچ كاتێك ئەم دوو ڕەهەندە لەیەكتر جیانابنەوە، لەبەرئەوەیە كە ولاتانی جیهان ناچارن لەدیاریكردنی ستراتیجی جیوپۆلەتیكی خویان ئەم دوو ڕەهەندە لەبەرچاوبگرن و لەباریتردا بابەتیتری بۆ زیادناكرێت.

ئەگەر ئەم بنەما و بیركردنەوەیە لەبەرچاوبگرین هەر ولاتێك كە بیەوێت بەرژەوەندی نەتەوەیی لەچوارچێوەی پەیوەندیە نێودەولەتیەكان بەمەبەستی گەیشتن بەلایەنی زۆری بەرژەوەندی ژیانی بپارێزێت، ناچارە كە لایەنی كەمی ئەم دوو ڕەهەندە (كات و شوێن) لەبەرچاوبگرێت، بۆیە لەخستنەڕووی پێشنیازەكان ئەم بنەمایە بەتەواوی لەبەرچاو دەگیرێت، ئەو بەشەی بۆ زیاددەكرێت بەسەرنجدان لەگۆڕانكاریەكان ئاماژەی بۆدەكرێت.

هەروەك لەپێشەوە باسكرا، عێراق خاوەنی دراوسێیە كە هاوبەشی و ناهاوشەی زۆری لەگەل ئەو ولاتانەدا هەیە، یەكەم عێراق كەوتۆتە ناوچەیەكەوە كە مێژووەكەی ساتبەسات لەجێگیربووندایە و جوگرافیاكەشی بەشێوەیەكە كە جیوپۆلەتیكی ناوچەیی و نێودەولەتی كاریگەری لەسەرە، لەم بوارەدا فاكتەری تایبەت زۆربووە كە لەماوەی دووهەزار سالی مێژووی تۆماركراوی ئەم ناوچەیەدا كاریگەری لەسەر دەرونی مرۆڤەكانی بەجێهێشتووە، لەبەرئەوە هەر ڕەوتێك بۆ كرانەوەی جیوپۆلەتیكی عێراق

بخرێتەڕوو دەبێت هەموو ئەم تێبینیانە لەبەرچاوبگیرێت، چونکە پەیوەندیەکانی ئەم فاکتەرە لەناستێکدایە کە نادیدەگرتنی ئەمانە هەتا بۆ ماوەیەکی کورتیش نامکینە، بۆیە بەسەرنجدان لەومەسەلانەی لەپێشەوە ئاماژەی بۆکرا دەبێت پێشنیازەکانی پەیوەست بەستراتیجی عێراق کە لەگەڵ دراوسێکانی هەیەتی بخرێتەڕوو.

## ئاسۆی ستراتیجی هاریکاری نێوان عێراق و تورکیا:

بەسەرنجدان لەناوەندی هاوبەشی هەردوو وڵات لەباکوری عێراق، تۆبۆگرافیای ناوچەکە بەجۆرێکە کە هەر دوو وڵات تەواوکەری یەکترن، عێراق لەڕووی ئابووریەوە دەتوانێت بازارێکی باشبێت بۆ تورکیا، ئەمە لەکاتێکدایە کە بەشێك لەتۆری گواستنەوە و گەیاندنی پێویستی عێراق بەناوخاکی تورکیادا تێدەپەڕێت، ئەمڕۆ تۆڕی پەیوەندیەکان بەهەر شێوەیەك بێت بەشاخوێنبەری ژیانی وڵات دەژمێردرێت و دەتوانێت ڕووبەڕووی مەترسی گەورەی بکاتەوە، چونکە جێگرتنەوەی ئەمە پێویستی بەدوو فاکتەری گرنگی وەك سەرمایە و کات هەیە کە لەدابینکردنی ئەم دووخاڵە کێشە دروست نەکات، سەرەڕای ئەوە پەیوەندی وشکانی لەڕێگای هێڵی ئاسنی لەگەڵ سوریا واتە ڕێگای (بەغدا-دیمشق) بەجۆرێك دانراوە کە ڕاستەوخۆ پەیوەندیەکە بەرقەرارنابێت بەڵکو دابینکردنی لەڕێگای تورکیاوەیە، لەجەنگی یەکەمی جیهانیەوە تائەمڕۆ ئەم خاڵە لاوازە جیوپۆلەتیکیە بوونی هەیە.

لەبەرئەوە ئەمڕۆ کە وڵاتان لەهەوڵدان بۆ فراوانکردنی تۆڕی پەیوەندیە ئەمنیەکانی خۆیان لەگەڵ دراوسێکانیان پەیوەندی دەبەستن بەتایبەت لەگەڵ ئەو دراوسێیەی کە خاوەنی ژێرخانی ئابوریی باشە، ئەم پەیوەندیە جیوپۆلەتیکیە دەتوانێت بۆ هەردوو وڵات سودمەندبێت، هەڵبەت هەلومەجەکە وادەخوازێت کە هەردوو وڵات بەرژەوەندنی ستراتیجی خۆیان نەکەنە قوربانی بەرژەوەندی ستراتیجی جیهانی کە هێشتا پایەدارنییە، عێراق دەبێت ئەم شێوازی بیرکردنەوەیە پەرەپێبدات بەجۆرێك کە بتوانێت کێشەی مرۆیی و گردبوونەوەی دانیشتوانی دەوڵەتە دراوسێکانی هاوتابکات، ئەگەر عێراق بتوانێت ئەم پێشنیازانەی خوارەوە بە قۆناغی کارکردن بگەیەنێت، لایەنیکەم لەگەڵ وڵاتانی دراوسێی خۆی دەتوانێت بەهاوسەنگی ستراتیجی بگات.

١- مەسەلەی کورد لەگەڵ تێبینیە جیهانیەکان هاوناهەنگە و بەهیچ جۆرێك لەم دەربڕینە مرۆڤانەیە کە دووچاری قەیران بووە سوودوەرنەگرێت، بەڵکو دەبێت خاوەنی ڕەوت بێت کەلەم ڕەوتەدا تێبینی وڵاتانی جیهانی کە وروژێنەری ئەو گرژییە نەتەوەییانە بوون وردەوردە لاواز بێت و بتوانێت لەئەنجامدا لەبەینیبەرێت.

٢- سەبارەت بەپەیوەندیە ئابووریەکان، تورکیا وڵاتێکە کە ئەو توانایەی هەیە کە لەڕووی فراوانکردنی چالاکی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری یارمەتی بەرچاو بەعێراق پێشکەش بکات، بەتایبەتی کە

هەردوو وڵات لەوناوچەیە کە لەگەڵ یەکتری پەیوەستن ژێرخانی پەرەپێدانی ئابووری ئاژەڵداری ئەو باشترین شێوەی بەرهەمهێنان هەیە.

٣- لەگەڵ ئەوەی بەندەری ئەسکەندەرونەی تورکیا ڕووبەڕووە لەگەڵ کێشەیەکی جیوستراتیجی جیهانی، بەڵام بۆ عێراق کێشەیەك دروستناکات، ئەگەر هەوڵبدرێت بۆ گواستنەوەی لولەی نەوت بەمەبەستی زیادکردنی ناردنەدەرەوەی بەرهەم بێت، چونکە ئەم شوێنە کەمتر دەکەێتە مەیدانی هەڕەشەوە بەشێوەی جیهانی بەرگری لێرە دەکرێت ڕووبەڕوونابێتەوە وەك ناوچە لاوازەکانی باشوری ڕۆژئاوا ئاسیا، لەم ڕووەوە کە تورکیا بەئاراستە پەرەپێدان و بەرزکردنەوە ئاستی گوزەران و گەیشتن بەستانداری ئەورووپی پێویستی بەهەڵسەنگاندنی دەرەکی هەیە و هیچ یەکێك لەوڵاتانی دراوسێی ئەو هەلومەرجەی نییە کە بتوانێت یارمەتی بەرچاو بەو وڵاتە لەڕووی ئابوورییەوە بکات، بۆیە ئەم پێویستیە ئابوورییەی تورکیا دەتوانێت هۆکارێك بێت بۆ لابردنی ئەو کێشە جیوپۆلەتیکیەی عێراق و پەیوەندیەکی گونجاوی دەبێت و ئەنجامێکی باش بەدەست بێنێت، خاڵی پۆزەتیف ئەوەیە کە لەڕابردوویەکی نەك زۆردوور پیشانماندەدات کە تورکیا بەرژەوەندی نەتەوەیی خۆی ناکات بەقوربانی بەرژەوەندی ناوچەکە ئەمەش بۆ عێراق لایەنی باشەیە و دەبێت لەم بوارەدا تێبکۆشێت.

٤- بنەمای ئابوری عێراق چ بەئەندازەی کەم لەبواری پیشەسازی و چ بەئەندازەی زۆر لەبواری کشتوکاڵی وابەستەیە بەتورکیاوە، چونکە زۆربەی تۆڕەکانی ئاودێری کە لەناو عێراق هەیە لەبەرزاییەکانی باشور و باشوری ڕۆژهەڵاتی تورکیاوە (کوردستانی تورکیا) سەرچاوەدەگرێت، سەرچاوەکانی ئەم ڕووبارانە بەهۆی فاکتەری جوگرافی و تۆپۆگرافی تایبەتی تورکیاوە کە کەوتۆتە بەرزاییەکانەوە لەهیچ هەلومەرجێکدا ئەو زەویانەی کە ئاویدەدات هەرەشە نابێت، لایەنی کەم دوو ڕووبار کە وەك بڕبڕەی پشتی ئابوری کشتوکاڵی عێراقە لەتورکیاوە سەرچاوەدەگرێت کە هەڵکەوتە جوگرافیاییەکەی عێراق قەرزاری ئەم دوو ڕووبارەیە، بەگوزارشتێکی سادەتر ژیان لەدەشتەکانی نێوان دووڕووبار پەیوەستە بەم دوو ڕووبارەوە، تا ئەو شوێنەی کە تورکیا توانای زۆرتری هەیە بۆ کۆنترۆڵ کردنی ئاوەکە هەرجۆرە سەرمایە گوزاریەك لەم بارەیەوە بۆ خەڵکی تورکیا جێگای سەنجدانە، بۆیە ئەگەر عێراق بتوانێت بەشێوەیەکی دڵنیایی ڕێرەوە ئاوەکەی ڕێکبخات، دەتوانێت ئایندەی وڵاتەکەی مسۆگەر بکات، لەم بارەیەوە کێشەیەك هەیە کە عێراق دەتوانێت بەڕاکێشانی متمانەی تورکیا بەپلەی یەکەم پەیوەندی بەکوردەکانەوە و بە پلەی دووەم پەیوەند بەوڵاتانی ناوچەکەوە هەیە دڵنیایی لەئایندەدا بۆ خۆی فەراهەم بکات، توانای سەرمایە گوزاری جۆراوجۆر هەیە بۆ نموونە لەڕووی دڵنیاکردنەوەی تورکیا لەدروستکردنی بەنداوەکان و عێراق لەبەشی نەوت و دامەزراندنی پاڵاوگە دەتوانێت سەرمایەگوزاری بەشێوەیەك ئاراستەبکات کە ئەم دووجۆرە بەشداریکردنە بەتەوەرەی ئاو پایەداربێت.

٥- ئەگەر عێراق بتوانێت بالآدەستی بەسەر سروشتی نالەباری بانی رۆژئاوا بەجۆرێك بكات لەگەڵ تێبینیە ستراتیجیەكان ناكۆك نەبێت تۆڕی ڕێگای ئاسنی و ڕێگاوبان بەئاراستەی رۆژئاوای بەغدا فراوان و پەرەپێبدات ئەمە یارمەتی گەشەكردن بەولآتانی دراوسێ دەدات و دەتوانێت ببێ هۆكاری جیوپۆلەتیكی خۆی بەكراوەیی بهێڵێتەوە.

**ئاسۆی ستراتیجی هاریكاری نێوان عێراق و سوریا :**

ولآتی عێراق لەگەڵ سوریا هاوبەشی ئایدۆلۆجی ومرۆیی و زەمینیان هەیە، بەتایبەت تۆپۆگرافیای سوریا بەشێوەیەكە كە فاكتەری هەرەشەی زۆر لاوازە، لەلایەكەوە بەسەرنجدان لەوەی كە دانوسانەكانی ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل و كشانەوەی هێزەكانی ئیسرائیل لەباشوری لوبنان، دەركردنی عەبدولآ ئوج لان سەركردەی پ.ك.ك. لەدۆڵی بقاع و دەستگیركردنی، سوریا ئەو ولآتەی كە رۆڵی (هارتلاندی) بۆ ولآتانی عەرەبی دەبینی، چووەدەرەوە وەك لەرابردوودا دەبینرا نەیدەتوانی لەئایندەدا وەك ركەبەری عێراق سەیر بكرێت، هەروەها ئەم ولآتە لەهەلومەرج و پێكهاتەی سیاسی، ئابووری، سەربازی و فەرهەنگی عێراق سوودمەندنییە، بۆیە ئەگەر گۆڕانكاریەك بەوشێوەیەی ئاماژەی بۆكراوە بەردەوامی هەبێت رۆڵی جیوپۆلەتیكی سوریا گۆڕانكاری زۆری بەسەردادێت، ئەمە لەكاتێكدایە كە ولآتانی وەك ئێران و عێراق بەتەوەرەی جیوپۆلەتیكی ناوچەكە و جیهان دەژمێردرێن، هاوبەشیەكانی نێوان ئەم دوو ولآتە بەجۆرە لەخوارەوە كورت دەكەینەوە:

١- یەكێك لەهاوبەشیەكانی نێوان هەردوو ولآت لایەنی مرۆییە، بەوشێوەیەی كە هەردوو ولآت خاوەنی مێژوویەكی تارادەیەك هاوبەشن و دەتوانین لەوروژاندنی هەستی خەڵكی هەردوو ولآتدا تێبینی بكەین.

٢- پێكهاتەی سەربازی هەردوو ولآت تارادەیەك هاوشێوەن و لەماوەی (٣٠) ساڵدا شێوەی وەرگرتووە و بابەتێك نییە كە لەماوەیەكی زۆر كورتدا شیاوی گۆڕان بێت، راستە لەگەڵ ڕوخانی یەكێتی سۆڤێت ئەم مەسەلەیە بۆشاییەكی دروستكردووە بەلآم لەئایندەدا ئەگەر زۆرە پشتیوانی ڕووسیا بۆ هەردوو ولآت چ لەڕووی راهێنان و چ لەڕووی لۆجستیەوە دروستبێت.

٣- لەدیدی ئایدیۆلۆجیەوە هەرچەندە بەهەڵوەشاندنەوەی یەكێتی سۆڤێت هەردوو ولآت ناچاردەبن لەئایندەدا پیاچونەوە بەئامانجەكانی حیزبی بەعسدا بكەنەوە بەتایبەت ئەوەی كە پەیوەندی بەئیسلام و بیری ئیسلامەوە هەیە.

٤- پێكهاتەی سیاسی/ئابووری هەردوو ولآت كەتۆتە ژێر كاریگەری ڕووباری فوراتەوە، ئەم ڕووبارە پەیوەندی ئەپچڕاوی بەتوركیاوە هەیە، بۆیە سەبارەت بەتوركیا دەبێت هەردوو ولآت كاری یەكسان بكەن و جگەلەوە ئەگەر بەجیا كاربكەن لەبەرژەوەندی هیچ لایەكیاندانییە، بۆیە لەهەڵبژاردنی كۆدی

جیوپۆلـەتیکی لەفاکتـەری سروشـتیدا دەتوانێـت زۆربـاش لـەڕووی دابینکردنـی ئاسایـشی هـەردوو وڵاتـدا بەمەبەستی کەمکردنەوەی ئامانجە جیۆستراتیجیەکانی سەبارەت بەتورکیا سوودوەرگرن.

بۆ بەهێزکردنی ئەم هاوبەشیانە و لاوازکردنی ناکۆکیەکان، فاکتـەری ئـابووریش ڕۆڵ دەبینێـت لـەم بارەیەوە دەتوانین ئامـاژە بـۆ لولـەی ناردنـەدەرەوەی نـەوتی عێـراق بکـەین، داهاتێـك کـە سـوریا بـەهۆی تێپەڕبوونی بۆری نەوتی عێراق کە بەخاکەکەیدا تێدەپەڕێت دەستی دەکەوێت بۆ وڵاتێکـی وەك سـوریا کـە کێشەی دەسکەوتنی پارەی گرانبەهای هەیە زۆر گرنگە بەتایبەت بـۆ بەدەسـتهێنانی ئـەم دەرامەتـە هـیچ ئەرکومەسرەفێکی تێناچێت، ئەگەر هەردوو وڵات بەمەبەستی بەهێزکردنی هاوبەشیە جیوپۆلەتیکیـەکانی خۆیان لەوانە زیادکردنی ژمارەی بۆری نەوتبەر یان باشکردنیان لەڕووی چۆنیەتیەوە باری سیاسی، ئابووری و سەربازی بەرەو باشتر دەبات، چونکە ستراتیجی نەوتی وادەکات کەهۆکاری گواستنەوە و گەیاندنی نەوت چ لەوەشکانی و چ لەناویی لەئاسـایـشی سـتراتیجیدا سـوودی لێوەرگیرێـت، ئـەم ئاسایـشە لایەنیکـەم ئـەو زەویانەدەگرێتەوە کە بۆریە نەوتیەکانی پێدادەڕوات، بوونی ئەم ئاسایـشە فاکتـەری دابینکـەری ئـارامی و جیگیری سـیاسی/سەربازی وڵاتانە، هەروەك ئـەوەی کـە تورکیـا ئـەم راسـتیە سـتراتیجیە هەسـتپێدەکات و لەژێر هیچ هەلومەرجێکدا ئامادەنییە دەستبەرداری بێت.

### ئاسۆی ستراتیجی هاریکاری نێوان عێراق و عەرەبستانی سعودی :

عێراق لەگەڵ عەرەبستانی سعودی هاوسنورە، کە لەڕابردوودا بەهۆی بـوونی ناوچـەی بێلایـەن کـە لەنێوانیاندا بوو لەوانەبوو لەهەڵبژاردنی کۆدی جیوپۆلەتیکی ناوچەیی بیانوو بۆ دەسەڵات بێنێتـەوە، بـەڵام دوای ئەوەی کە ئەم ناوچەیە لەنێوان هەردوو وڵاتدا دابەشکرا هیچ کێشەیەکی سنوری کە جێگای باسـبێت لەنێوانیاندا نەماوە، لەسیساڵی ڕابردوودا بەهۆی دژایەتیەك کە لەنێوان کۆدە جیوپۆلەتیکیەکانی ئەم دوو وڵاتەدا هەبووە زلهێزەکان لەم ناکۆکی کۆدە جیوپۆلەتیکیە سوودیان وەرگرتووە و نفوزی خۆیان تاناستێکی بەرز گەیاندووە، بەو واتایەی کە سنوری هەردوو وڵات سنوری ناوچەی نفوزی زلهێزەکان بووە، ئەم ناکۆکیـە کاتێك دەرکەوتووە کـە یـەکێتی سـۆڤیێتی پێـشوو کۆسـپی لەبـەردەم ئامانجـە جیوپۆلەتیکیـەکانی ڕۆژئـاوا لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دروستدەکرد ئامانجیشی ئەوەبوو کە ئەم وڵاتە بەرژەوەندیەکانی خـۆی هـەتا ئەگـەر بەئەندازەی ڕۆژئاواش نەبێت بەڵام تاناستێك بەشداری بکات، سەرئەنجام وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئەمـریکا ناچاربوو بۆ هاتنەناوەوەی یەکێتی سۆڤیێت لەڕووی ئابووریەوە گڵۆپی سەوز هـەڵکات، بـەڵام لەهەڵبـژاردنی ئەوەی کە کام وڵات خۆی لەیەکێتی سۆڤیێت نزیك بکاتەوە، عەرەبستانی سعودی خستەلاوە بەو هۆیەی کە شوێنی جیوپۆلـەتیك عەرەبـستانی سـعودی بەسـەرنجدان لەپێکهاتـە جیوپۆلەتیکیەکـەی بەبـەراورد لەگـەڵ وڵاتانیتری نەوتی کەنداو جیاوازە. لەئەنجامدا کوێتی بۆ ئـەم مەبەسـتە هەڵبـژارد و لـەم ڕێگایـەدا ڕووسـیا توانی بەرژەوەندیەك بۆخۆی بەدەست بێنێت، دەرهەق بەمە ڕووسیا بۆئەوەی ئەمەکداری خـۆی بـسەلمێنێت

لەجەنگی یەکەمی کەنداو نیەتپاکی پیشانداو بەشداریکرد لەپاریزگاریکردنی کەشتیە نەوتبەرەکانی کوێتدا، بۆیە تێبینی دەکرێت کە عێراق لەپەیوەست بەدراوسێ عەرەبیەکانی خۆی دەبێت زۆر تێبینی جیوپۆلەتیکی لەبەرچاوبگرێت، بەتایبەت ئەوەی کە جیاوازی دیدگاکان ئەم ناوچە هەستیارە کە هاوناهەنگی تێدا تارادەیەك کێشەی هەیە، بیرکردنەوەی جیوپۆلەتیکی عێراق و عەرەبستانی سعودی هیچ کاتێك بەبەڵگەی مێژووی و سیاسی نەیتوانییەوە بەتەواوی هاوجووت بێت و ئەگەر یارمەتیدانی مرۆیی لەنێوانیاندا هەبێت نەوە هەلومەرجێکی تایبەتە، هەروەك ئەوەی لەجەنگی یەکەمی کەنداو یارمەتی بەرچاو لەلایەن عەرەبستانی سعودی و کوێتەوە پێشکەش بەعێراق کرا ئەمە بەومانایە نییە کە ئەمانە لەیەك پێکهاتەی جیوپۆلەتیکی ناوچەییدان، بەلکو ئامانجی ئەوان ئەوەبوو کە قەیرانی دوایی لەخۆیان دووربخەنەوە.

پەیوەندیەکانی عێراق و عەرەبستانی سعودی دەتوانرێت لەم بوارانەی خوارەوەدا تێبینی بکرێت:

١- عێراق و عەرەبستانی سعودی لەرووی مێژوویەوە هاوبەشیان نییە هەتا ئەگەر بانەوێت لەکاتی لاوازی دەوڵەتی عوسمانی لەناوچەکە بکۆڵینەوە تەنیا رویەکی هاوبەش لەنێوان ئەم دوو وڵاتەدا بوونی سنورێکی دوورودرێژە و بەرچاوە کە خۆبەخۆ پەیوەندیەکانی نێوانیان ئاراستەدەکات، ئەویتر بوونی زمانی هاوبەشە کە ئەمانە لەئۆردوگایەکدا کۆدەکاتەوە، هەڵبەت ئەم خاڵە نابێت بەهەند وەرنەگیرێت کە ئەم ئۆردوگایە روو لەلاوازیە، چونکە کۆبونەوەیەك ئەرزشمەندە کە خاوەنی ئامانج بێت و ئەم ئامانجەش لایەنی هەرەشەی هەبێت، لەبنەمادا پێکهێنانی ئۆردوگای عەرەبی یان کۆمکاری عەرەبی یان پانعەرەبیزم کە یەکەمین ئامانجی لابردنی مەترسی بوو لەسەر کۆمەڵگای عەرەبی کە بەشێوەی گشتی ئیسرائیل لەپێشینەی مەترسیەکانە، بەڵام لەگەڵ بەرەوپێشچونی دانوسانەکانی ئاشتی و بەرەو چارەسەرکردنی کێشەی عەرەب و ئیسرائیل چاوەڕوان ناکرێت کە وڵاتە عەرەبیەکان لەژێر ئەم ئالایە بۆ یەك ئامانج کۆبنەوە، هەرچەندە کە هاوبەشی زمان لەپێکهاتەی هۆز و عەشیرەتدا کاریگەری هەیە، بەڵام بەهۆی ئەوەی کە عێراق لەرووی پێکهاتنیەوە خاوەنی خاڵی لاوازە لەگەڵ پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ئەم وڵاتانە هاوناهەنگ نییە.

٢- تا ئەو جێگایەی کە هاوردە و ناردەنی عێراق پشت بەکەنداو نەبەستێت رۆڵی گرنگی عەرەبستانی سعودی دوای تورکیا دەردەکەوێت، هەروك ئەوەی لەجەنگی یەکەمی کەنداو بۆ ماوەیەکی زۆرکورت بەبێ خەرجی تێچوون عێراق هەوڵی گواستنەوەی نەوتی عێراقیدا لەرێگای بەندەری یەنبوع لەسەر دەریای سوور، ئەگەر عێراق بتوانێت لەئاییندەدا ناردەنی نەوت لەم بەندەرەوە کە لەرووی ئەمنیەوە گرنگە بەدەست بێنێت دەتوانێت ناوچەی نفوزی هێزەکان بەبەستنەوەی ئابووری لەرووی سنور ئاودیوو بکات و باری ئاسایشی بەدەست بهێنێت.

عێراق دەبێت سەرنج لەخاڵی مێژوویی لەپەیوەندیەکانی لەگەڵ عەرەبستانی سعودی لەکۆدی جیوپۆلەتیکیدا بەئاراستەی جێبەجێکردنی سیاسەتی دەرەکی بدات، هەرچەندە لەماوەی نێوان جەنگی یەکەمی کەنداو و کۆتایی جەنگی دووەم ئەم خاڵە تاریکە کێشەی جۆراوجۆری پەیداکردووە بەڵام ئەوەی بەڵگەنەویستە ئەم دوو وڵاتە ناکۆکن لەسەر گەیشتن بەئامانجە ستراتیجیە ناوچەیی و جیهانیەکان، یەکێکیان ریشەی پێکهاتەی سیستەمی حکومەتە و ئەمیتریان ئەوەیە کەهەریەکەیان دەکەوێتە ناوچەی نفوزی وڵاتانی زلهێزی دژبەیەکەوە کە ئەم وڵاتانە بەبەڵگەی جوگرافی کە زیاتر سروشتی و ئابووریە ناتوانێت سیاسەتی جیهانی خۆی بەتایبەت لەرۆژهەڵاتی ناوەراست بەتەواوی ئاراستە بکات، بۆنموونە هەموو وڵاتانی ئەندامی بلۆکی رۆژئاوا گەیشتونەتە ئەو باوەرەی کە ستراتیجی وەرگیراو سەبارەت بەوڵاتانی کەنداو تەواوە بەڵام لەنێوان وڵاتانی ئەوروپا لەلایەك و نێوانی ئەمەریکا و ئەورووپیەکان لەلایەکیترەوە جیاوازی بۆچوون هەیە، هەروەها ئەم جیاوازی بۆچونانە لەنێوان وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و رووسیا سەبارەت بەعێراق و عەرەبستانی سعودی هیچ وەختێك یەك شێوە نەبووە و تائەو جێگایە بەرەوپێش دەروات کە زەرەر بەئامانجە ستراتیجیەکانیان نەگەیەنێت، ئەم ئامانجە ستراتیجیانە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی سارد بۆ رووسیا ئابووری و بۆ ئەمەریکا ئابووری/سەربازی بووە، بۆیە لێرەدا عێراق بەتێبینی زۆرەوە دەستەویەخەیە و ئەگەر ئەم تێبینیانە نادیدە بگرێت ماوەی نێوان دوو وڵات زیاتر دەبێت.

بەشێوەی گشتی لەرووی کرداریەوە سەبارەت بەستراتیجی عێراق لەبەرامبەر عەرەبستانی سعودی چەند پێشنیازێك دەخەینەروو:

١- واقعیەتی سنوری کوێت تاکۆتایی گۆرانەکانی جەنگی دووەمی کەنداو پەسەندبکات.

٢- بیرکردنەوەی لەرابەریکردنی وڵاتانی عەرەبی حەوزی کەنداو لەمێشکی خۆی دەرکات.

٣- لەنزیك دراوسێ عەرەبیەکانی خۆی دەبێت بەجۆرێك کاربکات کە پێکهاتەی سیستەمی سیاسی ناوچەیی دووچاری گۆران و وەرچەرخان نەکات، واقعی تێبینیە جوگرافیە ستراتیجیەکەی کەنداو لەبەرچاوبگرێت.

## ئاسۆی ستراتیجی هاریکاری نێوان عێراق و ئێران :

وڵاتی عێراق لەگەڵ ئێران نزیکەی (١٣٣٦کم) سنوری هاوبەشی هەیە، کە تایبەتمەندی ئەم سنورە بەجۆرێکە کە لەگەڵ هەموو دراوسێکانی جیاوازە، بەجۆرێك کە هیچ یەکێك لەسنورەکانی ئەو وڵاتە لەگەڵ دراوسێکانی بەئەندازەی ئەم سنورە دوچاری گۆرانکاری نەهاتووە لەئەنجامدا کاریگەری لەسەر پێکهاتەی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی و سەربازی هەردوو وڵات زیاتر لەهەموو فاکتەرەکان بەجێهێشتووە. ئەم دیاردە سروشتیە کە خۆی بەدرێژایی مێژوو مەسەلەی مرزیی بەدوای خۆیدا هێناوە و یەکێك لەئامرازەکان

بووە بۆ دروستبوونی دەسەڵات، ئەگەر بمانەوێت لایەنە ئەگەتیفەکانی پەیوەست بەهەردوو وڵات وورتر لێکبدەینەوە، ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە هەریەکە لەرژێمەکانی هەردوو وڵاتی ئێران و عێراق دەکەونە ژینگەیەکی ناوەخۆیی و دەرەکییەوە، لەژینگەی ناوخۆیدا لەوانەیە فاکتەرەکان لەگەڵ یەکتر ناتەبابن، ئەو فاکتەرانە لەوانەیە لەجۆری (پێکهاتەیی، دابونەریتی) یان فاکتەری (ناوێتە) واتە تێهەڵکێش لەفاکتەری (دابونەریت و پێکهاتەیی) بێت، لەلێکدانەوەی فاکتەری (دابونەریتی) هەردوو ڕەهەندی (نەتەوەیی) و (ئاینی) دەبینین، سەبارەت بەکۆی فاکتەری (پێکهاتەیی) دەبینین کە نێوان هەردوو وڵات ناکۆکی لەبواری سنور، ئابووری و دەسەڵات هەیە، هێشتا ناکۆکی لەمێژینەی سنوری نێوانیان چارەسەر نەکراوە و بۆتە هۆی دەستتێوەردانی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی لایەنی دەرەکی.

لەلێکدانەوەی فاکتەری ئاوێتە (دابونەریت/پێکهاتەیی) دەبینین جیاوازی لەبەکارهێنانی ناوی بەشێك لەناوچەکاندا هەیە، وەك ناوبردنی کەنداوی فارسی، میللەت، نەتەوە و هەتا زمانێك هەیە کە دەبێتەهۆی دوورکەوتنەوە لەنێوانیاندا.

هەڵبەت ئەم لێکدانەوەیە دەبێت بەجۆرێك لەبەرچاوبگیرێت کە حساب بۆ ڕۆڵی دەرەکی نەکرێت، چونکە فاکتەری دەرەکی دژایەتی و ناکۆکیەکان زیاتردەکات و کێشەکان بەبنبەست دەگەیەنێت، لەژینگەی دەرەکیدا فاکتەری کاریگەر لەسەر لێك دورکەوتنەوە بەتەواوی هەست پێدەکرێت و کاریگەری لەسەر پەیوەندی ئەم دوو وڵاتە بەجێدەهێڵێت، کەواتە ئەو فاکتەرانەی لەشوێنی ئەم دوو وڵاتە لەسیستەمی نێودەوڵەتیدا هەیە بریتیەلە:

١- شوێنی جیوپۆلەتیکی هەردوو وڵات و ئەو ناوچەیەی تێیکەوتوون سەبارەت بەهێزە گەورە دەرەکیەکان لەکۆنەوە ئانەمرۆ زەرەرهێن بووە (کێشەلەسەربووە).

هەردوو وڵات دەبێت ئەوە بزانن کە هەریەکەیان بەشێوەیەك خاڵی لاوازیان هەیە، لەگەڵ ئەوەی کە عێراق خاڵی لاوازی زۆرترە بەراورد بەئێران، ئەمە خاڵێکە کە بۆ بەڕێوەبەرانی ئەم وڵاتە لەهەر کاتێکی مێژوویدا بەشێوەی جۆراوجۆر سەلمێنراوە، لەبەرئەوە بەسەرنجدان لەمەسەلەی عێراق و ئێران بەبەڵگەی جیاواز کاتێك دووچاری لاوازی ژینگەی ناخۆ و ژینگەی دەرەکی دەبنەوە نابێت لەوبارودۆخەدا لەیەکتر نزیك ببنەوە، چونکە ئەو نزیك بوونەوەیە بەدحاڵیبوون دروستدەکات و لەکەشوهەوای وادا هەرجۆرە ڕێکەوتننامەیەك واژۆ بکرێت نابێت چاوەڕوانی ئاشتەوایی ڕاستەقینە و لاوازبوونی فاکتەری لێکدورکەوتنەوەی لێبکرێت، بەپێی ئەو ڕاستیە، گونجاوە کە هەردوو وڵات هەلومەرجی سروشتی و ئاسایی بخولقێنن تا خۆبەخۆ متمانەی پێویست بەدەستبێنن و کاریگەری بێگانەکان لەسەریان نەهێڵن.

٢-شوێنی ئیکۆپۆلەتیکی هەردوو وڵات و ئەو ناوچەیەی تێکەوتوون بۆتە هۆی وابەستەیی ناهاوسەنگی ئابووری لەدوو بواری زۆرگرنگی ووزە و بازاڕدا.

بەسەرنجدان لەو بابەتەی سەرەوە دوو پرسیاری سەرەکی خۆی دەسەپێنێت:

یەکەم ئەوەیە کە چۆن دەبێت دوو وڵات کاربکەن کە داهێنانی کار لەدەستی خۆیاندا بێت.

دووەم چۆن دەتوانن دوو وڵات بەم عەقڵانیەتی سیاسیە لەیەکتر نزیکبنەوە و فاکتەرە گرژیهێن و ناکۆکیەکان لەخۆیان دورخەنەوە.

ئەوەی دیارە فاکتەری گرژیهێن لەنێوان دوو وڵاتدا کارێکە دەبێتەهۆی دروستکردنی کەشوهەوایەکی پڕ لەبێمتمانەیی و ڕەشبینی لەبەرامبەر یەکتردا، بۆیە چاوەڕوانی هاوکاری لەسەر ئاستێکی بەرز و لەماوەیەکی کورتدا کەم وزۆر نامومکینە خۆشخەیاڵیە، لەبەرئەوە دەبێت ئەو دوو وڵاتە ئەو هاریکاریانە لەسەرئاستی بچوکتر دەستپێبکەن و وورد‌ەوورده لەگەڵ زیادبوونی متمانەسازی مەیدانی چالاکی خۆیان فراوان بکەن.

تەوەرەی سەرەکی ئەم هاریکاریە بەپلەی یەکەم سودوەرگرتنە لەتوانای بەهێز و بەکرداری ئابووری، فەرهەنگی، سیاسی و لەکاتی پێویستیشدا سەربازی دەبێت.

## هاریکاریەکانی ئێران و عێراق لەبوارەکانی :

(١) هاریکاری ئابووری:

لەقۆناغی یەکەمدا هەردوو وڵات لەبواری ئابووریدا زۆرترین ئەگەریان لەبەردەمدایایە، ئەمانە لەڕووی ئابووری یەك بەرهەمیەوە دوچاری جۆرێك لەوابەستەیی (پاشکۆیەتی) نهاوسەنگ بوون، بۆ کەمکردنەوەی ئەم وابەستەییە دەتوانن لەئاڵوگۆڕی بچوکی ئابووری و پلان بۆ داڕێژراوەوە دەست پێبکەن و دوای تێپەڕاندنی ئەم قۆناغە و دروستبوونی متمانە، هەردوو لا هەڵسن بەهاریکاری گەورەی ئابووری و دروستکردنی ناوچەی بەرهەمهێنانی هاوبەش یاناوچەی بازرگانی ئازادی هاوبەش لەنێوانیاندا، کە تواناکانی هەردوو وڵات لەبوارانەدا زۆرە.

بارودۆخی جوگرافی عێراق بەجۆرێکە لەهەمەجۆری تەواو سوودمەندە وەك ئاو، خاك و ئاووهەوای لەبار، هەروەها دەرامەتی باش و دەستلێنەدراوی هەیە و لەهەمرو ئەمانە گرنگتر دەسکەوتنی سەرچاوەی ووزەیە کە خۆبەخۆ یارمەتی ئەم وڵاتە دەدات داهاتی مسۆگەری دەسکەوێت. ئێرانیش بەهەمانشێوە لەم تایبەتمەندیانە سوودمەندە، بەتایبەت لەبەشەکانی باشوور واتە دەشتە بەپیتەکانی نێوان دووڕووبار و خۆزستان کە ئەم فاکتەرە سروشتیە لەیەکتریان نزیك دەکاتەوە، بەشێوەی تەواوکاری کاردەکەن کە هەموو توانا سروشتیەکانی لەیەك شوێندا کۆکردۆتەوە، بەڵام لەوشوێنەی کە ڕفتارەکانی هەردوو وڵات نیازخراپیە نەیانتوانیوە خاڵی تێڕوانینەکانیان بەسوودوەرگرتن لەم سەرچاوە سروشتیە بەتەواوی لەیەکتر نزیك بکەنەوە.

(٢) هاریکاری لەبواری ئاودا:

هەردوو وڵات لەشەتولعەرەب یان ئەروەندرود نزیکەی (٨٤کم) سنوری هاوبەشیان هەیە و گەلانی ئێران و عێراق لەسەر ئەم ڕووبارە دەتوانن وەك شارێگەی ئابووری ناوچەکە سوودی لێوەربگرن، سوودوەرگرتن لەسیستەمێکی ئاودێری هاوبەش لەناوچەکە بەدرێژایی (١٠٠کم) کە ئێستا ئەم دوو وڵاتە بەهیچ جۆرێك سوودی لێوەرناگرن، ئەگەرێکیتر بۆ هاریکاری لەنێوانیاندا دروستدەکات، ڕووبەری ئەم زەویە لەعێراق بەبەراورد بەئێران زیاترە، ئەگەر هەردوو وڵات بەسەرمایەی هاوبەش کەناڵ و جۆگا بۆ سەر ئەم زەویە بەرن باشترین سوودی ئابووری بەدەستدەهێنن، ئەمە لەکاتێکدایە کە بەداخەوە تا ئەمڕۆ هەردوو وڵات وەك دەرامەتێکی سروشتی بۆ بواری سەربازی سوودیان لێوەرگرتووە، ئێران ڕۆڵی گرنگ لەپێدانی ئاوی هۆڕی عزیمدا دەبینێت، واتە ڕووباری کەرخە بەو ڕێڕەوە درێژە و هەمەجۆرەی کە لەڕوانسر ڕۆژئاواوە دەستپێدەکات، پارێزگای کرماشان بەناوی قەرەسو و لوڕستان بەناوی سمیرە ئاودەدات و دەتوانێت خوزستان بەباشترین شێوە وەك سەرچاوەی ئاوی هەمیشەیی سودی لێوەربگرێت، بەسەرنجدان لەوەی کەبەشێکی لەخاکی عێراقدایە هەردوو وڵات دەتوانن لەبارودۆخێکی یەکساندا بەدروستکردنی بەنداو لەسەر ئەم ڕووبارە هاوبەشیەکی لۆجیکیان هەبێت، بەم هەنگاوە بەشێکی گەورەی هۆر و زۆنگاو و قامیشەڵانەکان وشکبکرێن بەکەمترین تێچوون زەوی ئامادەبکرێت بۆ بێستانی دارخورما.

وە لەتۆڕی ئاویتر کە بەدرێژایی سنور دەتوانرێت وەك ژێرخانی هاریکاری ئابووری سوودی لێوەربگیرێت، هەروەك ڕووبارەکانی چنگولە و گەنجانچەم لەناوچەی بەدرە و زرباتیە کە خاوەنی ئاوی هەمیشەییە.

(٣) هاریکاری لەبواری تۆڕەکانی پەیوەندی زەمینی:

لەبوارەکانیتری هاریکاری، تۆڕەکانی پەیوەندی زەمینی، هەردوو وڵات بەیەك ئەندازە لاوازی تۆڕی پەیوەندی زەمینیان هەیە بەتایبەت هێڵی ئاسنین لەناوچەکانی نزیك یەکتر، لەکاتێکدا هێڵی ئاسنینی ڕۆژهەڵاتی عێراق تاڕۆژئاوای خسرەوی درێژ بۆتەوە کە دەتوانێت بۆ زەویەکانی باکور و ناوەند فراوان بکرێت، لەگەڵ ئەوەی کە ئێرانیش بەم ئاراستەیە هێڵی ئاسنینی نییە بۆیە زەمینەی لەبار بۆ هاریکاری هاوبەش بەدەستدێنێت، بەتایبەت ئەوەی کە تۆڕی پەیوەندیەکان و لەناویاندا هێڵی ئاسنین وەك شارێگای ژیان وایە کە هەتا ڕووبەری فراوانتر بگرێتەوە پەیامی ئابووری و سیاسی زیاتر دەگەیەنێت.

جگە لەڕێگای ئاسنین تۆڕەکانیتری گواستنەوەی زەمینیش لاوازە، گەورەترین و کۆنترین تەوەری ناوچەکە ئەو تەوەرەیە کە خانەقین بەخسروی و هەمەدانی ئێرانەوە دەبەستێت، بەدرێژایی (٢٠٠٠) ساڵی ڕابردوو فراوانکردنی ئەم تۆڕە لاوازبووە. ئەمە لەکاتێکدایە ئەگەر گەورە ناوەندە ئابوورییەکانی هەردوو وڵات کە تەواوکەری یەکترن (لازم و ملزوم) بەیەکتری بگەیەنرێت، لەگۆڕانی ڕووی جوگرافی ناوچەکە کە

لێرەوە تێدەپەڕێت کاریگەری گەورە بەجێدەهێڵێت، لەم ناوچەیە دیمەنە جوگرافیەکان زۆر سادە و یەکشێوە و بێزارکەرە کە لێرەدا سروشت تەوەرەیە بەڵام دەتوانرێت وابکرێت مرۆڤ تەوەربێت.

دامەزرانـدن و فراوانکردنـی شـارێگای پەیوەنـدی لەسـەر سـنورەکان و بەسـتنەوەیان بەشـارێگا ناوخۆییەکانی هەردوو وڵاتەوە دەتوانێت کاریگەری گەورەی لەسەر کرانەوەی ئاسۆی سیاسی و هەناسەدانی عێراق بۆ سەر کەنداو هەبێت، هەروەك چۆن وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز کە لەرێگای هێڵی ئاسن و رێگاوبانی ئێرانەوە سوود لەهاوردە و ناردەنی کاڵاکان وەردەگرن، عێراق بەفەراهەمکردنی ئەم هەلومەرجە تاناستێك دەتوانێت زاڵبێت بەسەر کێشەی جیۆستراتیجی خۆیدا لەناوچەی کەنداو، بەجۆرێك کە ئەو کارە بۆ رابەرانی ئەم وڵاتـە فەراهـەم بـووە، لەراسـتیدا ئـەم هەنگاوانـە لـەرووی ئامـانجی سـتراتیجی عێراقـەوە کاریگـەری دەبێـت و لەبەرژەوەنـدی ئێـرانیش دەبێـت، سـەرەڕای ئەوانـەی سـەرەوە، ئەگـەری هاریکـاری لەتۆڕەکانی گواستنەوەی ئاویش هەیە، تۆڕی گواستنەوەی ئاوی لەعێراق زۆر لاوازە، لەگەڵ ئەوەی هـاوردە و ناردەنی عێراق پشت بەئاو نابەستێت بەڵام ئەمڕۆ کە گواستنەوە و بـارکردن بـەرێگای ئـاوی هـەرزانترە و هۆکارێکە کە هـەردوو وڵات دەتـوانن سـوودوەربگرن لـەرێڕەوی ئـاوی رووبارەکـان و بەنـدەرەکانی ئێـران و بنەمای گواستنەوەی ئاوی پەرەپێبدەن.

بیکردنـەوە لەسـوودوەرگرتن لـەتۆڕی گواسـتنەوەی وشـکانی و ئـاوی دەبێـت بەسـەرمایە گـوزاری هاوبەش لەهەردوو بـەش شـێوازەکە زیادبکـەن تـا لـەگۆڕانکاری جیهانیـدا لاواز نـەبن، ئـەم بیرکردنەوەیـە دەتوانێت زۆر لەنارێکیەکانی ناوچەکە رێکبخات و زۆر لەکەموکورییەکانی هەردوو وڵات چارەسەربکات.

## نیگایەك لەتواناکانی خوزستان بۆ هاریکاری لەگەڵ عێراق :

پارێزگای خوزسـتان بـەو رووبـەرە فـراوان و سـنورە هاوبەشـەی لەگـەڵ عێـراق و توانـا ئابوورییـەی هەیەتی دەتوانێت لەدروستکردنی پەیوەندی نێوان عێراق و ئێران رۆڵی گرنگ ببینێت، سەبارەت بەئامانجی جێگیرکردنی پەیوەندی و ئاڵوگۆڕی ئابووری لەگەڵ عێراق دامەزراندنی رێگـای پەیوەنـدیکردن لـەگرنگترین قۆناغەکان دەژمێردرێت، بەسەرنجدان لەوەی کە پارێزگای خوزستان رێگای پەیوەندی لەگـەڵ عێراقـدا نییـە بۆیە پێویسـتە ئەم ژێرخانە ئامادەبکرێت، بۆ ئەم مەبەستە دامەزراندنی رێگای پەیوەنـدیکردنی زەمینـی و رێگای ئاسنین لەخوزستانەوە بۆ عێراق شانبەشانی سنوری نێوانیان کارێکی پێویستە.

## بەیەکەوە بەستنی رێگای ئاسنینی ئێران بەرێگای ئاسنینی بەسراوە:

لـەقۆناغی ئێسـتای ئێرانـدا لـەدنیای جۆراوجـۆردا پەیوەندیـە زەمینیـەکانی سـنوردار بـووە کـە لەگۆڕانکاریە ناوچەیی و جیهانیەکانەوە سەرچاوەدەگرێت، پچڕاندنی پەیوەنـدی سیاسـی و ئـابووری لەگـەڵ ئەفغانستان دوای هاتنەسـەر دەسـەڵاتی تاڵیبان و پاش پارێزگاری کردنی پاکستان لەتاڵیبان سـاردی کەوتـە نێوان پەیوەندیەکانی ئێران و پاکستانەوە، کەمبوونەوەی پەیوەندی ئاڵوگۆڕی ئـابووری لەگـەڵ کۆمارەکـانی

ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز بەهۆی چالاکیە فراوانەکانی تورکیا بەپاڵپشتی ئەمەریکا بۆ کەمکردنەوەی نفوز و لاوازکردنی دیپلۆماسیەتی ئێران، بابەتی نادۆستانەی ولاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو لەسەر بنەمای ئەو داوایانەی ئیماراتی عەرەبی بۆ دورگەکانی ئێران، ئەمانە هەموو بۆتە هۆی لاوازی پەیوەندی ئێران لەگەڵ ولاتانی دراوسێ و ناوچەکەدا، بۆیە هەر هەوڵێك بۆ دەرچوونی ئێران لەگۆشەگیری جوگرافی پەیوەندیەکانی شتێکی پێویستە، هەرچەندە پەیوەندی نێوان عێراق و ئێران زۆر گونجاونییە بەڵام نابێت ئەوە پەدور بزانیین کە بارودۆخەکە لەبەرژەوەندی پەیوەندی نێوان هەردوو ولات بگۆڕێت (دروست وابوو کە دوای ڕوخانی سەدام بارودۆخەکە لەبەرژەوەندی پەیوەندی ئێران شکایەوە - وەرگێڕ) فراوانکردنی تۆڕە هەمەجۆرەکانی پەیوەندیەکان ئەو گرژیانە کەمدەکاتەوە.

پەیوەندی نێودەوڵەتی ڕێگای ئاسنینی کۆماری ئیسلامی ئێران لەئێستادا بەگشتی بەرێگای ئاسنینی ئاسیای ناوەڕاست لەباکوری ڕۆژهەلات زۆرترە بەڵام لەباکوری ڕۆژئاوا لەگەڵ ڕاێگای ئاسنینی تورکیا تاڕادەیەك کەمترە، ڕێگای ئاسنین کە ساڵانە نزیکەی (٢,٥) ملیۆن تەن کاڵای لەقەفقاز وڕووسیاوە کەدەکاتە نزیکەی (١٠٪) هاوردە دەگوازێتەوە، دوای ئەو گۆڕانکاریانەی بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤێت دروستبوو بەخێرایی کەمیکرد و تاڕادەیەك ناچالاك بوو، بەداخەوە ڕێگای ئاسنینی ئێران لەڕۆژئاوا و ڕۆژهەلات لەگەڵ سەرنجە ستراتیجیەکانی قۆناغی جەنگی سارد فراوانی بەخۆیەوە نەدیوە، دوای شۆڕشی ئیسلامی ئێرانیش بەهۆی شەڕی ناوخۆی کوردستان و جەنگی عێراق ئێران ئەم کارە ئەنجامنەدرا، ئێستا وا پێویست دەکات ئەم کارە ئەنجام بدرێت، لەڕێی پەیوەندی ئاسنەوە لەڕۆژئاوا زۆربەی ڕێگاکانی قەزوین، هەمەدان، کرماشان پێشنیازکراوە، ئەم ڕێگایە زۆر کردای (عملی) دەبێت هەرچەندە پێویستی بەکات و تێچوونی زۆرە، لەهەلومەرجی ئێستادا ڕێگای خورمشر و بەسرە پێشنیازکراوە کە نزیکە (٥٠کم) ڕێگای ئاسنی لەباشوری ڕۆژئاوا ئێران لەپارێزگای خوزستان دەبێت، کە بەئاسانی و لەماوەیەکی کورت بەتێچونێکی کەم دەتوانرێت ئەنجامبدرێت.

پەیوەندی ئێران لەگەڵ ولاتانی کەنداو کە لەدوای شۆڕشی ئیسلامی ئێرانەوە ڕووەو ئالۆزی چووە تاسەرەتای دەسپێکردنی سەرۆکایەتی ئاغای خاتەمی بەردەوامی هەبوو، لەدوای هاتنەسەر کاری محمد خاتەمی بەتایبەتی دوای کۆنفرانسی سەرکەوتووی سەرانی ڕێکخراوی ئیسلامی، پەیوەندیەکانی ولاتانی ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو لەگەڵ ئێران بەرەو باشبوون ڕۆیشت و لەم بوارەدا عەرەبستانی سعودی ڕێگای باشی هەلگرت لەپیوەندیەکانی لەگەڵ ئێراندا کە کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر ولاتانیتری ئەندامی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو، بەڵام مەسەلەی سێ دورگەکەی ئیمارات داوایدەکات و کڕینی چەکوجبەخانی زۆر لەلایەن ئەم ولاتەوە لەم ساڵانەی دواییدا و هەستان بەمانۆڕی سەربازی لەگەڵ

وڵاتانی ڕۆژئاوا و داواکاریەکانی لەدانیشتنەکانی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو و وڵاتانی عەرەبی دەتوانین بەهەرەشە بۆ سەر ئێران بیژمێرین کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەم بوارەدا ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت.

وادەبینرێت کە عێراق لەرۆژئاوای ئێرانەوە بەدراوسێیەتی لەگەڵ سوریادا دەتوانێت قووڵایی ستراتیجی ئێران لەبەرامبەر مەترسی و هەڕەشەی ئاسایشی نەتەوەیی لەرۆژئاواوە بەهێز بکات، جێگیر کردنی پەیوەندی نزیك لەگەڵ عێراق سەرەڕای دابینکردنی ئاسایشی نەتەوەیی لەسەر سنورە درێژەکانی رۆژئاوا، دەتوانێت ببێتەهۆی بەهێزکردنی بنەمای بەرگری وڵات لەهەموو سنورەکانی وڵاتدا، بەتایبەت فراوانکردنی بەئاراستەی ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو و پاریزگاریکردن لەعێراق لەبەرامبەر هەرەشەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

دەتوانرێت سوود لەرێگای ئاسنینی خرمشهر ـ بەسرە وەربگیرێت بۆ گواستنەوەی زیارەتکارانی ناوچە پیرۆزەکانی شارەکانی کەربەلا و نەجەف و کازمیە ... و لەوێشەوە بەسوریا و لوبنانەوە ببەسترێتەوە.

بەسەرنجدان لەوەی کە عێراق بەمەبەستی گەیشتن بەبەندەرەکان لەکەنداو ڕووبەڕووی گۆشەگیری جیوپۆلەتیکی و کێشەی گەورە بۆتەوە و بەهەمانشێوە وەك وترا بەهۆی تەسکی و نەگونجاوی کەنارەکانی لەسەر کەنداو نەیتوانیوە بەندەری گونجاو بۆ بازرگانی دابمەزرێنێت بۆیە هەمیشە لەتەنگانەی ستراتیجیدایە، لەبەرهەمان هۆ ئێران دەتوانێت بەسوودوەرگرتنی زیاتر لەبەندەری ئیمام خومەینی لەسنورێکی نزیك بە عێراق لەخوزستان لەکەناری کەنداو بۆ گواستنەوەی کاڵا وشمەکەکان لەم بەندەرەوە بۆ عێراق و بەپێچەوانەشەوە، سەرەڕای بەدەستهێنانی داهاتی ترانزێت باروودۆخێکی گونجا بۆ پەرەپێدانی گەشەی ئابووری و کەمبونەوەی گرژیەکان لەسەر سنور دەخولقێنێت.

<u>(٤) هاریکاری لەبواری ڕاوەماسی و ژینگەدا:</u>

أ/ ڕاوەماسی: زیادبوونی ژمارەی دانیشتوانی هەردوو وڵاتی عێراق و ئێران پێویستی زۆر بەپرۆتینە و واپێویست دەکات کە هەردوو وڵات هەرچی زیاترە سوود لەسەرچاوەی زۆر و دەوڵەمەندی گیانەوەری ئاوی وەرگرن لەگەڵ ئەوەی کە ئاوە ناوخۆییەکانی باشوری هەردوو وڵات و هەروەها کەنداو بەهۆی بوونی ئاووهەوای گەرم و لکاندنی بەئۆقیانوسەی ئازادوە دەوڵەمەند بەسەرچاوەی دەریایی، بەڵام ئەم پیشەسازیە لەبەرنامەی هەردوو وڵاتدا پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆیەوە نەبینیوە، سەبارەت بەراوی ماسی لەناوە کەنارەکاندا زەمینەی هەمەجۆری بۆ هاریکاری هەردوو وڵات هێناوەتە ئاراوە کە بریتیەلە : توێژینەوە لەدەرامەتەکان و هەڵسەنگاندنی، ڕێگرتن لە لەناوچوونی جۆرەکانی ماسی بەهۆی ڕاوکردنی بێسەروبەرەوە، ڕەوشی خەزنکردن، لەقوتونان، سەرمایەگوزاری هاوبەش لەبوارەکانی ماسیگری و پیشەسازی، ئاڵوگۆرکردنی زانیاریەکان سەبارەت بەلێکۆڵینەوە و توێژینەوەکانی پەیوەست بەشوێنی ڕاوی

ماسی، پەروەردە و پێگەیاندنی توانای پسپۆر لەبوارەکانی ڕاوی ماسی و دامەزراندنی دەستەیەکی هاوبەش بۆ لێکۆڵینەوە لەبواری گیانەوەری ئاویدا.

سەرەڕای ئەوە بەسەرنجدان لەزەمینەی لەباری ناوچەکە بەتایبەت لەناوچەی باویس تا نەفتشهر بەدرێژایی سنوری هەردوو وڵات توانای بەخێوکردنی ماسی زۆرە، لێکۆڵینەوەکان سەلماندویانە کە بەرهەمی باشی دەبێت، پەرەپێدان بەبەخێوکردنی ماسی لەم ناوچەیە دەتوانێت دوو کەڵکی هەبێت، یەکێکیان بۆ ڕاکێشانی هێزی کار لەو ناوچەیە و گۆڕانکاری لەئاستی گوزەرانی خەڵکی ناوچەکەدا و دووەم ناوە پەرشوبڵاوەکان لەناوچەکە بەشێوەی پێویست سوودی لێوەردەگیرێت.

ب/ ژینگە: پیسبوونی ژینگەی ڕووبارو دەریا بەهۆی ڕەگەزی پیسکەری جۆراوجۆرەوە و کاریگەری لەسەر پێکهاتەی سروشتی ئاو لەئەنجامدا زیان بەمرۆڤ دەگەیەنێت، ئەو مادە پیسکەرانە وەك مادەی ژەهراوی وایە کە لەرێگای بەکارهێنانی خۆراکی ناو دەریای پیسبوو و ژەهراویەوە هەڕەشە لەسەلامەتی مرۆڤ دەکات، سەرەڕای پیسبوون لەئەنجامی ڕەچاونەکردنی هاوسەنگی تەندروستی لەشەتولعەرەب و کەنداو بەهۆی ڕودانی دوو جەنگی وێرانکەرەوە بارودۆخی ژینگەی ناوچەکە لەخراپیدایە، شەتولعەرەب و زەویەکانی دەوروبەری سنوری نێوان هەردوو وڵات هێشتا بەهۆی مادەی هەمەچەشن لەمامێز و مادەی تەقەمەنیەوە ژینگەی دانیشتوانی ناوچەکەی خستۆتە مەترسیەوە، هەروەها لەجەنگی دووەمی کەنداودا ملیۆنەها تەن نەوتی خاوی کوێت لەلایەن عێراقەوە فڕێدرایە ناو ئاوی کەنداوەوە کە هەتا ئێستا کاریگەریەکەی لەسەر دەریا ماوە، بۆیە بەسەرنجدان لەوەی کە بنیاتنانەوە لەناوچەکە بەتایبەت ئەوەی کە ڕاستەوخۆ لەبەردەستی ئێران و عێراقدایە دەتوانرێت نەنجامبدرێت، لەبەرئەوە هەردوو وڵات دەتوانن بەهاریکاری یەکتر لەرێگای بەرنامەی ماوەکورت و مامناوەند و ماوەدرێژەوە هەنگاوی جدی لەبواری پاکسازی لەژینگەی ئاوی و وشکانی بنێن.

هەروەها لەبواری توێژینەوە و فێرکاری تایبەت بەهاریکاری ژینگەپارێزی هەردوو وڵات، دەتوانرێت ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بنرێت:

- ناسینی تایبەتمەندی هایدرۆلۆجی کەنداو و دەرامەتەکانی.
- ناسینی سەرچاوەکانی پیسبوون کە لەوشکانی و ناوچە کەناریەکاندا هەیە.
- زانیاری لەسەر بڵاوبوونەوەی نەوت و کاریگەریەکانی لەسەر پیسبوونی ژینگەی ئاوی.
- ڕێکخستنی خولی فێرکردن لەلایەن پسپۆرانی هەردوو وڵات لەبوارەکانی تایبەت بەژینگەپارێزی دەریایی.

## (٥) هاریکاری لەبواری نەوت و گازدا:

لەتایبەتمەندیەکانی هەردوو وڵات ئەوەیە کە خاوەنی سەرچاوەیەکی زۆری نەوت و گازن و خۆشبەختانە ئەم سەرچاوانە کەوتونەتە هەردوو بەری جیاکانی زاگرۆسەوە، هەردوو وڵات دەتوانن بۆ پەرەپێدان و وەبەرهێنانی بیری نەوت و گاز کە کەوتۆتە نزیکی سنوری یەکترەوە بەهاوبەشی دەستبەکاربن، ئەم جۆرە هاوبەشیکردنە لەپەرەپێدانی دەرامەتی سنورەکان ئیمتیازاتی هەمەجۆر بۆ هەردوو وڵات بەدەستدێنێت.

وەبەرهێنانی هاوبەش لەنەوت و گاز بەشێوەی گشتی تاناستێکی زۆر رێدەگرێت لەپێشبڕکێی نێوان هەردوو وڵات لەسەر بەدەستهێنانی بازاڕ، پێشبڕکێ لەسەر بازاڕی نەوت و گاز لەنێوان وڵاتانی بەرهەمهێنی نەوت زۆر کەوتووە لەسەریان، یەکێك لەئاماغجە سەرەکیەکانی کۆمپانیا نەوتیەکان و وڵاتانی رۆژئاوا لەڕابردوودا ئەوە بووە کە رێبگرن لەهاوکاری و هاوخوازی نێوان وڵاتە نەوتیەکانی کەنداو بۆ گەیشتن بەم ئاماغجە کۆمپانیا نێودەوڵەتیەکانی نەوت بەبەکارهێنانی رێگای سیاسی و نانەوەی دژایەتی لەنێوان وڵاتەکاندا لەگەڵ یەکتری.

لەلایەکیترەوە رێکەوتن بەوەبەرهێنانی هاوبەش لەیەك کێڵگەی نەوتدا توانای سەرمایەگوزاری لەلایەن دامەزراوە نێودەوڵەتیەکان و کۆمپانیا پەیوەندیدارەکان بەنەوت و گاز زیاددەکات، هەروەها هاریکاری لەپەرەپێدانی کێڵگەی نەوت و گازی هاوبەشدا بڕی تێچوون تاناستێکی بەرچاو کەمدەبێت و رێدەگرێت لەسەرمایەگوزاری هاوشێوە لەهەردوو دیوی سنور.

یەکێك لەکێشەکانی ئێران و عێراق ناردنەدەرەوەی نەوتی خاوە بەبێ ئەنجامدانی هیچ جۆرە پیشەسازیەك بەسەریدا، ئەمەش وایکردووە ستراتیجی نەوتی لەبەهایەکی نزمدا هێشتۆتەوە و هەردوو وڵاتی وابەستەکردووە بۆیە لەجیاتی ناردنەدەرەوەی نەوتی خاو دەبێت هەوڵبدن بەرهەمە پیشەسازیەکانی نەوت بنێرنە دەرەوە، بۆ رزگاربوون لەکاریگەری ئەم ستراتیجە نەخوازراوە هەردوو وڵات دەتوانن بەدامەزراندنی پاڵاوگەی جۆراوجۆری هاوبەش ئەم کەموکوڕیە کۆتایی پێبهێنن، چونکە تەکنەلۆجیای نەوتی دەتوانێت رۆژبەرۆژ بەشێوەی جیاواز خۆی بەرەوپێش بەرێت کە لەسادەترین شێوەی بەکارهێنانە لەبواری کشتوکاڵدا وەك (پەینی کیمیایی)، ئەمە لەکاتێکدایە کە هەردوو وڵات مادەی بەهێزکردنی خاك (پەین) لەدەرەوە دەهێنن، ئەگەر لەهەڵبژاردنی شوێنی دامەزراوەکاندا بەجۆرێك کاربکرێت کە تێبینیە ستراتیجیەکانیش لەبەرچاو بگیرێت بۆ بەرگرتن لەدەرکەوتنی رووداوی نەخوازراوی وەك شەڕ و هێرشکردن بۆسەر دامەزراوەکانی یەکتر.

بەسەرنجدان لەوەی کە ئێران گەورەترین بەرهەمهێنەری گازە لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کەنداو، رێژەی بەکاربردنی سوتەمەنی لەعێراق زۆرە، هەردوو وڵات سەبارەت بەپەرەپێدانی بۆری گاز چ بۆ

بەکارهێنانی ناوخۆ چ بۆ ناردنەدەرەوە بۆ وڵاتانیتر لەرێگای عێراقەوە هاوکاری دروستدەکات، هەڵبەتە ئەم مەسەلەیە دەبێت لەگەڵ ڕێکەوتنی ستراتیجی هاوتابکرێت تادڵنیایی و متمانەی پێویست دروستبکات، ئەمکارە سەرەڕای ئەوەی بۆ هەردوو وڵات سودمەند دەبێت وڵاتانی بەکاربەری گاز ناچاردەکات لەپاراستنی ئاسایشی بۆریەکاندا بەشداری بکەن.

سروشتیە کە بیروبۆچونێکی ئاوا بۆ هەردوو وڵات پەرەپێدانی واقعی و ئاسایشی متقابل و ئارامی سیاسی ئەسەپێنراو بەجۆرێك وەردەگرێت کە لەتوانای ناوچەکە بەدیدێت.

(٦) هاریکاری فەرهەنگی (کلتوری):

گەورەیی کلتوری ناوچەی نێوان دوو ڕووبار لەسەردەمانی زۆر کۆنەوە واتە کاتێك کە ئێرانیەکان لە دەوروبەری ئیمپراتۆرەکانی بابل و ئاشوور دەژیان، کاریگەریان لەسەر ئێران بەجێهێشتووە، دواتر کاتێك کە کۆرشی گەورە و جێنشینەکانی لەناوەڕاستی سەدەی شەشەمی پێش زایین یەکەمین ئیمپراتۆری لەجیهاندا دامەزراند، ئیمپراتۆری فراوانی هخامەنشین کە سەردەمانێك لەیۆنانەوە تا هندستانی لەژێردەستدا بوو ئەو ناوچەیەی ئەمڕۆ پێیدەوترێت عێراق بەشێکبوو لەوئیمپراتۆرە، هەروەها نێوان دوو ڕووبار بەپێی توانا دامەزراوەیی و فەرهەنگی بەخشیوە بەهەخامەنشینەکان .

لەڕاستیدا نێوان دووڕووبار بەیەکێکە لەفاکتەرەکانی یەکێتی نێوان دوو سەرزەمین دادەنرێت، دەشتەکانی نێوان دوو ڕووبار بەیەکێتی مێژوویی و سروشتیەوە ڕۆڵی زۆرگرنگی لەڕووە هاوبەشەکانی فەرهەنگی هەردوو ناوچەکە لەڕابردوودا هەبووە لەگەڵ هەموو ئەو گۆڕانکاریانەی بەدرێژایی سەردەمەکان ڕویانداوە ئەم فاکتەری یەکێتیە بەشێوەیەك خۆی لەگەڵیدا هاوئاهەنگ کردووە سەرەڕای فاکتەری زمانی فارسی کە لەسەدەمی خۆیدا لەگەڵ ڕێچکەی گۆڕانی سیاسی ـ ئاینی تەبابووە لەگەڵ دەرکەوتنی ئاینی ئیسلام، ئاین توانیویەتی وەك فاکتەرێکی زۆر مەعنەوی و ڕیشەیی لەناستی جیهاندا وەك لێکچونی فەرهەنگی هۆکارێك بێت بۆ بەیەکەوە بەستنی بەشە بچوکەکان.

ئەو گۆڕانکاریەی لەگەڵ هاتنی ئیسلام دەرکەوتووە هەموو ناوچەکە کەوتۆتە ژێردەسەڵاتی خەلیفەوە وایکردوە پەیوەندی ئاینی و سیاسی لەنێوان هەردوو لادا زیادکردووە و لەئەنجامدا وەك سنبلێکی مێژوویی ـ ئاینی پەیوەندی هەردوو وڵات بەتایبەت لەڕووی تایبەتمەندی مرۆیی و عقیدەییەوە لێکچونیان دروستکردووە .

لەنێوان وڵاتانی باشوری ڕۆژئاوا ئاسیا ئەگەر بمانەوێت پێوەرێك بۆ پەیوەندی فەرهەنگی لەنێوان ئێران و وڵاتانی ناوچەکە دابنێین ئەوا عێراق لەپلەی یەکەمدایە لەڕووی نزیکیەوە، بەجۆرێك لەڕابردوودا بەشەکانی ڕۆژئاوا ئێران بەناوی دالانی عێراق ناودەبران، بەکارهێنانی ئەم وشەی دالانە لایەنی فەرهەنگی و ئایدۆلۆجی هەیە، ئەم دالانە لەهەمەدانەوە دەستپێدەکات تا کازمیە و سامەڕا و نەجەف کە لەڕێگای

خانەقین بەردەوامی پەیدادەکات، ئامانج لەبەکارهێنانی دالآنی عێراق بۆ ئەم ناوچەیە ئەوەبووە کە ئەم پەیوەندیە جوگرافیە لەپێنەگەیشتنی سیاسی و عقیدەیی هەردوو وڵاتی کەمدەکردەوە (کە لەسەردەمی ئیمپراتۆری عوسمانی دەیانویست وەك کەلێنێك سوودی لێوەرگرن). بابەتیتری بواری فەرهەنگی بونی حەوزەی علمی نەجەفە کە رابردویەکی کۆنی هەیە و گرنگی تایبەتی هەیە، بڵاوبونەوەی ئەم حەوزە ئایدۆلۆجیانە لەرابردوودا زۆر رۆڵیان بینیوە، تا ئەو شوێنەی لەکاتی سەرهەڵدانی ناکۆکیەکاندا مەرجەعی ئاینی حەوزەی علمی رۆڵی گرنگی بینیووە لەرێگرتن لەساردی پەیوەندیەکاندا.

(۷) هاریکاری لەبواری فێرکاریدا:

هەردوو وڵات دەتوانن هەنگاوەکانیان بەئاراستەی پتەوکردنی بنەمای مرۆیی بێت، فراوانکردنی تواناکانی ژێرخان بۆ گەیشتن بەتایبەتمەندیەك کە بتوانێت لەئاستی پەرەپێدانی ئابووری و کەمکردنەوەی نەخوێندەواری و نەزانیەکان بێت، باشترین هەلومەرج بۆ هاریکاری دەسازێنێت، هیچ یەکێك لەوڵاتانی کەنداو وەك ئەم دوو وڵاتە خاوەنی مرۆڤی پسپۆر و شارەزانین، بەشێوەی نمونەیی ئێران و عێراق ئەو توانایەیان هەیە کە زانکۆیەکی نەوت دامەزرێنن بەهاوبەشی لەسەر سنور تاوەکو تواناکانیان زیادبکەن، ئەم ناوچە هاوبەشە زەمینەیەك دەسازێنێت کەناکۆکی و جیاوازیەکان بەرکەنار بکات و لەژێر هەر بارودۆخێکدا بێت دەتوانێت درێژە بەژیانی فەرهەنگی خۆی بدات و بەم شێوەیە لەکەشوهەوایەکی کلتوری وادادەتوانێت وەك بنەمایەك بۆ ئاشتی رۆڵی زۆر ببینێت و رێگا بۆ کەمکردنەوەی ناکۆکیەکان برەخسێنێت، پێکهاتەی زانستی و توێژینەوەکان دەتوانرێت تێکەڵ و ئاوێتە بکرێت و لەراکێشانی هێزی ناوخۆیی و ناوچەیی و نێودەوڵەتیدا رۆڵ ببینێت، لەوانەیە لەسەرەتادا جێبەجێکردنی ئەم پرۆژەیە لەناوچەی هاوبەش جێگای پرسیار بێت، بەڵام لەدنیای ئەمڕۆدا ئەو ناوچانەی دەتوانرێت بەشێوەی هاوبەش سوودی لێوەربگیرێت کەم نییە، قوتابخانە لەسەر سنوری ئێران و یەکێتی سۆڤێتی پێشوو لەناوچەی هاوبەش دروستکراوە و توانیویەتی کۆمەك بەئاشتی و ئاسایشی ناوچەکە بکات.

بەسەرنجدان لەوەی کە جیهان بەخێرایی بەرەو نێودەوڵەتی بوونی پەیوەندیەکان و ئابووری و سەرمایەگوزاری هەنگاودەنێت، هەردوو وڵاتی دراوسێش دەتوانن کەڵك لەم بیکردنەوەیە لەسەر ئاستی ناوخۆییدا وەربگرن.

هەروەها هەردوو وڵات دەتوانن لەبواری جیاوازی ماوەکورت و ماوەدرێژی فێرکردن لەوانە ئاڵوگۆڕی مامۆستا و خوێندکارانی زانکۆکانی خۆیان و کردنەوەی خولی فێرکاری - فەرهەنگی بۆ خوێنکارانی ناوەندی و زانکۆکان و بەکردنەوەی خولی فێرکردنی زمانەکانی عەرەبی و فارسی هاریکاری یەکتربکەن.

(٨) هاریکاری بەناراستەی پاراستنی بەها کلتوریەکان:

لەبارەی وەرگرتنی توانای ستراتیجی هاوبەش بۆ رێگرتن لەنفوزی کلتوری کە هەردوو ولآت هەروەك ولآتانیتری ناوچەکە روبەڕوی دەبنەوە، بواری هاریکاری دوولایەنە زۆر زۆرە، هەڵبەت لەم بوارەدا ڕەشبینی و نیگەرانی بۆ هەردوو ولآت زۆرە، بەلآم واچاوەڕوان دەکرێت ئەم ڕەشبینیە لەبەرامبەر نەتەوەکانی دەرەوە بەهێزتربێت، خاڵی گرنگ ئەوەیە کە بۆ خۆپاراستن لەنفوزی نەخوازراوی فەرهەنگی هەردوو ولآت پێویستە سود لەلایەنە ئەرێنیەکان وەرگرین لەجیاتی لایەنە نەرێنیەکان، بەلآم قەدەغەکردن و سانسۆردانان وادەکات کە فەرهەنگی دەرەکی سەرنجڕاکێشتر دەرکەوێت و لەڕاستیدا پایەی سەرەکی فەرهەنگی خۆمان لاواز دەکات، ژیانی فەرهەنگی هەر نەتەوەیەك بەپێی توانا لەنفوزی لایەنی نەرێنی فەرهەنگی دەرەکی بپارێزرێت، بەلآم لەرێگای قەدەغەکردن و سانسۆردانانەوە نایەتەدی، بەڵکو لەرێگای داهێنان و بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕی فەرهەنگیەوە بەدەستدێت.

لەهەندێك بواردا پارێزگاریکردن لەفەرهەنگی نەتەوە دەتوانرێت بەتەنیا لەلایەن نەتەوەکەوە بێت، بەلآم لەزۆر لایەنەوە بەهۆی بەربلآوی سەرچاوەکانی فەرهەنگەوە لەسەر ئاستی ناوچەکە و جیهان ئەمکارە پێویستی بەهاریکاری یەکتر هەیە کە هەردوو ولآت بەهۆی لێکچونی زۆر و بێشوماری فەرهەنگی پێویستی بەوەرگرتنی بریاری ستراتیجی هاوبەش و نزیك هەیە.

(٩) هاریکاریەکانی سیاسی، ئاسایشی و سەربازی :

هەردوو ولآت لەبواری هاریکاریەکانی سیاسی، ئاسایشی و سەربازی و هەتا لەمەسەلەکانی وەك هاوسەنگی هێز لەناوچەکەدا، ئێران و عێراق کە توانا و پشتبەیەکتربەستنی پێویست بۆ گەیشتن بەهاریکاری ئاسایشی ـ سەربازیان نییە، دەتوانن لەهاریکاری بچوکی سەربازیەوە دەستپێبکەن.

پێش هەر جۆرە هەنگاوێك هەردوو لا دەبێت بەجدی هەنگاوبنێن بۆ بەرکەنارکردنی هێڵی هێزەکانیان لەبەرامبەر یەکتر، ئاسایە دوای ئەوە زەمینە بۆ هاریکاری هاوبەشی سیاسی ـ ئاسایشی خۆش بکرێت.

(١٠) هاریکاری لەچارەسەری کێشە سنوریەکاندا:

پابەندبوون بەبڕیارە یاساییەکانی نێوان هەردوو ولآت مەرجی یەکەمی هەرجۆرە تێگەیشتنێکە بۆ چارەسەری کێشەی سیاسی ــ ئاسایشی سنورەکانی هەردوو ولآت، وەختێك هەردوو ولآت رازیبن بەپێی رێکەوتنی فەرمی کاربکەن، لەهەلومەرجێکی ئاساییدا خۆبەخۆ متمانە دروستدەبێت، لەکەشوهەوایەکی وادا کە هیچ کاریگەری لەسەر پێکهاتەی سیاسی، ئابووری و سەربازی نییە و چارەسەرکراوە، شوێنێك بۆ دەستتێوەردانی بیگانە نامێنێتەوە، لەوناوچانەی کە کۆبوونەوەی دانیشتوان دروستبوە لەسەر سنورەکان دەتوانرێت سوود لەژێرخانی ئابووری دانیشتوانی سنورەکان وەرگیرێت و سنورنشینانیش پێویستیان

بەمتمانەی زیاتره بۆئەوە درێژە بەژیانی ئارامی خۆیان بدەن، ئەگەر بمانەوێت لێکۆڵینەوەیەك لەئاستی بێکاری لەناوچەکانی سەرسنور بکەین دەبینین ئاستی بێکاری ئەم ناوچانە بەبەراورد بەناوچەکانیتر لەهەردوو وڵات زۆرترە، بۆیە زۆربەی سەرچاوەی کێشەکان و بێکاری لاوازی ئابووریە بۆیە ئەگەر هەردوو وڵات لەکەشوهەوایەکی ئارام و ئاشتیدا مەسەلە سنوریەکان یەکلابکەنەوە بەرەچاوکردنی مێژووی سنور و پەیوەستیە مرۆڤیەکان کە زۆر گرنگە دەگەن بەرێکەوتن بەجۆرێك کە ئەم رێکەوتنە بتوانێت ژینگەیەکی ئارام بۆ سەرمایەگوزاری بچوك بەدەستبهێنێت

چارەسەری مەسەلەی کورد فاکتەرێکە کە دەتوانێت لەجێگیری سیاسی و ئاسایشی واقعی هەردوو وڵات شێوەیەکی هاوبەش وەربگرێت، لەبەرژەوەندی هیچ یەکێك لەودوو وڵاتەدا نییە لەکاتی قەیرانەکاندا سوود لەدانیشتوانی ئەو ناوچانە وەربگرێت و مێژووش گەواهی ئەو ڕاستیە دەدات کە هەرکاتێك لایەنێك وەك هێزی چەکدار یان بەشێوەیەکیتر سوود لەکوردەکان وەربگرێت دژی ئەویتر ئەوا لەقۆناغێکیتردا هەمان تاکتیك لەلایەن وڵاتەکەیتریشەوە بەکاردەهێنرێت، هەتا دوو کەرتبوونی کوردەکان و نیدارەی کوردی دەبێتەهۆی ڕێگرتن لەبەردەم دروستکردنی سیستەمێکی بەڕێوەبردنی کارمە و شایستەدا.*

(١١) هاریکاری لەبەرامبەر دەستێوەردانی دەرەکی و پلانی ئاسایشی کەنداو:

بەدورگرتنی هێزە دەرەکیەکان لەکەنداو، لەگرنگترین سیاسەتەکانی ئێرانە، عێراقیش لەسەردەمی ڕوخانی ڕژێمی پاشایەتیەوە لەم وڵاتەدا بەگشتی دەستێوەردان لەکاروباری کەنداو بەبنەمای دژایەتی عەرەبی ناوبردووە، ئاسۆی سەرکەوتنە سەربازیەکانی ئێران لەجەنگی عێراق ئێراندا بووەهۆی ئەوەی کە عێراق سیاسەتەکانی خۆی بگۆڕێت و پێشوازی لەهێزی دەرەکی بکات، کاتێك کە جەنگی عێراق ئێران کۆتاییهات، عێراق ڕاستەوخۆ گەڕایەوە سەر سیاسەتەکەی پێشوو بەدژایەتیکردنی هێزە بێگانەکان لەکەنداو بەتایبەتی کە هێزەکانی ئێران لەکەنداو کەمبۆتەوە .

بەسەرنجدان لەوەی کە بەشداریکردنی ئێران و عێراق بەتایبەت بۆ نەهێشتنی هێزی بێگانە، دەتوانن هەنگاوی ئەرێنی بنێن بۆ پەیداکردنی متمانە لەنێوانیاندا و لەئەنجامدا بەستنی پەیمانی ئاسایشی لەگەڵ وڵاتانی کەنداو بۆ پاراستنی ئاسایش و ئارامی لەناوچەکە، ڕاستی ئەوەیە کە ئەم ڕێگاچارەیە بێتەدی دەتوانێت لەبەرژەوەندی وڵاتانی کەنداودابێت و ڕێبگرێت لەنفوزی هێزە دەرەکیەکان، پێویستە

---

*) نوسەر مەبەستی لەپارمەتیدانی عێراقە بۆ لایەنە کوردیەکانی ئێران و ئێرانیش بۆ لایەنەکوردیەکانی عێراق لەماوەی جەنگی عێراق ئێراندا کە بەزەرەری هەردوو وڵات و هەروەها بەزەرەری کوردیش کەوتەوە. وەمەبەست لەدوکەرتبوونی کوردەکانیش، ئەو کاتەیە کە ئیدارەی کوردی لەهەرێمی کوردستان بەهۆی شەڕی ناوخۆوە لەنێوان یەکێتی و پارتی دابەشبوو دیارە بەبۆچونی نوسەر ئەمە چەند زەرەی بۆ کوردەکان هەبوو ئەوەندە کێشەی بۆ ناوچەکە دروست کردووە . وەرگێڕ

وڵاتانی ناوچەکە دەست هەڵگرن لەداواکردنی زەوی یەکتر بۆئەوەی متمانـە بگەڕێتـەوە و دەسـت وەرنـەدەن لەکاروباری ناوخۆی یەکتر بێتەدی.

هەڵبەت ڕۆژئاوا لەم شێوە ڕێکەوتنە ڕازی نابێت لەنێوان وڵاتانی کەنداودا و سەرئەنجام کۆسپی بـۆ دروستدەکات، چونکە دەسەڵاتی نەوتی کەنداو بەتەواوەتی دەکەوێتە دەستی وڵاتانی ناوچەکەوە.

<u>(١٢) متمانە و هاریکاری یەکتر بۆ بەرگرتن لەپڕوپاگەندەی خراپ:</u>

ئەنجام نەدانی پڕوپاگەندەی خراپ مەرجی سەرەکیە بۆ پەرەپێدانی پەیوەندیەکانی نێوان وڵاتان، ئەم پڕوپاگەندە خراپانە لەوانەیە لەڕێگای چاوپێکەوتنی سەرکردە و بەرپرسـانەوە بێت یان لـەڕێگای ڕۆژنامـە و بڵاوکراوەکان یان کتێبەکانـەوە بەتایبـەت کتێبـی خوێندنـەوە بێـت، لەڕاسـتیدا هـەنگاوی یەکـەم متمانـە دروستکردنە بۆ پەرەپێدانی هاریکاری نێوان ئەودوو وڵاتـە و کەمکردنـەوەی هێرشـی ڕاگەیانـدن، بەگـشتی هەر هەنگاوێك کە ببێتەهۆی کەمکردنەوەی ئەو گرژی و نائارامیە دەتوانرێت وەك هەنگاوی متمانەسـازی ناوببرێت، لەگرنگترین ئەو هەنگاوانەی کە دەتوانێت کاریگەری لەسەر پەیوەندیەکانی نێوان ئـەم دوو وڵاتـە هەبێت بریتیە لە:

- هەوڵدان بۆ کەمکردنەوەی بەدحاڵیبوون لەنێوان هەردوو حکومەتدا.
- هەوڵدان بەبەرکەنارکردنی هەڕەشە سیاسی و سەربازیەکان.
- هەوڵدان بۆ کەمکردنەوەی قەیران و ناکۆکیەکان.
- هەوڵدان بۆ بەرقەرارکردنی پەیوەندی ڕاستەوخۆ.

هەنگاوەکانی متمانەسـازی لەبارەی عێراق و ئێرانەوە ڕاستی پەیدادەکات، چونکە لەپەیوەندی نێوان ئەو وڵاتانە بەکارهێنراوە کە لەگـەڵ یـەکتر دوژمـنن یـان نـاکۆکی گـەورەیان هەیـە، ئـەو فاکتەرانـەش زۆر لایەنی جیاوازی جوگرافی، سیاسی، ئابووری و فەرهەنگی دەگرێتـەوە، هەڵبـەت ئەوخاڵانـەی سـەرەوە وەك ڕێنمـایی گـشتی سـەیردەکرێت و دەبێـت هـەردوو وڵات هـەنگاوی وردتـر بنـێن لـەبواری متمانەسـازی و کەمکردنەوەی گرژیەکاندا.

لەڕێگای پڕوپاگەندەی خراپـەوە هـەر وڵاتێـك لـەبواری جیاجیـادا دەتوانێـت لایـەنی متمانەسـازی کەمکاتەوە و لەکۆتایشدا بیپچڕێنێت، بۆ نموونە لـەم بـوارەدا دەتـوانین لـەڕێگای کتێبـی قوتابخانەکانـەوە کاریگەری نەگەتیف لەسـەر ملیۆنەها کەس بەجێبهێڵێت و وەك فاکتەری گرژیـی هەمیـشەیی ئامـاژەی بـۆ بکـەین، کتێبـی قوتابخانـەکان لـەعێراق پڕیـەتی لـەم پڕوپاگەنـدە خراپانـە دژی ئێـران لەکاتێکـدا کتێبـی قوتابخانەکانی ئێران بەبەراورد بەعێراق پڕوپاگەندەی نەگەتیفی کەمترە.

ئەو وێنانەی لەکتێبی قوتابخانەکانی عێراق سەبارەت بەئێران خراوەتە ڕوو وێنەیەکە نەژادی ئێران وەك کەسانی نەفرەتلێکراو و زەلیل دەناسێنێت کە لەسەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدینەوە تا جەنگی عێراق ئێران لەدژی نەتەوەی عەرەب و یەکپارچەیی و شارستانیەتی عەرەبی و ئیسلام و زمانی عەرەبی بووە.

بەشێوەیەکی گشتی کتێبی قوتابخانەکانی عێراق ئەم خواست و دیدگایانەی خوارەوە لەمێشکی خوێندکارانی عێراق بەجێدێڵێت:

- ئێرانیەکان شەڕخواز و دەسەڵات خوازن.
- ئێرانیەکان وەك تابوری پێنجەم کاردەکەن و ئاژاوە و گرژی کۆمەڵایەتی لەژێر سەری ئەواندایە.
- ئێرانیەکان بەدوای هەڵگیرساندنی جەنگ و داگیرکاریدان.
- ئێرانیەکان بەدوای تۆڵە سەندنەوەی قادسیەی یەکەمن.
- ئێرانیەکان دژی عەرەبیەتی کەنداوی فارسین و دژی نەتەوەی عەرەبن.
- ئێرانیەکان نەیاری شارستانیەتی ئیسلامن.
- ئێرانیەکان نەیاری یەکێتی خەڵکی عێراق و نەتەوەی عەرەب و زمانەکەیانە.
- ئێرانیەکان هاوکاری وڵاتە ئیستعماریەکان دەکەن دژی عەرەب.
- ناسیۆنالیزمی ئێرانی ناکۆکە لەگەڵ ناسیۆنالیزمی عەرەبی کە ناسیۆنالیستێکی مرۆڤانەیە.
- سیاسەتی ئێران درێژکراوەی سیاسەتەکانی مێژووی ئەم وڵاتەیە و هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتووە.

ئەوەی شایانی باسە کە دەیان جار لەبەشە جیاوازەکانی کتێبی قوتابخانەکانی عێراقدا ناڕەوایەتی بەئێران کراوە بەڵام تەنیا یەکجار بەشێوەیەکی تێپەر جەختی لەسەر پەیوەندی دراوسێیەتی کردۆتەوە.

## بەشی پێنجەم

# لێکۆڵینەوە لەڕەگوڕیشەی دروستبوونی قەیران بەمەبەستی گەیشتن بەمۆدێلێکی ستراتیجی

### (أ)ــ لێکۆڵینەوە لەڕەگوڕیشەی قەیرانە سیاسیەکان:

زیاتر لەپێنج سەد ساڵە ئێران لەگەڵ دراوسێکەی ڕۆژئاوای خۆی لەناکۆکی سەرەکیدایە لەڕەوتی سیاسیدا، لەسەردەمی ئیمپراتۆری عوسمانیدا بەهۆی ئەو ناکۆکیە سەرەکیەی کە لەنێوان ئێران و ئەو دەسەڵاتە جوگرافیایەی کەوتۆتە ڕۆژاوایەوە، ئەم بابەتە بەهۆی جیاوازی لەبوونی وڵاتی ئێران لەگەڵ یەکە سیاسیەکانی ڕۆژئاوای خۆی چ وڵاتی سەربەخۆ بێت یان وڵاتی ژێردەستەی دەسەڵاتێ بوبێت، تائەو کاتەی ئەم ناوچەیە لەژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆری عوسمانی بوو بەهۆی ناجێگیری سیاسی هیچ کاتێك زەمینەی لەباری بۆ یەکەی سیاسی و فراوانکردنی پەیوەندی سیاسی یان هاوئاهەنگ کردنی ئامانجە سیاسیەکان چ لەسەر ئاستی ناوخۆ و چ ناوچەیی و جیهانی نەبوو، جگە لەوەی کە لەماوەیەکی زۆر کورتی ڕاگوزەردا کە ڕواڵەتەن پێگەی سیاسی هەردوو وڵات لەیەکەوە نزیك بوون، زۆربەی کات ڕەوتی سیاسی نێوانیان جیاواز و دوژمنانە بووە لەگەڵ یەکتردا. لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی و کۆتاییهاتنی و هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆری عوسمانی، وڵاتانێك لەناوچەکە دامەزران کە بەگشتی خاوەنی سنورێکی لەرزۆك بوون، هەر ئەمەش وایکرد دامەزراندنی وڵاتی عێراق وەك دراوسێی ڕۆژئاوای ئێران دوچاری کێشەی سیاسی ڕیشەیی لەڕووی ناکۆکی سنوری و داواکردنی خاك ببێتەوە، ئەم مەسەلەیە بەشێوەی نهێنی هەبوو تاشۆڕشی (١٩٥٨) لەعێراق، کە عێراق بەفەرمی وەك تەواوکەری ستراتیجی وشکانی دەرکەوت ڕیشەی ناکۆکی سیاسی ئێران و عێراق لایەنی ئایدیۆلۆجیشی وەرگرت، لەوکاتە بەدواوە ناکۆکی سیاسی نێوان ئێران و عێراق قوڵتربووەوە تا ئەو شوێنەی لەقۆناغی دوو جەمسەری جیهاندا، لەڕووی کرداریەوە وڵاتی عێراق وەك بەشێك لەتەواوکەری هێزی وشکانی و وڵاتی ئێران وەك بەشێك لەهێزی دەریایی دەژمێردران*، لەئەنجامدا لەڕووی کرداریەوە عێراق و ئێران لەبەرامبەر یەکتر وەستانەوە و پێکهاتەی جیوپۆلەتیکی هەردوو وڵاتیش کە خاوەنی لایەنی هاوبەشی بەرچاو بوون نەیتوانی لەنەهێشتنی گرژیەکاندا ڕۆڵ ببینێت، بۆیە فاکتەرە جیوپۆلەتیکیەکانی هەردوو وڵات بەپێی قۆناغەکان ئەم بۆشاییە سیاسیەی فراوانکرد تا ئەو شوێنەی کە هەردوو وڵات یەکتریان وەك هەڕەشەی ستراتیجی سەربازی

---

* ) هێزی وشکانی بە پێی تیۆرەکەی ماکندەر دانراوە کە یەکێتی سۆڤێت زیاتر پەیڕەوی لە پراکتیك کردنی ئەم تیۆرە دەکرد و عێراقیش زیاتر سەر بەم جەمسەرەبوو، هێزی دەریایی بەپێی تیۆرەکەی ماهان دانراوە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا زیاتر پەیڕەوی لە پراکتیك کردنی ئەم تیۆرە دەکرد و ئێرانی پێش شۆڕشی ئیسلامی سەر بەم جەمسەرە بوو. (وەرگێڕ)

سەیرددکرد، لەئەنجامدا پێگەی سیاسی هەردوو وڵات سەبارەت بەمەسەلە ناوخۆیی و ناوچەیی و جیهانیەکان نەك هاوڕا نەبوون بەڵکو ناتەبا بوون، لەبەرئەوە زەمینەی لەبار بۆ هەردوو وڵات دروست بوو کە ببنە شوێنی ئامین و گونجاو بۆ داڵدەدانی نەیارەکانی یەکتر، بەڵام ئەزمونەکانی ڕابردوو ئەو ڕاستیەی سەلماندووە کە ئەم بەریەککەوتنی ئامانجە سیاسی، سەربازی، فەرهەنگی و ئابووریەی نێوان ئەم دوو وڵاتە نەك دەسکەوتێکی باشی بۆیان نەبووە، بەڵکو ڕێگای خۆشکردووە بۆ دەستتێوەردانی زیاتری هێزە جیهانیەکان، بۆیە ئەگەر بەوردی و قوڵی لەتەنگانە هەمەلایەنەکانی ئەم دوو وڵاتە بڕوانین لەهەموو جێگایەکدا شوێن پێی هێزە دەرەکیەکان دەبینین، لەئەنجامدا نەك تەنیا گۆڕینی دیدگا سیاسیەکانی ئەم دوو وڵاتە نەیانتوانیوە سوودمەندبن بەڵکو ئەم دوو وڵاتە دراوسێ و خاوەن وزەیە، کە خاوەنی یەکێتی جیوپۆلەتیکن بەتەواوەتی لەیەکتر دورکەوتونەتەوە و بۆشایی جیوپۆلەتیکی لەنێوانیان دروستبووە کە هێزە بێگانەکان بۆ گەیشتن بەئامانجەکانی خۆیان سودیان لێوەرگرتووە، لەئەنجامدا هەردوو وڵات تائەمڕۆ نەیانتوانیوە ئامانجە سیاسیەکانی خۆیان لەجیهاندا بپارێزن، بەجۆرێك کە هەردوو وڵات بەیارمەتی وڵاتانیتری ناوچەکە کە لەڕووی گرنگیەوە لەپلەی نزمتردان نەیانتوانیووە سیستەمێکی سیاسی هەرێمی دروستبکەن، لەکاتێکدا پێکهاتەی هەردوو وڵاتی عێراق و ئێران و کۆمەڵێك لەوڵاتانی کەنداو دەتوانن شێوەیەکی زیرەکانەی سیستەمی سیاسی ناوچەیی کە لەو سیستەمەدا ڕۆڵی هێزی دەستتێوەردەری دەرەکی ناوچەیی و جیهانی دەگەیەنێتە کەمترین ئاست، لەبەرئەمەیە کە هێزە جیهانیەکان لەهەر قۆناغێکدابێت هەوڵیانداوە لایەنیکەم بەربگرن لەیەکێتی نێوان عێراق و ئێران یان ڕێبگرن لەهەرجۆرە زەمینەیەك کە بۆ یەکێتیەك لەنێوانیاندا بێتە پێشەوە ئەم بۆچوونە تائەمڕۆش بەردەوامە.

بۆئەوەی ئێمە بتوانین دەستتێوەردانی هێزە نێودەوڵەتیەکان کە بەشێوەی جۆراوجۆر دەردەکەون لەبەینبەرین، تا بەهۆیەوە بەهێزێکی واقعی نەبینراو بگەین، پێویستمان بەمۆدێلێك لەستراتیجە کە لەم مۆدێلە ستراتیجیە واقعیەتیدا لەسایەی ڕەوتی بەرژەوەندی نەتەوەیی هەردوو وڵات و ئاسۆی ئەوە لەباڵاترین پێوەر بپارێزرێت، ئەم واقعیەتە بۆ هەردوو وڵات زەمینەی ناکۆکی سیاسی دروست کردووە هیچ نییە جگە لەئامانجی زلهێزەکان، ئەم بابەتە بۆ سەرکردەکانی هەردوو وڵات ئاشکرابووە کە مانۆڕە سیاسیەکانیان لەبەرامبەر یەکتردا لەڕاستیدا بەشێکە لەسیناریۆی هێزە ڕکەبەرەکان کە وەك هاوپەیمانی ئەم دوو وڵاتە تیۆرەیان دەکەن، بەڵام ئەگەر بمانەوێت ڕووداوە سیاسیەکان لەم دوو وڵاتە وەك پاڵپشت بۆ ئەم بانگەشەیە بێنینەوە نموونەی زۆر لەبەردەستدایە، بە تێڕوانین لەکارەکانی هەردوو وڵات سەبارەت بەکەمینە نەتەوەکان باشترین نموونەیە، سەیرئەوەیە کە لەهەر بەشێك لەگۆڕانکاری پێکهاتەی سیستەمی نێودەوڵەتیدا ئەم سیناریۆیانە شێوەی دیارتری وەرگرتووە کە جارێك بەشێوەی دەرکەوتنی سەربازی بووە و هەندێکجار ورووژاندنی هەستی ناسیۆنالستی گروپێکی تایبەت و لەکاتێکیتردا لەژێر فشاری هێزە

بالآدەستە نێودەوڵەتیەکاندا بابەتەکە پاشەکشێی پێکراوە، ئەم گۆڕانکاریانە ئێمە بەو ڕاستیانە ئاشنا دەکات کە ناسینی هەڕەشە سیاسیەکان کە لەلایەن بەرپرسانی هەردوو وڵات لەبەرامبەر وڵاتی دوژمن دەخرێتەڕوو هیچ کاتێك لەقوڵایی ستراتیجیەوە نەهاتووە، بەڵکو تاکتیکێکە بەپێی داواکاری کات و شوێن هەڵبژێردراوە بۆیە لەبەرژەوەندی هەردوو وڵاتدانییە کە خۆیان ئامرازی ستراتیجی هێزە گەورەکانبن، سەیر لەوەدایە کە هەردوو وڵات وەك باقی وڵاتانیتری ڕۆژهەڵاتی ناوەراست خاوەنی قەیرانی هەمیشەیی و هەرچوار جۆری ڕەگوریشەی قەیران وەك وڵاتانیتری ڕۆژهەڵاتی ناوەراست لەم دوو وڵاتەشدا بەهەمیشەیی هەیە، بۆیە سەرانی هەردوو وڵات هەوڵیانداوە بۆ دامرکانەوەی قەیرانە ناوخۆییەکان بەهەر شێوەیەك بێت بیگوێزنەوە بۆ وڵاتانی دراوسێ، ئاراستەی گواستنەوەی قەیران بەگشتی بەرەو ڕۆژئاوایە واتە عێراق و هەندێکجار بەرەو باشوورە واتە وڵاتانی باشوری کەنداو، لەئەنجامی زانینی ڕیشەی سەرەکی قەیرانە سیاسیەکانی هەردوو وڵات ئەو ڕاستیە دەرکەوتووە کەیەکێك لەڕیشەی قەیرانەکان سیاسەتی ناوخۆی وڵاتەکانە و ئەویتریان ناجێگیری سیاسەتی دەرەکیانە، لەبەرئەوە ناساندنی هەریەکە لەم دوو وڵاتە لەلای ئەویتر وەك فاکتەری هەڕەشە، ڕیشەکەی لەبیرکردنەوەی هێزە جیهانیەکاندایە، بۆیە دەبێت هەردوو وڵات لەکاتی دانانی پلانی وردی گرنگیانەی ستراتیجی خۆیندا ئەو بابەتەی سەرەوە لەبەرچاوبگرن، هەرجۆرە مۆدێلێکی ستراتیجی کە لەگەڵ ئەو ڕەوتەیە، شوێن ئەو واقعیەتە جیوپۆلەتیکیە نەکەوێت کە مەحکومە بەشکست.

**( ب ) ـ لێکۆڵینەوە لەڕەگوڕیشەی قەیرانە ئابووریەکان :**

شوێنی جوگرافی هەردوو وڵات بەجۆرێکە ئەگەر لێکۆڵینەوەیەکی ئاسایی و ڕواڵەتی بکەین دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە دابەشکردنی ئاو و خاك لەهەردوو بەری سنور بەجۆرێکە ئەگەر پەیوەندی نێوان هەردوو وڵات لەسەر بنەمای ئاشتی و دراوسێیەتی بەرقەرارنەکرێت، بەهۆی گرژ و ئاڵۆزی پەیوەندیەکان، ئێران دەتوانێت گەورەترین کێشە بۆ بواری کشتوکاڵی و ئاژەڵداری عێراق دروستبکات، کە لەم بارەیەوە ئێمە دەبێت بەلێکۆڵینەوە و کاری مەیدانی ئەم تایبەتمەندیە بخەینە بەرباس و لێکۆڵینەوە، ئەگەر لەباکورەوە واتە سنوری هاوبەشی ئێران، عێراق و تورکیا (واتە سێگۆشەی سنور ـ وەرگێر) کە ناوچەیەکە بەناوی (دالامپرداغ) بەرەو باشوور بجوڵێن یەکەمین تۆڕی ئاو کە لەئێران بەرەو باکوری ڕۆژهەڵات و باشوری ڕۆژئاوا دەڕوات ئاراستەیان ڕوەوو دەشتەکانی نێوان دووڕووبارە، ڕووباری سیروان یان دیالە ئەو ڕووبارەیە کە بەدرێژایی ساڵ ئاوییێدادەڕوا (واتە ڕووباری هەمیشەییە ـ وەرگێر) و دەڕژێتە دیجلەوە و بەجۆرێك بۆ عێراق گرنگە کە پارێزگایەك بەناوی ئەم ڕووبارەوە ناونراوە، عێراق بەنداوێکی لەسەر دروست کردووە بەناوی بەنداوی دەربەندیخان، گرنگی ئابووری ئەم ڕووبارە بۆئاودێری زەویە کشتوکاڵیەکانی عێراق و پێویستیەکانیتر زۆرگرنگە، کەمێك خوارتر لەڕووباری سیروان ڕووبارەکانی ئەلوەند، چەمی ئەوت، چەمی

شانیلان و قۆرەتوو هەیە کە ئەمانیش بەدرێژایی ساڵ ئاویان پێدادەڕوات لەولآتی ئێرانەوە بەرەو ناوچەکانی خانەقین و مەندەلی دەڕۆن، ژیانی ئابووری کشتوکاڵی لەم ناوچانە پەیوەستە بەم ڕووبارانەوە، ئەگەر بەرەو باشوور بڕۆین لەناوچەکانی ئیلام ڕووبارە پڕئاوە هەمیشەییەکانی وەك کنجان و چنگولە دەبینین، تێبینی دەکرێت کە ئەم ڕووبارانە چەند دەتوانن لەدروستکردنی قەیرانی نێوان هەردوو ولآت ڕۆڵ ببینن، بەپێچەوانەشەوە کەباسی ئێمە لەسەرئەوەیە چۆن دەتوانن لەبنەمای جوگرافیای ئابووری و کەمکردنەوەی قەیرانەکان سودیان لێوەرگیرێت، کەمێك خوارتر لەپارێزگای ئیلام دەگەینە ناوچەی هۆری عەزیم، ئەم هۆرە بەدرێژایی نزیکەی (١٠٠کم) و پانی (٢٠ تا ٥٠کم) کە ڕواڵەتەن بەربەستێکی سروشتیە لەنێوان هەردوو ولآتدا کە ڕووباری (سیمرە یان کەرخە) ڕۆڵی سەرەکی هەیە لەدروست بوونیدا، ئەگەر ئێران بەهاوکاری عێراق بتوانن کۆنترۆڵی ئاوی ئەم ڕووبارە ئەو لقانەی لەڕووباری دیجلەوە دەڕژێتە ناو ئەم هۆرەوە بکەین کە ئامانجیان ژیانەوەی ئەو زەویانەبێت کە باشترین زەویە بۆ کشتوکاڵی بەرووبوومی پیشەسازی و دارخورما، ئەمە دەتوانێت لەڕیشەکێشکردنی قەیرانەکانی نێوان ئەم دوو ولآتە ڕۆڵی سەرەکی بگێرێت، بەڵام بەداخەوە هەردوو ولآت بەهۆی نەبوونی سیاسەتێکی دەرەکی جێگیر کە وەك تەوەری پاراستنی بەرژەوەندی نەتەوەیی و پەرەپێدانی گشتگیری پشتی پێببەسترێت، نەیتوانیوە بچوکترین هەنگاو بنێت، لەئەنجامدا ئەم هەموو توانا ئابووریە بەهۆی ڕوبەڕووبوونەوەی هەردوو ولآت و لەگۆڕەپانی شەڕ و پێکدادانەکاندا لەبەینچووە، چونکە هەردوو ولآت هیچ جۆرە سەرمایە گوزاریەکیان لەم ناوچەیەدا نەکردووە بەهۆی شەڕی سەربازیەوە بۆتە بەشێك لەناوچەی سەربازی و قەدەغەکراو، هەروەك ئەوەی لەجەنگی ئێران عێراقدا ئەم ناوچەیە و ناوچەکانی دورگەی مجنون گەورەترین گۆڕەپانی خەسارەتی جەنگی هەردوو ولآت بوو، بۆیە ئەگەر بمانەوێت بەمۆدێلێکی ستراتیجی کاربکەین بۆ بنبڕکردنی ڕەگوڕیشەی قەیرانەکان ئەم ناوچەیە باشترین ناوچەیە، ئەگەر بمانەوێت بەوردی شوێنەکەی دیاریبکەین ئەوا لەباشووری خوسرەویەوە تا باشووری مهران باشترین ناوچەیەکە کە دەتوانین هەڵیبژێرین هەردوو ولآت بەهاوبەشی بۆ سودوەرگرتن لەسەرچاوە ئابووریەکەی بەبێ گوێدانە بنەمای ناکۆکیە مێژووییەکان و لەگەڵ هەستکردن بەواقعیەتی نەتەوەیی و ناوچەیی و جیهانی بۆ هەڵگرتنی ئەم هەموو ناکۆکیە کە زیاتر لەحەفتا ساڵە بەرۆکی ئەم دوو ولآتەی گرتووە کۆتایی پێبێنێت.

ئێمە لەتوێژینەوەکانی ئایندەدا بەپشتبەستن بەکاری مەیدانی لەماوەی سێ قۆناغدا لەسەرانسەری شریتی سنوری بەتایبەت لەوناوچانەی هەرەشەی لەسەرە پێشنیازی دامەزراندنی بنکەی کشتوکاڵی هاوبەش لەگەڵ چالاکیەکانیتری ئاژەڵداری و بەخێوکردن دەکەین.

فاکتەریتری ئابووری کە تا ئەمڕۆ نەیانتوانیوە لەکەمکردنەوەی قەیرانەکانی نێوان هەردوو ولآت بەشێوەیەکی ڕاست ودروست سوودیلێ وەرگرن سەرچاوەکانی وزەیە، لەکاتێکدا بەپێی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە ڕێکخراوەکانی تایبەت بە ووزە لەدنیای ڕۆژئاوادا کراوە، لەنیوەی دووەمی سەدەی بیست و یەکەمدا

تەنیا دوو وڵاتی جیهان دەستیان دەگات بە ووزەی جیهان کە ئەوانیش ئێران و عێراقن، ئەم بابەت هەم جێگای ناخۆشحاڵیە و هەم جێگای خۆشحاڵیە، جێگای ناخۆشحاڵیە لەولایەنەوە کە هەر ئەم فاکتەرە دەیەوێت لەورێگایەوە هەتا بتوانێت زۆرتر لەوکەلێن و درزانەی نێوان ئێران و عێراق سوودوەربگرێت تا لەم رێگایەوە بتوانن ئامانجە ستراتیجیەکانی وزە بەکەمترین تێچوون بەدەستبهێنن، لەوشوێنانەوە کە تایبەتمەندی جیوپۆلەتیکی هەردوو وڵات زەمینەی گونجاو و یارمەتیدەری بۆئەوان خۆشکردووە کە تا ئەمڕۆ توانیویانە بەئامانجەکانی خۆیان بگەن، ئەگەر ئێمە (واتە عێراق و ئێران ـ وەرگێڕ) نەتوانین ئەم بۆشاییە جیوپۆلەتیکیە هەرچی زووتر پڕبکەینەوە و جیوپۆلەتیکی خۆمان تا ئەو ئاستەی دەکرێت بەڕووی یەکتریدا بکەینەوە ئەم بارودۆخە وەك خۆی دەمێنێتەوە کە لەلایەکەوە رێگرە لەبەردەم هاوپەیمانێتی نێوان عێراق و ئێران و لەلایەکیترەوە زەمینە بۆ دروستبوونی قەیرانەکان زیاددەکات، لەبەر ئەم هۆیەیە کە دەڵێن جێگای ناخۆشحاڵیە. لەولایەنەوە جێگای خۆشحاڵیە کە ئەمە دوو وڵاتن دەبنە خاوەنی دەرامەتێکی دەگمەنی ژێرزەوی کە دەتوانێت فاکتەرێکی باشی پەیوەندی جیوپۆلەتیکی بێت لەنێوان هەردوو وڵاتدا کە لەسایەیدا دەتوانن ئەم مادە گرنگەی بزوێنەری پیشەسازی جیهان بەجۆرێك بەکاربهێنین بەئاراستەکردنی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی هەردوو وڵات و گەیشتن بەگەشەپێدانێکی واقعی کەشوێنی سوودوەرگرتنبێت.

هەموو بوارەکان بۆ ئەمکارە ئامادەیە بەڵام لەوەرگرتنی ئەم ستراتیجەدا دەبێت ئەم تێبینیانە لەبەرچاوبگرین کە یەکەم نزیکبوونەوەی ئێران لەوڵاتی عێراق نەبێتە مایەی بێمتمانەی لەگەڵ وڵاتانی کەنداو، پێویستە خواست و هاوپەیمانی بەئاراستەی سوود وەرگرتنی هاوبەش لەسەرچاوەکانی وزەبێت و نابێت بەستراتیجێك وەربگیرێت کە لەلایەن هێزە جیهانیەکانەوە بگۆڕێت بۆ دژایەتیکردنی کەنداو، بەو مانایەی کە دەبێت لەتاکتیکێك سوودوەرگیرێت کە ئاسایشی ناوچەکە بۆ هەموو وڵاتانی ناوچەکە مسۆگەر بکات و لەژێر هیچ هەلومەرجێکدا ژینگەی سیاسی ناوخۆیی وڵاتەکان نەخرێتە بەرهەڕەشە، لەم حاڵەتەدایە کە ئێران و عێراق دەتوانن لەوشوێنە جوگرافیانەی کە جێگای کێشەی هێڵی سنور و ئەو داواکاریانەی کە هەردوو وڵات سەبارەت بەیەکتر هەیانە بەواتایەکی سادەتر لەوناوچە هەستیارانەی کە یەکەمین قۆناغی گرژی پەیوەندی نێوان هەردوو وڵات کە بووە جێگای تێڕوانینی فەرماندە سەربازیەکان بۆ هێرشکردنە سەر ئەوزەویانە، هەڵبژێردرێت بۆ شوێنی دامەزراندنی پاڵاوگەی هاوبەش، پیشەسازی پترۆکیمیایی، دامەزراندنی حەوزی بەخێوکردنی ماسی، دامەزراندنی بازاڕی سنوری، دامەزراندنی ناوچەی بازرگانی ئازاد، دامەزراندنی کێڵگەی کشتوکاڵی و پیشەسازی بەلەبەرچاوگرتنی جۆری بەرهەمەکەو تایبەتمەندی ئەوناوچانە، لەجێبەجێکردنی ئەم ستراتیجیەدا دەبێت هەوڵبدرێت پشتیوانی لەڕاکێشانی سەرمایەگوزاری بێگانەش بکرێت لەلایەن هەردوو وڵاتەوە، بەجێبەجێکردنی ئەم جۆرە سیاسەتە هەم توانای ڕاستەقینەی سروشتی هەردوو وڵات لەپەیڕەویکردنی ئەم ستراتیجیەدا سوودمەنددەبێت و هەم

زەمینە بۆ دەستێوەردانی نادروستی دەرەکی ناهێڵێت. ئەگەر سەیرێکی ئامارەکانی هەردوو وڵات بکەین ئەو ڕاستیەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە زۆرترین ڕێژەی بێکاری لەناوچەکانی سەرسنوری نێوان هەردوو وڵاتەدایە، بۆ نمونە بەپێی دوا ئامار ڕێژەی بێکاری لەناوچەکانی ڕۆژئاوای ئێران زۆرترە کە لەتوێژینەوەیەکی مەیدانیدا سەلمێنراوە، ڕێژەی بێکاری و تاوانەکان لەناوچەی ڕۆژاوای ئێران زیاترە بەبەراورد بە ناوچەکانیتر، لەم ناوچانە ڕێژەی بێکاری دەگاتە (٢٥-٢٧٪) کە ئەمەش سەرچاوەی دروستبوونی نارێکی کۆمەڵایەتی و ناسایشیە، لەکاتێکدا ئەگەر ئێران بتوانێت ئەم مۆدێلە لەستراتیج ئەناوچەکانی ڕۆژاوای وڵات بەتایبەت لەباشووری خوسروی تاباشوری مهران پیادەبکات ئەگەر سەرهەڵدانی قەیرانە سیاسی، ئابووری، ئاسایشی و کۆمەڵایەتیەکان بەڕێژەیەکی زۆر کەمدەبێتەوە.

### ( ج ) ـ توێژینەوە لەڕەگوڕیشەی قەیرانی کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی :

بۆ توێژینەوە لەڕەگوڕیشەی قەیرانی کۆمەڵایەتی دەبێت بنەماو پێکهاتەی دانیشتوانی هەردوو وڵات بەوردی بخرێتە بەرباس و لێکۆڵینەوە، لەم بوارەدا ڕووی هاوبەش هەیە کە دەتوانێت فاکتەری قەیراناوی بێت یان بەپێچەوانەوە بەهاوئاهەنگی بژمێردرێت، لێرەدا پێویستە زانیاری لەسەر بۆشاییە جیوپۆلەتیکیەکانی هەردوو وڵات کۆکەینەوە، بەتێڕوانینێکی گشتی تێدەگەین کە گرنگترین کەموکوڕی جیوپۆلەتیکی عێراق بوونی دوو نەتەوەی کورد و عەرەبی شیعەیە، کە دابەشبوونی جوگرافی ئەوانە بەجۆرێکە کە خۆبەخۆ عێراقی دابەشکردووە، بەجۆرێك کە کوردەکان لەناوچە شاخاویەکانی باکور و شیعەکانیش لەناوچەی دەشتەکانی باشوری عێراق نیشتەجێن، ماوەی نێوان ئەم دوو ناوچە جوگرافیە دەتوانێت تاناستێکی زۆر توانای مانۆڕی ئەوان بۆ ئێمە ڕۆشن بکات، چونکە یەك نەتەوە یان کۆمەڵەیەکی مرۆیی تایبەت ئەگەر بیەوێت وەك فاکتەری قەددەغەکردن لەخاکی جێنشینیان لەگەڵ حکومەت کارکەن دەبێت پێش هەرشتێك وڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە کە ئایا ئەم جوڵانەوەیە دەتوانێت ئەوان بۆ ئامانجی نەتەوەیی خۆیان ئاراستە بکات یان بەپێچەوانەوە بەربەست بۆ ئەمە دروستدەکات، هەردوو نەتەوە لەباردۆخێکدان کە ناتوانن فاکتەری یاساخکردن بەشێوەی لێهاتوویی و چارەنوسساز بۆ دەوڵەتی عێراق بێت و ئەمەش خۆی مەسەلەیەکی گرنگە، لەبەرئەوە وڵات چ لەناوەوەی سنوری سیاسی عێراق و چ لەدەرەوەی سنوری سیاسی عێراق ناتوانێت لەم دوو کەموکوڕیە جیوپۆلەتیکیە سودی پێویست وەرگرێت و زەمینەی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی ئەوان بەجۆرێکە بۆ دروستبوونی قەیران زۆر لەبارە (بەتایبەت کاتێك کە وڵاتی ئێران و عێراق لەبەرامبەریەکتردا وەستابن). بەڵام هیچ وەختێك سوودمەندنەبووە لەعقوڵایی ستراتیجی، لایەنی کەم ئەگەر سەیری مێژووی سەد ساڵی ڕابردوو بکەین ئەوە ڕاستیەکە کە کوردەکان هەمیشە بوونەتە قوربانی دەستی ئامانجە تاکتیکیەکانی عێراق و ئێران، چونکە لەدیاریکردنی ئامانجی ستراتیجی کوردەکان لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وڵاتانی جیهان ڕۆڵیان هەیە، نەك وڵاتانی ناوچەکە، بەڵام

هەڵبژاردنی تاکتیکە سەرپێیەکان لەدەست وڵاتانی ناوچەکەدایە، بۆیە هەستکردن بەواقعی ئەم چەمکە و وردەکاریەکانی دەتوانێت ئاناستێکی بەرز ڕێگربێت لەسەرهەڵدانی قەیرانە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیەکان لەبەرژەوەندی هەردوو وڵاتدایە، جگە لەم شێوەیە هەمان بارودۆخ کە ئانەمرۆ بینیومانە هیچ یەکێك لەم دوو وڵاتە (عێراق و ئێران) بەتایبەت لەقەیرانەکانیان لەگەڵ کوردەکان نەیانتوانیوە دەسکەوتێکی پێویست بەئاراستەی بەرژەوەندی نەتەوەیی وڵاتەکانیان بەدەستبێنن، ئەم ڕاستیە ئامۆژگاریمان دەکات کە دەبێت لەدیاریکردنی مۆدێلی ستراتیجیدا ئاگاداری ئەم خاڵە گرنگە بین کە هەر هەنگاوێك بێ لەبەرچاوگرتنی ئەم بۆشاییە جیوپۆلەتیکیە لەبەرژەوەندی دەوڵەتە دەرەکیەکان دەکەوێتەوە، ئەوەی پەیوەندی بەشیعەکانی باشوری عێراقەوەیە مەسەلەکەیان دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران دەرکەوتووە، لەکاتێکدا لەگەڵ جیوپۆلەتیکی باکوری عێراق زۆر جیاوازە، بەڵام ئەم ناوچەیە کەوتۆتە هەلومەرجێکەوە کە لەدابینکردنی ئاسایشی هەمەلایەنە یان لەتەنگەتاوکردنی عێراقدا دەتوانێت ڕۆڵی هەبێت بۆ وڵاتی ئێران، خاك و نامانجی داواکراو بۆ سوودوەرگرتن لەئاواتەکانی ئەوانە چ بەشێوەی نەتەوەیی و چ بەشێوەی ناوخۆیی و چ بەشێوەی ئیسلامی و ناوچەیی نەبێت، چونکە هەر وڵاتێك کە بیەوێت لەڕێگای نفوزی سیاسیەوە دەستوەردات لەجیوپۆلەتیکی ئەم ناوچەیە ئەوندە بەتوانا نەبێت کە لەڕێگای فەرهەنگی و کۆمەڵایەتیەوە ئامانجەکانی دارێژێت، ئامانجی سەربازی ناتوانێت یارمەتی بدات، ئەمە ڕاستیەکی جیۆستراتیجە نابێت فەرامۆشی بکەین. ئەزمونی شەڕ و ئەبەردیەکان لەم ناوچەیە و ئەو پەیامانەی لێوەی سەرچاوەی گرتووە و پشتگیری ئەم تیۆرە دەکات و ئومێد دەکرێت ئەم ئەزمونە بەقیمەتە لەئایندەدا بتوانێت وەك خاڵێکی سۆز لەوەرگرتنی مۆدێلی ستراتیجی لەلایەن ئێرانەوە لەبەرچاو بگیرێت، لەبەرئەوەی هەردوو وڵات لەپەیوەندی بەبابەتی ئایدیۆلۆجی و نەتەوەیی خاوەنی خاڵی لاوازو هاوبەشن، بۆیە دەبێت بەجۆرێك ڕێکیبخەن کە سەرنجدان لەناوچەکانیتر یا لایەنیکەم لەبەرامبەر ناوچە هاوشێوەکان بەدروستکردن و پەرەپێدانی چالاکی ئاوەدانی، ئابووری، فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی لەوناوچانەی باسکرا بخرێتە ژێرباسەوە کە ئەم شێوەیەی کارە دەتوانێت ئالەباریەکانی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی نێوان هەردوو وڵات لەوناوچانەی باسکرا تارادەیەکی زۆر کەمکاتەوە.

### ( د ) ــ توێژینەوە لەڕەگوریشەی قەیرانی سەربازی، ئاسایشی :

بۆ هاتنەناوەوەی ئەم باسە وادەبینرێت کە ئێمە دەبێت بەچەمکی نوێ لەئاسایش و گۆڕان و گۆڕانکاریەك کە لەبنەماو ڕیشەی ئاساشی نەتەوەیی پەیدابووە ئاشنابین، چونکە دوای کۆتاییهاتنی جەنگی سارد و ڕوخاندنی دیواری بەرلین و کۆتاییهاتنی سیستەمی دوو جەمسەری زۆر لەچەمکی ستراتیجی ئاسایشی نەتەوەیی، ئامانجی نەتەوەیی و زاراوەکانیتری ئاسایشی گۆڕانیان بەسەردا هاتووە.

## گۆڕانكاریەكانی چەمك و چوارچێوەی ئاسایشی نەتەوەیی:

لەساڵی (١٩٨٩)وە گۆڕانكاری هەمەلایەن لەمەیدانی نێودەوڵەتیدا ڕوویداوە، لەم ماوەیەدا جیهاندا ڕووداوی گرنگی وەك كۆتاییهاتنی جەنگی سارد، ڕوخانی كۆمۆنیزم و گۆڕان لەیاریكەرە سەرەكیەكانی پەیوەندی نێودەوڵەتی ڕوویداوە، هەرچەندە قسەكردن لەڕەگوڕیشەی ئەم گۆڕانكاریانە لەدەرەوەی باسەكەماندایە بەڵام دەتوانین لەدەرخستنی ئاراستە ئاسایشیەكاندا بگەینە ئەنجامی پێویست، دەرخستنی ئەم وەرچەرخانە ئەوەیە لەدیدگای چەمكی ئەم گۆڕانانە لەپەیوەندی نێودەوڵەتیدا سێ قۆناغی بڕیوە كە بریتیەلە:

١- كەمبوونەوەی دەسەڵاتی نەتەوەیی.
٢- زیادبوونی وابەستەیی لەبەرامبەر یەكتر.
٣- ململانێی نارێكوپێك و بێسەروبەر.

ئەم پۆلێنكاریە بەومانایە نییە كە هەریەكە لەمانە لەڕووی كاتەوە یەكبەدوای یەكدا هاتوون بەڵكو لەڕاستیدا هەرسێ قۆناغەكە هاوكات بوون لەگەڵ یەكتر.

قۆناغی یەكەم: واتە كەمبوونەوەی دەسەڵاتی نەتەوەیی، ڕەگەزی وای تێدایە كە بەبۆچوونی شیكەرەوان هەتا لەقۆناغی دوای جەنگی ساردیش ڕۆڵیان دەمێنێت، ئەم قۆناغە چاودێری كەمبوونەوەی كۆنترۆڵی واتاداری حكومەتەكانە لەوەی لەناو سنورەكانیان ڕوودەدات، شتێك كە لەكاتی ڕوودانداییە نابوتبوونی دەوڵەتی نەتەوەییە یان كاڵبوونەوەیانە نییە، بەڵكو هەموو هێزەكان سەرقاڵی داگیركردنی زۆربەی ڕۆڵی باوی حكومەتن. سنوری سیاسی دەوڵەتەكانیتر وەك سنوری نەتەوەیی جیاكەرەوەی نەتەوەكان بەشێوەی واتادار كاریپێناكەن، چونكە بیروباوەر، تەكنەلۆجیا، خەڵك، شمەك و كارگوزاریەكان زیاتر لەهەركاتێكیتر ئازادانە لەنێوان سنورەكاندا هاتوچۆ دەكەن. پاراستنی ڕێگا و ڕەوشی تایبەتی نەتەوە لەگەڵ سیستەمی دەوڵەتی جیاوازە بەشێوەی زۆر و كێشەدارتر دەبێت چونكە یەكسانسازی بەهاكان، ئایدیۆلۆجیەكان و سروشتی میانڕەوی لەزیادبووندایە، پێشكەوتنی خێرای گواستنەوە و گەیاندن و پەیوەندیەكان، لەوانەن كە كاریگەری زۆری لەم بوارەدا هەبووە.

لەڕاستیدا وابەرچاودەكەوێت سیستەمی جیهانی كرداری كەم بەهای لەمەیدانی سیاسەتی دەرەكی هێشتۆتەوە كە دەوڵەتە نەتەوەییەكان بتوانن سەری دڵنیایی معتەبەر و كاریگەر لەم بوارەدا بۆ خەڵكانی خۆیان بەدیبهێنن، ئەم كەمبوونەوەیەی تواناكان لەكاتێكدا ڕوودەدات كە خەڵكی بەشێوەی ڕۆژانە بەهۆی كرانەوەی زۆری حكومەتەكان و تێڕوانینی گشتیەوە، لەسەر خاڵی لاوازی سەركردەكان و پێكهاتەی دەوڵەتەكان بەئاگاتر دەبێت، ئەگەر ئێمە بمانەوێت گۆڕانكاری چوارچێوەی ئاسایشی نەتەوەیی لەم قۆناغە نوێیەدا وێنەبكەین لەوانەیە بتوانین وێنەیەكی وەك ئەم هێلكاریە بخەینەڕوو:

هێلکاری ژمارە (١)

| گۆڕانکاری چوارچێوەی ئاسایشی نەتەوەیی لەم قۆناغی دوای جەنگی سارد و کەمبوونەوەی دەسەڵاتی نەتەوەیی |
| --- |
| - دەرکەوتنی یاریکەری ناحکومی<br>- تێپەڕاندنی سنورە نەتەوەییەکان<br>- دابەشبوونی نەتەوەکان<br>- پشتبەستنی کەمتر بەئاستی نەتەوە<br>- فراوانبوونی تەکنەلۆجیا و بڵاوبوونەوەی دەسەڵات |
| بەرزبوونەوەی وابەستەیی ڕووبەڕووی نێودەوڵەتی |
| - جوڵان لەسیستەمی دوو جەمسەریەوە بۆ چەند سیستەمی<br>- زۆربوونی شەپۆلی ناوچەگەرایی<br>یەکسانبوونی توانا و تەکنەلۆجیاو ستانداربوونی سیستەمی چەکداری<br>- زۆربوونی کۆچکردن و بڵاوبوونەوەی دیوکراسی و ئازادی ئاین |
| زیادبوونی ململانێی ناڕێکوپێك و بێسەروبەر |
| - ڕودانی کەمتری جەنگی فراوان و جیهانی<br>- کەمبوونەوەی بەریەککەوتنی ئایدیۆلۆجی و زەوی<br>- زۆربوونی ئاکۆکی نەتەوەیی<br>- کەمبوونەوەی ململانێ ناباوەکان<br>زیادبوونی گرژیە بینراوە نەتەویی و ناننەتەوەییەکان |

بەسەیرکردنی ئەم قۆناغانە لەهێلکاری ژمارە (١) تائاستێکی زۆر گۆڕانکاری ئاسایشی لەکاتێکدا کە لەپێشکەوتندایین بەجوانی دەبینین کە ئێمە بۆ کورتکردنەوەی باسەکەمان بەشێوەی هێلکاری پیشانمانداوە.

دواهەمین قۆناغ لەگۆڕانکاری چوارچێوەی ئاسایشیدا زۆربوونی ململانێی پەرشوبڵاو و ناڕێکوپێکە، وا بەرچاودەکەوێت لەدەستدانی پێکهاتە کاریگەرەکان بۆ بەرەنگاربوونەوەی کەمبوونەوەی دەسەڵات و زۆربوونی وابەستەیی ڕووبەڕوو لەسیستەمی نێودەوڵەتیدایە، ئەم ناڕێکوپێکی و بێسەروبەریەی جیهان کە لەلایەن زۆر لەتوێژەران وەك خاڵی گرنگی ئاکۆکی نێودەوڵەتی جەختی لێدەکەنەوە و دەرگا بەڕووی دەرکەوتنی شێوەی زۆرتری ململانێکان کە لەماوەی جەنگی سارددا دەکەوتوون کردۆتەوە. بەهەمان شێوە کە ئێمە لەم ڕۆژانەدا لەناوچە جیاجیاکانی جیهان پشێوی هەستپێدەکەین بەواتایەکیتر

جەنگی هەموو دژ بەهەموو ئەسلی ململانێ چەکدارانەکانی ئاینده دەبێت هەرچەنده ئاکۆکی و ململانێ بێسەروبەرەکان لەقۆناغەکانی ڕابردوودا ناوبەناو دەرکەوتوون، بەڵام ئەوەی بەڵگەنەویستە ئەوەیە کە دەبێت ئێمە خۆمان ئامادەکەین کە هێرشێکی بێوێنە بەشێوەی نائاسایی لەدەرکەوتندایە.

وادەبینرێت کۆمەڵگای نوێی ئێستا لەبەرامبەر توندوتیژیە ناوخۆ و دەرەکیەکاندا بەتوندی زەرەردەهێنێت و لە خۆئامادەکردندایە بۆ کاری ڕووبەڕووبوونەوە.

ململانێکان لەم سەردەمەدا ڕێکخراو نییە و حاڵەتی جەنگ بەرنامە بۆداڕێژراو لەنێوان زلهێزەکاندا لەسەر جیاوازی ئایدۆلۆجی نییە کە بەشێوەی جیاواز لەجەنگی ناوچەیی دەرکەوێت، تیۆری گشتی ئەمڕۆ لەسەر ئەوەیە سودمەندی ئەجۆرە جەنگانە کەمبۆتەوە و بەڵام تێچونەکانی زۆر بەرزبۆتەوە، وابەرچاو دەکەوێت کە ململانێ پەرشوبڵاوەکانی هێزە بچوکەکان کە لەپێناوی بەدەستهێنانی ئامانجی کەسی سەرکردەکانیان یان گروپێکی تایبەتیە زیاتر بەشێوەی ڕێسا دەردەکەوێت. ئێمە ئەمڕۆ شایەتی جۆرێك لەم چالاکیانەین وەك چالاکی بەرهەڵستکاران لەناوەوە و دەرەوەی وڵاتان و قاچاخچیانی مادەهۆشبەر و کاڵاکان و هیتر.

بەسەرنجدان لەژمارەی کارکتەرانی نەتەوەیی و باننەتەوەیی، ململانێکانی نەتەوەیی و باننەتەوەیی بەبەراورد بەململانێکانی حکومەت لەبەرامبەر حکومەت بەهێزتر و ژمارەی زۆرتربووە، ململانێ تازەکان دەتوانێت شێوەی جیاواز وەربگرێت لەوانە ململانێی ئابووری لەڕێگای گەمارۆی ئابووری کە ڕاستەوخۆ بەکارهێنانی توندوتیژی نییە بەڵام کاریگەری قوڵ لەسەر کۆمەڵگا بەجێدەهێڵێت، کاتێك ململانێکان سەربازی بێت ئەگەری زیاتر بۆ پەنابردنەبەر ڕەوشی نائاسایی بەرچاودەکەوێت، لێرەدایە کە ئێمە دەبێت مانا و چەمکەکان لەکاتی دەرکەوتنی ناسایشدا هەست پێبکەین تا بتوانین ڕەگوڕیشەی قەیرانی ناسایشی بە ڕەهەندە جیاجیاکان دیاریبکەین.

## چەمك لەکاتی دەرکەوتنی ناسایشی نەتەوەدا:

واتابەخشین بەچەمکی ناسایشی نەتەوەیی لەجیهانی ئەمڕۆدا کارێکی ئاڵۆزە، لەمڕۆدا پێیانوایە کە ئیتر نەك تەنیا ناسایشی نەتەوە ئەو چەمکە مێژووییەی لەدەست داوە، بەڵکو ئەمڕۆ ناسایش چەمکێکی چەند ڕووە و لەبەرئەوەش سەبارەت بەماناکەی جیاوازی زۆر هەیە، بەم هۆیەوە کە چەندین پرسیاری گرنگ سەبارەت بەم چەمکە دەخرێتەڕوو:

ئایا ناسایش هیچ وەختێك بەدەست دێت؟

چ جۆرە گۆڕانکاریەك زۆرترین یان کەمترین هەڕەشە لەسەر ناسایش دروست دەکات؟

چ کەسێك بەرپرسیارێتی سەرەکی بەدواداچوون یان پاراستنی ناسایش دەگرێتە ئەستۆ یان دەبێت بیگرێتە ئەستۆ؟

ئایا ئاسایش چەمکێکە کە لەبنەڕەتدا پەیوەستە بەدەوڵەمەند و بەهێزەکان؟

سەبارەت بە پرسیاری یەکەم وادەبینرێت وەك لەزۆربەی توێژینەوەکاندا ئاماژەی بۆدەکرێت کە ئاسایشی تەواوەتی قابیلی بەدەستهاتن نییە، بەڵکو هەوڵدەدرێت ئاسایش تانەوپەڕی توانا زیادبکرێت.

بڕیاردان لەمەسەلەیەك لەژێر ناونیشانی بابەتی ئاسایشی دەتوانێت ببێتەهۆی دەرکەوتنی بارودۆخی قەیراناوی کە پێویستی بەڕێوشوێنی بەهێز و کتوپڕ هەیە کە هەرچی بکات نابەجێبووە و هەروەها لەوانەیە ببێتەهۆی جوڵە و کاردانەوەی بەهێز و هاوشێوە لەلایەن ئەوانیترەوە، سەرەرای بەدەستهێنانی ئاسایشی زۆر دەبێتەهۆی لەخۆباییبوون (خۆشخەیاڵی) کەخۆی کۆسپە لەبەردەم بەردەوپێش چوون و مانای وانییە توشی بادانەوە نەیەت یارمەتی گرفتاری ئەوانیتر نەکات، لەکاتێکدا کە هەڕەشە سەربازیەکان تەنیا شەڕ نییە بۆ مانەوەی نەتەوە، چونکە لەوانەیە هەڕەشەکانیتر بەهێزترین لەوە، بەڵام هێزی سەربازی بۆ پاراستنی ئاسایشی نەتەوە و مانەوە لەژیاندایە، گەڕان بەدوای خاڵێك کە دەربارەی بەردەوامی هێرش وتراوە هەندێك شێوەی ڕەفتاری پایەداری نێودەوڵەتی پێویستی بەبەڕێوەبردنی کاریگەری هەڕەشەی معتبری سەربازی هەیە، هەرچەندە تیۆری دانراوی باو لەقۆناغی جەنگی ساردا ئەمڕۆ گونجاوی و کارایی کەمترە بەڵام هەبوونی توانای سەربازی بۆ وەڵامدانەوە بەم شەڕانە بەڕەوشی داهێنراو لەسەردەمی جەنگ و ئاشیدا بەگرنگ دەبینرێت، خاڵی تەوەرەیی باسەکە ئەوەیە کە بەکارهێنانی هێزی سەربازی لەجەنگی گەرمدا پێویستە یان کاریگەرە، بەڵکو ئەم ئامادەباشیە بۆ سوودوەرگرتن لەهێزی سەربازی کە گرنگی زۆرتری هەیە، بۆیە لەم توێژینەوەیەدا هەوڵدراوە کە بەپشتبەستن بەڕێکاری ئابووری، سیاسی ڕیگری بکرێت لەشەڕی سەربازی، بۆیە ئەگەر بمانەوێت بەسەرنجدان لەو گۆڕانکاریانە پێناسەیەکمان بۆ ئاسایشی نەتەوە هەبێت وادەبینرێت کە پێناسەی ئێمە بۆ ئاسایشی نەتەوە بەتوندی پشت دەبەستێت بەپلان و وەسفکردنی ئاسایشی نەتەوە، چونکە لەتیۆر و پراکتیکدا دەبێت ئامانجەکانی ئاسایشی زۆر ڕوون و ئاشکراتر بێت لەهۆکارەکان، لەڕاستیدا لەسەردەمی ئێستادا وابەرچاودەکەوێت کە کەڵەکەبوونی زانیاری هەمەجۆری ڕۆژانە لەسەر سازوکارایی و ڕێکخستن و ئاسانکردنی جانتای ئامرازەکانی ئاسایشی نەتەوە فکرێکی جێگیری وەك ئامانجێکی باڵادەستی ئاسایشی نەتەوە خستۆتەبەردەست، وادەبینرێت کە جێگیری لەقۆناغی دوای جەنگی سارد لەجیهاندا مەسەلەیەکی تەوەرەیی و گرنگە، چونکە لەدنیای بێسەروبەر و ناجێگیری ئەمڕۆدا حکومەتەکان ووریاتر بوونەتەوە لەبەڕێوەبردنی ئامانجەکان لەڕووی پاراستنی بارودۆخەکە لەمەیدانەکانی ئابووری، سەربازی و سیاسی لەنێو ئامانجی ئاسایشی نەتەوە وەك لەو ئامانجانەی کە پەیوەست نییە بەپاراستنی بارودۆخەکەوە.

ئەمڕۆ ڕەهەندی ئابووری ئاسایشی نەتەوە چەندین گۆڕانی بەسەردا هاتووە کە جێگای ڕەهەندی سەربازی گرتۆتەوە و وورده وورده وەك خاڵی سەنتەری لەدیدی لێکۆڵەرەوە ستراتیجیەکانەوە سەیردەکرێت.

سەبارەت بەئاسایشی ئابووری جەختی ئەتەوە لەسەر توانای رکەبەری ئابووری و سەرکەوتنی لەبازاری نێودەوڵەتیدا دەکرێت و هەموو پێناسە قبوڵکراوەکانی ئاسایشی ئابووری ئەوەیە کە (بری بەرهەمهێنانی شمەك و كارگوزاری لەلایەن ولاتێکەوە لەهەلومەری ئازادی بازاردا شیاوی خستنەرووی لەبازاری نێودەوڵەتیدا هەبێت و لەهەمانكاتدا داهاتی هاوولاتیانی لەبەرزبوونەوەدا بێت) لەبەرئەوە هەوڵەكان بۆ ئەوە دەبێت كە بەمەبەستی كەمكردنەوەی ململانێكانی نێوان ئێران و عێراق لاوازكردنی ئەو ململانێیانە ووردەوردە بەپێی پرۆژەی ماوەكورت، مامناوەند و ماوەدرێژ، بەپێی لێكۆڵینەوەیەكی پراكتیكی لەبارودۆخی ناوچەك بەدرێژایی سنورەكانی نێوان هەر دوو ولات و شیكاركردنی هەرەشە سەربازی ـ ئەمنیەكان.

## لێکۆڵینەوە و باسکردنی ناوچە سنوریەکانی نێوان ئێران و عێراق لەدیدی سەربازیەوە:

ئێران و عێراق نزیكەی (١٣٣٦كم) سنوری چالاكیان هەیە، ئەگەر بمانەوێت بەدیدی پراكتیكی ئەم ناوچە سنوریانە لەگەڵ پارێزگا سنوریەكانی ئێران هەڵسەنگێنین دەگەینە ئەم دابەشكردنە:

١- لە دالامپرداغ تا باویسی لەگەڵ پارێزگاكانی ئازەربایجانی رۆژئاوا و كوردستان هاوسنورە.

٢- لە باویسی تا نەفتشهر لەگەڵ پارێزگای كرماشان هاوسنورە.

٣- لە نەفتشهر تا موسیان لەگەڵ پارێزگای ئیلام هاوسنورە.

٤- لە موسیان تا دەمی فاو لەگەڵ پارێزگای خوزستان هاوسنورە.

لەلێكۆڵینەوە و باسێكی مەیدانیدا دەركەوتووە كە ئێران خاوەی هەستیارترین و مەترسیدارترین دەربەند و رێرەوی بەیەكگەیاندنی نێوان ئێران و عێراقە كە بەپێی گرنگیان بەجۆرەی خوارەوە باسی دەكەین:

١- رێرەوی (معبر) نازدارداغ كە لەباكوری شنۆ كۆتایدێت.

٢- رێرەوی لۆلان كە لەشنۆ و ناوچەكانی دەوروبەری كۆتایدێت.

٣- رێرەوی گلەزردە كە بە تەوەرەی نەغەدە كۆتایدێت.

٤- رێرەوەی حاجی عمران كە لەپیرانشهر كۆتایدێت.

٥- رێرەوەی قەڵادزێ كە لەسەردەشت كۆتایدێت.

٦- رێرەوی مائوت كە لەباشوری سەردەشت كۆتایدێت.

٧- رێرەوەی پێنجوێن كە لەمەریوان و سنە كۆتایدێت.

٨- رێرەوەی هەڵەبجە، نەوسود، پاوە كە لەكرماشان كۆتایدێت.

٩- رێرەوەی نەفتخانە بەرەو گەیلان غرب و سومار.

١٠- رێرەوی مەندەلی بەرەو سومار.

١١- رێرەوی مهران، دهلران بەرەو ئەحواز و ئیلام.

لێکۆڵینەوە لەم ڕێڕەوانە و ناکۆکیە سنوریەکان و داواکای بۆ زەوی لەنێوان هەردوو وڵاتدا بکەین، ڕاستی ئەوەیە کە ئامانجەکانی هەردوو وڵات لەوناوچانەی کەوتۆتە نێوان مهران تا دالامپرداغ زیاتر لایەنی سەربازی هەیە و ئەو ناوچانەی کەکەوتۆتە نێوان فاو تا باکوری مهران لایەنی ئابووری و سیاسی هەیە، لەبەرئەوە بۆئەوەی بتوانین بەرێکارێکی گونجاو شەڕ و پێکدادانە سەربازیەکان کەمبکەینەوە و قەیرانەکانی ناوچەکە نەیەڵین دەبێت ناوچەکە بۆ چالاکی ئابووری هەڵبژێرین کە بگونجێت لەگەڵ شوێنە جوگرافیەکەی، بەواتایەکی سادەتر بەهەوڵدان بۆ دامەزراندن و پێکهێنان و ئاراستەکردنی دامودەزگای پیشەسازی لەوانە پیشەسازی خۆراک، پترۆکیمیایی، پاڵاوگەی نەوت و دامەزراوەی ئابووری کشتوکاڵی وەك حەوزی بەخێوکردنی ماسی، بێستانی خورما، کێڵگەی هاوبەش و دامەزراوەی پیشەسازی کە بەسەرمایەی هاوبەشی هەردوو وڵات و بەشداریکردنی سەرمایەگوزاری دەرەکی، هەروەها بەئاراستەی کۆنترۆڵ و کەمکردنەوەی هاتوچۆی ڕێپێنەدراوی سنوری، هەنگاوبنرێت و هەروەها هەوڵبدرێت نەگەری چالاکی سەربازی بەرێژەیەك کەمبکرێتەوە، دیاریکردنی شوێنی ئەم ناوچانە لەباکورەوە بۆ باشور بەشێوەیەی خوارەوە دەبێت:

١- زەویە سنوریەکانی دەوروبەری شنۆ.

٢- زەویە سنوریەکانی دەوروبەری ناوچەکانی نێوان نەغەدە تا پیرانشهر.

٣- زەویە سنوریەکانی دەوروبەری سەردەشت.

٤- زەویە سنوریەکانی دەوروبەری ناوچەکانی هەردوو دیوی پێنجوێن و مەریوان.

٥- زەویە چەماوە قۆقزەکانی سنوری نێوان کرماشان و (خانەقین) وناوچە تەپۆلکاویەکانی خسروی.

٦- ناوچە سنوریەکانی نێوان هەردوو وڵات لەسنوری چەماوەقۆقزیەکانی نەفتشهر و نەوتخانە.

٧- ناوچە سنوریەکانی نێوان هەردوو وڵات لەسنوری چەماوە قۆقزیەکانی مهران.

٨- ناوچەی سنوری لەدەوروبەری شلمچە.

٩- دامەزراندنی کێڵگەی کشتوکاڵی پێشکەوتوو بەبەروبوومی پیشەسازی لەناوچە تەختاییەکانی ڕۆژئاوا دەشتی ئازادگان.

بەتێڕوانینی ووردی هەردوو وڵات سەبارەت بەناوچە هاوبەشەکانی نێوان هەردووکیان و بەلەبەرچاوگرتنی ئەو گۆڕانکاریانەی کە ئەمڕۆ لەجیهاندا ڕوودەدەن، هەوڵبدرێت بۆ بەرگرتن لەهەرجۆرە جوڵانەوەیەکی سەربازی یان ئۆپەراسیۆنی هێرشی سەربازی بەمەبەستی سەپاندنی کاروباری وڵاتێك بەسەر ئەویتردا، ئەمە ڕاستیەکە کە نەك تەنیا لەنێوان هەردوو وڵاتی دراوسێ وەك ئێران و عێراق دەبێت بکرێت، بەڵکو دەبێت وڵاتانیتریش ئەم بارودۆخە دروستبکەن، بۆیە توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی تەواو و هەمەلایەنی ناوچەکان و ئەو زەویانەی جێگای ناکۆکی هەردوو وڵاتن و هەروەها ئەو زەویانەی زەرەرهێنن لەسەر

سنووری هەردوولا هەوڵبدرێت پەرەپێبدرێت و ببێتە جەمسەرێکی چالاکی ئابووری هاوبەش کە ئەمەش هەم دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی قەیرانی سەربازی نێوان هەردوو ولات و هەم ئەگەری پەرچەکرداری سەربازی بچوک و گەورە لەنێوان هەردوو ولاتدا ناهێڵێت.

## لێکۆڵینەوەی ناوچە سنوریەکانی نیوان ئێران و عێراق بەمەبەستی گەیشتن بەوناوچانەی کە لەبارترین بارودۆخیان هەیە:

لەلێکۆڵینەوەیەکی گشتی و پراکتیکی سنوری کرداری (١٣٣٦کم) نێوان ئێران و عێراقدا گەیشتینە ئەو ئەنجامە گشتیەی کە بەشێوەی گشتی لەباکوری مهرانەوە تا خاڵی سنوری هاوبەشی ئێران، عێراق و تورکیا ئامانجە سەربازییەکانی ئێران و عێراق لەهەردوو بەری سنوور بەیەکسانی دابەش بووە، لەباکوری مهرانەوە تا باکوری سنوری ئاوی هاوبەش واتە شوێنی بەیەکگەیشتنی هەردووبەری شەتولعەرەب ئامانجی سیاسی، ئابووری هەردوو ولات بەشێوەی یەکسان دابەش نەبووە، بەم لێکدانەوە گشتیە دەتوانین ناوچەی یەکەم هەڵبژێرین بۆ دیاریکردنی چالاکی ئابووری و بازرگانی، لەبەرئەوەی تایبەتمەندیەکانی ئەم ناوچەیە تا قوڵایی نزیکەی (٥٠ بۆ ٧٠کم) بەشێوەیەك کە تەوەرەی زرباتیە، مهران، دهلران دزفول کەوتۆتە بەری راستەوە کە دەکەوێتە پێشەنگی یەکەمە، بۆیە ئێمە لەلێکۆڵینەوەی مەیدانیەدا هەوڵدەدەین ووزە و سەرچاوەکان لەم ناوچەیە بەمەبەستی گەیشتن بەرێکاری ژیرانە و ستراتیجی بخەینە بەرباس و لێکۆڵینەوە تائەو شوێنەی پێگەیەکی گەشەکردو بابەتی بەدەستدێنین.

## لێکۆڵینەوە لەووزە و تواناکانی ناوچە سنوریەکان:

تەوەرەی پەیوەندی مهران و دهلران بەیەکێك لەتەوەرە ستراتیجی و گرنگەکانی ولات دادەنرێت، چونکە ئەم تەوەرەیە بەئاراستەی باکور، ستراتیجیترین ناوچەی رۆژئاوای ئێرانە واتە لێرەوە هەرەشە لەناوچەی کرماشان دەکرێت، بە ئاراستەی باشوری رۆژهەلات، خوزستان دەخاتە مەترسیەوە، بێهۆنییە کە لەرووی بەرگری، ئاسایشیەوە کلیلی کردنەوەی خوزستان لەپشتکوهی لورستانە، ئەمە دەستکەوتێکی زۆر گرانبەهایە کە لەماوەکانی پێشوو بەتێچوونی زۆر و زیانی گەورە دەست ئێران کەوتووە و نابێت بەسادەیی بەلایدا تێپەرین، چونکە پارێزگاری و پایەداری ئاسایش لەم تەوەرەیە بەسەرنجدان لەووزە و سەرچاوەکانی ناوچەکە هەنگاوەکان دەتوانرێت شێوەبگرێت کە بەشێکاری ئەوانەوە خەریکبێت.

ئەم تەوەرەیە بەسەرنجدان لە تایبەتمەنی ناوچەکە لەهەردوو رووی بەرهەمهێنان و سەربازیەوە جێگای گرنگی پێدانە دامەزراندنی یەکەی بەرهەم و سەربازی لەم ناوەندەدا رۆڵی گرنگ لەپەرەپێدان و پایەدارکردنی ئاسایشی ناوچەکەدا دەبینێت.

بوونی ئاوی پێویست لەرێگای سوودوەرگرتن لەرووبارەکانی گاوی، چنگولە، کنجانچم و میمە و دویرج ئەگەری پەرەپێدانی چالاکی کشتوکاڵی لەم ناوچانەدا دەسازێنێت، هەروەها بوونی هێزی مرۆیی زۆر

لەپارێزگاکانیتر کە پەیوەندی عەشایەریان بەدانیشتووی ناوچەکەوە هەبێت دوو فاکتەری گرنگ بۆ دروستکردنی ناوەدانی نوێ بۆ نیشتەجێکردنیان و ئابووری کردنی ئەم ناوچەیە دەژمێردرێت.

ئەم ناوەندە گرنگە ستراتیجیە خاوەنی ووزەی بەهێزە بۆ پەرەپێدانی بواری کشتوکاڵی، قەبارەیەکی زۆر لەئاوی کۆنترۆڵ نەکراو لەم ناوچەیە هەیە کە بەشێك لەمانە وەك رووباری کنجانچم، بردلە، گاوی و میمە و چنگولە بەبێ سودلێوەرگرتنی تەواوەتی بەرەو خاکی عێراق دەڕوات، لەکاتێکدا ئەگەر بتوانرێت سەرچاوە زۆرەکانی ئاو جڵەوبکرێت و بەکاربهێنرێت لەدەشتەکانی مهران و دهلران دەتوانرێت زەمینەی چالاکی کشتوکاڵی پەرەپێبدات و زۆر لەکەسە بێکارەکان بخاتە سەرکار و بەشێوەیەك رێژەی بێکاری کەم بکاتەوە. پێشبینی دەکرێت کە لەهەموو پارێزگای ئیلام ژێرخانی کشتوکاڵی بەپێی ئاسۆی بەرنامە بۆدارێژراو لەماوەی شەش ساڵدا واتە لەدوای ساڵی (١٩٩٩) لە (٢٤) هەزار هکتارەوە بەرزبێتەوە بۆ (١٠٠) هەزار هێکتار کە نزیکەی (٦٠٪) دەکەوێتە هەردوو شاری سنوری مهران و دهلرانەوە رێژەی خستنەکار لەبواری کشتوکاڵیدا نزیکەی (١٣هەزار)کەسە، لەم کاتەدا کە واچاوەڕوان دەکرێت لەدوای ئەو ماوەیە بگاتە (٢٣هەزار) کەس، کە ئەمەش زیاتر دەکەوێتە هەردوو شاری مهران و دهلرانەوە.

لەتەوەرەی ستراتیجی و گرنگی مهران، دهلران، دیزفول سەرچاوەی گرنگی نەوت و گازی سروشتی هەیە کە بەشێکی زۆری ئەمانە دۆزراونەتەوە و ئێستا لەبواری سوود لێوەرگرتندان، رابردووی سوودلێوەرگرتن لەدەرامەتی نەوت و گاز لەسنوری شاری دهلران دەگەڕێتەوە بۆ دوای جەنگی دووەمی جیهانی بەجۆرێك کە ئینگلیزەکان بەسوودوەرگرتن لەرێگای ئاسنین، نەوتی ئەم ناوچەیەیان بۆ عێراق دەگواستەوە و لەوێوە دەیانبرد بۆ بەریتانیا، ئێستاش ئەم سەرچاوە نەوتە بەبۆری بۆ پارێزگای خوزستان دەگوازرێتەوە و دوای پاڵاوتنی سوودی لێوەردەگیرێت، بەمەبەستی بەرزکردنەوەی رێژەی ئاسایش لەم ناوچەیەدا جێگا هەیە بۆ وڵاتی دراوسی وەك عێراق بۆ دروستکردنی پیشەسازی هاوبەشی پترۆکیمیایی و نەوتی و گازی هەنگاو بنێن، ئەم هەنگاوانە لەچەند لایەنێکەوە گرنگە: یەکەم کاتێك کە پیشەسازی پەیوەست بەهەردوو وڵاتی هاوسنور دادەمەزرێت لەکاتی سەرهەڵدانی قەیران و بەرزبوونەوەی دژایەتیەکان پارێزەری هەرجۆرە خسارەتێك دەبێت، بەتایبەت لەوناوچانەی کە هەریەکەیان لەقۆناغی یەکەمی شەڕدا مەبەستیان بوو داگیربیکەن. دووەم بوونی پیشەسازی نەوت و گاز لەناوچەکە هەنگاوێکە بۆ بوژانەوەی ناوچەکە و نەهێشتنی بێکاری و جوڵانەوەیەکە بۆ خستنەکار زیاتر.

لەبواری پەرەپێدانی ئاژەڵداریشدا زیاتر جەخت لەهەر دوو شاری مهران و دهلران دەکرێتەوە، بەجۆرە هەردوو بەشی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری دەتوانرێت چاوەڕوان بکرێت کە نزیکەی (٧) هەزار خێزانی تازە لەم ناوچە ستراتیجیە نیشتەجێ بکرێت، بەشێك لەم دانیشتوانی ئەم ناوچەیە بەکۆچ ورەوەوە خەریکن کە دەیانەوێت نیشتەجێبکرێن و بەشێك لەدانیشتوانە نیشتەجێکە دەیانەوێت چارەسەری بێکاریان بۆ بکرێت.

دروستکردنی یەکەی کشتوکاڵی و پیشەسازی بەمەبەستی گەشەکردنی ئابووری ناوچە سنوریەکانی نێوان هەردوو وڵات لەناوچەکەدا بۆتە جێگای باسکردن و ئاوەدانکردنەوەی ئەم ناوچەیە بەخەڵکی خۆی فاکتەری گرنگی کەمکردنەوەی قەیرانە، پێشنیازدەکرێت کە یەکەی کشتوکاڵی و پیشەسازی گونجاوترە و دامەزراندنی کشتوکاڵ و پیشەسازی لەدوو یەکەی کشتوکاڵی و پیشەسازی لەناوچەکانی دەشتی عەباس جێبەجێ بکرێت کە بەگەشە و ئاوەدانی ناوچەکە و پەرەپێدان و جێگیرکردنی نیشتەجێی نوێ بەهێزی مرۆیی زیاتر و لەکۆتایدا دروستکردنی بنەمایەکی دڵنیایی بۆ لایەنی ئاسایشی بۆ ناوچە سنوریەکان دیاری دەکات.

## دروستکردنی بازاڕی سنوری (مەرز) و ڕۆڵی لە پاراستن و پایەدارکردنی ئاسایشی نێوان هەردوو وڵات:

### پێناسەی بازارە سنوریەکان (سەرمەرزەکان):

بازاڕی سنوری ڕوبەرێکی شورە بۆکراوە کە کەوتۆتە خاڵی سفری سنور بەتەنیشتی گومرگەوە ڕێگاپێدراوە، یان ناوچەیەکە کە بەپێی ڕێکەوتننامەیەك لەنێوان وڵاتی کۆماری ئیسلامی ئێران وڵاتانی دراوسێی دیاریدەکرێت، خەڵکی هەردوو دیوی سنور دەتوانن بەرهەم و بەروبوومە ناوخۆییەکانیان بە ڕەچاوکردنی بڕیارەکانی هاوردە و ناردەنی و لایەنی ئاڵوگۆڕ لەم بازاڕانەدا ساخبکەنەوە و بیخەنەڕوو.

### کاری بازاڕی سنوری لە پارێزگاری ئاسایشدا:

سنورەکانی وڵات هەمیشە شوێنی هێنانوبردنی نایاسایی (قاچاخی) کاڵاکان بووە، دانیشتوانی ناوچە سنوریەکان زۆربەیان کەسانێکن زەمینەی لەبار بۆ کارەکانیان نالوێت بۆیە لەڕێگای قاچاخ و چالاکی نایاساییەوە دەرامەتەکانیان دەستدەکەوێت.

ئەگەر کەسانێك لەدانیشتوانی سنورەکان بیانەوێت دەرامەت لەڕێگای چالاکی دروست و گونجاوەوە بەدەستبهێنن، بەهۆی نەبوونی ئەو بارودۆخە لەسەر سنورەکان ناچارن کۆچ بکەن بۆ دەوروپشتی شارە گەورەکان، کۆچکردنی دانیشتوانی ناوچە سنوریەکان بەزۆری زەمینە بۆ لەبەینبردنی ئاشتی و ئاسایش دەسازێنێت، بۆیە پارێزگاری لەپێکهاتەی دانیشتوانی ناوچە سنوریەکان بەمەبەستی پاراستنی ئاسایش و پارێزگاری لەزەوی وڵات زۆر گرنگە.

بەجۆرە ئەگەر زەمینەی کاری گونجاو لەم ناوچانە بۆ دانیشتوانەکەی نەرەخسێنرێت، ناتوانرێت ڕێگا لەکۆچی دانیشتوانەکەی بگیرێت، بەسەرنجدان لەم کارە، حکومەت لەدامەزراندنی بازارە سنوریەکاندا لەسەر خاڵی سفری سنوری لەم ساڵانەی دوایدا گرنگی پێداوە، ئەم بازاڕانە دەتوانن زەمینە بۆ بەدەستهێنانی دەرامەت لەڕێگای بازرگانیەوە برەخسێنن و هەنگاو بۆ خستنەکار لەبواری پیشەسازیدا زیادبکات، بازاڕی سنوری لەپەرەپێدانی بازرگانی ناوچەیی، بەکارخستن و دابینکردنی پێویستی

سنورنشینان رۆڵی گرنگ دەبینێت.

جگە لەگرنگی بازاڕە سنوریەکان لەرووی پاراستنی ئاشتی و ئاسایش و بەرگرتن لەگۆڕانکاری پێکهاتەی دانیشتوان لەناوچە سنوریەکاندا، بەگشتی حکومەتەکان خواستیان لەسەر دروستکردنی ئەم بازاڕانە بەمەبەستی پەرپێدانی گونجاو لەبوارەکانی فەرهەنگی، ئابووری زیاترە، سەرەڕای ئەوە وردەواڵە فرۆشان پێویستیەکانی خۆیان لەڕێگای ئاڵوگۆڕی کاڵاکانەوە مسۆگەر دەکەن، ئەو جۆرە بازاڕانە هاوکات دەتوانێت رۆڵی کاریگەری لەکەمکردنەوەی قەیران لەناوچە سنوریەکان هەبێت.

## کاریگەری لاوەکی چالاکیەکانی بازاڕی سنوری:

پێکهێنانی بازاڕە سنوریەکان یارمەتی پێشکەش بەپاراستن و جێگیرکردنی ئاسایش لەسنورەکان کردووە و سنورنشینان بەپارێزگاری هێزی ڕێکخراوەیی و سەربازی و هەوڵی شایستەیانداوە بۆ پاراستنی ئاسایشی سنورەکان، ئەمانە دەزانن هەرجۆرە نائارامیەك لەناوچەکە دەبێتەهۆی لەکارکەوتنی بازاڕی سنور و سەرئەنجام زیانی بەرچاو بەرئەوان دەکەوێت.

دامەزراندنی بازاڕە سنوریەکان یارمەتی دابینکردنی پێویستیە بنەڕەتیەکانی سنورنشینان بەنرخێکی گونجاو دەدات، سەرەڕای ئەوەی کە ڕێگایەکە بۆ ناردنەدەرەوەی کاڵا ئانەوتیەکان و زەمینەی بۆ خستنەکاری سنورنشینان دەڕەخسێنێت، کۆمەڵێك کە کارتی بازرگانیان هەیە خەریکی بازرگانی دەبن و هەندێکیتریان بەبەڕێوەبردنی کارەکان و دامەزراندنی یەکەی بەرهەمەوە ئەمەش هۆکارێکە بۆ بەردەوامبوونی بواری بەرهەمهێنان. هێزی مرۆیی بێکار لەناوچە سنوریەکان ئامێرێکە بەدەستی دوژمنەوە کە لەڕێگای دڵنیا کردنەوەیەوە دەتوانێت ئامانجەکانی خۆی دژی حکومەت بەدەست بێنێت، هەروەك ئەوەی لەپێشەوە ئاماژەی بۆکرا بازاڕە سنوریەکان لەدۆزینەوەی کارو نەهێشتنی بێکاری زۆر کاریگەرە بەتایبەتی ئەوەی کە بارودۆخی ناوچە سنوریە هاوبەشەکانی نێوان عێراق و ئێران بەجۆرێکە کە جێگیرکردن و چالاکی ئەم بازاڕە سنوریانە دەتوانێت پەرەبە چالاکی ئابووری لەهەر دوو بەر بدات و فاکتەری دەرەکی کەمتر دەتوانێت چالاکیە خراپەکارانەکەی ئەنجام بدات، هەرکاتێك ژمارەی ئەم بازاڕانە لەناوچە هەستیار و ئەو شوێنانەی مەترسی سەربازی لەسەربێت دابمەزرێت بەهەمان ئەندازە کاری خراپەکارانە کەمدەبێتەوە.

## لێکۆڵینەوە لەشریتی سنوری لەناوچەی پشتکوهی لورستان بەمەبەستی جێگیرکردنی بازاڕی سنوری:

بەسەرنجدان لەو لایەنە باشانەی کە تایبەت بەدامەزراندنی بازاڕە سنوریەکان ئاماژەی بۆکرا و رۆڵی ئەم بازاڕانە لەپاراستنی جێگیرکردنی ئاسایش لەناوچە سنوریە هاوبەشەکان بەسەرنجدان لەسەرچاوەی وەزەی تارادەیەك یەکسان لەهەردوو وڵات لەوناوچانەی باسکرا بەلەبەرچاوگرتنی ناکۆکیە سنوریەکان و

داواکاری زەوی نێوان هەردوو وڵات بەدرێژایی هێڵی سنوری کە لەبەشەکانی پێشەوەدا باسکراوە وابەرچاو دەکەوێت کە بەشێوەی گشتی سنوری ئەندازەیی ڕووچاڵ بەشێوەی ناوبەناو لەنێوان وڵاتانی ئێران و عێراق دەردەکەوێت کە دەتوانرێت بەباشترین شوێن دابنرێت بۆ جێگیرکردنی بازاڕی سنوری و چالاکیە ئابووریە هاوبەشەکانیتر، بەلێکۆڵینەوەی مەیدانی لەزەوی و تایبەتمەندیەکانی ڕووی زەوی لەدەوروبەری ناوچەکانی سنور کە زۆرترین بەرزاییەکانی کەوتۆتە ناو پارێزگاکانی ئێلام و خوستانەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە گردۆڵکەکانی مهران و نزماییەکانی نێوانیان باشترین خاڵی سفری سنوریە کە بۆ ئەم کارە بەکاربێت. لەبەری سنوریش شارەکانی زرباتیە و بەدرە لەعێراق کە لەرابردویەکی دووردا لەنێوان دانیشتوانی هەردوو بەری سنور پەیوەندی ئابووری و فەرهەنگی زۆریان لەنێواندا هەبوو، ئەم هەنگاوە ئابووریە زەمینەیەکی لەبارە بۆ ئاشتی و دۆستایەتی لەنێوان دانیشتوانی هەردوو بەری سنور و زەمینە بۆ خستنەکاری خەڵکی بێکار لەشاری مهران و ناوچەکانیتری سنور خۆشدەکات.

لەقۆناغی دووەمدا دەبێت هەوڵبدرێت کە تەوەرەی پەیوەندی نێوان ئێران و عێراق بەجۆرێك فراوان بکرێت لەبوارەکانی ئابووری، فەرهەنگی، ئاینی لەم ناوچانەوە تێبپەرێت کەخۆی دەبێتە ناوەندێکی گەشتوگوزاری وسەردانی ناوچە پیرۆزدکان وسەرمایەی زۆر بۆخۆی کێشدەکات، هەڵبژاردنی خاڵی هاوشێوە لەهەموو ناوچەکان لەگەشەکردنی ئابووری شریتی سنوری بەدرێژایی (٣٠٠کم) لەنێوان هەردوو وڵات دەتوانێت لەپێدانی متمانەی سەرکردەکان ڕۆڵی سەرەکی ببینێت، لەبەرئەوە یەکجاریتر وادەبینرێت کە دەبێت لەستراتیجی هاوبەش و هاوبەشپێکردن لەچالاکیە ئابووریەکان بەمەبەستی بەدەستهێنانی کەشوهەوایەکی دڵنیایی سودوەرگرین کە دەتوانێت یارمەتیدەربێت لەهەڵبژاردنی سیاسەتێکی دەرەکی چالاك و کاریگەر لەرووی پارێزگاریکردن لەبەرژەوەندی نەتەوەیی و داهاتی نەتەوە هەردوو وڵاتدا.

تەواو بوو لە کاتژمێر (٦:٤٢) ئێوارێی ڕۆژی دوو شەممە ڕێکەوتی ٢٠١٠/١١/٢٩

پاکنوسی کۆتایی لە سێیەم ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان ڕۆژی پێنج شەممە ڕێکەوتی ٢٠١١/٩/٢ کاتژمێر (١:٢١) شەو

ئەم کتێبە یەکێکە لە کتێبە گرنگ و بەناوبانگەکانی دکتۆر عزت الله عزتی کەبەدەگمەن توێژینەوەیەکی زانستی و گرنگی وا لە کتێبخانەکاندا بەرچاودەکەوێت کە لەبارەی جیۆپۆلەتیکی دوو وڵات لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کەبریتیە لە ئێران و عێراق کرابێت، گرنگی ئەم کتێبە لەوەدایە کە توێژەر ئەم لێکۆڵینەوەیەی زۆر بەشێوەی وورد و ئەکادیمی نوسیوە و ئەمکارەی بۆ دەفتری زانیاری سیاسی و نێودەوڵەتی سەر بەوەزارەتی کاروباری دەرەوە کردووە و لەگەڵ ئەوەی نوسەر خۆی ئێرانیە بەڵام دەتوانین بڵێین زۆر بێلایەنانە و زانستیانە ئەم توێژینەوەیەی ئەنجام داوە و بەوردی ئاماژەی بۆ سەرجەم کێشە و کەلێنە جیۆپۆلەتیکیەکانی ئێران و عێراق کردووە، کەبەدرێژایی مێژوو بووەتە سەرچاوەی ناکۆکی و ململانێ لەنێوان ئەم دووڵاتانەدا و بەشێوەی جۆراوجۆر بەپێی سەردەمە مێژووییەکان.



2013



لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا

نرخی شەش هەزار دینارە

Farhad